THE **BOMB** IN MY GARDEN


مەهدی عوبێدی
کێرت پیتزەر

وەرگێڕان و پەراوێز
سەنگەر حەسەن نەجم


# بۆمبێک لە باخچەکەمدا

دانپێدانانەکانی داڕێژەری سەرەکیی بەرنامەی چەکی ئەتۆمیی سەدام حوسێن


www.iqra.ahlamontada.com
منتدى إقرأ الثقافي




دەزگای فام

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAMpublication

بەڕێوەبەری گشتی: سەنگەر زراری


**Orginal title**

**The Bomb In My Garden:**
The Secrets of Saddam's Nuclear Mastermind
By: Mahdi Obeidi, Kurt Pitzer
**Publisher:** Wiley; 1st edition (May 2, 2008)


مافی چاپ و بڵاوکردنەوەی بۆ **دەزگای فام** پارێزراوە.



**چاپی یەکەم- ٢٠٢٤**


**بۆمبێك لە باخچەکەمدا**

دانپێدانانەکانی داڕێژەری سەرەکی بەرنامەی چەکی ئەتۆمیی سەددام

نووسینی

**مەهدی عوبێدی و کێرت پیتزەر**

وەرگێڕان و پەراوێز:

**سەنگەر حەسەن نەجم**


بابەت: بیرەوەریی

**پێوانە**

١٣.٥*٢١سم (٤٢٤) لاپەڕە

ISBN: 978-9922-709-09-3

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان، ژمارە سپاردنی (٦٥٧)ی ساڵی٢٠٢٣ی پێ دراوە.

داستانی ئەتۆمی سەددام

# بۆمبێك لە باخچەکەمدا

دانپێدانانەکانی داڕێژەری سەرەکیی بەرنامەی چەکی ئەتۆمیی سەدام حوسێن


نووسینی:

**مەهدی عوبێدی و کێرت پیتزەر**



وەرگێڕان و پەراوێز:

**سەنگەر حەسەن نەجم**

**ئەم کتێبە پێشکەشە بە:**

لەیلا، ئیسرا، زەید، ئامینە و ئایات عوبێدی؛

لەپای بەرگەگرتنیان بە ساڵانێکی دژوار و

مانەوەیان بە بەهێزی و خۆشەویستی...

# ناوەڕۆك

ناوەڕۆك ........ ٥

پێشەكیی چاپی كوردی ........ ٧

پێشەكی ........ ٢١

بەشی یەكەم  بۆمبێك لە باخچەكەمدا ........ ٢٩

بەشی دووەم  هیواكانی سەرەتا ........ ٧٥

بەشی سێیەم  سەنتەرفیوج ........ ١١٥

بەشی چوارەم  نیگای توند و سەرنجئامێزی سەددام ........ ١٤٥

بەشی پێنجەم  بازاڕكردن لە ئەوروپا ........ ١٩١

بەشی شەشەم  بەرنامەی تێكچڕژان و بەریەككەوتن ........ ٢٢٣

بەشی حەوتەم شاردنەوەی چەكی ئەتۆمی ........ ٢٥٩

بەشی هەشتەم سالانی تاریكی ........ ٢٩٣

بەشی نۆیەم  بەرەو جەنگ ........ ٣٣٣

# پێشه‌كیی چاپی كوردی

سه‌ره‌تا ده‌مه‌وێت سوپاس و ستایشی خودای باڵاده‌ست و مه‌زن بكه‌م، به‌وه‌ی كه‌ توانای پێ به‌خشیم خزمه‌تی نیشتمانه‌ ئازیزه‌كه‌م -عێراق- بكه‌م. هه‌روه‌ها سوپاسی هه‌موو ئه‌و خوشك برایانه‌ ده‌كه‌م كه‌ له‌ ماوه‌كانی ڕابردوو توانیم به‌وپه‌ڕی دڵسۆزییه‌وه‌ كاریان له‌گه‌ڵدا بكه‌م و هه‌وڵی به‌ره‌وپێشبردن و خستنه‌ پێشه‌وه‌ی وڵاته‌كه‌م بۆ ڕیزی وڵاتانی پێشكه‌وتووی جیهان بده‌م.

خوێنه‌رانی ئه‌زیز، ڕێگه‌م بده‌ن ئه‌زموونی ژیانی خۆم بخه‌مه‌ به‌رده‌ستان. ئازیزانم، من هه‌ر له‌ منداڵییه‌وه‌ هه‌وڵم داوه‌ تاوه‌كو بۆم لواوه‌ ئه‌و متمانه‌یه‌ بپارێزم به‌وه‌ی خزمه‌تی نیشتمانه‌كه‌م ده‌كه‌م. بۆئه‌وه‌ی هه‌وڵی زیتر بده‌م كه‌ به‌ره‌و لوتكه‌ی شكۆمه‌ندی پێشی بخه‌م و وه‌ك چۆن هه‌ر شایه‌نی ئه‌وه‌شه‌. ڕوونه‌ كه‌ عێراق خودان شارستانییه‌تی دێرینه‌و هه‌ر له‌ گزیده‌ی مێژووه‌و گه‌وره‌ترین بناغه‌ی شارستانیه‌تی تێدا دامه‌زراوه‌.

ئه‌زموونی من، تژی بوو له‌ هیوا، چونكه‌ ئه‌وه‌ی به‌ده‌ستمان هێنا زۆر نزیك بوو له‌ سه‌ركه‌وتنی ته‌واومان له‌ بواری ئه‌تۆمیدا. ئه‌مه‌ش كاتێك به‌رجه‌سته‌ بوو كه‌ كۆمه‌ڵێكی پێكهاتوو له‌ دوو سه‌د زانا، ئه‌ندازیار، ته‌كنیكار و كارگێڕ له‌ دامه‌زراوه‌یه‌ك به‌ ناوی (سه‌نته‌ری دیزاینی ئه‌ندازیاری) توانیان له‌ ماوه‌ی سێ ساڵدا بگه‌نه‌ یه‌كێك له‌ خێراترین و كاراترین .شێوازه‌كانی پیتاندنی یۆرانیۆم له‌ مێژوودا، له‌سه‌ر بنه‌مای شێوازی سه‌نته‌رفیوج.

خوێنەری ئەزیز، ئەم کتێبەی بەردەستت تایبەتمەندی کەسێتی عێراقی دەردەخات کاتێك کە مەرجی گونجاوی لەبەردەست دا بێت، داهێنان دەکات و توانا زانستیەکانی دەردەخات. هەربۆیە خوێنەر دەگاتە ئەو پرسیارەی کە ئاخۆ لە کۆتاییدا چی ڕوویدا؟! بۆچی ئەم ئەزموونە لەسەرەتای سەرکەوتنی پاشەکشەی کرد؟

دەستپێکی ئەزموونی ژیانم بە بەدەستهێنانی هەلێکی خوێندن دەستی پێکرد لەدەرەوەی وڵات دوای تەواوکردنی خوێندنی ناوەندی لە شاری بەغدای خۆشەویست لە ساڵی ١٩٦٢. ئەوەبوو بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی ماستەر لە ئەندازیاری پاڵاوتنی نەوت و ئەندازیاری کیمیایی لە قوتابخانەی کانەکانی کۆلۆرادۆ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەرگیرام، کە یەکێکە لە زانکۆ بەناوبانگەکان.

دوای تەواوکردنی خوێندن لە ساڵی ١٩٦٧ پەیوەندیم بە وەزارەتی نەوتەوە کرد و لە پاڵاوگەی دۆرە و چەندین پاڵاوگەی دیکە کارم کرد. ئەمەش ئەزموونێکی گرنگ بوو لە بواری ئەندازیاری و بەڕێوەبردنی کاردا. لە ساڵی ١٩٧٢ هەلێکی خوێندنی ترم دەستخست بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی دکتۆرا لە زانکۆی سوانزی لە بەریتانیا و لە بواری زانستی کەرەستەدا. بێگومان مەبەستم کەرەستەکانی وەك ئەو مادانەی کە لە فڕۆکە و ئۆتۆمبێل و کەشتی و کەرەستەکانی بەکارهێنراو لە کارتیاکەرە ئەتۆمییەکاندا بەکاردەهێنرێن. سەرەنجام دکتۆرام تەواو کرد و لە ساڵی ١٩٧٥ گەڕامەوە عێراق.

دوای ئەوەی هەشت ساڵان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی

ئەمریکا و بەریتانیا خوێندم، خەونی کارکردنم لە شوێنێکدا هەبوو کە بتوانم خزمەتی نیشتمانەکەم بکەم و بیخەمە ڕیزی وڵاتانی پێشکەوتوو، چوون ئەم نیشتمانە هەر شایستەی ئەو خزمەتەیە. من لە کاتێکدا کە گەشتم بە ئەمریکا و بەریتانیادا دەکرد و بە چاوی خۆم ئەو پێشکەوتنە شارستانییەی ئەم وڵاتانەم دەبینی کە لە لایەنەکانی زانست، تەکنەلۆژیا، پزیشکی، بیناسازی و هتد، هەروەها تامەزرۆیی وچانیان بۆ کارکردن دەبینی، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ئای عێراقی ئازیزمان چەندێك ناهاوسەنگی هەیە، تۆ لەکوێ و ئەو وڵاتانە لە کوێ!

دوای کارکردن لە وەزارەتی نەوت و تێکەڵبوون لەگەڵ زۆرێك لە عێراقییەکان لەو زانکۆیانەی تیایدا خوێندبووم، هەروەها ئەو خوێندکارانەی سەرپەرشتی تێزی ماستەر و دکتۆرایانم لە عێراقدا کردووە، دڵنیا بووم کە عێراق خاوەنی وزەی مرۆیی داهێنەرانەیە کە دەشێت بەراورد بکرێت بە وڵاتانی ڕۆژئاوا. هەربۆیە هەموو ئەو هۆکارانە هانیان دام کە تەواوی ژیانم تەرخان بکەم بۆ ئامانجێك کە پێشخستنی عێراقە. ئەوەبوو لەگەڵ گەڕانەوەم بۆ نیشتمان، زانیم کە عێراق گرێبەستی لەگەڵ فەرەنسا کردووە بۆ کڕینی کارتیاکەرێك بۆ تاقیکردنەوەی ماددە ئەتۆمییەکان. ئەمەش پڕۆژەیەك بوو کە ڕێك یەکسان بوو لەگەڵ پسپۆری و تێزی دکتۆراکەم.

ئەوەبوو دواجار لە ساڵی ۱۹۷۵ داواکارییەکم پێشکەش بە دامەزراوەی وزەی ئەتۆمی عێراقی کرد. هەرچەندە دەمزانی وەزارەتی نەوت دریغی ناکات لەوەی کە من بگەڕێنێتەوە بۆ وەزارەتەکەیی و هەر ئەوەش ڕوویدا تاوەکو ئەوکاتەی نامەیەك

-كه فه‌رمانی گواستنه‌وه‌ی منی تێدابوو- بۆیان هاتوو نه‌یانتوانی ڕه‌تی بكه‌نه‌وه.

ده‌رئه‌نجام له به‌شی فیزیا دامه‌زرام كه دكتۆر جه‌عفه‌ر ضیاء جه‌عفه‌ر سه‌رۆكایه‌تی ده‌كرد و ئه‌ركی ئاماده‌كردنی كادره‌كان و پلانی ڕاهێنان بۆ تاقیكردنه‌وه‌كان و هه‌روه‌ها داڕشتنی پلان له كارتیاكه‌ری تاقیكردنه‌وه مادده‌یه‌كان -كه له فه‌ره‌نسا ته‌یار كرابوو- ، پێم سپێردرا. منیش ده‌ستبه‌جێ ده‌ستم كرد به ئاماده‌كردنی پلانێك بۆ به‌شی كه‌ره‌سته‌سازی له به‌شی فیزیا، كه بریتی بوو له داڕشتنی پلانێك بۆ ئه‌و كادرانه‌ی كه له ئێستاوه بوونیان هه‌بوو و خاوه‌نی بڕوانامه‌ی به‌كالۆریۆس و ماسته‌ر و دكتۆرا بوون، هه‌روه‌ها هێنانی كادری زیاده له نێو یه‌كه‌مه‌كانی زانكۆكانی عێراق، و ده‌سته‌به‌ركردنی ئامێری پێویست بۆ تاقیكردنه‌وه‌كان.

له ساڵی ١٩٧٦دا چوومه ئیتاڵیا بۆ مه‌شق و ڕاهێنان له سه‌نته‌ری ئه‌تۆمی كاساسیا كه ده‌كه‌وێته نزیك ڕۆما، له‌سه‌ر حیسابی ئاژانسی نێوده‌وڵه‌تی وزه‌ی ئه‌تۆمی، له‌وێ هاوكاری ته‌واوی ئیتالییه‌كانم به‌ده‌ست هێنا. پاشان توانیم بڕێكی زۆر له‌و دۆكیۆمێنتانه له‌به‌ربگرمه‌وه كه تایبه‌ت بوون به بابه‌تی ئه‌تۆمی و پێویست بوون بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم. له‌مه‌شدا هاوڕێی ئه‌زیزی كۆچكردووم منذر عریم —باڵیۆزی ئه‌وكاتی عێراق- یارمه‌تی دام تاوه‌كو بیاننێرمه‌وه بۆ ئاژانسی وزه‌ی ئه‌تۆمی عێراقی.

دوای ئه‌وه چوومه ناوه‌ندی ئه‌تۆمی ساكلی له نزیك پاریس له فه‌ره‌نسا بۆ گفتوگۆكردن له‌گه‌ڵیان تاوه‌كو پلانێك بۆ مه‌شقكردن سه‌باره‌ت به تاقیكردنه‌وه‌كانی ئه‌و كارتیاكه‌رانه‌ی كه له‌لایه‌ن ئه‌وانه‌وه بۆ عێراق دابینكرابوون، ئاماده بكه‌ین. له‌شوێنی

خۆی و لەکتێبەکە بە درێژی باسم لە تەنگ و چەڵەمەکان کردووە.

دوای بۆردومانکردنی کارتیاکەری فەڕەنسی لەلایەن ئیسرائیلەوە لە ساڵی ١٩٨١، چاوەکانی ئاژانسی وزەی ئەتۆمی عێراقی سەرنجیان خستە سەر پیتاندنی یۆرانیۆم بەمەبەستی بەرهەمهێنانی بۆمبی ئەتۆمی بە دوو شێواز: یەکەمیان شێوازی جیاکردنەوەی کارۆموگناتیسی بە سەرۆکایەتی دکتۆر جەعفەر و ئەوی دیکەش شێوەی بڵاوبوونەوەی گازی بوو بۆ بەشێکی تر دیاری کرابوو. ئەرکی من ئەوەبوو کە کەرەستەی پێویست بۆ هەردوو شێوازەکە دیاری بکەم.

دوای دوو ساڵ لێکۆڵینەوە لەسەر شێوازی بڵاوبوونەوەی گازی لەلایەن بەشەکەی ترەوە، من تووشی سەرسوڕمان بووم کاتێك کە دکتۆر جەعفەر داوای ڕاپۆرتی لێکردم لەسەر شێوازی بەرهەمهێنانی بۆڕی گازی کونیلەدار، ئەمەش ئاماژەبوو بۆ ئەوەی کە بەشەکەی تر نەگەیشتوونەتە هیچ ئەنجامێك، و ئەوەبوو منیش هەڵسام بەڕێگەیەك کارەکەم کرد کە پێشتر ئەوان بۆی نەچووبوون، ئەویش بریتی بوو لە بەکارهێنانی ئەلەمنیۆم لەبری نیکل، و ئەمەش لە ماوەیەکی پێوانەییدا تەواو بوو، بەو پێیەی دەرکەوت کە کاراییەکەی بە ڕێژەی لەسەدا سی لە شێوازی ئەمریکی خێراترە و بە تێچووی کەمتر بە بەراورد بەو پارەیەی ئەمریکا خەرجی کردووە، کە بڕی سێ ملیار دۆلار بووە، ئەنجام دراوە.

ئەوەبوو حوسەین کامل هەواڵەکەی بیستەوەو و داوای لێکردم سیمینارێك پێشکەش بکەم. ئەمەش لەشوێنی خۆی و لەنێو کتێبەکە

بەدرێژی باس كراوە. چونكە پرۆژەكە چەند بەربەستێكی بۆ دروست بوو كە لەدەوەری تواناكانی ئەوكاتی عێراق بوو. حوسەین كامل پرسیاری ئەوەی لێكردم كە ئایا جێگرەوەیەك هەیە، منیش وەڵامم دایەوە كە بیرۆكەیەك هەیە بەناوی سەنتەرفیوج بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم، كە تیایدا پشت بە خولێنەرەكان دەبەستێت بە خێرایەكی زۆر، ڕێك وەك ئامێری جلشۆر. كە تیایدا وەك چۆن لەو شوێنەی كە جلەكان دەچنە دیواری خولێنەرەوەكە كاتێك دەسوڕێتەوە، و ئاوەكەش دەچێتە ناوەندی خولێنەرەوەكە، جا هەمان شتیش لە سەنتەرفیوج هەیە، واتە یۆرانیۆمی قورس U238 كە پێویست نییە دەچێتە دیواری خولێنەرەوەكە و یۆرانیۆمی سووكیش ٢٣٥ U دەچێتە ناوەڕاست، كەئەمەش بۆ دروستكردنی بۆمبەكە جیادەكرێتەوە.

پرسیاری ئەوەی لێكردم كە ئاخۆ ئەم شێوازە لەلایەن وڵاتانەوە بەكاردەهێنرێت، منیش وەڵامم دایەوە ئەمریكا و ئەوروپا و پاكستان بەكاری دەبەن، بۆیە دەستبەجێ ڕێنمایی كردم كە پرۆژەی سەنتەفیوج دەست پێبكەم. حوسەین كامل شوێنێكی بۆ دابین كردین لە ناوچەی ڕەشیدیە، كە ڕووی لە ڕووباری دیجلە بوو، ناوی سەنتەری لێكۆڵینەوەی ئاودێری بوو، ئەركی پیتاندنی یۆرانیۆمم پێ سپێردرا بە ڕێگەی سەنتەرفیوج، هاوتەریب لەگەڵ شێوازی كارۆموگناتیسی كە بە دكتۆر جەعفەر سپێردرابوو. هەردووكیشیان لەلایەن حوسەین كاملەوە بەڕێوەدەبران. ئەوەبوو دەستمان كردە كاركردن و فشاری زۆرمان لەسەر بوو، و شەو و ڕۆژمان خستنە سەریەك. سەرەتاش لەسەر بنەمای نەخشە و دیزاینە كۆنەكان دەستمان پێكرد. ئەو دیزاینە كۆنانە بیرۆكەیەكی لەخۆگرتبوو كە لەسەر بنەمای خولێنەرەوە بوو، ڕێك وەك سوڕان

و خولانی ویلی تایه‌كانی ئۆتۆمۆبێل به‌ڵام به‌خێرایی زۆر.

هه‌موو پێداویستیه‌كانی كاركردنی ئیكسترۆده‌ری ڕۆن به بینایه‌كی كۆنكریتیشه‌وه ئاماده‌كران به مه‌به‌ستی سه‌لامه‌تی به‌هۆی خێرایی زۆره‌وه. ئامانجیش لێی گه‌یشتن بوو به خێرایی زیاتر له په‌نجا هه‌زار خول له خوله‌كێكدا. به‌ڵام ئێمه سه‌رمان سوڕما له‌وه‌ی كه ئیكسترۆده‌ری ڕۆنه‌كه نه‌یتوانیوه بگاته خێرایی پێویست، چونكه له‌كاتی كاركردنی به خێرایی كه‌مدا ده‌شكێت. دڵنیابووینه‌وه له‌وه‌ی كه ئه‌م شێوزاه ئامانجی دڵخواز به‌ده‌ست ناهێنێت. ئه‌وه‌بوو حوسه‌ین كامل یه‌كسه‌ر سه‌ردانی كردین و زۆر بێزار بوو كاتێك لێی پرسیم چی ده‌كه‌ن، منیش له وه‌ڵامدا گوتم هه‌وڵماندا پێش كات بكه‌وین، به‌ڵام ئه‌و له پێشمانه‌وه‌یه و هه‌وڵی مه‌حاڵ ده‌ده‌ین. ده‌مزانی چاره‌نووسی من و چاره‌نووسی ئه‌وانه‌ی له‌ژێر ئیداره‌ی مندا كارده‌كه‌ن و ئه‌وانیش ئه‌مانه‌تێكن له ده‌ستمدا.

دڵنیابووینه‌وه له‌وه‌ی كه شێوازی ڕۆنه‌كه جێی متمانه نییه و ده‌بێت بژارده‌یه‌كی تر هه‌بێت. له‌لایه‌كی تر فشاره‌كه زۆر گه‌وره بوو و خۆشبه‌ختانه په‌نامان بۆ بژارده‌ی دوورخه‌ری موگناتیسی برد. شایه‌نی باسه كه ئیكسترۆده‌ری موگناتیسی جیاوازه له ئێكسترۆده‌ری ڕۆن چونكه ئه‌و خولێنه‌ره‌ی كه به‌شداره له سوڕانه‌وه‌ی سلنده‌ره‌كه؛ موگناتیسییه و ڕۆن نییه، هه‌ر بۆیه هیچ به‌ركه‌وتنێكی تێدا نییه.

بۆمان ده‌ركه‌وت كه یه‌كه‌مین شێوازی موگناتیسی له‌لایه‌ن زانایه‌كی ئه‌ڵمانی به ناوی (بێرنۆت) دیزاین كراوه كه دیلێكی جه‌نگ بووه له ڕووسیا و په‌یوه‌ندی كردووه به زانكۆی ڤێرجینیا له ویلایه‌ته یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مریكا، له‌وێ سه‌ركه‌وتوو بووه له

كارپێكردنی ماده‌یه‌كی موگناتیسی به خێرایی زۆر و جیاكردنه‌وه‌ی یۆرانیۆم. ئه‌وه‌بوو دووجار ڕاپۆرتێكی له‌سه‌ر دۆزینه‌وه‌كانی نووسی. پاشان گه‌ڕایه‌وه ئه‌ڵمانیا و په‌یوه‌ندی به كۆمپانیای به‌ناوبانگی M.A.N كرد، به‌و پێیه‌ی ئه‌م كۆمپانیایه پێشه‌نگ بوو له‌م بواره‌دا. منیش ئه‌وكات دركم به‌وه‌كرد كه بێگومان ئه‌و ڕاپۆرته زۆر گرنگ و پێویست و به‌سوود ده‌بێت بۆ دروستكردنی سه‌نته‌رفیوج و جیاكردنه‌وه‌ی یۆرانیۆم بۆ به‌رهه‌مهێنانی بۆمب.

له كتێبخانه‌ی ڕێكخراوی وزه‌ی ئه‌تۆمی و شوێنه‌كانی تردا به‌دوای ڕاپۆرته‌كه‌دا گه‌ڕاین، به‌ڵام نه‌ماندۆزییه‌وه. له كۆتاییدا بڕیارمدا بچمه زانكۆی ڤێرجینیا به یاوه‌ری دكتۆر فه‌رید به‌شیر به‌ڕێوه‌به‌ری به‌شی ده‌رهێنان. له زانكۆی ڤێرجینیا به‌خت یاوه‌رمان بوو و ڕاپۆرته‌كه‌مان دۆزیه‌وه و ده‌ركه‌وت یه‌كێكه له ڕاپۆرته قه‌ده‌غه‌كراوه‌كان. به‌ڵام دوای ئه‌وه‌ی به ته‌كنیكێك توانیمان سه‌یری بكه‌ین، ئیدی ئه‌وه بوو به چرا و ڕێ ڕۆشنكه‌ره‌وه. له لیستی ئه‌و كه‌سانه‌ی كه ڕاپۆرته‌كه‌یان بۆ نێردرابوو، ناوی پرۆفیسۆر جاكادا هه‌بوو له ناوه‌ندی ئه‌تۆمی گێزا له ئیتاڵیا. بۆیه چوونه میلانۆ و سه‌ردانی دكتۆر مۆراندی به‌ڕێوه‌به‌ری ته‌كنیكی ناوه‌ندی ئه‌تۆمی جیزه‌م كرد، كه هاوڕێیه‌كی دێرینم بوو كه له ساڵی ١٩٧٦ له كاتی مه‌شق و ڕاهێنان له ئیتاڵیا ناسیم و سه‌ره‌نجام دوای هه‌فته‌یه‌ك كۆپییه‌كی ڕاپۆرته‌كه‌ی هێنایه به‌غدا.

دوای به‌ده‌ستهێنانی ڕاپۆرته‌كه، پلانێكی یه‌كگرتوو ئاماده‌كرا بۆ ئه‌نجامدانی توێژینه‌وه و ئاماده‌كردنی پێداویستییه پێویسته‌كان بۆ به‌رنامه‌ی ده‌وڵه‌مه‌ندكردنی سه‌نته‌رفیوج. ئێمه پێداویستییه‌كانی

دروستكردنی ٤٠٠٠ ئێكسترۆدەرمان لە ساڵێكدا بەجێ گەیاند، لەوانەش تاقیگە و ئامێری ورد، و دەزگای پاك و بێ خەوش. هەروەها ژمارەیەك زانا و ئەندازیار لە باشترین ناوەندەكانی ڕاهێنان لە جیهاندا ڕاهێنانیان پێكراوبوو.

دواجار ئەم هەوڵانە گەیشتنە لوتكە بە ئەگەری سوڕانەوەی ئامێرێكی شێوازی موگناتیسی بە خێرایی ٦٣ هەزار خول لە خولەكێكدا و بە هێزی ٢٩ وات، كە هاوتایە لەگەڵ وزەی ڕووناكییەكی بچووك، لەگەڵ دامەزراندنی دەزگای زەبەلاحی بێ خەوش بۆ ئەوەی بە وردییەكی زۆرەوە ئامێرەكان بۆ دروستكردنی ٤٠٠٠ لەو شێوازە لە ساڵێكدا جێگیربكرێت، كە ئەمەش بەسە بۆ بەرهەمهێنانی جبەخانەی ئەتۆمی، بە تێچووی زیاتر لە ٤٠ ملیۆن دۆلار. هەموو ئەمانە لە ماوەی سێ ساڵدا ئەنجامدران، بەو پێیەی هەموو پێداویستییەكان جێبەجێكران، ئێكسترۆدەرەكە دەسوڕایەوە و یۆرانیۆمیش پیتێندرا. كارەكە بە مانای تەواوی وشەكە زۆر نهێنی بوو و بە بەكارهێنانی هەموو ئامرازێك بۆ دووركەوتنەوە لە هەر ئاشكراكردنێك لەسەر ئەوەی چی ڕوودەدات و هەموو ئەمانەش بە شێوەیەكی ڕێك و پێك و بە متمانەیەكی بەرز و باوەڕ بەخۆبوون لەلایەن كارمەندانی سەنتەری دیزاینی ئەندازیارییەوە بەدەست هاتن.

هەر لەم سۆنگەیەوە سوپاس و پێزانینی گەورەم بە خوشك و برایانی ناوەندی دیزاینی ئەندازیاری و عەرەب و كورد و هەموو كەمینەكان دەگەیەنم، بۆ هەوڵە گەورەكانیان بۆ بەدیهێنانی یەكێك لە خێراترین و كاراترین پرۆگرامەكانی پیتاندنی یۆرانیۆم لە

مێژوودا، كه‌ توانای مرۆڤی عێراقی پشتڕاست ده‌كاته‌وه‌ بۆ دروستكردنی موعجیزه‌ و گه‌ڕاندنه‌وه‌ی شكۆمه‌ندی عێراق بۆ پێش سه‌رده‌می خۆی، كاتێك ئه‌م نیشتمانه‌ ئالآی زانست و پێشكه‌وتنی بۆ هه‌موو مرۆڤایه‌تی هه‌ڵگرتبوو. هه‌روه‌ها داوای لێبوردنیان لێده‌كه‌م كه‌ ناوی هه‌موویانم نه‌هێناوه‌ و به‌ڕاستی ئه‌وانه‌ شایه‌نی باسكردنن.

به‌ڵام دواجار دوو ڕۆژ دوای چوونی سوپای عێراق بۆ ناو كوێت، دكتۆر جه‌عفه‌ر ضیاء جه‌عفه‌ر سه‌ردانی كردم له‌ ئۆفیسه‌كه‌م له‌ ڕه‌شیدیه‌، به‌مه‌به‌ستی ئه‌وه‌ی كه‌ یه‌ك بۆمب دروست بكرێت به‌ شێوازی ئێمه‌ كه‌ سه‌نته‌رفیوجه‌. له‌و كاته‌دا دڵنیا بوومه‌وه‌ كه‌ ئه‌وان به‌ شێوازی كارۆموگناتیسی نه‌گه‌یشتوونه‌ته‌ پیتاندنی یۆرانیۆم. داوام له‌ دكتۆر جه‌عفه‌ر كرد كه‌ چه‌ند ڕۆژێكم پێ بدات تا بزانم چی ده‌كرێت. كاتێك جارێكی تر هاته‌وه‌ پێم گوت كه‌ ده‌توانین ئه‌و ئه‌ركه‌ ئه‌نجام بده‌ین به‌ دروستكردنی هۆڵێكی بچووك له‌ په‌نجا ئێكسترۆده‌ر بۆ به‌رزكردنه‌وه‌ی چڕیی یۆرانیۆم كه‌ له‌لایه‌ن ئه‌وانه‌وه‌ دابین ده‌كرێت له‌ ٧٠% بۆ ٩٣% یۆرانیۆم-٢٣٥ كه‌ پێویسته‌ بۆ دروستكردنی یه‌ك بۆمب. هه‌روه‌ها داوام لێكرد مادده‌ی یۆرانیۆم له‌ جۆری یۆرانیۆم هێكسافلۆراید ئاماده‌ بكات، بۆ ئه‌وه‌ی به‌ چڕیی ٩٣٪ ڕاده‌ستی ئه‌وان بكه‌ین. سه‌باره‌ت به‌ باقی په‌یوه‌ست به‌ به‌رهه‌مهێنانی بۆمبه‌كه‌، ئه‌وه‌ كاروباری ئه‌وانه‌ و ئێمه‌ هیچ په‌یوه‌ندییه‌كمان پێوه‌ نییه‌. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ڕێككه‌وتین كه‌ كادره‌كانی دیزاینی ئه‌ندازیاری له‌گه‌ڵ كادره‌كانیان هه‌ماهه‌نگی بكه‌ن بۆ ئاماده‌كردنی یۆرانیۆم هێكسافلۆراید.

لێرەوە دەمەوێت ئاماژە بۆ خوێنەرانی ئەزیز بکەم کە دکتۆر جەعفەر ضیاء جەعفەر لە کتێبی (دوا دانپێدانان)دا باسی ئەوەی نەکردووە لەڕووی هەماهەنگی لەگەڵ سەنتەری دیزاینی ئەندازیاری و هەوڵەکانی کادرەکان کە شەو و ڕۆژ بە ئارەقەی نێوچاوانیان و بە هەموو دڵسۆزی و خۆبەخشییەکەوە کاریان دەکرد بۆ سەرکەوتنی ئەم ئەزموونە، کە توانای کەسێتی عێراقی لە قوربانیدان و بەخشین نیشان دەدا بۆ بەرزکردنەوەی پێگەی عێراق. بۆیە هەڵسەنگاندنی ئەم دۆخە بۆ خوێنەر جێدەهێڵم.

شتەکان بە خێراییەکی خێرا بەرەو ئامانجی خوازراو دەڕۆیشتن، ئێمەش لە گەیشتن بە ئامانجەکە نزیك بووین، چونکە خەریك بوو پێداویستییەکانی پیتاندنی یۆرانیۆم تەواو بکەین و ڕادەستی ئەو کەسە بکەین کە بەشدارە لە دروستکردنی بۆمبەکەدا. بەڵام هیوا گۆڕا بۆ ئازار کاتێك لە ساڵی ۱۹۹۰ مووشەکەکانی ئەمریکا بەسەر بەغدا داباریین و ئێمەیش هەرزوو درکمان بەوەکرد کە ئەو بینایەیەی کە دروستمان کردبوو خەریکە وا لەبەرچاوماندا دەڕووخێت.

مرۆڤ دەبێت بیر لەوە بکاتەوە کە پەند و عیبرەت لەوە وەربگرێت کە ڕوویداوە. جا هەر لەم سۆنگەیەوە من دەمەوێت بیری خوێنەرانی ئەزیزی بخەمەوە کە من کەسێکم لە خەمی زانست دابوومە نەوەك سیاسەت، ئەمەش بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە عێراق توانی لە ماوەی ساڵێکدا چوار هەزار ماددەی پێویست بەرهەم بهێنێت، ئەمەش بەس بوو بۆ بەدەستهێنانی جبەخانەی

ئەتۆمی، کەواتە سەدام بۆچی فەرمانی دروستکردنی یەك بۆمبی دا کاتێك هاتە ناو کوێت؟ ئاخۆ دەیتوانی بەم بۆمبە چی بکات؟ بۆچی چاوەڕێی نەکرد تا جبەخانەی ئەتۆمی بەدەست بێنێت بۆ ئەوەی لە پێگەیەکی بەهێزەوە موزایەدەی بەسەر شتەکانەوە بکات؟ بەڕاستی من گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە ئێمە لە چنگی پیاوێکدا بووین کە خودان ئاسۆیەکی ستراتیژی نەبوو. ئەوەی دۆخەکەی خراپتر کرد، ئەوە بوو کە لە کاتی دیدارەکانیدا لەگەڵ زاواکەی —حوسەین کامل- تێبینیم کرد کە لە وردەکارییەکانی بابەتەکە ئاگاداری نەکردۆتەوە.

دواجار لەلایەن حوسەین کاملەوە فەرمانمان بەسەردا کرا کە بەڵگەنامەکانی پەیوەست بە سەنتەرفیوج و کەرەستە و ئامێرەکان بدەینە دەزگای ئاسایشی تایبەت، ئەویش داوای لێکردم کۆپییەکی بەڵگەنامەکان هەڵبگرم. هەروەها دواتر دوای هەڵاتنی حوسەین کامل و لەکاتی پێداچوونەوە بە پرۆژەی سەنتەرفیوج لەگەڵ قوسەی سەدام حوسێن باسی لێوەکرا.

دوای لەشکرکێشی ئەمریکا بۆ سەر عێراق بە بیانووی چەکی کۆمەڵکوژی لە ساڵی ٢٠٠٣، سەنتەرفیوج لە پێشەنگی هۆکارەکانی لەشکرکێشییەکەدا بوو، خۆم و خێزانەکەم لە دۆخێکی زۆر خراپدا بینیەوە، بەتایبەتی کە من ژمارە ٦٦ بووم لە لیستی داواکراوەکانی ئەمریکا. خەڵکانێکی زۆر بەدوامەوە بوون و مەترسی تەواو لەسەر ژیانم هەبوو. ڕۆژێك لەماڵەوە بووین، گوێمان لە دەنگی شکاندنی دەرگای ماڵەکە بوو، کاتێك سەربازە

ئەمریكییەكان بە چەكەوە هاتنە ناو ماڵەكەمان و فڕێیاندامە سەر زەوی، بەدوای ناسنامەكەمدا دەگەڕان. دوای ئەوەی ناسنامەكەم پشتڕاستكردەوە، دەستبەندیان كردم و بەرەو فڕۆكەخانەی نێودەوڵەتی بەغدا بردمیان، زۆر تووشی سەرسوڕمان بووم كاتێك ئەو شوێنەی كە منیان بۆ برد، تابلۆیەكی لەسەر بوو نووسرابوو (دیلەكانی جەنگ).

خۆشبەختانە پێش ئەو ڕووداوانە كەوتمەوە كاتێك لە ئینتەرنێت خوێندمەوە كە یەكێك لە پشكنەرە ئەمریكییەكان بەڕێز ئۆلبرایت لە ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆستدا باسی لەوە كردووە كە ناوی من لەنێو ئەو پێنج زانایەدایە كە پشكنەرەكان دەیانویست سەبارەت بە چەكی كۆمەڵكوژ چاویان پێ بكەوێت، و تەلەفۆنم بۆ كرد بۆ ئەوەی ئاگاداری بكەمەوە كە بەڵگەنامەی گرنگم لایە كە ڕادەستی پشكنەرەكان نەكراو ن تا ئەو كاتە ئاشكرا نەكرابوون، هەربۆیە بەپەلە ئازادیان كردم و ئەوەبوو من و خێزانەكەمیان بردە دەرەوەی وڵات.

لەكۆتاییدا دەمەوێت بەبیری خوێنەری ئازیز بخەمەوە كە ئەم كتێبەم لە ساڵی ٢٠٠٤ بەزمانی ئینگلیزی نووسیوە و بەپێویستم زانی كە وەربگێڕدرێتە سەر زوبانەكانی كوردی و عەرەبی تاوەكو خوێنەران بەگشتی و خوێنەرانی عێراقی بەتایبەت وێنەیەكی هەمەلایەنەی ئەو قۆناغە سەرەكییەی بۆ بنەخشێنم. هەروەها سوپاسی ئوستازی بەڕێز مخلص یونس دەكەم كە بۆچوونە بەپێز و نایابەكانی بوونە پتر دەوڵەمەندتركردنی ئەم كتێبە و سوپاسی

برای ئەزیزم سەنگەر حسن نجم دەكەم كە وەرگێڕانە كوردییەكەی گرتە ئەستۆی خۆی. لە كۆتاییدا هیوادارم خوێنەری خۆشەویست دڵخۆش بێت بە خوێندنەوەی كتێبەكە و سوود لە وانە و ئەزموونەكانی وەربگرێت. سەركەوتنیش هەر لە خوداوەیە.

**مەهدی عوبێدی**

# پێشەكی

لە ٥ی شوباتی ٢٠٠٣، كاتێك سەربازانی ئەمریكی لە كوێت كۆبوونەوە تاوەكو ئامادەكاری بكەن بۆ داگیركردنی عێراق، لەوكاتەدا من و خێزانەكەم لە ژووری میوانەكان لە بەغدا لەبەرامبەر تەلەفزیۆن دانیشتبووین بۆ ئەوەی سەیری سەربازەكان بكەین.

كۆڵن پاوڵی وەزیری دەرەوە، لەبەردەم ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان گوتاری پێشكەش دەكرد كە تێیدا بڕیار بوو بەڵگە بدات بەدەستەوە بەوەی عێراق هێشتا پەرە بە چەكی كۆمەڵكوژ دەدات. ئێمە ژەمی ئێوارەمان دواخستبوو بۆ ئەوەی ڕاستەوخۆ سەیری وتارەكە بكەین كە لەنیویۆركەوە پێشكەش دەكرا و لەوێ كاتەكەی بەیانی بوو. هەر پێنج كەسی خێزانەكەمان لەدەوری شاشە گەورەكەی تەلەفزیۆن كۆببووینەوە و قەرەباڵغییەكمان دروست كردبوو؛ تەلەفزیۆنەكەم بە دەفری سەتەلایتێكی نایاسایی بەستبوویەوە لەسەر بانەكەوە. ئێمە بە وریاییەوە ئاگاداری ئەوەبووین كە مەترسی شەڕ لە هاوسەنگیدا دەرچووەو ئەمە ساتێكی گرنگ بوو لە مێژووی هەردوو عێراق و ئەمریكادا.

تاوەكو خێزانەكەم و منداڵەكانم سوود لەزمانەكە ببینین، كەناڵی هەواڵەكەمان گۆڕی بۆ ئەلجەزیرەی عەرەبی، بەڵام بەهۆی ئەوەی من لە ئەمریكا و بەریتانیا خوێندووەمە، بۆیە دەمتوانی لەژێرەوە شریتی وەرگێڕانەكە بخوێنمەوە و لە دەستەواژە ئینگلیزییەكان بگەم.

کۆڵن پاوڵ -کە چاکەتێکی دیپلۆماتکاری ڕێکپۆشی لەبەردا بوو- لە پشت مێزە دارینەکەی ژووری نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دانیشت و دەستی کرد بە پێشکەشکردنی بەڵگەکان کە لەڕێگەی شاشەکەوە دەیخستنە ڕوو. سەرەتا بیانگەکانی ساکار و ماقوڵ دەردەکەوتن، هیچ کام لەو زاراوە باق و بریقانەی بەکاری دەبردن تایبەت نەبوون بە عێراقی سەددام و تۆنی قسەکردنەکەی سەرنجی ئەو کەسەی لە مندا ڕاکێشا. کاتێك هاتە سەر پرسی ئەتۆمی، من لەسەر لێواری قەنەفەکە دانیشتم و سەرم بردە پێشەوە تاوەکو هیچ وشەیەکی لەدەست نەدەم. وەك دروستکەر و بەڕێوەبەری بەرنامەی پێشووی سەنتەرفیوجی ئەتۆمی سەددام، یەکێك بووم لەو کەمینەیەی کە ڕاستییەکانم لەبارەی هەندێك لەو تۆمەتانەی کە دەیکرد، دەزانی.

کۆڵن پاوڵ ئاماژەی بەوەدا کە ئەمریکا گومانی ئەوەی هەیە گوایە عێراق پلانی هەیە موگناتیسی کوالیتی بەرز دروستبکات بۆ بەکارهێنانی لە سەنتەرفیوجەکاندا تاوەکو یۆرانیۆم بۆ چەکی ئەتۆمی بپیتێنێت. ئەوەبوو لەوەو پێش، چەند هەفتەیەك بوو پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ چەکی ئەتۆمی؛ پرسیاریان لەبارەی کارگەیەکی موگناتیسی عێراقی دەکرد، کە هێشتا لە قۆناغی بیرۆکەدا بوو و نەچووبووە بواری جێبەجێکردن. من سەرپەرشتی پلانە داراییەکانی دامەزراوەکەم کردبوو، و بەم دواییانەش یارمەتیدەر بووم لە هەوڵدان بۆ ئەوەی پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان قەناعەت پێبکەم کە بۆ مەبەستی ئاشتیانە دیزاین کراوە و نەوەك سەنتەرفیوج.

خاڵی دووەمی کۆڵن پاوڵ بریتیی بوو لەوەی کە پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان جەختی تایبەتیان لەسەر کردبووەوە. ئەویش عێراق فەرمانی کردبوو هەزاران بۆڕی ئەلەمنیۆمی پلە بەرز

بۆ موشەكەكانی تۆپخانە بەكاربهێنرێت، ئەمەش بەڕای ئەو گوایە دەتوانرێت لە پرۆگرامی سەنتەرفیوجیشدا بەكاربهێنرێت. وێنەی بۆرییە دەستبەسەرداگیراوەكان لەسەر شاشەیەك دا دەدرەوشایەوە بۆ ئەوەی ئەنجومەنی ئاسایش و باقی جیهان ببینن. هەروەها پشكنەرانی نەتەوە یەكگرتووەكان لە عێراق چەندین جار پرسیاریان لەبارەی ئەم بۆڕییانە دەكرد. ئێمەیش تەنانەت هەوڵمان دا كەیسەكە بۆ تیمێكی جیاواز لە بەرنامە ئەتۆمییەكەی پێشووی ئەفریقای باشوور ڕوون بكەینەوە. من دەمزانی ئەم بۆریانە بۆ سەنتەرفیوج دەست نادەن. چونكە ئەلەمنیۆم مادەیەكی زۆر نزمترە لە ڕیشاڵی كاربۆنی یان پۆڵایی كوالیتی بەرز، كە لەمەو پێش زیاتر لە دوازدە ساڵ بوو ئەمەمان بەكارهێنابوو. هەروەها تیرەی ئەو بۆریانەی كە باسیان لێوە دەكرا، نزیكەی نیوەی تیرەی ئەو بۆڕییانە بوو كە بە درێژایی بەرنامەی سەنتەرفیوجەكەمان بەكارمان هێنابوو. لە ڕوانگەی ئەندازیارییەوە بێت، ئەم تایبەتمەندییانە پێویستیان بەوە بوو كە سەرلەنوێ لە سفرەوە دەست پێ بكەینەوە. بۆ ساتێك كەوتمەوە بیری ئەوەی كە لەكۆتایی ساڵانی هەشتاكانی سەددەی ڕابردوو چەندێك هەوڵماندا بۆ بەدەستهێنانی بۆری گونجاو بۆ سەنتەرفیوجەكان، هەروەها بەپێی ئەو زانیارییانەی من هەمبوون؛ زۆر ناعەقڵانی بوو ئەگەر وابیربكرێتەوە كە ئەم بۆرییە ئەلەمنیۆمیانە دەتوانن بەشێك بن لە بەرنامەیەكی زیندووكراوی چەكی ئەتۆمی عێراق.

بەڵام كۆلن پاوڵ ئەوەندە دڵنیا بوو لە بیانووەكانی، بەجۆرێك كە هەستم دەكرد نزیك بووم لەوەی وەسوەسەم بۆ دروست بێت و باوەڕ بەو بیانوانەی بكەم! لەوێ لەسەر قەنەفەكە دانیشتبووم، هەمان ئەو پرسیارە بێزاركەرەم لە خۆم كرد كە چەند مانگێك لەمەوبەر پشكنەرانی چەكی ئەتۆمی —كە بیانووی تۆمەتی نوێ

هاتبوونەوە نێو عێراق- ئاراستەیان کردم: ئایا ڕێی تێدەچوو کە سەددام بەرنامەیەکی ئەتۆمی دەستپێبکاتەوە و منیش بکاتە دەرەوەی بازنەکە واتە بێ ئاگاداری من؟ ئایا پشکنەرەکان خەریك بوون دامەزراوەیەکی سەنتەرفیوج بدۆزنەوە کە لەمن شارراوە بوو؟ نەخێر، دیسانەوە من درکم بەوە کرد کە ئەم شتە ڕێی تێ نەدەچوو. چوون من لە بنەڕەتەوە بەرنامەی سەنتەرفیوجم دروست کردبوو، هەروەها بینیم کە چۆن لە دوای شەڕی کەنداو لە ساڵی ١٩٩١ لەلایەن پشکنەرانی چەکی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە هەڵوەشێنرایەوە. من سەرە گەورەکەی هەوڵەکانی سەددام بووم بۆ شاردنەوەی ئەمە لە پشکنەرەکان -کە لە ماوەی ساڵانی نەوەدەکاندا بەشێکی زۆری ئامێرەکانمانیان لە عێراق لەناوبردبوو و ئەوانی دیکەشیان بردبوو. لە کۆتایی ئەو دەیەدا، تاکە توخمەکانی بەرنامەی سەنتەرفیوجی ئەتۆمی -کە هێشتا شاراوە بوون- بریتیی بوون لە کۆمەڵەیەکی تەواوی دیزاینەکان و چەند پێکهاتەیەکی نموونەیی- لە باخچەکەماندا شاردرابوونەوە -کە تەنها چەند پێیەك لە ژووری میوانەکەمانەوە دووربوون، تەنانەت خێزانەکەشم ئاگادار نەبوو، ئینجا چ جای باقی جیهان. سەددام بەهیچ جۆرێك نەیدەتوانی ئەم بەرنامەیە بەبێ بەشداری من، یان لانیکەم ئاگاداری من، دروست بکاتەوە.

دوای نانخواردنی ئێوارە، من و خێزانەکەم چووینە دەرەوە بۆ ئەوەی لە باخچەکەمان دابنیشین، لەوێ هەستمان دەکرد لەو ئامێرانە دوورین کە سەددام بۆ سیخوڕی کردن بەکاری دەهێنان، هەربۆیە ئازادتر بووین لە قسەکردن لەسەر بیروڕاکانمان. ئێستا وا دیار بوو کە شەڕ شتێکی حاشاهەڵنەگر بوو. پێداگری عێراق لەسەر ئەوەی وڵاتەکەی هیچ چەکێکی کۆمەڵکوژی نییە، وەك ئەوە وابوو کە بۆ گوێی کەڕ قسەبکات. سەددام هەمیشە تینووی

ئەوەبوو بۆمبی ئەتۆمی دروست بكات و كەم كەسیش هەبوو لە خۆرئاوا باوەڕیان بەوە هەبوو كە بە نهێنی هەوڵی پەرەپێدانی بۆمبی ئەتۆمی نادات. ئەو، بەردەوام بوو لە شكاندنی یاسا نێودەوڵەتییەكان، مووشەكی دروستكردبوو كە مەودای كەمێك زیاتر بوو لەو سنورانەی كە نەتەوە یەكگرتووەكان هێزی لێ دانابوو، هەروەها فڕۆكەی بێ فڕۆكەوان كە دەیانتوانی بە قووڵایی وڵاتانی دراوسێدا بفڕن. ئێستا بێ متمانەیی نێوان سەددام و هەروەها بەتایبەتی هەریەك لە ئەمریكا و بەریتانیا، گەیشتبووە خاڵی بنبەست. هەرچەندە دەكرا بەهۆی ئەوەی ئەمەمان گوت، سزای لەسێدارەدانمان بۆ دەربكرێت، بەڵام من و هاوسەرەكەم و منداڵەكانم دڵنیا بووین لەوەی كە ئەم پێشینەی سەددام عێراقی بە داگیركاری مەحكوم كردووە.

لە زۆر ڕووەوە، خودی سەددام چەكێكی كۆمەڵكوژ بوو. ئەوەتانێ دوو وڵاتی دراوسێی داگیركردبوو، هەزاران عێراقی و ئێرانی بە چەكی كیمیایی كوشتبوون، گەلەكەی خۆی ئەشكەنجە دابوو و تیرۆری كردبوون و زۆرێك لە قوربانییەكانی لە گۆڕە بەكۆمەڵەكاندا ناشتبوو. ساڵانێك بوو ڕەفتارە نارێكەكانی سەلماندبووی كە ئەو كەسێكی چەندە وەهمباز و ترسناكە. هەروەها بیرۆكەی ئەوەی كە ڕەنگە ڕۆژێك بە بۆمبێكی ئەتۆمی جیهان سەرسام بكات، كابوسێكی ترسناك بوو.

من دەمزانی تەواوی ڕژێمەكەی سەددام لەسەر بنەمای فێڵكردن دامەزراوە. هەروەها دەمزانی چەندێك نزیك بووەتەوە لە بەدەستهێنانی بۆمبەكە؛ لەڕاستیدا من لە ناوەندی ئەم چیرۆكەدا گیرم خواردبوو. لە كۆتایی هەشتاكانی سەدەی ڕابردوودا، بەهۆی هەڕەشە و گوڕەشەكانی ئەو، بە نهێنی چوومە زۆرێك لە دامەزراوە و كۆمپانیاكانی ئەمریكا و ئەوروپا كە خاوەنی ئەو زانیارییە ئاڵۆزانە

بوون كە پێویستمان بوو بۆ دروستكردنی سەنتەرفیوج. ئەوەبوو بازاڕێكی ڕەشی نێودەوڵەتی فراوانم قۆستەوە بۆ كەرەستە و یارمەتی تەكنیكی، هەروەها ئەم كارەم بە سەركەوتوویی دوور لەچاوی جیهان هێشتەوە. تاوەكو سەرهەڵدانی شەڕی كەنداو لە ساڵی ١٩٩١، سەركەوتوو بووین لە هەنگاوێكی سەرەكی بەرەو پیتاندنی یۆرانیۆم بۆ بۆمبی ئەتۆمی عێراق. ئەوەبوو دواجار جیهان بە شێوەیەكی ترسناك نزیك بووەوە لەوەی بزانێت كە سەددام خەریكە چی بەسەر ئەواندا دێنێت.

لە ماوەی ساڵانی نەوەدەكاندا، سەددام بۆ ماوەیەكی زۆر ناسنامەی منی لە پشكنەرانی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ چەكی كۆمەڵكوژ شاردەوە، پێدەچێت لەو باوەڕە دابوو بێت كە ئەگەر ڕۆڵی من نەخرێتە ژێر مەترسییەوە، ئەوا دەستپێكردنەوەی بەرنامەی سەنتەرفیوج ئاسانتر دەبێت. بەڵام تا كۆتایی ئەو دەیە، بەرنامەی ئەتۆمی عێراق هەرتەنها وەك یادگارییەك وابوو. لە كاتێكدا جیهان گریمانەیان دەكرد كە ئایا سەددام لە ساڵانی پێش لەشكركێشییەكەی ٢٠٠٣دا بەرنامەكانی چەكی ئەتۆمی و ئەوانی دیكەی خۆی پێكدەهێنێتەوە یان نا. ڕۆڵی منیش وەك یەكێك لە بەڕێوەبەرانی ئامێری سەربازی پیشەسازی عێراق دیدێكی تەواوی پێبەخشیم لەنێو ئەو دیكتاتۆریەدا. من تەنها جارێك لەبەردەم پشكنەرانی چەكدا شایەتحاڵیم دا دوای ئەوەی لە ساڵی ٢٠٠٢ لەپێش جەنگ هاتنەوە بۆ عێراق. من و خێزانەكەم بەزەحمەت لەو شەڕە ڕزگارمان بوو كە بەدوایدا هات. لەناو ئاژاوەگێڕی و نادڵنیایی دوای جەنگدا، لە سەرەتادا نەمدەزانی من لە لیستی عێراقییە داواكراوەكاندام یان نا، بۆیە ئەوەبوو بڕیارە مەترسیدارەكەم دا بەوەی كە ئەو نهێنییە ئەتۆمییانە هەڵكەنمەوە كە لە باخچەكەمدا نێژراون و ڕادەستی لێكۆڵەرە ئەمریكییەكانی بكەم.

ئه‌و پێداویستیانه زۆرترین نهێنی چه‌كی كۆمه‌ڵكوژ بوون كه ئه‌مریكییه‌كان له چه‌ند مانگی دوای جه‌نگدا له عێراق دۆزییانه‌وه.

له نووسینی ئه‌م كتێبه‌دا، هیوادارم بتوانم باس له‌ته‌واوی داستانی ئه‌تۆمی سه‌ددام بكه‌م هه‌ر له‌سه‌ره‌تاوه تاوه‌كو دوای جه‌نگه‌كه.

له زۆر ڕووه‌وه‌ش ده‌شێت بڵێین ئه‌مه چیرۆكێكی هۆشدارانه‌یه سه‌باره‌ت به‌وه‌ی كه چۆن چه‌كی ئه‌تۆمی به نهێنی به‌رهه‌م ده‌هێنرێت. كۆكردنه‌وه‌ی بۆمبی ئه‌تۆمی زۆر قورسه، به‌ڵام به به‌راورد به په‌ره‌پێدانی ماده‌ی بۆمبی ئه‌تۆمی تارِاده‌یه‌ك ئاسانه. به‌شه سه‌خته‌كه، وه‌ك هه‌موو زانایه‌ك له هه‌موو به‌رنامه‌یه‌كی ئه‌تۆمی شاراوه‌ی جیهاندا ده‌زانێت، بریتیه له به‌ده‌ستهێنانی بڕی پێویستی ماده‌ی چالاككراو بۆ كاردانه‌وه‌ی زنجیره‌یی ته‌قینه‌وه. بۆ وڵاتێك كه هه‌وڵی شاردنه‌وه‌ی ویسته ئه‌تۆمییه‌كانی ده‌دات، سه‌نته‌رفیوج باشترین ڕێگه‌یه بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم چونكه كه‌مترین شوێن و به‌كارهێنانی كاره‌بای ده‌وێت، هه‌ر له‌به‌ر ئه‌م هۆیه‌شه ئاسانترینه بۆ شاردنه‌وه.

چیرۆكی ئه‌وه‌ی كه عێراق چۆن له ماوه‌ی شتێك زیاتر له سێ ساڵ شاره‌زا بوو له ته‌كنه‌لۆژیای سه‌نته‌رفیوج- و دواتر چۆن هه‌وڵماندا توخمه سه‌ره‌كییه‌كانی به‌رنامه‌كه له كۆمه‌ڵگه‌ی نێوده‌وڵه‌تی بشارینه‌وه- بریتیی نییه له‌وه‌ی ته‌نها به‌شێك بێت له مێژوو. چونكه من پێم وایه شیكارییه‌كی ورد بۆ چۆنیه‌تی ئه‌نجامدانی ئه‌م كاره، ده‌توانێت گرنگییه‌كی كاریگه‌ری هه‌بێت، له كاتێكدا جیهان هه‌وڵده‌دات كۆتایی به بڵاوبوونه‌وه‌ی چه‌كی كۆمه‌ڵكوژ بهێنێت.

مه‌ترسی بڵاوبوونه‌وه‌ی چه‌كی ئه‌تۆمی بۆ چه‌ندین نه‌وه‌ی داهاتوو هه‌ڕه‌شه‌یه له‌سه‌ر مرۆڤ. هه‌روه‌ها ئه‌و ترسه‌ی كه كۆڵن

پاوڵ و کەسانی دیکە دەریانبڕیوە لەوەی کە کەسێکی وەك سەددام بتوانێت چەکی کۆمەڵکوژ، یان ئامرازی بەرهەمهێنانی تیرۆریستان دابین بکات، زۆر دروست و ڕاستەقینەیە. بیرۆکەی چەکدارکردنی تیرۆریستان بە چەکی کیمیایی یان بایۆلۆژی بەڕاستی ترسناکە؛ بەڵام بۆمبی ئەتۆمی هێشتا خراپترین کابوسی مرۆڤایەتییە. تاکە چەکە کە توانای کوشتنی سەدان هەزار هاوڵاتی مەدەنی هەیە.

من ئەو سەرگوزشتەیەم بۆیە دەنووسم، تاوەکو بەو هیوایەی کە خوێنەران لە ڕاستییەکان نزیك بکاتەوە، بەوەی کە پێش داگیرکردنی عێراق هیچ بەرنامەیەکی چالاکانەی چەکی ئەتۆمی نەبووە. بەڵام بە دڵنیاییەوە سەددام توانای هەبوو و هەروەها دەبێ گریمانەی ئەوەش بکرێت کە مەبەستی ئەوە بوو ڕۆژێك لەڕۆژان دەست پێبکاتەوە، بەتایبەت لە کاتێکدا دەست پێبکاتەوە کە جیهان ئەوەندە لە نزیکەوە چاودێری نەدەکرد و سەرنجی لەسەر ئەو نەبێت. تا ئەو کاتەی ستەمکارانی وەك سەددام ئامادەبن زاناکان بترسێنن بۆ ئەوەی فەرمانەکانیان ئەنجام بدەن، مەترسییەکانی بەرنامە ئەتۆمییە نهێنییەکانیش بەردەوام دەبن. هیوادارم چیرۆکەکەم بتوانێت یارمەتی خەڵك بدات لەوە تێبگات کە چۆن بەرنامە مەترسیدارەکانی لەو شێوەیە پەرەی پێدەدرێت تاوەکو لە هەر شوێنێك کە بتوانرێت؛ بوەستێنرێن.

# بەشی یەكەم
# بۆمبێك لە باخچەكەمدا

سپێدەی ڕۆژی ١٠ی نیسانی ٢٠٠٣ لەماڵی كچەكەمەوە دەرچووم و شاری بەغدا لە دۆخێكی تەواو پڕ ئاژاوە دابوو. دوو ڕۆژی شەڕی دڕندانە لە كاتی داگیركاری ئەمریكادا، كوشتار و سەرلێشێواوی لە دوای خۆیدا بەجێهێشتبوو. تەقە و تەقینەوەی پچڕپچڕ لە شارەكەدا دەنگی دەدایەوە. دوكەڵی سووتانی باڵەخانە حكومییەكان لە سەرانسەری شارەكە لە ئاسۆدا بەرەو ئاسمان بەرز دەبوونەوە. بۆنی گۆگرد و گازە ژەهراویەكان كە لە ئاگرەكانەوە دەردەچوون، هەوایەكی گەرمی لە بەیانییەكە دروست كردبوو. هەستێكی شووم و خامۆشی لە شەقامەكانی گەڕەكەكەی كچەكەمدا دروست ببوو.

چەند دراوسێیەك لە ماڵەكانیان هاتبوونە دەرەوە بۆ ئەوەی سەیری ئەو دوو خانووە بكەن كە لەلایەن تۆپخانەكانی ئەمریكاوە دوو شەو پێشتر لە خوارەوەی كۆڵانەكە وێران كرابوون. نیوەی تەواوی خانووەكان لەناو داروپەردوودا كەوتبوون. چەند كەسێكی كەم سەری داخ و پەژارەیان بۆ ئەم كارەساتە دەلەراند، بەڵام لەوەدەچوو كەس نەزانێت كە ئاخۆ كەس لەم ماڵانەدا كوژراوە یان نا. لە گۆشەی شەقامەكەدا، پاشماوەی سووتاوی دوو بارهەڵگری سەربازی عێراقی وەك پەیكەرێكی جەنگ وەستابوون، تایەكانیان تەقی بوو و هەروەها بەشێكی بارهەڵگرەكانیش توابوونەوە. لەولاشەوە كۆمەڵێك هەرزەكار لەسەر قۆڵی بڕاوی

سەربازێکی عێراقی کە لەناو زێرابەکە کەوتبوو، کز دانیشتبوون.

ئەو جەستەیەی کە قۆڵەکەی لێ ببوویەوە، لە هیچ شوێنێکدا نەدەبینرا.

یەکێك لە دراوسێکانی کچەکەم -کە نەمدەناسییەوە- پیاوێك بوو لە ناوەڕاستی تەمەنیدابوو، هاتە لام و لە ئەحواڵی خێزانەکەمانی پرسی.

گوتم: هەموومان لە ژیاندایین و سەلامەتین، سوپاس بۆ خودا. "ئەی ئێوە؟" ئەو لەڕادەبەدەر تووشی شڵەژان بوو و وتی نازانم دڵنیا نیم. خزمەتگوزاری تەلەفۆن لە سەرانسەری عێراقدا پچڕابوو و هیچ هەواڵێکی لەبارەی خێزانی کوڕە گەورەکەیەوە نەبوو کە لە بەشی باکووری خۆرهەڵاتی شارەکەدا دەژیان. ئەو بێ هیوا بوو لەوەی کە بە ئۆتۆمبێل بڕۆن و بەدوایدا بگەڕێن.

- پرسیاری کرد: پێت وایە بارودۆخەکە گونجاوە ئەگەر بەدوایدا بگەڕێم؟

گوتم: "نازانم، پێدەچێت شتەکان زۆر ناجێگیر بن، بەڵام ڕەنگە ئەگەر بە ورياييەوە بەدوایدا بگەڕێیت ئەوا باش بێت، هەروەها منیش هیوادارم بتوانم تەواوی خێزانەکەم ببەمەوە بۆ ماڵەکەی خۆمان".

ژن و کچەکانم لە ماڵەکەدا بەجێهێشت، من و زەیدی کوڕم بە ئۆتۆمبێل بەرەو خۆرئاوا و گەڕەکی ئەلغەزالییە ڕۆیشتین تاوەکو بزانین ئاخۆ ماڵەکەمان لەو شەڕە ڕزگاری بووە کە گەڕەکەکەمانی گرتبووەوە. ئەوەبوو لەگەڵ نزیکبوونەوەمان لە ناوچەی بازرگانی و دەوروبەری ناوچەی زانکۆ، ڕێگاکان ئەوەندە پڕ بوون لە داروپەردوو و ئۆتۆمبێلی لەناوچوو کە هاتوچۆیان قورس کردبوو. دەنگی تەقە لە کۆلانەکانەوە دەنگی دەدایەوە. گڵۆپی ترافیکەکە

لەگەڵ كارەبای شارەكەدا كوژابوویەوە و شۆفێران بە بێ باكییەوە چوارڕیانەكەیان دەبڕی و یاساكانی هاتوچۆیان پشتگوێ دەخست و بە ترسەوە چاویان لەسەر یەكتر بوو.

بە شۆكەوە لە پەنجەرەی سەرنشینەكانەوە سەیری دەرەوەم كرد و ناشرینییەكانی داروپەردووەكەم بینی. لە تەنیشت مینی ڤانێكی سپی -كە كونە فیشەكی لە دەعامی پێشەوەی ئۆتۆمبێلەكەیدا بوو- تەرمی دوو پیاو بە جلی سپی خوێناوییەوە كەوتبوون، دەموچاویان ڕەش و ئاوساو بوو لەگەڵ مردنیان. زەید بە دەوری تەرمی كەرێكدا سوڕایەوە كە لە سەر ڕێگاكەدا كەوتبوو و لاشەكەی وەك ئەوە وابوو كە هەمووی ماك بێت بەهۆی برینەوە. هەر چوار قاچی -كە ڕەق ببوون- وەك ئەوە وابوو ئاماژەی بە ئۆتۆمبێلەكان تێپەڕبووەكان بكات و تۆمەتباریان بكات.

كاتێ گەیشتین بە ناوچەی بازرگانی، ئێستا ژمارەیەكی زۆری هاوڵاتیانی ئاساییمان لە ڕێگاكەدا دەبینی. دەیان پیاو بە پەلە بەسەر شەقامەكەدا ڕۆیشتن و مۆبیلیاتی تاڵانكراویان لەسەر سەریان و ئامێری كارەبایی لە نێو باوەشیاندا بوو. وەك ئەوەی كێوی دڕندە بن یان لەحاڵەتێكی ناشیرین دابن ئاوا بوون. لەولاتر گەنجان لەناو دوكانێكی كۆمپیوتەردا كە بەهۆی بۆردومانەوە تێكشكابوو، چووبوونە ژوورەوە و هەریەكەیان بەئامێزی پڕ لە ئامێر و شتی دیكەی بەنرخەوە دەهاتنە دەرەوە. چەند ئۆتۆمبێلێك تێپەڕین كە سندوقی ئۆتۆمبێلەكانیان كراوە بوو و پڕبوو لە كەلوپەلی تاڵانكراو. تۆزێك لە سەرووتر، خاوەنی دوكانێكی پایسكل لە دەرەوەی دوكانەكەیدا بە تفەنگەوە بە پاسەوانی وەستابوو. سەرنجم دا، لە شەقامە لاوەكییەكاندا دانیشتووان بە بەكارهێنانی پارچە پاشماوە و لكی دار خورما و· شووشەی شكاو، بەربەستیان بۆ دەروازەی چوونە ژوورەوەی گەڕەكەكانیان دانابوو.

بە زەیدم گوت: "ئەمە چییە؟!" من لە شوێنی خۆمەوە شەرمەزاری دایگرتبووم، چوون وەك عێراقییەك كە شانازی بە گەلەكەیەوە دەكات، باوەڕم بەم هەڵسوكەوتە نەدەكرد. بەغدا شوێنی خەڵكی شارستانی بوو نەوەك تاڵانچی. وەك ئەوە وابوو كە لابردنی لەناكاوی ڕژێمی سەددام شێتییەكی كاتیی لێكەوتبێتەوە. بە ئۆتۆمبێلەكەمانەوە بە نەفەقەكەدا ڕۆیشتین، ئەو ڕێگا تونێلییەی كە دەچووە سەر یەكێك لە چوارڕێیانە گەورەكانی بەغدا. وێنەیەكی زەبەلاحی سەددام حوسێن لە ناوەڕاستی بازنەی هاتوچۆدا هەڵواسرابوو. لەگەڵ نزیكبوونەوەمان، كۆمەڵێك پیاو بەدیدەكرا كە جل و بەرگی ڕەشیان لەبەردا بوو و چەكی ئۆتۆماتیكی و نارنجۆك و تەنانەت هەڵگری موشەكیان بەدەستەوە بوو، ئەوانە ئەندامانی فیدایی سەددام بوون، میلیشیایی كەسیی دڵسۆز و توندی سەرۆك. بەچاوێك سەیرم كردن كە جێگای متمانە نەبوون. لەوەدەچوو مەحاڵ بێت كە شەڕكەرانی فیدایی سەددام بتوانن لەم چوارڕێیانەدا بن. ئەمریكییەكان لە كاتی داگیركارییەكەدا ناوچەی سەوزیان گرتبوو و زۆر دوور نەبوون. فیداییەكان بەسەر بەم ناوەدا بڵاوبووبوونەوە و چەكەكانیان بەكاردەهێنا بۆ ئاماژەدان بە هاتوچۆ بە دەوری بازنەكەدا. ڕووخساریان توند دەردەكەوت، بەڵام ماندوو بوو لە ڕۆژانی شەڕی سەخت. دوو كەس لە میلیشیاكان پشتیان بە وێنەی سەددام بەستبوو وەك ئەوەی لە غیابی سەرۆك، دوا هەڵوێستیان هەبێت لە بەرگریكردن لە وێنەكەی.

من و زەید سێ چارەكی ڕێگاكەمان بە خێرایی بە دەوری بازنەی هاتوچۆدا بڕی و بەرەو دەروازەی ڕێگای خێرای ئەبوغرێب -كە بەرەو گەڕەكەكەمان دەڕۆیشت-. هەر كە كەوتینە نێو قەرەباڵغییەكە، دڵم خورپەی بوو. كەمتر لە دوو سەد مەتر لە دوورمانەوە، ستوونی زرێپۆشی ئەمریكی ڕاستەوخۆ بەرەو ئێمە

ده‌هات، ئه‌وان به ئاراسته‌یه‌كی هه‌ڵه ده‌ڕۆیشتن. ئێمه ته‌واو گیرمان خواردبوو.

له په‌نجه‌ره‌ی دواوه چاوێكم لێكرد. دڵنیا بووم كه له هه‌ر ساتێكدا فیدایانی سه‌ددام گوێیان له كاروانی نزیكبووه‌وه‌ی ئه‌مریكییه‌كان ده‌بێت و ئێمه له‌و نێوه‌نده‌دا ده‌كه‌وینه نێو ته‌قه‌ی ئه‌م دووهێزه. من و زه‌ید به نائومێدیه‌وه به‌دوای ده‌رچه‌یه‌ك له شه‌قامی ئه‌بوغرێب ده‌گه‌ڕاین له‌گه‌ڵ نزیكبوونه‌وه‌ی زرێپۆشی ئه‌مریكی. تۆپه‌كانیان ڕاسته‌وخۆ ئاماژه‌یان به ئێمه ده‌كرد. چه‌ند چركه‌یه‌ك له له‌ناوچوون دوور بووین.

"ئا له‌وێوه!" هاوارم كرد.

زه‌ید له ده‌رچه‌یێكه‌وه به‌لای ڕاستمانه‌وه ڕۆیشت بۆ سه‌ر ڕێگایه‌كی بچووكی لاوه‌كی هاوته‌ریب له‌گه‌ڵ شه‌قامی سه‌ره‌كی. چه‌ند چركه‌یه‌ك دواتر تانكه‌كان به‌لای ئێمه‌دا هاواریان لێ هه‌ڵسا و شه‌ڕه‌كه ده‌ستی پێكرد. كاتێك چه‌كدارانی فیدایی سه‌ددام ته‌قه‌یان ده‌كرده‌وه نارنجۆكێك له شوێنێك له پشت ئۆتۆمبێله‌كه‌مانه‌وه ته‌قیه‌وه. له ترسی ئه‌وه‌ی كه گولله‌ی وێڵ لێمان بدات، ڕوومان كرده شه‌قامێكی لاوه‌كی نیشته‌جێبوون و سه‌د مه‌تر ڕۆیشتین و وه‌ستاین. ته‌نها نیو میل له شه‌ڕه‌كه‌وه دووربووین، گوێمان له ڕشاندنی به‌رده‌وامی ته‌قه بوو. وا دیار بوو زۆر نزیك بوو، بۆیه سه‌د مه‌ترێكی دیكه به ڕێگاكه‌دا ڕۆیشتین.

بۆ ماوه‌ی پانزه خوله‌ك بارودۆخه‌كه به‌مجۆره به‌رده‌وام بوو، پاشان شه‌ڕكه‌ره عێراقییه‌كان خه‌ریكی ته‌قه‌كردن بوون به‌مه‌به‌ستی به‌رگری كردن و هه‌روه‌ها ترس و بێ هیواییان پێوه دیاربوو له‌وه‌ی كه تانكه ئه‌مریكییه‌كان دواجار به‌سه‌ریاندا زاڵ بن. پاشان بێده‌نگییه‌ك دروست بوو به‌هۆی ته‌قینه‌وه‌یه‌ك.

بە زەیدم گوت: "ئێستا خەریکە تەقەکە کەمتر دەبێتەوە. با بەردەوام بین."

کاتێك ڕوومان لە ڕێگای لاوەکی کرد، ئاوڕم دایەوە و بینیم کۆمەڵێك ئۆتۆمبێلی ئەمریکی لە چوارڕێیانەکەدا وەستابوون، بەڵام سەرباز نەبوون. ڕەنگە ئەمریکییەکان بەدوای میلیشیاکانی سەددامدا ڕۆیشتبن بۆ شەقامەکانی دەوروبەریان. دواتر پرسیمان و پێمان گوترا کە یازدە میلیشیای فیدایی سەددام لەوێ کوژراون.

لە خۆرئاواشەوە، ڕێگای خێرایی ئەبوغرێب بە شێوەیەکی نامۆ چۆڵ بوو. لەوەوبەر بە شێوەیەکی ئاسایی یەکێك بوو لە قەرەباڵغترین ڕێگاکانی بەغدا. بەڵام ئێستا هەستت دەکرد کە مردووە، وەك ئەوەی ئەمریکییەکان کردبێتیان بە ڕێگای جنۆکان.

لە ڕێگای ماڵەکەماندا، قەوانی فیشەك و پاشماوەی زبڵ و خاشاك لە قەراغی شەقامەکە هەبوو، ئەمەش بەڵگەی ئەوە بوو کە ئەم جارەکە ڕێگەیە شەڕێکی قورسی بەخۆیەوە بینیبوو. کاتێك گەیشتینە دەروازەی ئاسایشەکەمان، بینیمان خانووەکەمان — کە لەپێنج ژوور پێکهاتبوو- وەك خۆیەی بوو. دەرگای پێشەوەم کردەوە و من و زەید ژوور بە ژوور دەگەڕاین، سەرەتا بەدوای زیانەکان گەڕاین. پەرداخێکی شووشەی ئاو بە شکاوی لەسەر زەوی چێشتخانەکە کەوتبوو، پێدەچوو بەهۆی هێزی تەقینەوەکانی ئەو دەوروبەرە کەوتبێتە خوارەوە. پەنجەرەیەك درزی بردبوو. لەوە زیاتر ماڵەکە بێ زیان دەردەکەوت.

هەنگاوم نایە دەرەوە بۆ ناو باخچەکەمان، کە شوێنی پەناگەی من بووە لەوساڵانەی کە وەك داڕێژەر و بزوێنەری سەرەکی بەرنامەی ئەتۆمی سەددام حوسێن بووم. ڕەنگە من لە باخداریی خۆمدا زۆر پەرۆشم هەبێت، کە بە چاوی ئەندازیارێکی ئاسایی نزیك دەبمەوە

بۆ هێڵی ڕاست و وردەکارییە تەواوەکان. ئەوەبوو ڕووپێوی حەوشەکەم کرد بۆ دۆزینەوەی هەر کەموکوڕییەك. درەختی خورمای تەنیشت پەرژینەکە وەك خۆی بوو. تاکە مانگۆیە تازە پێگەیشتووەکە هێشتا بە لقە بچووکەکەوە هەڵواسرابوو و پێشبینیم دەکرد لە ماوەی نزیکەی سێ مانگدا پێبگات. ئەوەبوو سەیری درەختی لیمۆکەشم کرد، کە ساڵانێك لەمەوبەر لە هۆڵەندا کڕیبووم، کە ئەوکات لە ساڵانی هەشتاکانی سەددەی ڕابردوودا بەدوای نهێنییەکانی پیتاندنی یۆرانیۆمدا دەگەڕام. گوڵە بچووکەکانی لیمۆ لە شەڕ ڕزگاریان بووبوو و بەم زووانە دەبوون بە لیمۆ. ڕووەکی تووی هیندی - کە لە گەشتێکدا بۆ بۆمبای کۆم کردبووەوە - لە دۆخێکی باشدا بوون. هەروەها لە دەوری چەمەکەمان -کە شێوەی گورچیلە بوو-، گاردینیاکان بە تەواوی گوڵیان کردبوو.

لەولاوەش چیمەنی دیکۆندرە، بە گەڵا ناسکی و ڕووەو ڕۆژ، لە ئێستاوە لەبەر خۆری گەرمی عێراقدا وشك دەبووەوە و زۆر پێویستی بە ئاودان بوو. سەرنجم دا چەند شوێنێك بەدرێژایی سنوورەکەی کە چەمەکە بەسەر پەنجەرەکاندا گەورە بووبوو. چەند پارچەیەك لە پاشماوەیەك لە چەمەکەدا ڕژابوو، لەنێویاندا شتێکی خۆڵەمێشی لە شێوەی گۆچکەدا کە درێژییەکەی نزیکەی پێیەك بوو، لە سەرەتا نەمدەناسیەوە.

ئاڕاستەی گەڕانەکەم گۆڕی بۆ حەوشەی ئەولاو و بینیم بەسەر ئەم ناوەدا هاتووە کە ئامێرەکانی باخداریم تێدا هەڵگرتبوو. بە لایەکدا هاتبوویە خوارەوە و بنمیچە ئەستوورەکەی داڕمابوو و بە دەوری شتێکدا کۆبووبووەوە. نزیکتر بوومەوە، سەرم سوڕما کاتێك بینیم کە مووشەکێکی نەتەقاو بە هەردوو لای ڕەفە وێرانبووەکەدا چۆتە خوارەوە. ئایا دەکرێت ئەوە مووشەك بێت؟

بەڵێ گومانی تێدا نەبوو. تەنك بوو، بەڵام درێژییەكەی زیاتر لە دوو مەتر بوو، ئەگەر ڕاست بوەستابا، لە من بەرزتر دەبوو. من بنكەی موشەكەكەم بە نزیكەیی ٢٥ سانتیمەتر لە تیرەدا خەمڵاند. ڕەنگی سپی بوو. تێبینیم كرد كە ڕەنگە لەنیوەی ڕێگەكەدا گڕی گرتبێت، بە درێژایی لایەكانیدا باڵدار بوو. كۆتایی پێشەوەی كێشەی نەبوو، وەك ئەوەی لە گۆچكەكەی دەرچوو بێت.

یەكسەر زانیم كە مووشەكەكە ئەمریكییە، چونكە بەتەواوی جیاوازبوو لە هەموو شتێك كە لە جبەخانەی عێراقدابوو. من سەرەتا زۆرم لەبارەی مووشەكەكانی ئەمریكاوە نەدەزانی، بەڵام بەهۆی ئەوەی كە ساڵانێك بوو لە كاركردن لە بەرنامە ئەتۆمییەكەی عێراق بووم، دواتریش وەك یەكێك لە بەڕێوەبەرانی كۆمپلێكسی سەربازی-پیشەسازی سەددام كارم دەكرد، زۆر ئاشنا بووم بە موشەكسازی بە گشتی. درێژییەكەی ئەوەی پیشان دەدا كە لە ئاسمانەوە هەڵدراوە. مووشەكێك بەم قەبارەیە لەتوانای دایە هەموو شتێك لە ناوچەیەكی لانیكەم پەنجا گەزەدا بسڕێتەوە، بگرە ڕەنگە زۆر زیاتریش بێت، واتە بە هەموو ماڵ و باخچەكەمەوە. بە خێرایی ئەو بیرۆكانەم لە مێشكم دەركرد كە ماڵەكەمیان كردبێتە ئامانج. چوون ئەمریكییەكان هیچ هۆكارێكیان نەبوو بۆ ئەوەی ماڵی زانایەك بكەنە ئامانج و تەنانەت ئەگەر هەیانبێتیش، ئەوا گومانم هەبوو بزانن لە كوێ دەژیم. بۆیە دەبێ بۆمبەكە ئاراستەكەی بۆ پێگەیەكی سەربازی عێراقی نزیك بووبێت.

كۆتایی پێشەوەی تەنها چەند پێیەك لە دیواری ژووری نووستنی كچەكانمەوە دوور بوو. من لەرزم لێ نیشت كاتێك هەوڵمدا ڕێژەی بیركاری ئەو دوو هۆكارە حیساب بكەم كە ئەگەر تەقیبایەوە ئەوا چەندێك ئەگەری مانەوەمان مسۆگەر دەبوو. ئەو بڕیارەی كە لە ٨ی نیساندا دابووم بۆ ئەوەی شەوی شەڕەكە لە

دووری ماڵه‌وه‌مان به‌سه‌ر به‌رم، نزیكه‌ی نیوه به نیوه بوو. ئه‌گه‌رچی من ئه‌گه‌ری نه‌ته‌قینه‌وه‌ی مووشه‌كێكم ئه‌ژمار نه‌كردبوو له‌كاتی بۆمبارانكردن، به‌ڵام ده‌مزانی كه ئه‌م ئه‌گه‌ره كه‌م بوو. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ئه‌گه‌ر هه‌ردوو هۆكاره‌كه به پێچه‌وانه‌وه ڕۆیشتبایه، ئه‌وا له ماوه‌ی میلی چركه‌یه‌كدا له‌ناو ده‌چووین. دواتر له‌پڕ بۆم ده‌ركه‌وت كه ئه‌و شته‌ی له‌سه‌ر چه‌مه‌كه‌م دا بوو فتیله‌ی بۆمب بوو.

چه‌ند ساتێك وه‌ستام و سه‌یری مووشه‌كه‌كه‌م ده‌كرد به‌رله‌وه‌ی بارودۆخه گاڵته‌ئامێزه‌كه بمهه‌ژێنێت. كه‌متر له بیست پێ له دوورییه‌وه، له زه‌وی ژێر گوڵێكی نیلوفه‌ر له ته‌نیشت باخچه‌ی گوڵه‌كانم، به‌رمیلێكی سه‌وزی په‌نجا گالۆنی -كه له ساڵی ١٩٩٢دا نێشتبووم-، پاشماوه‌ی به‌رنامه ئه‌تۆمییه‌كه‌ی عێراقی تێدابوو.

له‌ناوه‌وه‌یدا كۆمه‌ڵه‌یه‌كی ته‌واو له پلانی زۆر ورد و نه‌خشه‌ی دیزاین هه‌بوو كه پێویست بوو بۆ دروستكردنی سه‌نته‌رفیوج. زیاتر له دوو سه‌د نامیلكه وه‌ك كتێبی ڕێنمایی بۆ دروستكردنی هه‌موو پارچه‌یه‌كی سه‌نته‌رفیوج و چۆنیه‌تی كۆكردنه‌وه‌یانی تێدابوو. هه‌ندێك له پارچه‌كان دروستكردنیان ئه‌وه‌نده قورسه كه تایبه‌تمه‌ندییه‌كانیان له نهێنیترین زانیارییه‌كانی جیهانن. به‌ڵگه‌نامه‌كان تایبه‌تمه‌ندی و ڕه‌هه‌نده‌كانی هه‌ر به‌شێكیان ده‌خسته‌ڕوو، له‌گه‌ڵ دیزاینه ورده‌كانی دروستكردنیان.

هه‌روه‌ها له‌ناو به‌رمیله‌كه‌دا، نموونه‌ی چوار له پێشكه‌وتووترین پێكهاته‌كانی سه‌نته‌رفیوجی تێدا حه‌شار درابوو. ئه‌م پارچه كانزایانه، ئه‌وه‌نده بچووكن كه له‌ناو جانتایه‌كدا جێیان ده‌بێته‌وه، ئه‌گه‌رچی پێناچێت مه‌ترسیدار بن بۆ سه‌یركردن، به‌ڵام به شێوه‌یه‌كی سه‌یر ئاڵۆزن. دروستكردنیان پێویستی به ئه‌ژماركردنی وردی ئه‌ندازه‌یی، كانزازانیی پێشكه‌وتوو و زانینی فشار و

ڕەهەندی لە دەرەوەی تواناكانی زۆربەی گەلان هەیە. ملیۆنان دۆلارم خەرج كرد و هەزاران كیلۆمەتر ڕۆیشتم و دانوستانم بۆ زنجیرەیەك گرێبەستی نێودەوڵەتی كرد تەنها بۆ ئەوەی نهێنی دروستكردنیان بزانم.

یەكێك لە چوار بەشە ئاڵۆزەكان بریتییە لەو تۆپەی كە ڕۆتۆری (سوڕاوی) سەنتەرفیوجەكە لەسەری دادەنیشێت. بەڕاددەیەك بچووكە كە دەتوانیت لەنێو لەپی دەستتدا بیشاریتەوە، ڕەنگە تۆپەكە گرنگترین پارچەی بێت و تا ڕادەیەكی بێكۆتایی پێویستی بە وردبینی بیركاری هەیە. شێوەی سەرەوەی خولاوە، تۆپە كانزاییە بریقەدارەكە هاوسەنگی بۆری ڕۆتۆری سەنتەرفیوج دەكات كاتێك بە خێرایی زیاتر لە ٦٠,٠٠٠ خول لە یەك خولەكدا دەسوڕێتەوە. لە نوكی خوارەوەی تۆپەكە، بڕبڕەیەكی بچووكی خڕ كە تیرەكەی چوار ملیمەترە و لەشێوەی میزراحێكی بنكە تیژ چەسپاوە، ئەمە بەتەواوی سەنتەرفیوجەكە دەگرێت و دەیخولێنێتەوە. تەنانەت نەخشی بنكە تیژەكەش بەشێوەیەكی سەیرو سەمەرەی زۆر پۆلێنكراوە.

دووەم نموونەی سەرەتایی كە من نیشتبووم، ماتۆڕی سەنتەرفیوجەكە بوو. ئەم ماتۆڕە لە ئەلەمنیۆمی درەوشاوە دروستكراوە و قەبارەكەی نزیكەی پارچە نانێك بوو، زنجیرەیەك موگناتیسی و كویلەكانی وابەستە بە یەكتری تێدایە كە سەنتەرفیوجەكە دەجولێنن. ڕۆتۆری سەنتەرفیوج لەناو كونێكدا لە ناوەڕاستەكەیدا هەڵواسراوە و موگناتیسیەكان كێڵگەیەكی كارۆموگناتیسی دروست دەكەن كە ئەوەندە بەهێزە بەڕاددەیەك سەنتەرفیوجەكە دەخولێنێتەوە بەبێ ئەوەی هەرگیز بەری بكەوێت. ئەم دیمەنە لای زانایەك، شاكارێكی زۆر جوانە.

موگناتیسی سەرەوەی تۆپەكە یەكێكی ترە لە سەرسوڕهێنەرەكانی

زانست. دوو دیسكی موگناتیسی ئەلەمنیۆم-نیكل-كۆبالتی بەش بەشكراو، كە قەبارەكەی بە نزیكەیی قەبارەكەی پارچەی پشكنەرەكەیە، بە تارە بنكە تیژەكانی پۆلا بەیەكەوە بەستراونەتەوە. ئەم موگناتیسیانە كە لە سەرەوەی سەنتەرفیوجەكە دادەنیشن، ڕۆتۆرەكە لە شوێنی خۆیدا و لە بۆشاییدا دەگرن كاتێك بە خێرایی سەروو دەنگی دەسوڕێتەوە. پێكهاتەی چوارەم- دیسكێكی تەنكەو و ڕەنگی برۆنزییەو تیرەكەی نزیكەی شەش ئینج بوو و بەرزییەكەشی دوو ئینج بوو- بە شێوەیەكی سەیر بۆ چاوانێك كە پێی ئاشنا نەبوو، ئاسایی دەرەكەوت. ئەمە پێی دەوترێت زەنگ، مەبەست لێی بەستنەوەی بۆرییەكانی سەنتەرفیوجە لەم سەر بۆ ئەو سەر، ئەمەش بۆ دروستكردنی سەنتەرفیوجێكی درێژتر كە درێژییەكەی نزیكەی سێ مەتر بێت. ئەم وەشانەی درێژتر دەتوانێت یۆرانیۆم بە شێوەیەكی بەرچاو خێراتر لە سەنتەرفیوجە ئاساییەكانی درێژی دوو پێ دەوڵەمەند بكات، بەمەش توانای دروستكردنی بۆمب بە شێوەیەكی بەرچاو زیاد دەكات. ڕەهەندەكانی كریمپ- ڕیزێكی وردبینی لە بەشی ناوەڕاستیدا كە بۆرییەكانی سەنتەرفیوج لە خاڵی زۆرترین فشاردا كۆدەبنەوە- پێویستی بە شتێك بوو كە پێی دەوترێت ژمێریاری ئاڵۆز(١). لەو كاتەدا تەنانەت ژاپۆنییەكانیش نەیانتوانیبوو لە دیزاینكردنی ئەو جۆرە سەركەوتوو بن.

ئەم وێنەكێشان و بەڵگەنامە و نموونە سەرەتاییانە نوێنەرایەتی زانیاری كەڵەكەبووی بەرنامەی سەنتەرفیوجی ئەتۆمی عێراقیان دەكرد. ئەوانە چەكی ڕاستەقینەی كۆمەڵكوژی نەبوون، بەڵام ڕەنگە بەنرخترین پارچەگەلی بنیاتنانی چەكی كۆمەڵكوژیی بووبن كە عێراق تا ئەوكاتە خاوەنی بووبێت. قوسەی كوڕی

---

(1) Hairy mathematics

سەددام لە ساڵی ۱۹۹۲ فەرمانی پێکردبووم دوور لە چاوی پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان بە سەلامەتی بیانهێڵمەوە و حکومەتی عێراق چیرۆکێکی دارِشت کە گوایە ئەوانە لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانەوە لەناوچوون. هەرچەندە پشکنەرانی چەك لەرِادەبەدەر گومانیان هەبوو، بەڵام ئەمە ئەو چیرۆکە بوو کە سەرەرِای فشاری بەردەوام پاراستبوومان. تا ساڵی ۱۹۹۸ ئەوان تاکە نهێنی ئەتۆمی عێراق بوون کە مابوونەوە. زەحمەتە گرنگییەکانیان یان ئەو مەترسییە زیادە بخەملێنرێت کە ئەگەری هەیە بۆ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دروستیان کردبێت. ئەمانە بە خێرایی بەرنامەیەکی کوشندە بۆ چەکی ئەتۆمی دروست بکەن.

ئەگەر بۆمبی ئەمریکی تەقیبوایە، رِەنگە هێزی ئەو بۆمبە بەرمیلە پلاستیکییەکەی هەڵکەندابا. لە کاتی حیسابکردنی مەودای نێوان مووشەکەکە و درەختی نیلوفەرەکەدا، بە خەیاڵمدا هات کە چۆن بەڵگەنامە ئەتۆمییە بەنرخەکانی عێراق بەهێزی فشاری بۆمبەکەوە دەفرِن و لە بادا دێن و دەچن، یان بەشەکانی سەنتەرفیوجی نموونەیی لەناو داروپەردوودا لەلایەن ئەو ئەوانەی کە خۆڵ و خاشاك فرِێ دەدەن و هیچ شارەزاییەکیان لەبارەی بابەتەکەوە نییە، دەپشکنرێن. بەڵام بۆمبەکە نەتەقیبووەوە و بەرمیلەکەش بەبێ تێکچوون لە ژێر درەختی نیلوفەرەکەدا مابوو.

ناوەرِۆکەکەی زیاتر لە دە ساڵ بوو ئارامیەکی کەمی پێبەخشیبووم. وەك پارێزەری بەنرخترین سەروەت و سامانی ئەتۆمی سەددام، بە رژێمەوە بەسترابوومەوە و بەردەوام لە ژێر چاودێریدا بووم. وامدەزانی دەزگای هەواڵگری عێراقی، چاودێری هەموو جوڵەیەکی من دەکات. تەنانەت لە کاتی باخداریشدا هەمیشە ئاگاداری ئەوە بووم کە لە ژێر پێمدا چی هەیە. ئێستا کە هێزەکانی

ئه‌مریكا عێراقیان كۆنترۆڵ كرد، ده‌مزانی ئه‌م نهێنییه نێژراوانه ڕه‌نگه چاره‌نووسی خێزانه‌كه‌م له قاڵب بده‌ن.

كاتێك پشكنه‌رانی چه‌كی نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان له پاییزی ۲۰۰۲دا چوونه ناو عێراق بۆ گه‌ڕان به‌دوای چه‌كی كۆمه‌ڵكوژی سه‌ددام، به خێرایی سه‌رنجیان كه‌وته سه‌ر گرنگی چاوپێكه‌وتن له‌گه‌ڵ زانا عێراقییه‌كان. له مانگی تشرینی دووه‌می ڕابردوودا پشكنه‌رانی نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان داوایان كرد كه ڕێگه به به‌شێك له زاناكان بدرێت له‌گه‌ڵ خێزانه‌كانیان عێراق به‌جێبهێڵن بۆ ئه‌وه‌ی بتوانن به ئازادی قسه بكه‌ن، به‌بێ ئه‌وه‌ی مه‌ترسی تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه‌یان له‌سه‌ر بێت. هاوڕێیه‌كم كۆپییه‌كی بابه‌تێكی واشنتۆن پۆستی پێدام له ئینته‌رنێته‌وه دایبه‌زاندبوو، ئه‌م بابه‌ته منی وه‌ك یه‌كێك له پێنج زانای سه‌ره‌كی ناساندبوو كه پشكنه‌ره‌كان هیوایان ده‌خواست چاوپێكه‌وتنیان له‌گه‌ڵدا بكه‌ن له ده‌ره‌وه‌ی عێراق. دووباره و سێباره بابه‌ته‌كه‌م خوێنده‌وه. من بیرم ده‌كرده‌وه كه ئاخۆ ده‌شێت من و خێزانه‌كه‌م له عێراق وه‌ده‌ربهێنرێین تاوه‌كو ببم به شایه‌تحاڵی ئه‌وه‌ی كه سه‌ددام چییه و له ڕاستیدا چی حه‌شارداوه.

به‌ڵام ئه‌م بیرۆكه‌یه هه‌ر زوو له‌لایه‌ن به‌رپرسانی سه‌ددامه‌وه ڕه‌تكرایه‌وه. سه‌ره‌تای مانگی شوباتی ۲۰۰۳، مانگ و نیوێك پێش جه‌نگ، بانگهێشتی كۆبوونه‌وه‌یه‌كی ئه‌منی كۆمیسیۆنی پیشه‌سازی سه‌ربازی (MIC) كرام، كه تێیدا تاكه زانابووم كه ئاماده‌بووم. عه‌بدولته‌واب مه‌لا حویش جێگری سه‌رۆك وه‌زیرانی عێراق سه‌رپه‌رشتی كۆبوونه‌وه‌كه‌ی كرد. من به‌هۆی ئه‌وه‌ی به‌ڕێوه‌به‌ری MIC بووم، بۆیه عه‌بدولته‌واب هه‌م سه‌رۆكم بۆو و هه‌میش ئه‌و پیاوه بوو كه منی له ژێر چاودێری ناڕاسته‌وخۆدا هێشت بوویه‌وه. پیاوێكی ئازا بوو -كه چێژی له پێگه به‌هێزه‌كه‌ی وه‌رده‌گرت و

حه‌زی له‌ هاوارکردن و ته‌قاندنی ده‌مانچه‌که‌ی بوو بۆ هه‌وا له‌ کاتی گردبوونه‌وه‌کانی لایه‌نگرانی سه‌ددام-. به‌ سمێڵه‌ ئه‌ستووره‌که‌یی و به‌ جلوبه‌رگی زه‌یتونی سه‌ربازی که‌ هه‌موو چه‌پڵه‌ لێده‌ره‌کانی سه‌ددام حه‌زیان لێی بوو، ڕوون بوو که‌ عه‌بدولته‌واب چه‌نده‌ ده‌یه‌وێت لاسایی سه‌رۆك کۆمار بکاته‌وه‌. به‌ڵام ته‌نها شتێك که‌ توانیبووی به‌ شێوه‌یه‌کی کاریگه‌ر له‌خۆیدا کۆپی بکات، بێبه‌زه‌یی سه‌ددام بوو. عه‌بدولته‌واب به‌ زیندانیکردنی ئه‌و به‌ڵێنده‌ره‌ سه‌ربازییانه‌ی که‌ واده‌ی گه‌یاندنیان له‌ده‌ستدابوو، هه‌ندێکیان له‌ زینداندا گیانیان له‌ده‌ستدا، هه‌روه‌ها به‌ زیندانیکردنی زانا و ئه‌ندازیاران ناسرابوو. به‌ڕاستی ئه‌و بوو له‌ چه‌وسێنه‌رێك زیاتربوو، کاتێك به‌و شته‌ نه‌ده‌گه‌یشت که‌ ده‌یویست ئه‌وا به‌ مشته‌کانی مێزه‌کانی ده‌کوتا و پارچه‌ پارچه‌ی ده‌کردن و به‌ قسه‌ی ناشرین هاواری ده‌کرد به‌سه‌ر ئه‌ندازیارانی سه‌ربازی و به‌ڕێوه‌به‌رانی پرۆژه‌کاندا.

عه‌بدولته‌واب سته‌می سه‌یر و سه‌مه‌ره‌ی داهێنابوو. کولتوری ترساندن له‌ ڕژێمدا و له‌لایه‌ن سه‌ددام حوسێن نزیك بوو له‌ کولتوری عیرفانیی یان سۆفییه‌کان[1]. سه‌ددام وای له‌ خه‌ڵك کردبوو وه‌ك خوداوه‌ندێك بیری لێبکه‌نه‌وه‌ و گوایه‌ ئه‌و ده‌سه‌ڵاتی خوداوه‌ندی هه‌یه‌. مه‌لاکان پێویست بوو پێش نوێژ، به‌هه‌مان هه‌ناسه‌ی ناوی خوا، ستایشی ناوه‌که‌ی ئه‌ویش بکه‌ن. سه‌ددام هه‌رگیز توڕه‌یی خۆی له‌ده‌ست نه‌ده‌دا، وه‌یان لانیکه‌م له‌به‌رده‌م خه‌ڵکدا، چونکه‌ له‌ڕاستیدا ئه‌و پێویستی به‌ ئه‌وه‌ نه‌بوو. به‌ڵکو که‌سانی وه‌ك عه‌بدولته‌واب هه‌بوو که‌ ئه‌م کاره‌ی بۆ بکه‌ن.

(1) Mystical

ئەوەبوو عەبدولتەواب بانگهێشتی بۆ كۆبوونەوەكە كرد. دوای وتارێكی ورد سەبارەت بە دوژمنانی عێراق و ئەركی عێراقییەكان و هەموو عەرەبەكان بۆ بەرەنگاربوونەوە، ئەوەبوو قسەی ناشیرینی بە خۆرئاوا گوت كە داوای دەست گەیشتنیان بە حەشارگەكانی چەكی میللەت كردووە.

هەروەها وتیشی: زۆر باس لە دوا ئاگاداركردنەوەی سەرۆك بوش و پشكنەرانی چەكی نەتەوە یەكگرتووەكان دەكرێت. و ئەوان دەیانەوێت بیانوویەك بۆ شەڕ دروست بكەن، دەیانەوێت زانا بەڕێزەكانمان بكەنە ئامرازێك بۆ مەبەستە دوژمنكارانەیان. ئایا لێرە كەس هەیە بیەوێت قسە بكات لەم بارەوە؟"

عەبدولتەواب سەیری منی نەكرد و یەكێك لە جێگرەكانی هەستا بۆ قسەكردن.

جێگرەكە وەك ئەوەی وتارێكی پێشـــوەختەی بۆ ڕێكخرابێت وتی: "ڕەنگە هەنـدێـك لە زانـاكـان بە تـامەزرۆییەوە وڵات بەجێبهێڵن." بەرپرســـــانی تری MIC ســـــەریان لەقاند و چەند كەســـێكیش زمـانیـان چرپـانـد. "ڕەنگە چەنـد زانـایەك تەنانەت حەزیان لە لادان بێت."

عەبدولتەواب دەستی بەرز كردەوە و قسەكەی پێبڕی. ڕووی لە من كرد و ئەوەبوو بە شێوەیەكی هەڕەشەئامێز سەیری چاوەكانی كردم. وتی: با زاناكان عێراق بەجێبهێڵن بۆ ئەوەی چاویان بە پشكنەرەكان بكەوێت. پاشان سەری بەرزكردەوە و پەنجەیەكی بەسەر قوڕگیدا كێشا و گوتی: خێزانەكانیان لێرە دەمێننەوە.

له‌گه‌ڵ ئه‌و قسه‌دا منیش له‌رزم لێهات. به‌ ده‌گمه‌ن هه‌ڕه‌شه‌كان له‌ عێراقدا ئه‌وه‌نده‌ ئاشكرا و ڕاشكاو بوون. بۆ ده‌یان ساڵ به‌رگه‌ی هه‌ڕه‌شه‌كانمان گرتبوو كه‌ ته‌نیا به‌ ئاماژه‌ ده‌رده‌بڕان. ئه‌مه‌ به‌شێكه‌ له‌ شێوازی په‌یوه‌ندیكردنی عه‌ره‌به‌كان: واته‌ شتێك ده‌ربېڕیت به‌بێ ئه‌وه‌ی به‌ڕاستی بیلێیت، به‌كارهێنانی وردبینی بۆ گه‌یاندنی مه‌به‌سته‌كانی مرۆڤ. سه‌ددام و پیاوه‌كانی به‌ ڕووكار ڕووخۆش بوون به‌ڵام له‌ناخدا تا بڵێی سامناك بوون، له‌مجۆره‌ ده‌ربڕینانه‌ وه‌ستا بوون. به‌ یه‌ك نیگا ده‌یانتوانی خوێنت بمه‌یێنن. به‌ڵام ئاماژه‌كه‌ی عه‌بدولته‌واب خام و بێ پێچ و په‌نا بوو.

ئه‌سته‌مه‌ بتوانم ئه‌و هه‌سته‌ پڕ له‌ ترسه‌ وه‌سف بكه‌م كه‌ تێیدا ده‌ژیاین. له‌ شوێنی كار و له‌ ماڵه‌وه‌ خۆم سانسۆر ده‌كرد چونكه‌ ده‌مزانی خێزانه‌كه‌م سه‌لامه‌ت نییه‌. ته‌نانه‌ت له‌گه‌ڵ ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ له‌ جیهاندا نزیكترینم لێی، ژنه‌ سی و چوار ساڵه‌كه‌م، بوێری ئه‌وه‌م نه‌بوو هه‌ستی ڕاسته‌قینه‌ی خۆم ده‌رببڕم. ئێمه‌ ده‌مانزانی كه‌ به‌ ئه‌گه‌رێكی زۆره‌وه‌ ته‌له‌فۆنه‌كه‌مان چاودێری له‌سه‌ره‌و و ترسمان له‌وه‌ هه‌بوو كه‌ مایكرۆفۆنه‌كان له‌ناو ئۆتۆمبێله‌كه‌مان یان له‌ناو كه‌لوپه‌لی ناوماڵ وه‌ك گوڵدان، چرا، یان ته‌له‌فزیۆندا شاردرابنه‌وه‌. خۆمان ڕاهێنا بۆ ئاگاداربوون له‌ هه‌ر وشه‌یه‌ك كه‌ ده‌مانگوت، ئینجا هه‌رچه‌نده‌ تایبه‌تیش بێت. به‌ ئازارترین په‌شیمانی من ئه‌وه‌یه‌ كه‌ كاره‌ پۆلێنبه‌ندییه‌ به‌رزه‌كانم چۆن كاریگه‌رییان له‌سه‌ر خێزانه‌كه‌م هه‌بووه‌. ئه‌وان به‌ ترسه‌وه‌ ده‌ژیان له‌وه‌ی ده‌شێت كه‌ شه‌وێك له‌ شه‌وان نه‌گه‌ڕێمه‌وه‌ ماڵه‌وه‌، ڕه‌نگه‌ زیندانی بكرێم یان ئه‌شكه‌نجه‌ بدرێم. كاتێكیش دره‌نگ ده‌هاتمه‌وه‌ ماڵه‌وه‌، له‌به‌ر خاتری ڕووخساری پڕ له‌ نیگه‌رانی ئه‌وان بوو كه‌ زه‌رده‌خه‌نه‌م ده‌كرد.

هەر كاتێك هاوڕێ و خزمەكانمان دەهاتنە سەردانمان، تێبینیم دەكرد كە وریا بوون لە دەربڕینی قسەكانیان. ئەوان باش دەیانزانی كەماڵەكەم بە دڵنیاییەوە لە ژێر چاودێریدایە. ئەگەر وتووێژێك تەنانەت بەجۆرێك لە جۆرەكان چووبایەوە نێو بابەتە سیاسیەكان، ئەوا ئێمە بە شێوەیەكی غەریزەیی ئاماژەی دەستمان بەكاردەهێنا و دەچووینە دەرەوە بۆ ناو باخچەكەمان، لەوێ هەستمان بە سەلامەتی دەكرد دوور لە گوێی ئەلیكترۆنی ڕژێم. ئەمە بە تایبەتی لە هەفتەكانی كۆتایی دەسەڵاتی سەددامدا تەواو ڕاست بوو.

مانگێك پێش دەستپێكردنی شەڕ، كۆبوونەوەیەكی خێزانی گەورەمان لەماڵی یەكێك لە ئامۆزا دوورەكانمدا هەبوو. لە كاتێكدا لەسەر مێزێكی گەورە دانیشتین بۆ ژەمێكی بەچێژ، گفتوگۆكە ئاڕاستەكەی بەرەو ڕووی كۆبوونەوەی سەربازی ئەمریكا كرد. هەستمان بە ئازادی زیاتر دەكرد لە ماڵی خزمێكدا تا لەوەی لە ماڵەكەی خۆمدا دەمتوانی. وەك زۆربەی عێراقییەكان، هەموو ئەندامێكی بنەماڵەكەم دەیانویست سەددام لە پۆستەكەی لاببرێت، بەڵام بۆچوونمان جیاواز بوو سەبارەت بەوەی كە ئایا ئەوە ڕوودەدات یان نا. ئەوەبوو هەریەكەو قسەیەكی دەكرد. گرووپێك دەیانگوت شەڕ حەتمییە و سەددام تەواو بووە. بەڵام بە گاڵتەجاڕیەوە پێیان دەگوترا "هەڵۆكان"،[1] بە ناوی بەرپرسانی ئەمریكی كە هەمان بۆچوونیان هەبوو. لەو كاتەدا لە عێراق، لەسەر قسەیەكی لەمجۆرە دەكرا لە سێدارە بدرێین. تاقمێكی تریش دەیانگوت شەڕ ڕوونادات و سەددام لە حوكمڕانی بەردەوام دەبێت. ئەم كۆمەڵەیەمان ناونا "كۆترەكان"[2]. پاشان كەسێك

---

[1] ئەوانەی پتر پشتگیری لە چارەسەری یەكلاكەرەوەی جەنگ دەكەن

[2] ئەوانەی پتر لە چارەسەری دیكە دەگەڕێن جگە لە سەربازی و جەنگ

تیاماندا ناڕازی بوو، گوتی: ئامۆزایەكی من كە پێشبینی دەكرد ئەمریكییەكان شەڕ لە دژی عێراق دەكەن، بەڵام سەددام لە ژیاندا دەمێنێتەوە و دەجەنگێت. منیش گاڵتەم كرد و گوتم: "تۆ نە پەپوولەی و نە كۆتری- بەڵكو تۆ قەلەڕەشیت!" بۆ ئەمەش هەمووان پێكەنین.

پاشان بێدەنگییەك باڵی بەسەر مێزەكەدا كێشا و ترس كەوتە نێو هەموومان. هەمووان دركیان بەوە كرد كە ئێمە لە سنووری خۆمان تێپەڕین و چوینە نێو هەرێمێكی مەترسیدار. چاوەكانی ئەندامانی خێزانەكەمم دەبینی كە بە دەمارگیرییەوە بە دەوری ژوورەكەدا دەسوڕانەوە و وەك بڵێی بەدوای مایكرۆفۆنی شاراوەدا بگەڕێن. هیچ قسەیەكی تر لەسەر ئەو بابەتە نەگوترا.

فڕۆكەهەڵگرەكان بەرەو كەنداو دەهاتن و جۆرج بوشی سەرۆكی ئەمریكا و تۆنی بلێر سەرۆكوەزیرانی بەریتانیا تادەهات لێدوانی شەڕانگێزانەیان بۆ جیهان دەدا، خەڵكی بەغدا بە دەستلەكاركێشانەوە دەستیان كرد بە ئامادەكاری بۆ شەڕ، بەڵام بە كەرامەتیشەوە. پێشتر بەم دۆخەدا تێپەڕیبووین و دەمانزانی دەبێت چی بكەین. لە هەموو وێستگەیەكدا سرەی درێژ بۆ بەنزین دروست بوو، بەو پێیەی شۆفێران خۆیان بۆ كەمیی بەنزین ئامادە دەكرد، بەڵام ئەمە بە شێوەیەكی ڕێك و پێك ئەنجامدرا. بێزارییە سەرەكییەكان لە تێچوونەكاندا بوون: بەرزبوونەوەی نرخی خۆراكە قوتووەكان، ئاوی قوتوو و مۆلیدەكان، لە كاتێكدا خەڵك خۆیان ئامادە دەكرد بۆ ئەوەی لە ماڵەكانیاندا بمێننەوە. منیش وەك زۆرێك لە خێزانەكان بە دوودڵیەوە بڕیاریمدا تفەنگێكی كلاشینكۆف بكڕم لە ئەگەری تێكچوونی یاسا و ڕێساكان.

جیهان سەیری دەیان هەزار سەربازی ئەمریکی دەکرد کە لە پێگەی هێرشبەری لە نزیك سنووری عێراق لە کوێت دادەنێن. ئەوەی نەیاندەتوانی ببینن ئەو شتە سەیرانە بوون کە لە ئاستە بەرزەکانی حکومەتی سەددامدا ڕوودەدەن. لە پلە باڵاکانی دەسەڵاتدا، دەستی ڕژێم هێندەی تر توندتر بوو. گفتوگۆ ئاساییەکان فۆرماڵی بوون، لەگەڵ دەربڕینی ناپاك بەڵام بە دەنگی بەرز ڕاگەیەندراوی نیشتمانپەروەری دەردەبڕدرا. هەستێکی وەهمیی بە واقیع لە سەرانسەری حکومەتدا بڵاوبووەوە. بە پێچەوانەی هاوڵاتیانی عێراقەوە، حکومەت بە تەواوی ئامادەنەبوو بۆ شەڕ.

لە ١٩ی ئازاردا، کە یەکەم ڕۆژی هێرشە ئاسمانییەکان بوو بۆ سەر بەغدا، پابەند بووم بە ڕێنماییەکان بۆ ئەوەی وەك هەمیشە ڕاپۆرت بدەم بۆ بارەگای MIC. بۆردومانەکە پێش بەیانی دەستی پێکردبوو و دواتر وەستابوو و هێوربوونەوەیەکی پێشبینیکراو بەسەر شارەکەدا کەوتبوو. کاتێك گەیشتمە ئەوێ، لە ترسی ئەوەی کە بە ئۆتۆمبێل دەچمە ناو ناوچەیەکی بۆردومانکردنەوە، بەرپرسێکی ترساو و پێی وتم لەبری ئەوەی ڕاپۆرت بدەم پێویستە بچم بۆ باخچەیەکی ساوایان لە قەزای جومهورییە، کە کرابوو بە ئۆفیسی کاتی بۆ بەڕێوەبەرانی MIC و ستافی باڵامان. ئاماژەی بەوەشکرد، دەزگاکانی دیکەی حکومەت خەریکی چۆڵکردن بوون بۆ شوێنی هاوشێوە. لە شەوێکدا ڕژێمەکە تەواو کارەکانی خۆی گواستەوە بۆ ژێر زەوی، بەو هیوایەی فڕۆکەوانە ئەمریکییەکان ئامادە نەبن قوتابخانەکان بۆردومان بکەن.

هێشتا هەر بەیانی بوو گەیشتمە باخچەی ساوایان و چووم بەسەر قەرەباڵغی و تێکچڕژانی ئۆتۆمۆبێلان، هەروەها ئۆتۆمبێلی

جۆری مێرسیدس سیدان ڕەش و ئۆتۆمبێلە گرانبەهاكانی دیكەم بینی -كە بەرپرسانی باڵای عێراق حەزیان لێیە- و كۆڵانەكانی نیشتەجێبوونی دەوروبەری قوتابخانەكەیان داخستبوو. خوێندن ڕاگیرابوو، منداڵانی گەڕەكەكەش لە ژێر فەرمانی مانەوە لەماڵەوە بوون، بەڵام زۆرێكیشیان هاتبوونە دەرەوە بۆ ئەوەی بە پەرۆشەوە سەیری ئەو ئۆتۆمبێلە لوكسانە بكەن كە لەناكاو شەقامە تەسكەكانیان پڕكردبوو. دانیشتوانی ئەوێ لە شوقە سێ و چوار نهۆمییەكانی گەڕەكەكەدا لە پەنجەرەكانیانەوە سەیری ئەو دیمەنەیان دەكرد. من بەخێرایی ئۆتۆمۆبێلەكانی دەروروبەری باخچەی ساوایانەكەم ژمارد نزیكەی پەنجا دانە دەبوو، كە بەرپرسانی MIC بەكاریان دەهێنا. دركم بەوەكرد كە ڕەنگە كۆبوونەوەیەكی وا لە ئۆتۆمبێلە فەرمییەكان بە ئاسانی لەلایەن فڕۆكەكانی چاودێری ئەمریكییەوە ببینرێت، كە ئێستا بە تەواوی بەسەر ئاسمانەكانی بەغدادا زاڵ بوون.

لەناو باخچەی ساوایاندا ئەفسەرانی بەعسی بەپەلە دەگەڕان و پۆلەكانیان بۆ بەشە جیاوازەكانی MIC دیاری دەكرد. لە یەكێك لە پۆلەكاندا كۆبوونەوەیەكی پشێوی بەڕێوەبەران بەڕێوەدەچوو. هیچ پلانێكی نائاسایی بۆ لەشكركێشی ئەمریكا نەبووە و ڕوون نەبووەتەوە كە كێ بەرپرسیار دەبێت. دوو بەرپرسی پلەدار، عەمید وەلید موسلیح، بەرپرسی بەشی تەكنیكی و ڕەجا ئەلخەزراجی، بەڕێوەبەری گشتی كارگێڕی، هاواریان دەكرد فەرمان و ئەركی پۆلەكانیان دیاری دەكرد، كاتێك دەیان كەسمان بەدەوریدا قەرەباڵغیمان كرد و كۆبووینەوە. دەستم بەرز كردەوە و پێشنیارێكم پێشكەش كرد.

گوتم: "زیاتر لە پەنجا ئۆتۆمبێلمان لە نزیكی ئەم دەوروبەرە

وەستاون. ئەمە دەشێت مەترسیدار بێت بە لەبەرچاوگرتنی چاودێری لەلایەن فڕۆكە ئەمریكییەكانەوە. ئایا نابێت بڵاوەیان پێبكەین؟"

ڕوون بوو كە ئەمە بە مێشكی هیچ كامێك لە هاوكارەكانم دا نەهاتبوو، لەناكاو ترس ژوورەكەی داگرت و كاتێك دركیان بە مەترسییەكە كرد. ئەوەبوو ڕەجا ئەلخەزراجی بەسەر شۆفێرەكانمان هاواری كرد تا ئۆتۆمبێلەكانمان بەسەر ناوچەیەكی فراوانتردا بڵاوەپێبكەن.

ئێمە دابەش بووین بەسەر یەكەكانی فریاگوزاریدا، بۆ ڕێكخستنی پشتیوانی كورتخایەن بۆ شەڕ و دابینكردنی چەك. لە یەكێك لە پۆلەكاندا، سەرنجم دا وێنەیەكی سەددام حسێن كە لەگەڵ زاوای كۆچكردووی خۆی، حوسەین كامل، كە لە ساڵانی هەشتاكانی سەدەی ڕابردوودا بۆ پەرەپێدانی چەكی ئەتۆمی لەگەڵمان بوو و بەڕێوەبەرم بوو. لەسەر كورسییە بچووكەكان دانیشتبووین، هەوڵمان دەدا ئەژنۆكانمان لە ژێر مێزەكاندا دابنێین كە بۆ منداڵانی شەش ساڵان دروستكرابوون. هێشتا وانەكانی ئەلفوبێ لەسەر تەختە ڕەشەكان دەبینرا. لە دەرەوەی پەنجەرەكانمان، ئامێری یاریكردنەكانی منداڵان پێدەچوو تاكە بەرگریمان پێشكەش بكەن لە بەرامبەر هێرشێكی چاوەڕوان نەكراوی ئەمریكی. ڕەنگە دیمەنەكە كۆمیدی بووایە ئەگەر هاتوو ئەوەندە ترسناك نەبوایە. لە تەنیشت باخچەی ساوایانەوە، خەزانەیەكی سەر كەشتیوانی نیوەی لە زەویدا نێژرابوو، پلیكانەیەكی هەبوو كە دەچووە خوارەوە بۆ ناو ناوپۆشی خەزانەكە و بۆ ئەوەی بنكەیەكی كاتی دروست بكەین كە بتوانین تێیدا خۆمان بشارینەوە لە ئەگەری بۆردومانكردندا.

من له‌لای یه‌كێك له‌و گرووپانه‌ دانیشتم كه‌ ڕێنماییم بۆ كرابوو تاوه‌كو فشار بخه‌نه‌ سه‌ر به‌رهه‌مهێنه‌رانی نارنجۆك هه‌ڵگر وه‌یان موشه‌ك هه‌ڵگر بۆ كه‌مكردنه‌وه‌ی كاتی به‌رهه‌مهێنان له‌ مانگێكه‌وه‌ بۆ هه‌فته‌یه‌ك. بیرۆكه‌كه‌ له‌سه‌ر ئه‌و گریمانه‌ بێمانایه‌ بوو كه‌ كارگه‌كانی چه‌ك هێشتا ده‌توانن به‌ شێوه‌یه‌كی ئاسایی كاربكه‌ن.

ئه‌وه‌بوو پرسیارم كرد كه‌: "ئامانج له‌م RPGانه‌ چییه‌؟" ، به‌بێ ئه‌وه‌ی باسی ئه‌و حه‌قیقه‌ته‌ به‌رچاوه‌ بكه‌م كه‌ ته‌نانه‌ت دوای دروستكردنیش چه‌ند هه‌فته‌یه‌كی ده‌وێت تا پارچه‌كان كۆبكرێنه‌وه‌ و ده‌بنه‌ چه‌كێكی ته‌واو.

یه‌كێك له‌ جێگره‌كان هاواری كرد: "بێگومان بۆ به‌هێزكردنی سوپا!".

دوای ئه‌و كۆبوونه‌وه‌یه‌ كه‌ یه‌كه‌م كۆبوونه‌وه‌ بوو، هه‌وڵمدا زیاتر له‌ پانزه‌ خوله‌ك له‌ باره‌گای كاتی نه‌مێنمه‌وه‌. ئه‌ركی "چاودێری"م بۆ خۆم دیاری كرد بۆ سه‌ردانی هاریكاره‌ زانستی و ئه‌ندازیارییه‌كانم، كه‌ فه‌رمانیان پێكرابوو له‌ بنكه‌كانی دیكه‌دا بمێننه‌وه‌. به‌م ئه‌ركه‌ ساخته‌یه‌، توانیم به‌شێكی زۆری به‌شی یه‌كه‌می شه‌ڕه‌كه‌ به‌ لێخوڕینی ئۆتۆمبێل له‌ شه‌قامه‌ تاڕاده‌یه‌ك سه‌لامه‌ته‌كانی به‌غدا به‌سه‌ر به‌رم، دوور له‌ بینا حكومییه‌كان كه‌ ئامانجی بۆردومانی ئاشكرای فڕۆكه‌كان بوون. هه‌روه‌ها هه‌وڵمدا خۆم به‌دوور بگرم له‌ به‌ركه‌وتن و زۆرترین كاتم له‌ ماڵه‌وه‌ له‌گه‌ڵ خێزانه‌كه‌م به‌سه‌ر ده‌برد.

به‌ڵام هه‌ستی ئینكاری ته‌واو له‌ نێوان به‌رپرسانی حكومه‌تدا تا كۆتایی به‌رده‌وام بوو، له‌گه‌ڵ فشاره‌كانی پابه‌ندبوون به‌ فه‌رمانه‌كان، فه‌رمانگه‌لێك كه‌ جێگای گاڵته‌جاڕی بوو. له‌ ٧ی

نیسانی ۲۰۰۳، کاتێك سەربازە ئەمریکییەکان گەیشتنە جەرگەی بەغدا، فەرمانم پێکرا تا کاتژمێر ٩ی پاشنیوەڕۆ ڕاپۆرت بدەم. جارێکی تر بۆ بنکەی باخچەی ساوایان. خێزانەکەم داوایان لێکردبووم نەڕۆم. ئەوان دەیانزانی کە لێخوڕینی ئۆتۆمبێل لەنێو شاردا و بەم ئێوارەیە جگە لە خۆکوشتن هیچی تر نییە. ئەمریکییەکان زانیاری هەواڵگری زۆر باشیان بەکاردەهێنا بۆ بۆردومانکردنی کۆبوونەوە فەرمییەکان. بەڵام من پێداگریم کرد ئەگەر لە ماڵەوە بمێنمەوە بۆ هەموومان مەترسیدارترە. لەلایەکی تر ناو بەغدا هێشتا عێراقی سەددام بوو و سەرپێچیکردن لە فەرمانێك سزای لەسێدارەدانی خێرای لەسەر بوو.

لە سەرتاسەری شاردا کارەبا بڕدرا. تارمایی بیناکان لە بەرامبەر درەوشانەوەی پرتەقاڵی بۆردومانەکاندا وەك مۆتەکە دەردەکەوتن. تەنها بە لایتی ئۆتۆمبێلەکەمەوە ئۆتۆمبێلم دەهاژوشت، بەو هیوایەی نەبمە ئامانجی فڕۆکە ئەمریکییەکان. گوێم لێ بوو کە لەسەرمەوە بە ئاسماندا دەفڕین.

لە بنکەی باخچەی ساوایاندا، کۆمەڵە بچووکەکانی زانا و تەکنیکار و بەرپرسانی حیزبی بەعس بە دڵەڕاوکێیەوە چاویان لە یەکتر دەکرد؛ کەسمان نەماندەزانی بۆچی بانگهێشت کراوین بۆ ئەوێ. لە شوێنێك لە سەرووی ئێمەوە مۆلیدەیەکیان داگیرساند کە کارەبای دەگەیاند بەم دوو گلۆپەی ژوورەکەمان و لەوێ لەسەر مێزی کۆنفرانسەکە کە خەریك بوو چارەنووسمان تێدا ڕوون دەبووەوە. دەکرا زیندانی بکرێین یان لەسێدارە بدرێین ئەگەر سەددام یان بەرپرسەکانی بڕیاریان دابێت کە ئێمە تاوانبارین بۆ خراپی ئەدای عێراق لە شەڕەکەدا. یان ڕەنگە فەرمانمان پێکرابێت دەست بکەین بە هەندێك کارەساتی ئەندازیاری گەورە کە ئەوان

خه‌ونیان پێیه‌وه بینیبوو وه‌ك هه‌وڵێكی كۆتایی بۆ ڕاگرتن و دوورخستنه‌وه‌ی هێزه‌كانی هاوپه‌یمانان. ڕه‌نگه مه‌به‌ست له كۆبوونه‌وه‌كه ئه‌وه بووبێت كه چاودێری هه‌مووان بكه‌ین، بۆ ئه‌وه‌ی دڵنیا بین كه هه‌موومان بێ كێشه له‌وێین.

"بۆ چ مه‌به‌ستێك؟" ویستم بزانم. "ناتوانن نووسینی سه‌ر دیواره‌كه بخوێننه‌وه؟"

ئه‌م بارودۆخه دیمه‌نه‌كانی فیلمی "ڕۆشتن له‌گه‌ڵ با-دا"[1]ی بیرخستمه‌وه، كه تیایدا باشوورییه‌كان به شێوازی ژیانی مه‌حكومی خۆیانه‌وه لكاندبوون، به‌بێ گوێدانه ئه‌و هێزه پێشڕه‌وانه‌ی كه خه‌ریك بوون بۆ هه‌تا هه‌تا بیاخه‌نه ناو مێژووه‌وه. له عێراقدا، بیركردنه‌وه‌ی هه‌موو ڕژێمه‌كه پابه‌ند بوو به فه‌رمانی سه‌ددام، به‌وه‌ی كه بینا سه‌ره‌كییه‌كان به قوڕ داپۆشرێن و ئاگری نه‌وت له ده‌وروبه‌ری شاره‌كه‌دا بكرێته‌وه، به‌و باوه‌ڕه‌ی كه دوكه‌ڵ فڕۆكه‌وانه ئه‌مریكییه‌كان ده‌سته‌خه‌رۆ ده‌كات. به‌ڵام ئه‌مریكییه‌كان به ئاسانی ده‌یانتوانی به‌ناو دوكه‌ڵه‌كه‌دا بڕۆن، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا كه‌س ئه‌وه‌نده ئازایه‌تیه‌ی نه‌بوو كه ئه‌م حه‌قیقه‌ته به سه‌ددام بڵێت. له كۆتاییدا دوكه‌ڵه‌كه زیانی زیاتری به هه‌وڵه‌كانی دژه‌-فڕۆكه‌ی عێراقی گه‌یاند. به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی سه‌ددام وای وتبوو، هه‌مووان قه‌ناعه‌تیان به‌خۆیان كردبوو كه "ئه‌گه‌ر ئێمه نه‌توانین فڕۆكه ئه‌مریكییه‌كان ببینین، ئه‌وا مانای وایه كه ئه‌وانیش ناتوانن ئێمه ببینن"، وه‌ك ئه‌و چیرۆكه‌ی فۆلكلۆرییه كۆنه‌ی كه نه‌عامه سه‌ری خۆی له‌ناو خۆڵدا ده‌نێژێت بۆ ئه‌وه‌ی خۆی بشارێته‌وه و واده‌زانێت كه كه‌س ناتوانێت ببینێت.

---

[1] Gone with the Wind

به‌رپرسان به‌شێوه‌ی كۆمه‌ڵه‌ی بچووك كۆده‌بوونه‌وه‌ و به‌ ده‌نگی نزم قسه‌یان ده‌كرد. من بۆ ماوه‌یه‌كی كورت په‌یوه‌ندیم به‌ گروپێكه‌وه‌ كرد، كه‌ به‌رپرسێكی حیزبی به‌عسی زۆر تۆخ بوو، ئه‌و هه‌ر له‌سه‌ر ئه‌و ئینكارییه‌ بوو. به‌ وردی باسی له‌ شه‌ڕی فرۆكه‌خانه‌ی نێوده‌وڵه‌تی كرد، كه‌ به‌ وته‌ی خۆی پڕ بووه‌ له‌ ته‌رمی سه‌ربازانی ئه‌مریكی. پیاوه‌كانی ده‌وروبه‌ری سه‌ری ئه‌رێنیان بۆ قسه‌كانی ده‌له‌قاند، هه‌رچه‌نده‌ دڵنیا بووم هه‌موویان ده‌یانزانی ئه‌مه‌ ڕاست نییه‌. به‌رپرسێكی دیكه‌ به‌ شانازییه‌وه‌ ئاماژه‌ی به‌وه‌دا كه‌ سه‌ددام خۆی ئه‌و بنكه‌ی شه‌وی پێشوومانی بۆ كۆبوونه‌وه‌ به‌كارهێناوه‌. گوێم لێ بوو باسی سه‌رۆك كۆمار ده‌كات و هه‌رووه‌ها له‌ غیابی بێ پۆزشی عه‌بدولته‌واب ده‌هری ببوو. سه‌ددام هه‌ڕه‌شه‌ی كوشتنی لێده‌كرد ئه‌گه‌ر هه‌ڵاتبێت یان هه‌وڵی هه‌ڵاتنی دابێت، گرووپێكی ناردبوو بۆ دۆزینه‌وه‌ی جێگری سه‌رۆكی وه‌زیرانی وڵاته‌كه‌ی. به‌ڵام عه‌بدولته‌واب هه‌ڵنه‌هاتبوو. به‌ڵكو ئه‌و له‌و سه‌ری مێزه‌كه‌ بوو و خۆی ئاماده‌ ده‌كرد بۆ سه‌ركردایه‌تیكردنی كۆبوونه‌وه‌كه‌. سه‌ره‌ڕای ئه‌و هه‌موو قسه‌ و باسانه‌ سه‌باره‌ت به‌ ئه‌گه‌ری مردنی سه‌رۆك یان برینداربوونی سه‌ختی سه‌رۆك، كه‌چی سه‌ددام هێشتا كۆنترۆڵی له‌ده‌ست بوو.

ڕوون بوو كه‌ عه‌بدولته‌واب هیچ كام له‌ هه‌ڕه‌شـــه‌ شـــانۆ-ئامێزه‌كانی له‌ده‌ســـت نه‌داوه‌. مشـــته‌كانی له‌ســـه‌ر مێزه‌كه‌ ده‌دا و ئه‌وه‌بوو فه‌رمـانی دا بۆ كۆبوونه‌وه‌. به‌ ئـازایه‌تییه‌وه‌ گوتی: "وه‌ك چۆن ده‌توانم به‌چاوی خۆم هه‌مووتان له‌به‌رده‌مم ببینم، ئاوه‌هاش ده‌توانم به‌ڕوونی ســـــه‌ركه‌وتن ببینم"، دیـاره‌ خۆی قه‌نـاعه‌تی پێكردبوو كه‌ ئه‌مه‌ ساتێكی خۆشه‌، سه‌ره‌ڕای ده‌نگی بۆمبه‌كان له‌ ده‌ره‌وه‌ و ئه‌و ڕاســـتییه‌ی كه‌ ئێمه‌ له‌نـاو خه‌زانه‌یه‌كدا گیرمـان

خواردووەو كۆبوونەوەكەش بەپەلەیە. دواجــار گوتی: "دوای ئەوەی ئەمریكییەكــان ســــەردەبڕین و لە خــاكی خۆمــان دەریانـدەكەین، من بەڵێن دەدەم كە ئاهەنگێكی گەورە ســـــاز بكەین".

چاوێكی خستە سەر ئەو ژنەی وەستابوو، تاكە ژن بوو لەوێ؛ ئەو بەڕێوەبەرە ناوی خاتوو جابریە بوو كە لە ئاهەنگەكانی ڕابردوودا گلەیی لە كات بەسەربردن كردبوو و پێكەنی.

"هەروەها قەرەجگەلی زۆریش دێنین تاوەكو سەما بكەن، سەرەڕای ناڕەزایەتییەكانی ئەو خانمە."

عەبدولتەواب تاكە كارێك كە لە كارنامەی كاتژمێری یازدەیەمدا بوو هێنایە ئاراوە بریتی بوو لە: داواكاری سوپای عێراق بۆ دارشتنی پەرژینی كۆنكرێتی بەسەر ڕێگایەكی خێرادا وەك بەربەستێك لەبەردەم پێشڕەویكردنی سەربازانی ئەمریكیدا. پەرژینی كۆنكرێتی! چەندە جێی باسە كە ئەو پیاوانەی لە پشت كۆمەڵگە سەربازی-پیشەسازییەكەی عێراقەوە بوون، لە ئاستێكی نائومێدكەردا كورتكرانەوە لە دانانی بەرگرییەكی وەها لە شارەكە. بەڕاستی ئەوەندە گاڵتەجاڕانە بوو خەریك بوو قاقا پێبكەنم. من تواناكانی سوپای ئەمریكام بە وردی نەدەزانی، بەڵام زانیارییەكی نزیكم لەسەر هێزە عێراقییەكان هەبوو. من سەرپەرشتی دروستكردنی دامەزراوەكانی بەرهەمهێنانی پارچەكانی ناو تۆپخانە و تانك و موشەكەكانم كردبوو كە لەسەر بنەمای مۆدێلی كلاسیك و كۆنی ڕووسی بوون -ئەمەش یەكسانبوونێكی بەزەییدار بوون لەگەڵ چەكی ئاڵۆزی ئەمریكییەكان- دەمزانی سوپای عێراق وەك كەرە وایە چاوەڕێی چەقۆیەكی گەرمە.

ئێستاش سوپا دەیویست ئێمە بەربەستێکیان بۆ دروست بکەین بۆ ئەوەی هێزەکانی ئەمریکا و بەریتانیا ڕابگرن!

من نەمتوانی لەوە زیاتر خۆم بگرم و گوتم: "ئەمریکییەکان بە وردبینییەکی زۆرەوە بینا گەورەکان لە ئان و ساتێکدا تەواو خاپوور دەکەن، ئایا بەڕاستی هیچ کام لە ئێوە باوەڕتان وایە کە پەرژینێکی کۆنکریتی هیچ سوودێکی دەبێت؟"

وەڵامەکە هەرتەنها بێدەنگی و چاولێکردن بوو لەلایەن ئەوانەی لە دەوری مێزەکە بوون. بە جەستەی لەرزۆکەوە تێگەیشتم کە باسم لە شتە نەگێڕدراوەکان کردووە: کە ئەمریکییەکان زۆر بە زوویی بەغدا داگیر دەکەن و بەرەنگاریی ئەم پیاوانەش بێ مانایە. لە ڕووی دەروونییەوە تێبینییەکەمم دووبارە کردەوە، ئەگەرچی زۆر دڵخۆش نەبووم بە ئەنجامەکەی.

لە ژێر ئەو بارودۆخە ئاڵۆزەدا، ناڕەزایەتی دەربڕین بەرامبەر بە هەر فەرمانێك دەتوانرێت بە خیانەت هەژمار بکرێت. بەڵام کەس تەحەدای نەکردم. ڕەنگە ئەوانیش هەمان بیریان بکردایەتەوە. لەبری ئەوەی ڕووبەڕووی گەمژەیی داواکارییەکە ببنەوە، دواجار لیژنەیەك بۆ دیزاینکردنی پەرژینەکە پێکهێنرا.

دوای کۆبوونەوەکە، گۆڕەپانی باخچەی ساوایانمان لێ قەدەغە کرا و فەرمانمان پێکرا بچینە ناو پۆستە ئەمنییە جیاوازەکانەوە. شەوەکەم لە ژێر چاوی دەرگای بنکەکەدا بەسەر برد، لەناو ئۆتۆمبێلێکی وەستاودا لەگەڵ حزبییەکی بەعسی، کە تفەنگێکی کلاشینکۆفی لەسەر ئەژنۆی هەڵگرتبوو. چەندین کاتژمێر دانیشتین و گوێمان لە بۆمب و تۆپ و مووشەك بوو کە بەسەر بەغدادا دەباری، دەترساین لەوەی کە ئەگەر ئەمریکییەکان بتوانن بە وردی

شوێنپێی جوڵەكانی حكومەتی سەددام بگرن، ئەوا بنكەكەمان دەبێتە ئامانجێكی سەرەكی. خەمی ژنەكەم و منداڵە گەورەكانم بوو. هەر جارێك لە دوورەوە گوێم لە تەقینەوەیەك بوو، بە بێدەنگی دوعام دەكرد: "خودایە داوات لێدەكەم كە خێزانەكەم باش بن. داوات لێدەكەم با لە ژیاندا بمێننەوە". خراپترین ترسم ئەوە بوو كە لە كاتێكدا من لەم ئۆتۆمبێلەدا دانیشتووم و چاوەڕێی مووشەكێك بووم كە بۆ سەددام دانراوە، ڕەنگە دواجار خێزانەكەم تووشی مەترسی ببن و بیانپێكێت.

لەگەڵ بەیانیدا، بە خێرایی بە شەقامە چۆڵەكاندا گەڕامەوە ماڵەوە. لە سەرووی دارخورما گەشاوە و بینا ڕەنگ خۆڵەمێشییەكانەوە، بەشێكی زۆری ئاسمان ڕەش بوو بەهۆی دوكەڵی ئاگرە بێ هودەكەی سەددام. چەند پارچە تۆپ و تانكی پاسەوانی كۆمارییەكانم بینی كە لە نێو دارەكانی پاركە گشتییەكاندا شاردرابوونەوە. گومانی من ئەوە بوو كە دوكەڵەكە ڕێگری لە فڕۆكەوانە ئەمریكییەكان ناكات و بەم زووانەش ئەم تانك و جبە سەربازییە عێراقییانەش بۆردومان دەكرێن. گەیشتمە ماڵەوە و ژنەكەم و منداڵەكانم بینی كە ترساون بەڵام لە ژیاندان. بە بینینی یەكتر بە ئاسوودەیی دەگریاین و دوای ئەوەی یەكترمان لە باوەش گرت، سوێندم خوارد كە جارێكی تر بەجێیان نەهێڵم.

زەیدی كوڕم بە درێژایی شەو بەئاگا بووبوو و بە دەوری ماڵەكەماندا سوڕابوویەوە و وتی كە لە شەودا گوێم لە دەنگی چەكدارانی فیدایی سەددام بووە لە ژێر ئۆڤەرپاسی عەلەوی، لەسەر ڕێگای خێرای ئەبوغرێب كە دەروازەی سەرەكی ڕۆژئاوایە بۆ ناو بەغدا. هەروەها زەید وتی چەند خولەكێك لەمەوبەر لە

نزیکەوە گوێی لە تەقەکردن بووە. منیش چوومە پاڵ دیواری باخچەکە تا بۆ خۆم گوێی لێ بگرم. ئەوەبوو گوێم لە دەنگی زۆر نزم بوو کە بە زمانی عەرەبی قسەیان دەکرد بەڵام بە لەهجەی میسر و سوریا و شوێنەکانی ترەوە. زانیم کە ئەوانە بەکرێگیراوانی بیانین. درکم بەوەکرد کە ئەوان هاتوونەتە عێراق بۆ شەڕکردن تا کۆتایی، و ئەو جۆرە کەسانە لەوانەن کەهەمیشە پێیان باشترە بمرن نەوەك هەڵبێن.

لە ژووری میوانەکەماندا کۆبوونەوەیەکی بەپەلەم لەگەڵ هاوسەرەکەم، لەیلا و دوو کچە هەرزەکارەکەم و زەید ئەنجامدا، بۆ گفتوگۆکردن لەسەر چۆڵکردنی ماڵەکەمان، چونکە پێدەچوو ئەو شەڕە بە شێوەیەکی بەردەوام لەبەردەم دەرگاکەماندا بێت. من و زەید بڕیارماندا بە ئۆتۆمۆبێل جەولەیەك بە شەقامەکانی گەڕەکەکەماندا بکەین. کۆڵانەکانی دەوروبەری ماڵەکەمان چۆڵ بوون و دەرگای حەوشەی ماڵەکانی دراوسێکانمان هەموویان بە توندی داخرابوون. سەرەڕای ئەوەی سەربازەکان لە دەرەوەی دیواری باخچەکەمان کۆبووبوونەوە، بەڵام بێدەنگی زاڵ بوو بەسەر گەڕەکەکەدا. شەقامەکان وەك پەناگەیەك دەهاتە بەرچاو نەوەك وەك ناوچەیەکی شەڕی ڕاستەقینە.

من و زەید دوای ئەو جەولەیەی کۆتایی خەریك بوو بگەڕێینەوە ماڵەوە، بەڵام لەپڕ کەوتینە نێو خاڵێکی پشکنینی عێراقی. ئەفسەرێکی پاسەوانی کۆمارییەکان تفەنگی کلاشینکۆفەکەی سوارکرد. تەمەنی لە بیستساڵیدا بوو، پێستی

ڕەش و سمێڵی ڕێك بوو، ئەو كڵاوە سوورەی لەسەربوو كە سەربازە نوخبەكانی سەددام حەزیان لێی بوو. زۆر گرژ بوو. دەموچاوی بۆ پەنجەرەی ئۆتۆمبێلەكەمان دابەزاند و بە گومانەوە سەیری كردین.

گوتی: سڵاوتان لێ بێت. تۆ كێیت و لێرە چی دەكەیت؟

ئاماژەم بە ئاراستەیماڵەكەمان كرد و گوتم: ماڵەكەمان لێرە لەم گەڕەكەدایە.

- بەڕای تۆ كارێكی ژیرانەیە ئەگەر لە ناوچەكەدا بمێنمەوە؟

ئەفسەرە گەنجەكە وتی: "ئەوە هەڵبژاردەی خۆتە، بەڵام ئەم گەڕەكە ئێستا هێڵی پێشەوەیە. ئەمریكییەكان زۆر لە نزیكەوەن. خەریكە دادەخرێن و شەڕەكەش نزیكە. بۆیە پێشنیاز دەكەم چۆڵی بكەن".

قسەی ئەفسەرەكە جۆرێك بوو، سەرنجی ڕاكێشام كە ڕەنگە دواكاتی شكست بۆ ئەفسەرە عێراقییەكان بەیانی بێت. ڕۆژێك پێشتر دانانان بەم كارەدا یەكسان بوو بە لە سێدارەدان، بەڵام ئێستا ڕووخساری ئەم ئەفسەرە گەنجە چیرۆكێكی جیاوازی گێڕایەوە. هەرزوو دركم بەوەكرد كە خێزانەكەمان پێویستە بە خێرایی بڕیار بدات.

زەید نزیكەی یەك میل لەسەر ڕێگایەكی تەسك و باریكی ڕێگای خێرایی ئەبوغرێب ئۆتۆمۆبێلی لێخوڕی و بەدوای شوێنێكدا دەگەڕا كە ڕێگاكە فراوانتر بێت و بتوانین بگەڕێینەوە.

کاتێك لە شوێنێك نزیك بووینەوە، بینیمان دوكەڵ لە ڕێگای خێرا لە سەرەوە بەرز بووەوە. پاشان هەرلەوێوە تانكێكی ئەمریكیمان بینی كە دوكەڵی لێدەهات و دیار بوو لەكاتی شەڕدا و هەر ئێستا لێیدراوە. ئەگەرچی من نەمدەتوانی هیچ سەربازێكی ئەمریكی ببینم، بەڵام تێگەیشتم كە ئێمە بەڕاستی لە هێڵی پێشەوەی شەڕەكەداین.

من بە زەیدم وت: "با بگەڕێینەوەماڵەوە". ئەویش ئۆتۆمۆبێلەكەی سوڕاندەوە.

لەكاتێكدا زەید دوو تەڵقە سوكانەكەی سوڕاندەوە، گوێم لە چەندین دەنگ بوو لە دەرەوەی ئۆتۆمبێلەكەمان، دواتر دەستڕێژی تەقە بەدوای یەك. ئەوەبوو ئێمە كەوتینە ژێر هێرشی قەناس بەدەستی چەكدارانی ئەمریكی.

هەردووكمان سەرمان بەرەو داشبۆردەكە نزمكرد و زەید پێی لە بەنزینەكە نا و ئەوەبوو خێراتر بە درێژایی ڕێگای لاوەكیدا ڕۆیشتین. گوێمان لە دەنگی فیشەك بوو كە بەر ئۆتۆمبێلەكەمان كەوت. دوای چەند خولەكێك، كاتێك گەیشتینە ماڵەوە، بازمان دا و لەیلا و كچەكانمان بەستەوە سەر كورسی پشتەوە و بەپەلە بڕیارمان دا بە ئۆتۆمبێل بەرەو ماڵی كچە گەورەكەم، ئیسرا بڕۆین كە نزیكەی پانزە خولەك لە ناوچەی یەرموك دووربوو لە باشووری بەغدا.

هەركە گەیشتینە ماڵی كچەكەم، هەستمان بە كەمێك سەلامەتی كرد. ئەحمەد -زاواكەم- وتی شەوی پێشتر بۆمبەكانی ئەمریكا بە

شێوەیەكی مەترسیدار لە نزیك ماڵەكەیانەوە دەنگیان هاتووە. كەل و پەلی ماڵەكەمان بەشێوەی بازنە لە ژووری میواندا ڕێكخستبوو لە ئەگەری ئەوەی پەنجەرەكان یان دیوارەكان بتەقن، بەربەستێكی پاراستنمان بۆ نۆ كەس دروستكرد، لەنێویشیندا بۆ هەردوو نەوەكانم كە كچەكەیان پێنج ساڵان و كوڕەكەش سێ ساڵان بوون. هەموو پەنجەرەكانمان بە تێپ و بەنیشانەی X بەستەوە، چەند پەنجەرەیەكمان بە كراوەیی هێشتەوە بۆ ئەوەی ڕێگری لە پەستان بكەین و بەمەش نەتەقنەوە، ئەمەش كاتێك ڕوودەدات كە شەپۆلێكی بەهێزی تەقینەوە ڕوو لە شوێنێكی داخراودا دەكات و لەئەنجامدا پەنجەرەكان و كەل و پەلەكان و خەڵكیش فڕێدەدات بە دەوری ژوورەكەدا. دەنگی تۆپبارانە دوورەكان نزیكتر بوونەوە، تا كەڕبوون مووشەكەكان دەنگیان بەرز بوو. ئێمە بە حیساب خۆمان لە مەیدانی شەڕێك بەدوور گرتبوو كەچی خۆمان لە ناوەڕاستی مەیدانێكی دیكەدا بینینەوە.

لە ناوەڕاستی ژووری میوانەكەدا كۆبووینەوە، لە كاتێكدا سەربازانی ئەمریكا و عێراق لە دەوری كۆشكی سەرۆكایەتی لە نزیكەوە شەڕیان دەكرد. بۆنی تیژی باروت و باڵەخانە سووتاوەكان لووتی ئیمە پڕكردبوو و ناوەوەی دەممان پۆشیبوو. بۆ كەسێكی وەك من ئەو بۆنە بۆ هەمیشە بە تامی شەڕ دادەنێم. خەریك بوو دڵم دەتەقی كاتێك ترسی سەر ڕووخساری خێزانەكەمم دەبینی، و نەوەكانم بەبێ وەستان دەگریان. منیش بەردەوام بە چرپە پێم دەگوتن: "خەمتان نەبێت ئازیزان، بۆمبەكان

ئامانجیان سەربازەکانە نەك ئێمە. ئێمە سەلامەت دەبین". بەڵام من بە هیچ شێوەیەك دڵنیا نەبووم. هەمووومان چەند بەهێمنی دوعامان دەکرد و دەلالاینەوە تاوەکو ڕزگارمان بێت.

درەنگانی بەیانی، بۆ ماوەی نزیکەی نیو کاتژمێرێك بۆردومانەکە وەستا، هەرچەندە لە مەودای ناوەڕاستدا گوێم لە تەقەی دەمانچە و گوللەی تانکەکان بوو. پێم وابوو ڕەنگە ڕەوشەکە دواجار کۆتایی هاتبێت و ڕزگارمان بووبێت. بە نەوەکانم -کە هێشتا بیجامەکەیان لە شەوی پێشووەوە لەبەردا بوو- وت: هەوڵبدەن لە باوەشماندا بخەون، بەو هیوایەی کە ئەمە یارمەتیان بدات هەست بە سەلامەتی بکەن و لەو کابوسانە دەربازیان بێت کە دەورمانی تەنیوە. پاشان وەك بڵێی هەوا بتەقێتەوە بەجۆرێك لە جۆرەکان، چوون لەهەموو لایەکەوە بووە تۆپباران و دەنگە دەنگی گەورە. فڕۆکە جەنگییەکان گڕڕەیان دەهات بەسەر گەڕەکەکەماندا و بۆمبیان فڕێدا و دیوارەکانیان دەهەژاند. دواتر گوێم لە دەنگێك بوو کە خەریك بوو گیانم لەگەڵیدا بتەزێت: دەنگی سەربازە عێراقییەکان کە لە شەقامەکانی باشووری ماڵی کچەکەمدا هاواریان دەکرد بۆ یەکتر. بەڕاستی ئێمە لە ناوەڕاستی شەڕەکەدا بووین. پاشان گوێمان لە دەنگی بزوێنەری ئۆتۆمبێلی سەربازی و هاوارکردنی زیاتر بوو.

دەنگی گرمە گرم و شکانی پەنجەرەکانمان لە هەمان کاتدا بوو. ڕەنگە بۆ چەند چرکەیەك هۆشم لەدەستدابێت پێش ئەوەی موشەکێکی دیکە لە باخچەی خانووی دراوسێکەماندا بکەوێتە

خوارەوە و وەك بوومەلەرزەیەكی یەك چركەیی لە زەویەوە بمان لەرزێنێت. چەند ساتێك دواتر تەقینەوەی سێیەم، ئەودیوی ماڵەكەی هەژاند. بە هاوارەوە بازم دا: "زەید، ئەحمەد، هەموومان! با بڕۆین، با بڕۆین! " دڵنیا بووم كە ئەگەر لە ژووری مێوانەكە نەجووڵێین ئەوا دەمرین. ژنەكان هاواریان دەكرد. كاتێك نەوەكانمان هەڵگرت و ڕامانكرد بۆ دیوی پشتەوە. تێبینیم كرد هیچ كام لە نەوەكان ناگرین. بەڵكو ئەوان دەمیان لێك كراوە بوو، و لە حاڵەتی شۆك دابوون.

ئێمە بە پەلە چووینە ناو دوو ئۆتۆمبێلەكەمانەوە. ئەوەبوو پێشبڕكێمان دەكرد، بەڵام وا دیار بوو كات خاو بووەوە وەك ئەوەی لە خەونێكی ترسناكدا گیرم خواردبێت. لەكاتێكدا چووینە سەر شەقامەكە، كە بەرەو ناوەندی شارۆچكەكە دەڕۆیشت، بەلای سەربازێكی عێراقیدا ڕەت بووین كە لەسەر زەوی كەوتبوو؛ جەستەی لە نیوەی بڕابوویەوە، قاچەكانی لە نزیك بەشی سەرەوەی پەرش و بڵاو بوون. چاوەكانی كراوە بوون. قۆڵێك لە جەستەی نەمابوو، بەڵام قۆڵەكەی تر وا دیار بوو دەستی بۆ ئێمە درێژ دەكرد. ئێستاش ناتوانم وێنەكە لە مێشكم دەربهێنم. هەندێك جار شەوان خەیاڵم دەڕواتەوە بۆ ئەو سەربازە. كاتێك لە جامی ئۆتۆمبێلەكەمانەوە سەیریان دەكات، دەبینم لێوەكانی دەجووڵێن و وشەكانی "یارمەتیم بدەن" پێكدەهێنن. هیوادارم ئەمە تەنها خەیاڵی یادەوریم بێت و هیچی تر.

دڵم خەبەری دابوو كە نابێت جارێكی تر بچینەوە ماڵەوە. بە

زەیدم گوت بەرەو ماڵی عەلی زاوام بڕۆ، ئەودیوی شار لە باكووری ڕۆژهەڵاتی بەغدا. ئێمە بە خێرایی بەرەو باكوور بە شەقامی دیمەشقدا تێپەڕین و لەبەردەم تاوەری سەددامی بۆردومانكراودا ڕەت بووین. گرمە گرمی ئاسمان بەردەوام بوو، وەك جۆرێكی نوێی زریانی ڕەشەبا كە شەپۆلی تەزووی مێشك دەنێرێتە دەرەوە. ترسم لەوە هەبوو كە لەنێو شەقامەكەدا تیابچین. زەید لە نێوان ئۆتۆمبێلە جێهێڵراوەكانی عێراق و ئۆتۆمبێلە سەربازییەكاندا دەڕۆیشت و ئەم لاو ئەو لای دەكرد. لەلایەكی تریش بەردەوام چاوم لەپشتەوە دەكرد تاوەكو دڵنیابیمەوە لەوەی كە زاواكەم و كچەكەم و نەوەكانم هێشتا بە تویۆتاكەیان لە پشتمانەوە لێدەخوڕن. ژنەكەم و كچە بچووكەكانم بەبێ دەربڕینی هیچ وشەیەك لە كورسی دواوە دەستیان بە یەكترەوە گرتبوو. منیش دەستم بردە دواوە و دەستم گرتن.

كاتێك گەیشتینە پردی ئەلئەحرار بەسەر ڕووباری دیجلەدا، شەقامێكی ترم لە پێشمانەوە بینی، ئەوەبوو خۆمان لەنێو قەرەباڵغیەكی تری بچووكی هاتوچۆی بەغدادیەكان بینیەوە كە بەرەو ڕۆژهەڵات هەڵدەهاتن. پاسەوانی كۆمارییەكان لە هەر دوو لای پردەكەدا خاڵی پشكنینیان دانابوو و خەڵكی مەدەنیان ناچار دەكرد بچنە سەر شۆستەكە. لە دەرگای چوونە ژوورەوەی پردەكەدا، دوو سەربازی گەنج بەزەحمەت سەرنجیان داین. ئەوان ترساو دەردەكەوتن و دركم بەوەكرد كە ئەوانە لە ژێر هەڕەشەی كوشتن لەلایەن فەرماندەكانیانەوە ناچار كراون لەوێ بن. هیوادار بووم بتوانن هەڵبێن.

کە گەیشتین زاواکەی ترم بەپەلە هاتە لامان و باوەشی پێداکردین. "سوپاس بۆ خودا!" بەگریانەوە وای گوت. — من خەریك بوو تەواو باوەڕ بەوە بکەم کە هەمووتان کوژراون!

لە کاتێکدا سەربازە ئەمریکییەکان شەڕیان دەکرد بۆ پێشڕەوی بۆناو بەغدا، ئەوەبوو ئێمە چەند کاتژمێرێك لە ماڵەکەیداماینەوە. ژەمی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد، هێندە گۆشتی قوتوو و برنج و پەتاتەمان خوارد، بەجۆرێك هەموومان بێزاربووین. براکەم یەکێك لەو چەند مەڕانەی کە مابوونەوە سەربڕی و ژنەکان دەستیان کرد بە دروستکردنی پاچەی عێراقی: مەرەگەییەك لە نان و گۆشت و بەهارات کە بە تیشریب و برنجی سپی و سوور ناسراوە. وەك ئاهەنگێکی خنجیلانەی لێهات، بەڵام ئاهەنگە بچووکەکەمان زۆری نەخایاند، کاتێك دەنگی ترسناکی بۆمب و تۆپخانەکان دەستی کرد بە نزیکبوونەوە لە ماڵی عەلی بە هەمان شێوە و کورسییەکانی ژێر ئێمە دەستیان کرد بە لەرزین. لە ترسی ئەوەی لە ناوچەی شەڕی سێیەمدا گیر بخۆین، هەرزوو بڕیارم دا.

ئەگەرچی من دڵنیا نەبووم کە ئەمە هەنگاوێکی دروستە یان نا بۆ سەلامەتیمان، بەڵام ڕامگەیاند: "دەگەڕێینەوە بۆ ماڵی ئیسرا". لەگەڵ ئەوەشدا ئەم شوێنەش وەکو هەموو شوێنەکانی بەغدا نائارام دەردەکەوت. بەڵام بە جۆرێك لەجۆرەکان من لام وابوو کە بەڕێگاوە ڕۆیشتن سەلامەترە. ئەوەبوو دیسانەوە دەستمان بە گەشتێکی تر کرد لەنێو جەنگدا. کاتێك بە شەقامە لاوەکییەکاندا ڕەت دەبووین بۆ ئەوەی بگەینە ماڵی کچەکەم، بۆردومانەکە کەمتر دەهاتە بەرچاو.

وەك هەر خێزانێك کە پێشبینی کارەسات دەکات، ئێمەش پێداویستییەکانمان کۆکردبووەوە. ئیسرا و ئەحمەد مۆلیدەیان هەبوو، من و زەیدیش بەم دواییە دیشێکی مانگی دەستکردمان لەسەر سەقفەکەیان دانابوو. بە درێژایی شەو سەیری گرتە ڤیدیۆییە ڕاستەوخۆکانمان دەکرد کە لەلایەن بی بی سی و ئەلجەزیرە پەخش دەکران سەبارەت بەو لەشکرکێشییەی کە لە دەوروبەرمان ڕوویدەدا. شەڕەکە هێشتا زەویەکەی دەهەژاند، هەرچەندە تا ئەوکات چەندین کیلۆمەتر لە دوورییەوە بوو. دواجار بەیانی زوو هەندێك لە خێزانەکەمان خەویان لێکەوت، بەڵام من بەدیار دیمەنەکانی کەوتنی شارەکەمانەوە دانیشتم.

دوای بەرەبەیانی ٩ی نیسان، کە دەنگی شەڕێکی سەخت هێشتا لە بەغدا دەهات، وێنەی تانکە ئەمریکییەکانمان بینی لەسەر پردەکانی باشووری شارەکە بەسەر ڕووباری دیجلەدا. ئەو نیوەڕۆیە شتێکمان بینی کە هەرگیز بەخەیاڵمان دا نەدەهات. ئەویش ئەوەبوو کە هەزاران هاوڕێی بەغدادیمان ڕوویان لە گۆڕەپانی بەناوبانگی فیردەوس کرد. زۆرێك لەوانە لەنێو هوتاف دا چەکوش و ئامرازی تریان بەکاردەهێنا بۆ ئەوەی لە بنی پەیکەرەکە سەددام بدەن. بەرامبەر تەلەفزیۆنەکە دانیشتین و دەستمان لە دەممانەوە گرتبوو و باوەڕمان نەدەکرد بەوەی کە ڕووی دەدا.

ئەحمەد وتی: سەیری ئەوە بکەن. "وا خەریکە پێیەکانی پەیکەرەکە دەبڕن، هیچ پۆلیسێك ڕێگرییان لێناکات!"

كە گەیشتین زاواكەی ترم بەپەلە هاتە لامان و باوەشی پێداكردین. "سوپاس بۆ خودا!" بەگریانەوە وای گوت. — من خەریك بوو تەواو باوەڕ بەوە بكەم كە هەمووتان كوژراون!

لە كاتێكدا سەربازە ئەمریكییەكان شەڕیان دەكرد بۆ پێشڕەوی بۆناو بەغدا، ئەوەبوو ئێمە چەند كاتژمێرێك لەماڵەكەیدا ماینەوە. ژەمی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد، هێندە گۆشتی قوتوو و برنج و پەتاتەمان خوارد، بەجۆرێك هەموومان بێزاربووین. براكەم یەكێك لەو چەند مەڕانەی كە مابوونەوە سەربڕی و ژنەكان دەستیان كرد بە دروستكردنی پاچەی عێراقی: مەرەگەییەك لە نان و گۆشت و بەهارات كە بە تیشریب و برنجی سپی و سوور ناسراوە. وەك ئاهەنگێكی خنجیلانەی لێهات، بەڵام ئاهەنگە بچووكەكەمان زۆری نەخایاند، كاتێك دەنگی ترسناكی بۆمب و تۆپخانەكان دەستی كرد بە نزیكبوونەوە لە ماڵی عەلی بە هەمان شێوە و كورسییەكانی ژێر ئێمە دەستیان كرد بە لەرزین. لە ترسی ئەوەی لە ناوچەی شەڕی سێیەمدا گیر بخۆین، هەرزوو بڕیارم دا.

ئەگەرچی من دڵنیا نەبووم كە ئەمە هەنگاوێكی دروستە یان نا بۆ سەلامەتیمان، بەڵام ڕامگەیاند: "دەگەڕێینەوە بۆ ماڵی ئیسرا". لەگەڵ ئەوەشدا ئەم شوێنەش وەكو هەموو شوێنەكانی بەغدا نائارام دەردەكەوت. بەڵام بە جۆرێك لەجۆرەكان من لام وابوو كە بەڕێگاوە ڕۆیشتن سەلامەترە. ئەوەبوو دیسانەوە دەستمان بە گەشتێكی تر كرد لەنێو جەنگدا. كاتێك بە شەقامە لاوەكییەكاندا ڕەت دەبووین بۆ ئەوەی بگەینە ماڵی كچەكەم، بۆردومانەكە كەمتر دەهاتە بەرچاو.

وەك هەر خێزانێك كە پێشبینی كارەسات دەكات، ئێمەش پێداویستییەكانمان كۆكردبووەوە. ئیسرا و ئەحمەد مۆلیدەیان هەبوو، من و زەیدیش بەم دواییە دیشێكی مانگی دەستكردمان لەسەر سەقفەكەیان دانابوو. بە درێژایی شەو سەیری گرتە ڤیدیۆییە ڕاستەوخۆكانمان دەكرد كە لەلایەن بی بی سی و ئەلجەزیرە پەخش دەكران سەبارەت بەو لەشكركێشییەی كە لە دەوروبەرمان ڕوویدەدا. شەڕەكە هێشتا زەویەكەی دەهەژاند، هەرچەندە تا ئەوكات چەندین كیلۆمەتر لە دوورییەوە بوو. دواجار بەیانی زوو هەندێك لە خێزانەكەمان خەویان لێكەوت، بەڵام من بەدیار دیمەنەكانی كەوتنی شارەكەمانەوە دانیشتم.

دوای بەرەبەیانی ٩ی نیسان، كە دەنگی شەڕێكی سەخت هێشتا لە بەغدا دەهات، وێنەی تانكە ئەمریكییەكانمان بینی لەسەر پردەكانی باشووری شارەكە بەسەر ڕووباری دیجلەدا. ئەو نیوەڕۆیە شتێكمان بینی كە هەرگیز بەخەیاڵمان دا نەدەهات. ئەویش ئەوەبوو كە هەزاران هاوڕێی بەغدادیمان ڕوویان لە گۆڕەپانی بەناوبانگی فیردەوس كرد. زۆرێك لەوانە لەنێو هوتاف دا چەكوش و ئامرازی تریان بەكاردەهێنا بۆ ئەوەی لە بنی پەیكەرەی سەددام بدەن. بەرامبەر تەلەفزیۆنەكە دانیشتین و دەستمان لە دەممانەوە گرتبوو و باوەڕمان نەدەكرد بەوەی كە ڕووی دەدا.

ئەحمەد وتی: سەیری ئەوە بكەن. "وا خەریكە پێیەكانی پەیكەرەكە دەبڕن، هیچ پۆلیسێك ڕێگرییان لێناكات!"

ئەمە وێنەیەك بوو كە دەمزانی لە سەرانسەری جیهاندا سەیری دەكرێت. زرێپۆشێكی ئەمریكی -هەڵگری سەربازەكان- ڕۆیشت بۆ ناو گۆڕەپانەكە بۆ ئەوەی یارمەتیان بدات، لەڕێگەی زنجیرێكەوە كە بە ملی سەددامەوە بەسترابوو، هەوڵیدا پەیكەرەكە ڕابكێشن.

ژنەكەم هەناسەیەكی هەڵكێشا و گوتی: "پەیكەرەكە كەوت".

پەیكەری سەددام ڕووی بەرەو پێشەوە كەوتە سەر زەوی و لە یەك كاتدا عێراقییەكان بە دار و پێڵاوەكانیان و هەر شتێكی دیكە كە دەیاندۆزینەوە، كەوتنە سەری و لێیان دەدا. باوەڕم بە چاوەكانم نەدەكرد. وەك ئەوە وابوو كە من سەیری مردنی خودی ستەمكارەكە بكەم. ئەو پیاوە كەوتە خوارەوە كە زیاتر لە بیست ساڵە من و هاوڕێ زاناكانم لە ڕووی جەستەیی و دەروونییەوە لەسەر تارێك لە دەوری پەنجەی خۆی و خێزانەكەمی لە ژێر سێبەری ترسدا هێشتبووەوە. ئەو پیاوە كەوتە خوارەوە كە ساڵانێك پێشتر هەوڵمدا یۆرانیۆمی پیتێنراوی پێویست بۆ بەرهەمهێنانی چەكی ئەتۆمی بەرهەمبهێنم. لەوێدا پەیكەری پیاوێك كەوت كە ترسی بەكارهێنا بۆ ئەوەی زاناكان درۆ بكەن و فریو بخۆن. پەیكەرەكە بە ملیەوە ڕاكێشرا خوارەوە.

ستەمكار هەموو لایەنەكانی ڕەفتاری ڕەعیەتەكانی بە دەسەڵاتەكەی خۆیدا دەچەمێنێتەوە. من و خێزانەكەم لە خراپترینی كەس ڕزگارمان بووبوو. ئێمە لەسەر زەوییەك ژیاوین كە پڕبوو لە ترس، لەبەر ئەوەی پێش ئەوەی زۆربەی منداڵەكانم تەنانەت

لەدایك ببن مەحكووم بوون بەم ژیانە. سەددام بە واتایەكی ڕەسەن حوكمی ژیانی ئێمەی كردبوو. لەو چركەساتەدا ئەو ترسەی كە من و خێزانەكەم بەسەریدا تێپەڕین، نەما و لە هەندێك ڕووەوە بیرم كردەوە كە ڕەنگە هەرگیز نەمێنێت، بەڵام بیركردنەوەكەم كەمێك خاوبویەوە. وا دیار بوو كەوتنی ئەو تەنها یەك پەیكەرە هەستێكی ئازادی بە من بەخشی. هەرچەندە هێشتا شەڕەكە هەر توند و نادیار بوو، بەڵام بە ئاشكرا چەپڵەمان لێدەدا و باوەشمان بە یەكتردا گرت. بە هەستێك كە جێگای باوەڕ نەبوو سەیری یەكترمان دەكرد، سەرمان لەقاند و پێدەكەنین و واهەستمان دەكرد كە ڕەنگە كابوسێكی درێژخایەن خەریكە كۆتایی پێبێت.

ڕۆژی دواتر، كاتێك بە سەرسوڕمانەوە سەیری بۆمبی ئەمریكیم دەكرد لە باخچەكەماندا، خۆشحاڵیەكەم نەما. ئاڕاستەی مێشكم ڕووی لە نهێنییە ئەتۆمییەكان كرد، كە چەند پێیەك لەو شوێنەی لێیەوە وەستابووم حەشاردرابوون. ئەوان گرنگییەكی سەرەكییان دەبێت بۆ هەموو ئەو كەسانەی كە بەرژەوەندییان هەیە لەوەی كە بەرنامەكانی عێراق بووە بەهۆی پەرەپێدانی چەكی كۆمەڵكوژ. دەمتوانی زۆر مەترسی لە پێشم و دەرئەنجامە ئەگەرییەكان ببینم، كە هێشتا هیچیان بە تەواوی لە مێشكمدا دروست نەبوون. وەك ئەوە وابوو بەڵگەنامەكان و پێكهاتەكان وەك بۆمبێكی كاتی لە ژێر خاكەكەدابن. تەنیا یەك شت ڕوون بوو: ئەوەی من لەگەڵ نهێنییەكانی سەنتەرفیوجی عێراقدا كردوومە، بە ئەگەرێكی زۆرەوە چارەنووسی من و خێزانەكەم بۆ هەمیشە دیاری دەكات.

بەڵام یەكەم بابەتی كارنامەكەم ئەوە بوو كە بۆمبە ئەمریكیە نەتەقیوەكە لە باخچەكەمان دەربهێنم، بۆ ئەوەی خێزانەكەم بتوانن بگەڕێنەوە ماڵەوە. زیاتر لە هەفتەیەك دوای ئەوەی دۆزیمەتەوە، چەندین جار هەوڵمدا سەربازانی ئەمریكی بدۆزمەوە بۆ ئەوەی بیبەنەوە. سەرەتا هەستم بە دەمارگیری دەكرد لە بیرۆكەی قسەكردن لەگەڵیان. بە پێ ڕۆیشتمە دەرەوە بۆ ڕێگای سەرەكی نزیك ماڵەكەمان، كە لە تەنیشت ئەو ڕێگایە گەورەیەدایە كە بەرەو ڕۆژئاوا بەناو بیابانەكەدا دەڕوات بۆ ئوردن. تانكێكی ئابرامازی ئەمریكی لەجۆری ئێم وەن لەسەر ئۆڤەرپاسەكە وەك پاسەوانی وەستابوو، كە چەند ڕۆژێك پێشتر شەڕێكی سەختی لەگەڵ چەكدارانی فیدایی سەددام و پاسەوانی گاردی كۆماری ئەنجامدابوو. ئەوان یەكەم سەربازی ئەمریكی بوون كە بینیبووم. ئەوان تا ڕادەیەك گەنج دەردەكەوتن و تا ڕادەیەكیش لە حیرەتدا مابووم چوون كاتێك هوتافیان دەدا و تاوەكو وەڵامی ئەو جەماوەرە عێراقییانە بدەنەوە كە لە دەوری تانكیەكەیان كۆبوونەتەوە و شتگەلی وەكو "سڵاو بەڕێز! سەددام خراپە. سوپاس!"یان دەگوت.

لە تانكەكە نزیك بوومەوە و لە نێو خەڵكەكەدا چاوەڕێم كرد تا یەكێك لە سەربازەكان سەرنجی دام. پاشان بانگم كرد، هەوڵمدا دەنگێكی بێ خەوش و ئارامم هەبێت.

گوتم: هیوادارم چێژ لە كەش و هەوای خۆشی عێراقمان وەربگرن. "ڕەنگە كەمێك گەرم بێت بۆ تۆ، وایە؟"

ئەو بە بینینی پیاوێکی عێراقی کە بە ئینگلیزییەکی ڕەوان قسەی دەکرد، سەری سوڕما.

- "لە کوێوە هاتوویت؟" پرسیم.

گوتی: "لە ئارکانساسەوە هاتووم، بەڕێز". قسەکانی جۆریك بوون.

گوتم: سەردانی وڵاتە خۆشەویستەکەتم کردووە. - ساڵانێکی زۆر لەمەوبەر، کاتێك خوێندکار بووم لە قوتابخانەی کانەکانی خەڵوزی کۆلۆرادۆ. ئایا بیستووتە؟"

"نەخێر بەڕێز."

گوتم: باشە ئێوە زۆر بەخێربێن بۆ عێراق. — هیواخوازم چاکەیەکم لەگەڵدا بکەن. ئەویش لە حەوشەی ماڵەکەمدا یەکێك لە موشەکە نەتەقیوەکان هەیە. پێت وایە کەسێك هەبێت بتوانێت موشەکەکە پوچەڵ بکاتەوە یان لایبدات؟"

سەربازەکە نیگایەکی ئاسایی لێکردم.

وتی: بەڕێز، فەرمانم پێدراوە کە شوێنەکەم بەجێ نەهێڵم.

ڕێنمایی کردم بۆ کەمپێکی سوپای ئەمریکا لە شوێنێك دروست دەکرا کە نزیکەی یەك میل لە ماڵەکەمەوە دووربوو. زەید لە نزیکەوە وەستا و منیش لە دەروازەکە وەستام بەو هیوایەی کە بە لەبەرکردنی پانتۆڵێك —کە بە ئوتوێك ئوتووکرابوو بە پیل کاری دەکرد و هی خێزانەکەم بوو، لەگەڵ تیشێرتێکی وەرزشی-

جیاواز دەربکەوم لە باقی خەڵکەکە. کاتێك گەنجێکم بینی کە نیشانەی دوو هێڵ لەسەر شانی جلە سەربازییەکەی بوو، دەستم بە قسە کرد.

گوتم: ببورە بەڕێز، دەمەوێت هەواڵی ئەوە بدەم کە مووشەکێك لە حەوشەی ماڵەکەمدا کەوتووە و نەتەقیتەوە. تکایە لەگەڵ کێ قسە بکەم؟

گوتی: "دواتر وەرەوە". "ئێمە تازە لێرە بارگەمان داناوە."

ڕۆژی دواتر گەڕامەوە و لە دەروازەکە پێیان وتم لەگەڵ لیوا کۆپلی قسە بکەم. سێ کاتژمێر چاوەڕێم کرد و کاتێك کۆپلی هات، دیار بوو سەرقاڵ بوو، داوای لێکردم ڕۆژی دواتر چاوم پێی بکەوێت.

- لە چ کاتێکدا بێم؟ پرسیم. وتی: نزیکی کاتژمێر سێ.

ڕۆژی دواتر کاتژمێر سێ گەیشتمە لایی و لە پۆلیسێکی گەنج نزیك بوومەوە کە دەروازەکەی بەڕێوەدەبرد.

"لێرە مەوەستە!" ئەو هاواری کرد.

گوتم: بەڵام کۆبوونەوەیەکم لەگەڵ لیوا کۆپلی هەیە. "بابەتەکە پەیوەندی بە مووشەکێکی نەتەقیوە هەیە."

"دەرەوە!" هاوارێکی کرد و ئیشارەتی بۆ کردم کە خۆم دوور بخەمەوە. سەرم سوڕما لە شێوازی قسە کردنەکەی. هەر لەو کاتەدا دەروازەکە کرایەوە و کاروانێکی ئۆتۆمبێلی سەربازی لە

شەقامەکەوە هاتنە ناو کەمپەکە و بڕێکی زۆری تۆز و خۆڵ بەسەر من و زەیددا کەوت.

- بڕۆ دواوە! پۆلیسەکە هاوارێکی کرد، بەڵام زۆر درەنگ بوو بۆ ئەوەی جلە تازە شۆردراوەکانم لە تۆز و خۆڵەکە ڕزگار بکەم.

دوای چەند ڕۆژێك وەستام بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ یەکەیەکی سوپاکە بکەم کە لە کەناری ڕێگایەك لە گەڕەکەکەمان وەستابوو. دڵخۆش بووم کاتێك سەربازەکان پێیان وتم ئەندازیارن. فەرماندەیی ئەوان، ناوی کاپتن باتلەر بوو، گەنجێکی قۆز و ئەفریقی-ئەمریکی بوو و هەڵسوکەوتەکەی دۆستانە بوو.

پرسیم: وەك ئەندازیارەکان لێرە لە عێراق چ جۆرە کارێك دەکەن؟.

وتی: "لە ئێستادا، ئێمە زیاتر تەقەمەنی نەتەقینەوە پوچەڵدەکەینەوە." "بەڵام هەر کە ئەم ئەرکە تەواو بوو پرۆژەی ناوەدانکردنەوە ئەنجام دەدەین. ئەرکی ئێمە ئەوەیە هەوڵ بدەین عێراق ببێتە شوێنێکی باشتر".

هەر لەو ساتەوەی کە کاپتن باتلەرم ناسی، کەسایەتی ئەوم بەدڵ بوو. سلندەرێکی کانزایی پیشاندام و ڕوونیکردەوە کە بەشێکە لە بۆمبێکی کلاستەری ئەمریکی کە یەکەکەی لە گەڕەکەکەدا دۆزیویەتیانەوە. ئەوەبوو دواجار پوچەڵیان کردبوویەوە. کاتێك باسی ئەو بۆمبە نەتەقیوەی ناو باخچەکەمم بۆ کرد کە سەدان هێندەی قەبارەی بۆمبە کلاستەرەکەی بوو، وا

دیار بوو به‌ڕاستی تووشی شۆك بوو و به‌ڵێنیدا له ماوه‌ی یه‌ك دوو كاتژمێردا بێته ماڵه‌كه‌م.

كاپتن باتله‌ر وه‌ك به‌ڵێنی دابوو، پاش نیوه‌ڕۆی ئه‌و ڕۆژه هات، له‌گه‌ڵ پێنج سه‌رباز له یه‌كه‌ی ئه‌ندازیاره‌كانی. منیش بردمنه ناو باخچه‌كه‌م، كاتێك ڕه‌هه‌نده‌كانی شته‌كه‌ی بینی، فیكه‌یه‌كی لێدا و وتی ده‌بێت ڕۆژی دواتر به بارهه‌ڵگرێكی گه‌وره‌تره‌وه بگه‌ڕێمه‌وه. به‌یانیه‌كه‌ی به بیست سه‌رباز و ئۆتۆمبێلێكی گه‌وره گه‌ڕایه‌وه. منیش بردم بۆ لای ماڵه‌كه‌م و مووشه‌كه‌كه‌م پیشاندا و ئه‌وانیش به جۆرێك سه‌یری یه‌كتریان كرد و پاشان پوچه‌ڵیان كرده‌وه و به وریاییه‌وه ده‌ریانهێنا. فه‌رمانیان پێكردم كه له‌دواوه بوه‌ستم. له كاتێكدا زۆربه‌ی سه‌ربازه‌كان له دواوه وه‌ستابوون و هاواریان له فه‌رمانده‌كه‌یان ده‌كرد كه ئاگاداری بێت، كاپتن باتله‌ر و دوو له پیاوه‌كه‌ی له‌سه‌ر شانیان هه‌ڵیانگرت و بردیان بۆ ئۆتۆمبێلێكی زرێپۆش بۆ ئه‌وه‌ی به عه‌ره‌بانه ببرێنه ده‌ره‌وه بۆئه‌نجامدانی ته‌قینه‌وه‌ی كۆنترۆڵكراو. خه‌ریك بوو وا قه‌ناعه‌ت بكه‌م كه ئه‌گه‌ر مووشه‌كه‌كه له كاتی لێداندا نه‌ته‌قیبێته‌وه، ئه‌وا به‌دووری ده‌زانم ئێستا له‌سه‌ر شانی ئه‌م سه‌ربازه گه‌نجه ئه‌مریكییانه بته‌قێته‌وه. دوای ئه‌وه‌ی مووشه‌كه‌كه‌یان به بارهه‌ڵگره‌كه‌یانه‌وه به‌سته‌وه، كاپتن باتله‌ر گه‌ڕایه‌وه بۆ حه‌وشه‌كه.

گوتم كه شانازی به باخچه‌كه‌مه‌وه ده‌كه‌م، باخچه و دره‌خته میوه به‌نرخه‌كانم پیشانی كاپتن باتله‌ر دا، ئه‌ویش به میهره‌بانییه‌وه سه‌رسامی بوو. چه‌ند پێیه‌ك له دوورییه‌وه، لقه‌كانی دره‌ختی نیلوفه‌ر

سێبەری ئەو شوێنەیان دەكرد كە هێشتا زانیارییە ئەتۆمییەكانی عێراقی تێدا حەشاردرابوون. لە ساڵانی بڕینی گوڵەبەڕۆژەكانم و باخداریكردنم تەنها بە بەكارهێنانی بەرمیلی پلاستیكی لە ژێر پێمدا، جارێكی دیكە سەرسام بووم كە كاتێك ئەم شوێنەم هەڵبژارد ئاگاداری نەبووم. لە قورئاندا نیلوفەر، یان گوڵە شلێر، سنووری نێوان مەعریفەی فانی و خودا نیشان دەدات، سنووری نێوان ئەوەی دەزانرێت و ئەوەی ناتوانرێت بزانرێت. هێمای دوورترین لێواری بەدواداچوونی مرۆڤە، كە لەودیوەوە تەنیا حوكمدانی خودایی هەیە. حەزێكی زۆرم هەبوو كە ئەم چیرۆكە بە كاپتن باتلەر بڵێم. ئەو وەك گەنجێكی بیرمەند و چالاك دەهاتە بەرچاو كە چینە وردەكانی پشت "مانا" بەرز دەنرخێنێت. بەڵام نهێنییەكە زۆر لەوە مەترسیدارتر بوو كە لەم ژینگەیەدا ئاشكرای بكەم. ئەوەبوو كاپتن باتلەرم لە نیلوفەرەكە دوور خستەوە بۆ لێواری چەمەكە، بردم بۆلای ئەو شتە خۆڵەمێشی و شێوە گۆچكەیە هاتبووە سەر چیمەنی دیكۆندراكە.

شتەكەم هەڵگرت و گوتم: باوەڕم وایە ڕەنگە ئەمە فیوزی بۆمبەكە بێت. لێوارەكەیشم پیشانی دا و وتم كە ئەم پارچەیە لە بەشی پێشەوەی مووشەكەكەدا بووە بەڵام لە كاتی لێدانەكەدا لەجێی خۆی لەق بووە و كەوتۆتە شوێنی ئێستای.

"فیوزەكانی مووشەكەكانتان بە شێوەیەكی ئاسایی لە كۆتایی پێشەوەن، ئایا ئەوە ڕاستە؟" پرسیم. "ڕەنگە ئەمە هۆكارێك بێت بۆ ئەوەی بۆمبەكە نەیتوانیوە بتەقێتەوە."

كاپتن باتله‌ر ڕازی بوو كه ئه‌مه ڕوونكردنه‌وه‌یه‌كی ئه‌گه‌ری بێت، به‌ڵام نیگایه‌كی سه‌یر و سه‌مه‌ره‌ی پێدام.

- چۆن هه‌موو ئه‌مانه ده‌زانیت؟ به هه‌ستێك سه‌یری كردم كه جێگای باوه‌ڕ نه‌بوو.

شانم هه‌ڵكێشا، ده‌مزانی كه قسه‌ی زیاتر ده‌توانێت پرسیاری نائاساییتر هه‌ڵبگرێت.

به‌بێ ئه‌وه‌ی ورده‌كاری زیاتر بخه‌مه‌ڕوو، گوتم: "منیش هه‌ر وه‌ك تۆ ئه‌ندازیارم."

# بەشی دووەم
# هیواكانی سەرەتا

بێگومان من هەر تەنها ئەندازیارێكی وەك كاپتن باتلەر نەبووم. بەڵكو دركم بەوەدەكرد كە بەهۆی پێگەی خۆمانەوە لەناو سیستەمی سەربازیدا، ئێمە خۆشەویستییەكی هاوبەشمان بۆ زانست هەیە، هەروەها هەردووكمان پابەند بووین بە جێبەجێكردنی فەرمانەكان. بەڵام بەراوردكردنەكە كەم تا زۆر لەوێ كۆتایی هات. كاپتن باتلەر هەرگیز تێنەدەگەیشت كە ژیان لە ژێر نهێنییە گەورەكاندا چۆنە، چوون ئەو هەوڵدەدات شتە بێ ماناكان لە وادەی خۆی جێبەجێ بكات و پابەند بێت بە جێبەجێكردنیان و وەگەرنا هەڕەشەی لەسەر دەبێت. بەڵام لانی كەم هیوای ئەوەم دەخواست كە نەیكات، هیچ نەبێت لە پێناو ئەودا.

بەڵام كاتێك سەیری چاوەكانی كاپتن باتلەرم كرد، شتێكی ئاشنام بینی كە لەسەردەمی لەبیركراوی گەنجێتیم هەبوو، ئەویش: پریشكێكی ئایدیالیزم كە لەناو ئەو گەنجانەدا دەدرەوشێتەوە كە بڕیاریان داوە جیهان بكەنە شوێنێكی باشتر. من خۆم بە ئاواتێكی بەرزەوە گەورە بووبووم، بۆ ئەوەی یارمەتی وڵاتەكەم بدەم بۆ پێشكەوتن و سەرفرازی، بۆ بەرژەوەندی گەلی عێراق. وەك گەنجێك هەرگیز خەونم نەبینیوە كە چارەنووسم پەرەپێدانی چەكی ئەتۆمی بێت بۆ دیكتاتۆرێكی مەترسیدار.

من له ساڵی ١٩٤٤ له دایك و باوكێكی چینی ناوه‌ند له‌دایك بووم، كه سه‌ر به‌هه‌ردوو مه‌زهه‌بی شیعه و سوننه بوون له كێڵگه‌یه‌ك له ناوچه‌ی گوندنشینی زه‌عفه‌رانییه، نزیكه‌ی ده میل له باشووری به‌غداوه دووره. زه‌ویه‌كه‌ی ئێمه پارچه زه‌وییه‌كی قه‌باره مامناوه‌ند بوو كه ڕووبه‌ره‌كه‌ی نزیكه‌ی یه‌ك میل چوارگۆشه بوو، به دره‌ختی پرته‌قاڵ و سێوه‌وه ده‌ور درابوو، له نێوان ڕێگایه‌كی تۆزاوی و ڕووباری دیجله‌دا. دایك و باوكم له ڕووی دارایییه‌وه باش بوون، به‌جۆرێك كه خاوه‌نی یه‌كێك له یه‌كه‌م ئۆتۆمبێله‌كانی گونده بچووكه‌كه‌مان بوون، به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ئه‌وه‌نده ده‌وڵه‌مه‌ند نه‌بوون كه گیرۆده‌ی سیاسه‌ت بن وه‌یان گیرۆده‌ی ئه‌و دۆخه پڕ له گێژاوه‌ی پایته‌خت. ساڵانی سه‌ره‌تای ته‌مه‌نم له‌گه‌ڵ هادی برا گه‌وره‌كه‌م و چوار خوشكه بچووكه‌كه‌مدا، ده‌وردراو به كرێكاران و كۆڵبه‌ره وه‌رزییه‌كان، له نێو دره‌ختی میوه‌دا یاریم ده‌كرد. ته‌نانه‌ت ئه‌مڕۆش بۆنی پرته‌قاڵێك ده‌مباته‌وه بۆ منداڵی.

باوكم پیاوێك بوو كه زوو هه‌ڵده‌چوو و هه‌روه‌ها خاوه‌ن ئیراده بوو، فێریكردم كه هه‌میشه كۆڵنه‌ده‌م. ئه‌مه‌ش سیفه‌تێك بوو كه به درێژایی ژیانم له‌گه‌ڵم بوو. له‌باره‌ی ئه‌وه‌وه من هه‌میشه ئه‌و یادگارییه‌م بیردێته‌وه كه ڕۆژێكیان له‌سه‌ر یه‌كێك له په‌یژه‌كان كه‌وته خواره‌وه له باخه‌كه‌ماندا و قۆڵی شكا، ئه‌م ڕووداوه پێش ئه‌وه‌بوو كه ته‌مه‌نم بگاته ته‌مه‌نی چوونه قوتابخانه. ئه‌وه‌بوو دواتر شه‌وه‌كه‌ی پزیشك هاته ماڵه‌كه‌مان و قۆڵی باوكمی له گه‌چ كرد و پێی گوت پشوو بده تا چاك ده‌بێته‌وه. باوكم به‌زه‌حمه‌ت سه‌ری ئه‌رێنی له‌قاند بۆ پێشنیاره‌كه‌ی. به‌یانیه‌كه‌ی باوكم گوێی نه‌دا به ئازاره‌كه و جارێكی دیكه به‌ره‌و باخه‌كان ڕۆیشته‌وه و منیشی

لەگەڵ خۆیدا برد؛ خاكەنازێكی خستبوویەوە سەر شانێكی و قۆڵەكەی تریشی هێشتا لەنێو گەچ دا بوو.

دایكم هەم موسڵمانێكی لەخواترس بوو و هەمیش ژنێك بوو كە باوەڕی بەكۆمەڵێك شتی بێ بنەما و پڕوپووچ هەبوو. ئەو باوەڕی وابوو خەونەكانی باس لە داهاتوو دەكەن و هەموویان دێنە دی، بەتایبەتی كاتێك خەونی بە ئەندامانی خێزانەكەیەوە دەبینی. زۆر جار پێی دەوتم كە ڕۆژێك دادێت دەچمە ئەمریكا، ئەمەش لە كۆتاییدا هاتە دی. جارێك لەگەڵیدا چووم بۆ سەردانی مامم بۆ ئەوەی ئاگاداری بكەمەوە كە خەونی بینیوە كە ڕۆژی دواتر ژیانی لەدەست دەدات مەگەر ئەوەی لەماڵەوە بمێنێتەوە. پێكەنی و گوێی بە قسەكانی نەدا و بەیانیەكەی ماڵەكەی بەجێهێشت. لە ماوەی چەند خولەكێكدا دوای ئەوەی لە دەرگای پێشەوەی ماڵەكەی دەرچوو، لە شەقامەكەدا تەقەی لێكرا و كوژرا. بكوژەكە بۆ هەرگیز نەدۆزرایەوە.

كاتێك تەمەنم سێ ساڵ بوو، كەوتمە ناو كۆگایەكەوە لە باخی پرتەقاڵەكەمان و نزیك بوو بخنكێم. هەندێك لە كرێكارەكان بینیبوویانم كە كەوتوومەتە ژوورەوە و بەپەلە هاتبوون بۆ ئەوەی جەستەی بێهۆشم لە ئاوەكە دەربهێنن. هەرچەندە لە خنكان ڕزگارم بوو، بەڵام زۆر نەخۆش كەوتم. سكم ئاوسا، پزیشكەكان بە دایك و باوكمیان گوت كە جگەرم زیانێكی زۆری بەركەوتووە و پێدەچێت زۆر نەژیم. دوای چەند هەفتەیەك لە هەوڵدان بۆ چارەسەركردن، دواجار بە دایكمیان گوت كە بەردەوامبوونیان لە هێنانی من بۆ نەخۆشخانە هیچ سوودێكی نییە. خێزانەكەم بێ ئومێد بوون و خۆیان بۆ مردنم ئامادەكرد. ئەو شەوە -دایكم دواتر پێی وتم- خەونی بینیوە كە ئامۆزایەكم ڕۆژی دواتر

سەردانمان دەكات و هەواڵی پزیشكێكی مەسیحی لایە كە چارەسەری ژنێكی دراوسێمان دەكات. بەپێی خەونەكەی، ئەم پزیشكە دەتوانێت چارەسەری منیش بكات. بەیانی هەموو شتێك هەر وەك چۆن خەونی پێیەوە بینیبوو، ڕوویدا. ئامۆزاكەمان هات و پزیشكێكی پێشنیار كرد كە جۆرێكی جیاوازی دەرمانی پێدام و لە ماوەی هەفتەیەكدا چاك بوومەوە.

هەرچەندە من زۆر بچووك بووم بۆ ئەوەی بە چاوێكی ڕەخنەگرانە سەیری هێزە پەرجوو ئاساكەی دایكم بكەم، بەڵام دەمزانی كە ئەو تەواو باوەڕی بەم شتانە هەیە و هەستی ڕۆحانییەتی یارمەتیدەر بوو لە دارشتنی منداڵیم. دواتر لە ژیاندا، وەك زانایەك كە خودان بیركردنەوەی پراكتیكی بوو، زۆرجار بە هەستێكی پڕ لە سەرسوڕمانەوە بیرم لە پێشبینییەكانی ئەو دەكردەوە. دایكم پێی وابوو نەخۆشییەكەم بووەتە هۆی ئەوەی ببمە كوڕێكی بێدەنگ و ماندوونەناس. هەروەها چەندین جار پێی وتم كە ئەزموونی نزیك لە مردنم سەلماندی كە خودا ڕزگاری كردووم بۆ هەندێك كاری گرنگ.

لە قۆناغی سەرەتاییدا لەگەڵ كۆمەڵێك خوێندكاری زۆر گەورەتر دەبوو دابنیشم و وانە بخوێنم. مامۆستاكانم سەرنجیان دایە حەز و لێهاتوویی تایبەتی من لە بیركاریدا و تا تەمەنی چواردە ساڵیش ئەوەبوو قوتابخانەیەكی ئامادەیی بەناوبانگتر بۆم پێشنیاركرا لە گەڕەكی كەڕادەی بەغدا. ساڵی دواتر دایك و باوكم یارمەتیان دام لە كڕینی ئۆتۆمبێلێكی كۆنی ڤۆلكس واگن جۆری بیتڵ بۆ ئەوەی لە خانووی كێڵگەكەمانەوە بۆ ناو شارەكە هاتوچۆبكەم. چەندین كاتژمێرم لەگەڵ ئەو ئۆتۆمبێلە كۆنەم بەسەر برد بەناو باخی خورما و لیمۆدا كە بەدرێژایی ڕووباری دیجلە درێژ

ببوونه‌وه، به‌ڵام له‌به‌ر ئه‌وه‌ی سه‌یاره‌كه پێویستی به چاككردنه‌وه‌ی به‌رده‌وام بوو، بۆیه منیش ده‌ستم كرد به گرنگیدان به ئامێره‌كان و چۆنیه‌تی كاركردنیان.

تا گه‌یشتمه قۆناغی ئاماده‌یی، خه‌ریك بوو ئاگاداری ئه‌و گێژاوه ده‌بووم كه له ده‌ره‌وه‌ی سنووری كێڵگه‌ی میوه‌ی خێزانه‌كه‌مان، ساڵانێك بوو ڕوویده‌دا. ده‌یه‌كانی یه‌كه‌می عێراق وه‌ك نه‌ته‌وه‌یه‌كی به‌ردین وابوو. دوای ڕووخانی ده‌وڵه‌تی عوسمانی له جه‌نگی جیهانی یه‌كه‌مدا، سه‌ربازانی به‌ریتانیا ئه‌و ناوچانه‌یان داگیركرد كه عێراقی ئێستایه و حكومه‌تێكی كاتییان دانا كه له له‌نده‌نه‌وه كۆنترۆڵ ده‌كرا. ئه‌مه‌ش لای زۆرێك له عێراقییه‌كان باش نه‌بوو، كه چه‌ندین جار له شه‌قامه‌كاندا ناڕه‌زایه‌تیان ده‌ربڕی. پیاوانی ئایینی و ئۆپۆزسیۆن فه‌توایان له دژی عێراقییه‌كانی به‌شداربوو له حكومه‌تی داگیركه‌ردا ده‌ركرد. له كۆتاییدا له ساڵی ١٩٢٠ یاخیبووانی سوننه و شیعه دۆزی هاوبه‌شیان له دژی ئینگلیزه‌كان ڕاگه‌یاند و له هه‌ڵسانه‌وه‌یه‌كی چه‌كداریدا ڕاپه‌ڕین. سه‌ره‌نجام سه‌ربازانی به‌ریتانیا ڕاپه‌ڕینه‌كه‌یان دامركانده‌وه، به گیانی سه‌دان سه‌ربازی به‌ریتانیا و هه‌زاران عێراقی. هه‌ر زوو دوای ئه‌وه، ئینگلیزه‌كان ده‌سه‌ڵاتێكی پاشایه‌تییان دامه‌زراند بۆ سه‌ركردایه‌تیكردنی حكومه‌تێكی نوێی عێراق، ئه‌وبوو دواجار ئه‌میر فه‌یسه‌ڵ خرایه سه‌ر ته‌ختی پاشایه‌تی. ده‌سه‌ڵاتی پاشایه‌تی به چاكسازی دیموكراسی ده‌ستیپێكرد له هه‌وڵدان بۆ درێژكردنه‌وه‌ی ئازادییه‌كان بۆ ڕۆژنامه‌گه‌ری و لایه‌نه سیاسییه‌كان. به‌ڵام ناڕه‌زایه‌تییه‌كانی عێراقییه‌كان كه حكومه‌تیان وه‌ك به‌كرێگیراوێكی زلهێزه‌كانی خۆرئاوا ده‌بینی كه ته‌نیا به‌رژه‌وه‌ندییان له نه‌وتی عێراقدا هه‌بوو، بووه هۆی سه‌ركوتكردن

و پێكدادانی توندوتیژی له شه‌قامه‌كاندا. ئه‌وه‌بوو ده‌سه‌ڵاتی پاشایه‌تیش زنجیره‌یه‌ك سه‌رۆك وه‌زیرانی توند و به‌هێزی دانا، له‌وانه‌ش به‌هێزترینیان نوری سه‌عید بوو، كه دۆستی تایبه‌تی تۆماس ئێدوارد لۆرانس بوو (لۆرانسی عه‌ره‌ب).

له ١٤ی ته‌ممووزی ١٩٥٨ له قۆناغی ئاماده‌یی له پشووی هاوینه‌دا بووم، كاتێك ڕادیۆ هه‌واڵی كوده‌تایه‌كی خوێناویی په‌خش كرد. شه‌وی پێشتر و به سه‌رسوڕمانی ته‌واوی ده‌سه‌ڵاتی پاشایه‌تی، یه‌كینه‌كانی سوپای عێراق به فه‌رمانده‌یی عه‌قید عه‌بدولسه‌لام عارف و عه‌مید عه‌بدولكه‌ریم قاسم خۆیان خسته ناو به‌غدا و ده‌ستیان به‌سه‌ر هه‌موو بینا و وه‌زاره‌ته گرنگه‌كانی حكومه‌تدا گرت. یه‌كینه‌كانی سوپا كۆشكی شاهانه‌یان گه‌مارۆ دا و بۆردومانیان كرد تا پاسه‌وانی شاهانه خۆیان ڕاده‌ست كرد. له ماوه‌ی چه‌ند خوله‌كێكدا نه‌وه گه‌نجه‌كه‌ی شا فه‌یسه‌ڵی یه‌كه‌می كۆچكردوو و شازاده‌ی جێنشینه‌كه‌ی و باقی بنه‌ماڵه‌ی شاهانه‌یان به چێشتلێنه‌رانی كۆشك و مامۆستا و كارمه‌ندانی دیكه‌وه كۆكرده‌وه و له گۆڕه‌پانی كۆشكه‌كه‌دا ته‌قه‌یان لێكردن. نوری سه‌عید توانی له ماڵه‌كه‌ی خۆی ده‌رباز بكات به جلوبه‌رگی ژنانه‌وه. به‌ڵام به‌یانی ڕۆژی دواتر ناسرایه‌وه و ده‌ستگیر كرا و له شه‌قامه‌كه‌دا له سێداره درا. جه‌ماوه‌رێك به هاندانی كوده‌تاچییه‌كان، ته‌رمه‌كه‌یان له پشت ماتۆڕسكیلێكه‌وه ڕاكێشا، پاشان ئه‌ندامه‌كانیان پارچه پارچه كرد و هه‌ڵیانواسی و نمایشیان پێكرد.

عه‌مید قاسم خۆی كرد به سه‌رۆك وه‌زیران و هه‌رچه‌نده به‌ڵێنی گۆڕانكاری دیموكراسی دا، به‌ڵام له‌گه‌ڵ حكومه‌ته سه‌ربازیه‌كه‌ی درێژه‌یان به ڕێگا سه‌ركوتكه‌ره‌كانی ده‌سه‌ڵاتی پاشایه‌تی دا. قاسم

پارتە سیاسییەكانی قەدەغە دەكرد و زۆرجار یاسای سەربازیی دەسەپاند. ڕووداوەكانی ئەم ساڵانە سێبەری ئەو توندوتیژییە بوون كە لە دەیەكانی داهاتوودا عێراقی تووشی ئازار كرد. لە كاتێكدا عێراقییەكان لە دوای چەندین سەدە لە دەسەڵاتی دەرەكی خەباتیان دەكرد بۆ هەستكردن بە ناسنامەی خۆیان دوای چارەگە سەددەیەك لە حوكمی بیانییەكان. دواجار گرووپێكی نوێی ئۆپۆزسیۆن بە ناوی پارتی بەعس بەشێوەیەكی نهێنی دەستیان كرد بە بانگەواز بۆ یەكگرتوویی عەرەب و شانازی نەتەوەیی و ناسیۆنالیزم.

لە تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٥٩، كە ساڵی دووەمی خوێندنم بوو لە ئامادەیی، ئەندامانی پارتی بەعسی عێراق پیلانێكی تیرۆركردنیان دارشت لە دژی عبدالكریم قاسم كە سەركەوتوو نەبوو. یەكێك لەو بكوژانەی كە لەگەڵ پیلانەكە بوو، گەنجێكی تەمەن بیست و دوو ساڵانی ناوچەی تكریت بوو بە ناوی سەددام حسێن، كە دواجار توانی لە وڵات ڕابكات و لە تۆڵەی قاسم ڕزگاری بێت.

ئەو پێشكەوتنەی كە ڕاستەوخۆ كاریگەری لەسەر ژیانم هەبوو، پەرەسەندنی خواستی جیهان بوو بۆ كڕینی نەوت. پێكهێنانی ڕێكخراوی وڵاتانی هەناردەكاری نەوت (ئۆپیك) لە ساڵی ١٩٦٠ بەو مانایە بوو كە عێراق و دەوڵەتانی دیكەی عەرەبی نەك تەنیا لەسەر نرخی نەوت بەڵكو كۆنترۆڵی بەرهەمهێنانی نەوتیش لەسەر زەوییەكانیان زیاتر ڕێك دەكەون. وەك خاوەن دووەم گەورەترین یەدەگی نەوت لە جیهان، عێراق لە ماوەی ساڵانی ١٩٥٠دا چوار هێندە بەرهەمهێنانی نەوتی زیاد كردبوو. تەنها یەك كێشە هەبوو: عێراق كەسانی لێهاتووی نەبوو بۆ بەڕێوەبردنی پیشەسازییەكی

بەرفراوانی نەوتی ناوخۆیی. بۆ دابینکردنی ئەم پێویستییە بەپەلەیە، حکومەت دەستیکرد بە ناردنی سەدان خوێندکاری لێهاتووی بیرکاری و زانستی نێوخۆی بۆ دەرەوەی وڵات تاوەکو لە باشترین دامەزراوە زانستییەکانی خۆرئاوا بخوێنن.

لەگەڵ نزیکبوونەوەی دەرچوونی خوێندنی ئامادەیی، دەستم کرد بە بیرکردنەوە لە داهاتووم و چۆن پێشبینییەکەی دایکم بەدی بهێنم کە لەداهاتوودا کارێکی گرنگ دەکەم. ئەوەبوو ڕۆژێك، بەڕێوەبەری قوتابخانە بە هەواڵێکی سەرنجڕاکێشەوە بانگی کردم بۆ ژوورەکەی: وەزارەتی پەروەردە سکۆلەرشیپێکی پێشکەش کردبووم بۆ پرۆگرامێکی پێنج ساڵە لە قوتابخانەی کانەکانی کۆلۆرادۆ لە ئەمریکا. منیش زۆر کەیف خۆش بووم. بە خێرایی ڕۆیشتمەماڵەوە بۆ ئەوەی بە دایکم و باوکم بڵێم، ئەوانیش لە باوەشیان گرتم و پێیان وتم کە چەندە شانازیم پێوە دەکەن. من یەکەم ئەندامی خێزانەکەمان بووم کە لە دەرەوەی عێراق بخوێنم.

لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٢، لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا، بە تەنیا گەشتم کرد بۆ واشنتۆن دی سی، ئەمەش وەك ئامادەکاری بۆ خولێکی هاوینەی زمانی ئینگلیزی پێش ئەوەی وانەکانی کۆلێژم دەست پێبکات. لە شوقەیەکی بچووك و تاریکدا لە نزیك بازنەی دوپۆنت دەژیام. دواتر لەپڕ وەکو کەسێك کە منداڵییەکەی دەور درابوو بە خێزانەکەیی و هەمیشە لەنزیکیانەوە بووم، هەستم بە تەنیاییەکی زۆر کرد لە پایتەختی ئەمریکا. لە ڕۆژی سێیەممدا بیرم لە ماڵەوە دەکردەوە و گریام. بەڵام لە کۆتاییدا دواجار لەگەڵ ماڵە کاتییەکەم ڕاهاتم. کاتێك من ڕۆیشتم، عێراق هێشتا وڵاتێکی زۆر هەژار بوو، پڕ بوو لە باڵەخانە نارێکەکان و جادەی پڕ لەچاڵەکان. واشنتۆن دی سی وەك وڵاتێکی خەیاڵی وابوو بۆ من.

کاتە بەتاڵەکانم بە دەوری ناوەندی شاردا بەسەر دەبرد و سەرسام بووم بە گەورەیی کۆشکی سپی و دامەزراوەی سمیسۆنی و شوێنەوارەکان. بیرمە پاشنیوەڕۆیەك لە ژێر قوبەی یادەوەری جێفرسۆن وەستابووم و قسەکانی جێفرسۆنم دەخوێندەوە کە لە ژێرەوە نووسرابوو: "من لە قوربانگای خوداوە سوێندم خواردووە کە دوژمنایەتییەکی هەمیشەیی لە دژی هەموو جۆرە ستەمکارییەك بکەم کە بەسەر عەقڵی مرۆڤدا بێت." ئەم قسانە بە شێوەیەك زایەڵەی دایەوە کە وەك ئەوەی بڵێی هی کەسێك بێت لە وڵاتێك لەدایك نەبووە کە تیایدا سەرکوتکاری هەبووبێت. هەر لە ڕووخانی دەسەڵاتی پاشایەتییەوە، ستەمکاری لە عێراقدا حوکمڕان بووە. تەنانەت لە قۆناغی ئامادەییشدا هەمیشە وریای ئەو قسانە بووین کە دەمانگوت. هەروەها بە شێوەیەك کە لەو کاتەدا نەمدەتوانی پێشبینی بکەم، خنکاندنی ستەمکاری تەنیا لە عێراقدا لە ماوەی دەیەکانی داهاتوودا توندتر دەبووەوە، باشترین عەقڵی میللەتیش بە ئیرادەی خۆیەوە گیرۆدە دەکات، تەنانەت بە عەقڵی خۆشمەوە.

مانەوەی پێنج ساڵەم لە قوتابخانەی کانەکانی کۆلۆرادۆ خۆشترینی کاتەکانی ژیانم بوو. کۆلێژەکە لە شارۆچکەی پێشووی زێڕین لە ویلایەتی کۆلۆرادۆ لە دامێنی چیای ڕۆکی هەڵکەوتبوو، یەکێك بووە لە بەناوبانگترین قوتابخانەکانی کانگا و ئەندازیاری لە جیهاندا. من سەرسام بووم بەم شێوازەی ئەمریکییەکان، و شێوازی تێکەڵبوونی کۆمەڵایەتییان لەسەر بنەمای متمانە و ڕاستگۆیی. هاوژووری بەشەناوخۆییەکەم، ناوی دەیڤد بوو، شاخەوانێکی بەئەمەك بوو. کە چەندین جار کۆتایی هەفتەم لەگەڵیدا بەسەر دەبرد لە چیاکانی ڕۆکیدا. لە کاتێکدا کە

ئۆتۆمۆبێلە مێرسیدسە خراپەکەیمان بەرەو سەرەوە واتە بەرەو لوتکە هەناسەبڕکێکانی سەرووی قوتابخانەکەمان دەهاژۆشت، هەمیشە بە دەربڕینە سەیرەکانی من کە لە زمانی عەرەبییەوە وەرگێڕدرابوون، سەرقاڵ بوو. لەگەڵ ئاسوودەیی زیاترم لە قسەکردن بە ئینگلیزی، توانیم بە وەسفکردنی نیشتمانەکەم میوانداری دەیڤد و هاوپۆلەکانی دیکە بکەم. من باسی دەشتەکییەکانی وڵاتەکەمم بۆ دەکردن کە حوشتریان هەبوو، باسم لە بیابانەکانی میزۆپۆتامیا و باسی هۆزەکەم، عوبێدیەکانم بۆ کردن، کە لەنەوەکانی خێڵی دێرینی شاژنی سەبەئی عەرەبی یەمەن بوون، کە هەندێکیان هەزاران ساڵ لەمەوبەر کۆچیان کردبوو بۆ باکوور و لە نزیك ئەو شوێنەی ئێستا بووبوونە فەرمانڕەوای ناوچەیی بەغداد.

لە ماوەی پێنج ساڵی خوێندنی کۆلێژدا نەگەڕامەوە ماڵەوە و عێراق زۆر دوور بوو بۆ من. پشووەکانم بە گەشتکردن لە ئەمریکا لەگەڵ هاوڕێکانم بەسەر دەبرد یان خولی هاوینەم دەخوێند. لە ساڵی دووەمی خوێندنمدا پەیوەندی خۆشەویستیم بەست لەگەڵ خوێندکارێکی پەروەردە و فەلسەفە لە زانکۆی دێنڤەر بە ناوی فیلیس مولهاوسن. فیلیس قژ سوورێکی نەرم و نیان بوو و یارمەتی دەدام کە زیتر سەرنجم لەسەر خوێندنەکەم بێت. چەندین کاتژمێری زۆرمان پێکەوە بەسەر برد، لە کافێیەکی ناوچەکەدا کێکمان دەخوارد و باسی جیاوازییەکانی کولتوورەکانمانمان دەکرد. دایك و باوکی لانیکەم هەفتەی جارێك بانگهێشتی نانخواردنی ئێوارەیان دەکردم و زۆری نەخایاند ئەو هەستەم بۆ دروست بوو کە بەشێکم لە خێزانەکەی. پێش ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٧ دەربچم، من و فیلیس باسی هاوسەرگیریمان دەکرد، بەڵام

لە کۆتاییدا مانەوەی لە ئەمریکا هەڵبژارد و منیش ویستم بگەڕێمەوە بۆ عێراق. لەلایەکی تریش ئەمە وەرچەرخانێك بوو کە دۆستێکی عێراقی بە ناوی حەمید ئەلحەکیم بە ئاڕاستەیەکی دیکەدا ڕۆیشت. من و حەمید بەدرێژایی ساڵانمان لە قوتابخانەی کانەکاندا لە کۆلۆرادۆ زۆر لەیەکەوە نزیك بووین و لە کۆتاییدا زۆرجاران پێکەوە باسی گەڕانەوەمان بۆ عێراق دەکرد. بەڵام کەمێك پێش بەرواری ڕۆشتنمان، حەمید تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی کە ئەو نیازی وایە لە ئەمریکا بمێنێتەوە. دواتر هاوسەرگیری لەگەڵ نووسەرێکی نێو هۆڵی دادگا کرد بە ناوی پاتریشیا و خۆیشی لەکاری گەڕان بەدوای نەوتدا لە کۆمپانیای ئارکۆ لە شاری هیوستن دامەزرا. بەهۆی ئەو بڕیارە گەنجانەیەوە —واتە بڕیاری ئەو بۆ مانەوەی، و بڕیاری منیش بۆ گەڕانەوە بۆ عێراق- ڕێگاکانمان تا ئەو ڕادەیەی کە خەیاڵ دەکرا، دوورکەوتنەوە.

کاتێك دایك و باوکم دەرگاکەیان کردەوە و تاوەکو پێشوازیی لە کوڕەکەیان بکەن کە گەڕاوەتەوە ماڵەوە، گەنجێکیان بینی کە گەشبینی لەڕووخساری بەدی دەکرا و لەلایەکی تر هەستی دەرچوونی لەخوێندن پێوە دیاربوو. عێراق لە بەربەستی شۆڕشی پیشەسازیدا بوو و بە بڕوای من ئامادە بوو پیشەسازییەکی نەوتی خۆبژێوی دروست بکات کە کوالیتی ژیانی هەموو عێراقییەکان باشتر بکات. بەهۆی بڕوانامەی ماستەرەکەم کە تازە وەرمگرتبوو لە ئەندازیاری پاڵاوتنی نەوت، هەستم دەکرد دەتوانم یارمەتی وڵاتەکەم بدەم بۆ دەستخستنی ئامانجەکەی. بە لەبەرچاوگرتنی دەوڵەمەندی سەرچاوەکانی خاك و مێژووی داهێنان کە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاییترین هەوڵەکانی مرۆڤ ئەوا عێراقییەکان بۆ ماوەیەکی زۆر هەژار بوون. چوون ئەوێ

میزۆپۆتامیا بوو کە شارستانیەتی لێ دەست پێکرد. دوانزە هەزار ساڵ لەمەوبەر مرۆڤەکان سیستەمێکی ئاودێری کشتوکاڵیان داهێنا کە دوور نەبوو لەو باخانەی کە دایك و باوکم تێیدا پەروەردەیان کردم. خەڵکی کۆنی میزۆپۆتامیا نووسینیان داهێنا، سیستەمێکیان بۆ گێڕانەوەی کات دارشت و داهێنانێکی بەسوودیان بە ناوی چەرخ پەرەپێدا. بۆ ماوەی هەزاران ساڵ، باوباپیرانی عێراقییەکان بەشێکی زۆری شیعر و مێژوو و داستانە گەورەکانی جیهانیان نووسیوە. لەگەڵ گەڕانەوەمدا ئەو هیوایەم بەخۆم دا کە ڕەنگە عێراق جارێکی دیکە ببێتەوە نموونەی شارستانیەتێکی پێشەنگ لە جیهاندا.

بەڵام لە غیابی مندا ناسەقامگیری سیاسی بەردەوام بوو. کودەتایەك لە ساڵی ١٩٦٣دا ڕوویدا، پارتی بەعسی بۆ ماوەیەکی کورت هێنایە سەر دەسەڵات، بەڵام کودەتایەکی بەرپەرچدانەوەی ئەفسەران کەمتر لە ساڵێك دواتر بەعسییەکانی دەرکرد. دوای ئەوەی هەوڵەکانیان سەرکەوتوو نەبوو بۆ وەرگرتنەوەی دەسەڵات، ئەحمەد حەسەن بەکر سەرۆکی پارتی بەعس و سەددام حسێنی خزمە گەنجەکەی و ئەندامانی دیکەی ئەو حزبە خرانە زیندانەوە. سەددام تا ساڵی ١٩٦٦ لە پشت مێزی دادگا مایەوە و پەیوەندییەکانی لەگەڵ هاوڕێ زیندانییەکانیدا درێژە پێدا کە لە کودەتاکەی ساڵی ١٩٦٨دا بوون و هەروەها ئەوانەش کە دەسەڵاتی پارتی بەعسیان چەسپاند.

جگە لە گێژاوی سیاسی، هەندێك شت لە عێراق بەرەو باشتر دەچوون. حکومەت پارەی زیاتری بۆ قوتابخانە و نەخۆشخانەکان تەرخانکرد، بەتایبەتی لە دەوروبەری بەغدا کە نیشانەکانی پێشکەوتن چەند هێندە زیادیان کرد. ژیانی من لەو ساڵانەدا

ئایدیالی بوو. ئەوەبوو ئافرەتێکی شۆخ و شەنگم ناسی بە ناوی لەیلا و کە دواجار بوو بە هاوڕێی ڕۆحیم و دوای دوو ساڵ هاوسەرگیریم لەگەڵدا کرد.

وەزارەتی نەوت منی بۆ پاڵاوگەی نەوتی دۆرە لە نزیك بەغدا ڕاسپارد. من شانازیم بە کارەکانمەوە دەکرد و ئەوەبوو هەر زوو دوای ئەوە بەڕێوەبەری گشتی ناوچەکە وەك چارەسەرکەری کێشەکان بۆ کێشەکانی پاڵاوگەکان لە سەرتاسەری عێراقدا منی ڕاسپارد. تا ساڵی ۱۹۷۲ یەکێك بووم لە بەئەزموونترین ئەندازیارانی پاڵاوگەکانی عێراق. کاتێك وەزارەتی نەوت یارمەتییەکی پێشکەش کردم بۆ ئەوەی بڕوانامەی دکتۆرا بەدەست بهێنم لە پرۆگرامی ئەندازیاری کەرەستەسازی لە کۆلێژی زانکۆی سوانزی لە وێلز، ئەوەبوو من و لەیلا هەرزوو بۆ ئەوەی چانسێکی تری ژیان تاقیبکەینەوە بۆ دەرەوەی وڵات سەفەرمان کرد.

لە کۆتاییەکانی پرۆگرامی دکتۆرام کە سێ ساڵ بوو لە بەریتانیا، هاوڕێیەتی هاوخوێندکارێکی دکتۆرای عێراقیم لە سوانزی کرد کە لە کۆمیسیۆنی وزەی ئەتۆمی عێراق (IAEC) کاری کردبوو. من ئەوسا بەشێوەیەکی ناڕوون و لێڵ ئاگاداری ئەوەبووم کە عێراق بەرنامەی وزەی ئەتۆمی هەیە. هاوڕێکەم دەیگوت کە بەرنامەکە تازە لە سەرەتاکانی دایە. ئەو، شوێنی کارکردنەکەی بە شوێنێکی سەرنجڕاکێش وەسف کرد، کەتیایدا دەرفەتی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە دەڕەخسێنێت، بە پێچەوانەی وەزارەتی نەوتەوە کە لە بنەڕەتدا تەنها بەشداریم لە بەرهەمهێناندا کردبوو.

بیرۆکەی ئەوەی کە عێراق وەك وڵاتێکی گەشەسەندوو،

هه‌نگاو ده‌نێته‌ نێو دونیای ئه‌تۆمی، بۆ من جێگای بایه‌خ بوو. توێژینه‌وه‌ی ئه‌تۆمی له‌ پێشه‌نگی ڕه‌هاى زانستدا بوو، هه‌روه‌ها خودان داهاتوو بوو، ئه‌مه‌ش هاوتا له‌گه‌ڵ به‌كارهێنانی له‌ كشتوكاڵ و پاراستنی خۆراك، توێژینه‌وه‌ی پزیشكی و چاره‌سه‌ركردنی شێرپه‌نجه‌ و نه‌خۆشییه‌كانی دڵ و بێگومان به‌رهه‌مهێنانی وزه‌ی ئه‌تۆمی. هه‌ستم ده‌كرد، ته‌نانه‌ت زیاتر له‌ پیشه‌سازی نه‌وت، ده‌توانم له‌ ڕێگه‌ی لێكۆڵینه‌وه‌ ئه‌تۆمییه‌كانه‌وه‌ یارمه‌تی وڵاته‌كه‌م بده‌م بۆ ده‌ستخستنی ئامانجه‌كه‌ی. كاتێك من و له‌یلا له‌ ساڵی ١٩٧٥ گه‌ڕاینه‌وه‌ عێراق، داواكاریم پێشكه‌ش به‌ IAEC كرد و داوایان لێكردم كه‌ وتارێك سه‌باره‌ت به‌ كاره‌كانم له‌ ئه‌ندازیاری كه‌ره‌سته‌ سازیدا پێشكه‌ش بكه‌م. دوای ته‌نها كاتژمێرێك، ئه‌وه‌نده‌ سه‌رسام بوون به‌ من به‌جۆرێك كه‌ هه‌ر ئه‌وكات له‌ شوێنی وتاره‌كه‌ گوتیان كه‌ داتده‌مه‌زرێنین.

خوێندنی دكتۆراكه‌م ڕاسته‌وخۆ په‌یوه‌ندی به‌ كێشه‌یه‌كه‌وه‌ هه‌بوو كه‌ ڕیاكتۆرێكی[1] ئه‌تۆمی ٢ مێگاواتی تێكشكاو بوو كه‌ عێراق له‌ ناوه‌ڕاستی شه‌سته‌كاندا له‌ ڕووسیا كڕیبووی. ئه‌م ڕیاكتۆره‌ بچووكه‌ -كه‌ بۆ لێكۆڵینه‌وه‌ له‌ فیزیا و پزیشكیدا به‌كارده‌هێنرا- تووشی ژه‌نگ بوو له‌ توێكڵی ئه‌له‌منیۆمه‌كه‌ی و ڕێك له‌و بلۆكه‌دا كه‌ سووته‌مه‌نی تیشكده‌ره‌كه‌ی تێدابوو. جا بۆیه‌ ئه‌گه‌ر ئه‌له‌منیۆمه‌كه‌ ژه‌نگاوی بێت، له‌وانه‌یه‌ سووته‌مه‌نی له‌ ناوكه‌وه‌ دزه‌ بكاته‌ ده‌ره‌وه‌ و گازی تیشكده‌ر ده‌ربدات بۆ به‌رگه‌هه‌وا. كاتێك په‌یوه‌ندیم به‌ IAEC كرد، یه‌كه‌م ئه‌ركم دڵنیابوون بوو له‌ سه‌لامه‌تی ڕیاكتۆره‌كه‌.

[1] كارتیاكه‌ر، وه‌یان كارگه‌ی ناوكی

ئه‌وه‌بوو به‌شداریم كرد له‌ به‌رزكردنه‌وه‌ی ڕیاكتۆره‌كه‌ بۆ وه‌شانێكی نوێتری ٥ مێگاواتی له‌ سه‌نته‌ری لێكۆڵینه‌وه‌ی ئه‌تۆمی له‌ (التویثة)، نزیكه‌ی ده‌ میل له‌ باشووری خۆرهه‌ڵاتی به‌غداوه‌، دوور نییه‌ له‌و باخانه‌ی كه‌ منداڵیم تێدا به‌سه‌ر بردووه‌. بلۆكی ڕیاكتۆره‌كه‌ له‌ هۆڵێكی گه‌وره‌دا له‌ ژێر قوبه‌یه‌كدا دانرابوو، له‌ چاڵێكی ستوونیدا دانرابوو كه‌ تیره‌كه‌ی نزیكه‌ی پانزه‌ پێ بوو و قووڵیه‌كه‌ی نزیكه‌ی بیست و چوار پێ بوو، پڕ بوو له‌ ئاو. بیرمه‌ یه‌كه‌م جار كه‌ به‌ پلیكانه‌یه‌ك دابه‌زیم بۆ بنی حه‌وزه‌ چۆڵه‌كه‌، سه‌رسام بووم به‌ بڕی ئه‌و شوێنه‌ی كه‌ پێویست بوو بۆ ساردكردنه‌وه‌ی ڕیاكتۆرێكی ئاوا بچووك.

له‌و كاته‌دا عێراق له‌گه‌ڵ فه‌ره‌نسا له‌ دانوستاندا بوو بۆ كڕینی ڕیاكتۆرێكی گه‌وره‌تر —بۆ توێژینه‌وه‌- كه‌ توانای ٤٠ مێگاواتی هه‌بێت، ئه‌مه‌ش یارمه‌تی ئاژانسی عێراقی وزه‌ی ئه‌تۆمی ده‌دات بۆ به‌ده‌ستهێنانی تێگه‌یشتنێكی زیاتر له‌ فیزیای ئه‌تۆمی و ئه‌ندازیاری. له‌ ڕاستیدا ئه‌مه‌ هه‌نگاوێكی بنه‌ڕه‌تی بوو به‌ره‌و ئامانجی كۆتایی كڕینی ڕیاكتۆرێكی ئه‌تۆمی به‌ قه‌باره‌ی ٦٠٠ مێگاوات بۆ به‌رهه‌مهێنانی وزه‌.

ئاژانسی وزه‌ی ئه‌تۆمی عێراق IAEC منی كرده‌ به‌رپرسی توێژینه‌وه‌ی كه‌ره‌سته‌ و له‌ ساڵی ١٩٧٦دا بۆ ماوه‌ی چوار مانگ منیان نارد بۆ ئیتالیا تاوه‌كو به‌شداربم له‌ به‌رنامه‌ی ئه‌تۆمی، كه‌ به‌شێكی له‌ ڕێگه‌ی یارمه‌تییه‌كی نه‌ته‌وه‌ یه‌كگرتووه‌كانه‌وه‌ پاره‌ی بۆ دابینكرا، ئه‌ویش له‌سه‌ر بنه‌مای ئه‌وه‌ بوو سه‌لامه‌تی ئه‌و ڕیاكتۆرانه‌ی كه‌ وڵاتانی تازه‌پێگه‌یشتووی كڕیویانه‌، مسۆگه‌ر بكات. ئیتالییه‌كان زۆر میهره‌بان بوون و ڕێگه‌یان پێدام به‌شێوه‌یه‌كی به‌رچاو بچمه‌ ناو دامه‌زراوه‌كانیان و دیزاینی

ڕیاكتۆرەكانیانەوە. لەوێ هاوڕێ ئەندازیارە زیرەكەكانم ناسی كە یارمەتیان دام لە دیزاینكردنی تاقیكردنەوەكان بۆ ئەوەی بزانم كە مادده جیاوازەكان چۆن كارلێك دەكەن لە ژینگەییەكی سەختی ڕیاكتۆری وزەدا. ئێمە بارودۆخێكمان هێنایە كایەوە كە تا ٣٦٠ پلەی سەدی و پەستانی زیاتر لە ١٠٠ بەرگەهەوا (یان ١٠٠ هێندەی پەستانی هەوا لە ئاستی دەریادا) بوو، و من ئەمجۆرە تاقیكردنەوەم بە دڵخۆشكەر دەزانی. دوای چوار مانگ پەیوەندییەكی تۆكمەم لەگەڵ چەند ئەندازیارێكی ئیتاڵیدا دروستكردبوو و هەروەها لە زۆرێك لە خاڵە وردەكانی ئەندازیاری ڕیاكتۆر و دیزاینی تاقیكردنەوەكان تێگەیشتبووم.

بۆ تێگەیشتن لەوەی كە ڕیاكتۆرە ئەتۆمییەكان چۆن كاردەكەن، و چی پەیوەندییێكیان بە چەكی ئەتۆمیەوە هەیە، ئەوا دەبێت لە تێگەیشتنێكی بنەڕەتییەوە دەست پێبكەین، واتە لەوەی كە لە ئاستی ئەتۆمیدا چی ڕوودەدات. سەرنج بدەن كە هەموو ماددەیەك لە ئەتۆم پێكهاتووە، لە ناوەندەكەیدا گەردیلەی چڕ هەنە و لە تەنۆلكەكان پێكهاتوون، كە پێیان دەوترێت پرۆتۆن و نیوترۆن، ئەوانیش بەهۆی هێزی ناوكی بەهێزەوە بەیەكەوە ڕاگیراون. ئەگەر ئەم ناوكە بتوانرێت لە ڕێگەی پەستانەوە لە ئاستی ژێر ئەتۆمیدا لەیەكتر جیا بكرێتەوە، ئەوساتە ئەم هێزە چەسپاوانە وزە ئازاد دەكەن. ڕیاكتۆرێكی ئەتۆمی وەك ئامێری پینبۆڵ كاردەكات، نیوترۆنی ئازادی بەدەوری ناوكی هەندێك ئەتۆمی هەڵاوساوەو دەخولێتەوە لە هەوڵێكدا بۆ دابەشكردنیان و ئازادكردنی بڕێكی زۆر لە وزەی هەڵگیراو، لە پرۆسەیەكدا كە پێی دەوترێت تیشكدانەوە.

زۆربەی توخمەكانی سەر خشتەی خولیی ڕێگرن لەبەردەم

ئەمە. بەڵام قورسترین توخم لە سروشتدا کە یۆرانیۆمە، زرِتوخمی[1] زۆر ناجێگیری تێدایە کە پێی دەوترێت یۆرانیۆم-٢٣٥. یۆرانیۆمی سروشتی کەمتر لە سەدا یەك یۆرانیۆم-٢٣٥ی تێدایە و بەهۆی چرِی جێگیرەکەیەوە کە یۆرانیۆم-٢٣٨یە، ئامادە نییە بۆ تیشکدانەوە. بۆ گەیشتن بەو دابەشبوونە ئەتۆمییەی کە وزە ئازاد دەکات، دەبێت یۆرانیۆم بپیتێنرێت. زۆربەی رِیاکتۆرە ئەتۆمییەکان کە کارەبا بەرهەم دەهێنن بە سووتەمەنی یۆرانیۆم کاردەکەن کە لە نێوانی سەدا ٢ بۆ ٤ یۆرانیۆم-٢٣٥. ئەمەش رِێگە بە ئەتۆمەکان دەدات بە رِێژەیەکی باش دابەش ببن بۆ ئەوەی وزەکە بۆ کارەبا بەکاربهێنرێت.

شتێکی تەواو جیاواز لە بۆمبی ئەتۆمیدا رِوودەدات. هەمان ئەو نیوترِۆنانەی یۆرانیۆم کە کاری بەرهەمهێنانی وزە و خزمەتکردنی دەرمان و کشتوکاڵ دەکەن، ئەوا دەبنە کوشندە کاتێك یۆرانیۆمەکە زێتر دەوڵەمەند دەکرێت بۆ زیاتر لە ٩٠ لەسەد U-235. زیاتر لە پانزە کیلۆگرام یۆرانیۆمی لەو جۆرە کە زۆر پیتێنراوە دەبێتە بەرمیلێك لە باروت، کە تێیدا نیوترِۆنەکان بە رِێژەیەکی رِیزبەندی دەشکێنە ناو گەردیلەی هاوسێکانەوە. کارلێکی زنجیرەیی لە یەك کاتدا لە ژێر کۆنترِۆڵ دەردەچێت و لە ئەنجامدا تەقینەوەیەکی ئەتۆمی کارەساتبار دروست دەبێت.

هەر میللەتێك کە رِیاکتۆری ئەتۆمی هەبێت دەتوانێت بە دوو شێوە بەکاری بهێنێت بۆ پەرەپێدانی چەکی ئەتۆمی. یەکەم، رِەنگە بەشێك لە یۆرانیۆمی پیتێنراو -کە بۆ سووتەمەنی رِیاکتۆر بەکاردەهێنرێت- بۆ پیتاندنی زیاتر بۆ پلەی دروستکردنی تەقینەوە

---

[1] ئایزۆتۆپ Isotope

بە بەكارهێنانی چەندین ڕێگەی جۆراوجۆر تەرخان بكرێت. بەڵام لەوەش زیاتر كە جێگەی نیگەرانییە ئەوەیە كە دەتوانرێت ڕیاكتۆری ئەتۆمی وەك ئامرازێك بۆ بەرهەمهێنانی پلۆتۆنیۆم بەكاربهێنرێت. پلۆتۆنیۆم توخمێكی ناسروشتییە كە لە ڕیاكتۆرێكدا بە پێچانی خانەكانی سووتەمەنی یۆرانیۆم كە U-238ای تێدایە لە كاتی تیشكدانەوەدا دروست دەكرێت. لەم پرۆسەیەدا لەبری ئەوەی ئەتۆمەكان دابەش بكرێن، نیوترۆنەكان لەگەڵ ناوكەكاندا دەبەستنەوە و پلۆتۆنیۆمی ناجێگیر بە ناوی Pu-239 دروست دەكەن، كە دواتر ڕەنگە لە كارگەیەكی دووبارە پرۆسێسكردنەوەدا بە شێوەیەكی كیمیایی جیا بكرێتەوە. پلۆتۆنیۆم زۆر تیشكدەرترە لە یۆرانیۆمی پیتێنراو و لەڕادەبەدەر مەترسیدارە بۆ ئەوانەی مامەڵەی لەگەڵ دەكەن، هەرچەندە كەمتری پێویستە بۆ چەكێك. ئەو بۆمبەی لە ساڵی ١٩٤٥دا بەسەر ناگازاكیدا فڕێدرایە خوارەوە، نزیكەی سێزدە پاوەند پلۆتۆنیۆمی تێدابوو و لە چەكی پلۆتۆنیۆمی مۆدێرن بڕێكی كەمتریش بەكاردەهێنێت.

ڕیاكتۆری ئەتۆمی وەك چەقۆ وایە- كە كەلوپەلێكی پێویستە بۆ پارچەكردنی سەموون یان تۆستێك، بەڵام دەتوانرێت بۆ بڕینی شتی تریش بەكاربهێنرێت. هەر میللەتێك دەتوانێت بە شێوەیەكی یاسایی ڕیاكتۆرێكی ئەتۆمی بكڕێت و بەو پێیەی كە بەكارهێنانی ئاشتیانە بۆ وزەی ئەتۆمی هەیە، ئەستەمە ئەم تەكنەلۆژیایە تەنانەت بۆ مەترسیدارترین ڕژێمی بەڕواڵەت ڕەت بكرێتەوە. بەهۆی ئەمەوە ژمارەیەك لە وڵاتانی تازەپێگەیشتو لە هەوڵی پەرەپێدانی چەكی ئەتۆمی بە شێوەیەكی شاراوە ڕوویان لە بژاردەی پلۆتۆنیۆم كردووە، ئەمە جگە لە بەكارهێنانی تەكنیكی سەنتەرفیوج بۆ بەرهەمهێنانی یۆرانیۆمی پیتێنراو. هیندستان ڕیاكتۆرێكی بەكارهێنا

کە لە ساڵانی ١٩٥٠ لە کەنەدا بەدەستی هێنابوو بۆ بەرهەمهێنانی پلۆتۆنیۆم بۆ ئەو بۆمبانەی کە لە ساڵی ١٩٩٨ تاقی کردنەوە. ئیسرائیل کە تاکە وڵاتی چەکداری ئەتۆمی بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دوای ماوەیەکی کەم لە کارکردنی وێستگەی ئەتۆمی لە دیمۆنا لە ساڵی ١٩٦٤ دەستی بە بەرهەمهێنانی پلۆتۆنیۆم کرد. کۆریای باکوور تۆمەتبارە بە کۆکردنەوەی لانیکەم ٦٠ پاوند پلۆتۆنیۆمی جیانەکراوە لەناو داری سووتەمەنیدا لە دامەزراوە ئەتۆمییەکەی لە یۆنگبیان. ئێران لە ماوەی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا لە بوشێهر لە کەنارەکانی کەنداو دەستی بە کارەکانی کرد لەسەر ڕیاکتۆری وزەی ئەتۆمی. هەرچەندە عێراق لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا ڕیاکتۆرەکانی ئێرانی بۆردومان کرد، بەڵام ئێران یارمەتی ڕووسیای بەدەست هێنا بۆ دووبارە ئاوەدانکردنەوەیان، ئەمەش گومانی لای ئەمریکا و شوێنەکانی دیکە دروستکردووە کە ئێران هێشتا هیوادارە بۆمبی ئەتۆمی دروست بکات.

دەتوانین بڵێین کە دەکرا هەمان ئەو گومانانە لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا سەبارەت بە عێراق دروست بکرایە. بەڵام لەو کاتەدا کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی، وڵاتی عێراقی وەك نەتەوەیەکی شەڕانگێزی تایبەت سەیر نەدەکرد، هەربۆیە بەرنامە ئەتۆمییەکە عێراق لەسەرەتا نەبووە هۆی سەرنجی ئەوان. من خۆم باوەڕم وابوو کە ڕیاکتۆری فەرەنسی وەك ئامرازێکی توێژینەوە بەکاردەهێنرێت بۆ ئامادەکردنی زاناکانمان بۆ بەرهەمهێنانی وزە. ئاخر عێراق پەیماننامەی قەدەغەکردنی چەکی ئەتۆمی لە ساڵی ١٩٦٨ واژۆ کردبوو، کە تێیدا چاودێری نێودەوڵەتی بۆ بەرنامە ئەتۆمییەکەی دابینکرابوو.

لە ساڵی ١٩٧٩دا هەڵچوونە سیاسییەکانی ناوەوە و دەوروبەری عێراق ناوچەکەی بە شێوەیەك هەژاند کە بۆ ساڵانی داهاتوو دەنگی دایەوە. لە ئێرانی دراوسێدا، چەکدارانی شیعە دەستیان بەسەر حکومەتدا گرت و جۆرێکی توندڕەوی یاسای شەریعەیان سەپاند، کە لەسەر بنەمای لێکدانەوەی توندی ئیسلام بوو. خۆپیشاندەرانی ئێران، کە توڕە بوون لە پشتیوانی ئەمریکا بۆ شای لەدەستەڵات لادراو، دەیان کەسیان لە باڵیۆزخانەی ئەمریکا بە بارمتە گرت و لە شەڕێکدا کە زیاتر لە ساڵێکی خایاند. شۆڕشی ئێران ڕژێمی سەربازی عێراقی تووشی شۆك کرد. سەرەڕای ئەمەش، سەددام حسێن کە لەوکاتەوە فەرمانڕەوای دیفاکتۆی عێراق بووە، هەرچەندە ئەوکات پۆستی سەرۆکایەتی کۆماری عێراقی وەرنەگرتبوو، بەڵام نامەیەکی فەرمی پیرۆزبایی ئاراستەی حاکمی نوێی ئێران، ئایەتوڵڵا ڕوحوڵڵا خومەینی کرد. لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەی ئاشتەوایی بۆ هیچ شوێنێك بری نەکرد. خومەینی نامەکەی لەگەڵ بەشێك لە ئایەتێك لە قورئان گەڕاندەوە کە دەڵێت: "والسلام على من اتبع الهدى"[1]. بەم وەڵامە ڕەنگە بە هەمان شێوەی چیرۆکە قورئانییەکە و ویستبێتی کە زللەیەك لە دەموچاوی سەددام بدات. چوون ئایەتەکە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە موسا (علیه السلام) ئامۆژگاری فیرعەون دەکات، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە سەددامیش وەك فیرعەون دیکتاتۆر و بکوژ و بێباوەڕ بووە.

بیرمە بە خێزانەکەمم گوت: تازە شەڕ شتێکی حاشا هەڵنەگرەو بەم زووانە بەرۆکمان دەگرێت".

---

- [1] سڵاویش لەسەر ئەو کەسانە بێت کە شوێنی هیدایەت و ڕێبازی ڕاستەقینە کەوتوون" سورة طه ٤٧

چه‌ند مانگێك دواتر سه‌ددام ده‌ستی به‌سه‌ر پۆستی سه‌رۆكایه‌تی دا گرت به شێوه‌یه‌ك كه میلله‌تی تووشی جۆرێك له ساردی كرد. ئه‌مه‌ش دوای ده‌ستله‌كاركێشانه‌وه‌ی ئه‌حمه‌د حه‌سه‌ن به‌كری سه‌رۆك كۆماری عێراق، له ١٨ی ته‌ممووزی ١٩٧٩ له هۆڵێكی كۆنفرانسی به‌غدا به‌رپرسانی پێشه‌نگی حكومه‌تی بانگهێشت كرد بۆ كۆبوونه‌وه، بۆ ئه‌وه‌ی دڵنیابێت له‌وه‌ی په‌یامه‌كه‌ی بێ خه‌وشه، دانیشتنه‌كه به‌شێوه‌ی ڤیدیۆیی تۆماركرا ئه‌مه‌ش ڕاكێشانی سه‌رنجی گشتی. دوای ئه‌وه‌ی به سه‌دان له پیاوانی گرنگ و به‌هێزی عێراقی له هۆڵه‌كه دانیشتن، ئه‌وه‌بوو سه‌ددام له‌سه‌ر مێزه‌كه دانیشت .و جگه‌ره‌یه‌كی داگیرساوی له نێوان په‌نجه‌كانیدا بوو و نیگه‌رانی به ڕووخساری دا دیاربوو. به ده‌نگێكی دراماتیكی به ئاماده‌بووانی گوت كه پیلانێكی بۆ تێكدانی حكومه‌ت ئاشكرا كردووه. ده‌نگی نزم كرد و چاوێكی به‌ته‌واوی هۆڵه‌كه‌دا گێڕا. دواتر ئاماژه‌ی به‌وه‌كرد، هه‌ندێك له‌وانه‌ی هه‌ر له‌م ژووره‌دان، خیانه‌تكارن. له‌سه‌ر ئه‌م ئاماژه‌یه ئه‌میندارى گشتی ئه‌نجومه‌نی فه‌رمانده‌یی شۆڕش (محيي عبد الحسين مشهدي)، له پشت په‌رده‌یه‌كه‌وه هاته ده‌ره‌وه و له ته‌نیشت سه‌ددام وه‌ستا. مه‌شهه‌دی كه ئه‌میندارى گشتی بوو، چه‌ند ڕۆژێك پێشتر ده‌ستبه‌سه‌ر كرابوو. وه‌ك ئه‌وه‌ی له غه‌یبووبه‌تدا بێت، ئه‌و ددانی به‌وه‌دا نابوو كه یه‌كێكه له‌و كه‌سانه‌ی كه پیلانگێڕانیان له دژی حكومه‌ت كردووه. پاشان ده‌ستی كرد به خوێندنه‌وه له لیستی ئه‌و كه‌سانه‌ی كه گوایه هاوپیلانگێڕن. له‌كاتی گوتنه‌وه‌ی هه‌ر ناوێكدا پاسه‌وانه چه‌كداره‌كان به‌ناو ئاماده‌بوواندا ده‌ڕۆیشتن و تۆمه‌تباره‌كانیان له هۆڵه‌كه‌دا ڕاده‌كێشا. زۆرێك له پیاوه مه‌حكومكراوه‌كان هاواری بێتاوانییان ده‌كرد و هه‌ندێكی دیكه‌شیان له كاتێكدا پێشبینی خراپترینیان ده‌كرد، ده‌گریان.

لە بەرامبەر ناوی هەر مەحكوومێك كە بانگ دەكرا، سەددام هاواری دەكرد: "إطلع" واتە "بڕۆ دەرەوە".

ئەوەبوو مەشهەدی شەست ناوی خوێندەوە. كاتێك تەواو بوو، پێدەچوو سەری سوڕمابێت كاتێك پاسەوانەكان گرتیان و لە ژوورەكەش بردیانە دەرەوە. هەروەها ئەندامانی ڕزگاربووی كۆبوونەوەكە لەسەر پێی خۆیان هەڵسان و هەوڵیاندا بە هاواركردن بۆ سەددام و دەسەڵاتی درێژخایەنی لە یەكتر تێپەڕن. لە ڕۆژانی دواتردا زانیمان كە زۆرێك لەو شەست بەرپرسە تۆمەتباركراوەكان ڕەمی كراون، هەر بەتەنهاش نا، بەڵكو لەگەڵ سەدان كەسی دیكە كە سەددام بە نامتمانەیانی زانیبوو.

بیرمە، نمایشێكم بینی كە سەددام دوای ماوەیەكی كەم ڕێكی خستبوو. لە پشت سەرۆكی نوێ، تەها یاسین ڕەمەزان وەستابوو، كە دواتر بوو بە جێگری سەرۆك و تا كۆتایی ڕژێم لەساڵی ٢٠٠٣ بە دڵسۆزی سەددام مایەوە، سەرنجی چاوەكانی تەها یاسینم داو بینیم دەمارگیر و ترساو دەردەكەوت. هەندێك لە هاوڕێكانی لە كاتی هەڵمەتی پاكتاوكردنەكە لەلایەن سەددامەوە ڕەمی كران، و هەرچەندە پێشتر یەكێك بوو لە دەستە ڕاستەكانی سەددام، بەڵام دیار بوو هەستی بە نادڵنیایی دەكرد سەبارەت بە سەلامەتی خۆی. پاكتاوكردنی خوێناوی لە چەند ساڵی داهاتوودا بەردەوام بوو، چونكە سەددام هەزاران دوژمنی هەستپێكراوی كۆكردەوە و كوشتنی. پاكتاوكردنەكان بۆ عێراق شتێكی نوێ نەبوو، بەڵام مەودا و شێوازی گشتی كە سەددام پۆستی سەرۆكایەتیی وڵاتەكەی وەرگرت، جۆرێك لە پەیامی نارد بەوەی كە هیچ شتێكی لەمجۆرە لە ئۆپۆزسیۆن قبوڵ ناكرێت.

تا ساڵی ١٩٧٩ ئاژانسی عێراقی وزەی ئەتۆمی تا ئەو ڕادەیە فراوان بوو كە من سەرپەرشتی ستافێكی زیاتر لە دوو سەد كەسیم دەكرد لە بەشی كەرەستەی ناوەندی لێكۆڵینەوەی ئەتۆمی لە (التویثة)، هەرچەندە تەمەنم تەنیا سی و پێنج ساڵ بوو، بەڵام شانبەشانی زانایانی دیكەی بەناوبانگی وەك دكتۆر جەعفەر ضیاء جەعفەر، بەرپرسی بەشی فیزیا و حسێن ئەلشەهرستانی، بەرپرسی بەشی كیمیا، بەڕێوەبەرایەتیی بەشێكم هەبوو. سەرۆكی ناوەندی لێكۆڵینەوەی ئەتۆمی، دكتۆر هومام عبدالخالق غەفور، ڕاپۆرتی بۆ بەرپرسی سیاسی ئاژانسی عێراقی وزەی ئەتۆمی، پیاوێكی بەژن كورت و بەخۆوە ببوو، هەروەها لەگەڵ دكتۆر عبدالرزاق الهاشمي و خودی سەددام حوسێن خۆی.

دروستكردنی دامەزراوەیەك بۆ ڕیاكتۆری فەرەنسی بە توانای ٤٠ مێگاوات لە التویثة نزیك بوو لە تەواوبوون. هۆڵی سەرەكی ڕیاكتۆرەكە تەنیشت بینایەكی فرە نهۆمی بۆ سەدان كارمەندی IAEC، بەرزییەكەی دە نهۆم بوو، سێ تاوەری ساردكەرەوە و قوبەیەك بەسەر سلندەری سەرەكیدا هەبوو. لەناو هۆڵەكەدا پەمپە زەبەلاحەكان دانرابوون بۆ سووڕانەوەی ئاو لە حەوزێكی تاریك كە گەرمی بلۆكی ڕیاكتۆرەكە بڕەوێنێتەوە. ڕیاكتۆرێكی ٤٠ مێگاوات بڕێكی زۆر گەرمی بەرهەم دەهێنێت، كە نزیكەی بیست هەزار جار زیاترە لە ئاو گەرمكەرەوەیەكی ئاسایی ٢ كیلۆوات لەماڵەوە. ئێمە ناومان نابوو ڕیاكتۆرەكەی تەمموز، كە وشەیەكی عەرەبییە و ئاماژەیە بۆ مانگی تەمموز، گەرمترین مانگی ساڵ، كە پلەكانی گەرما دەگاتە ئاستێكی بەرگە نەگیراو، هەروەها مانگی كودەتاكە كە بەعسیەكانی هێنایە سەر دەسەڵات لە ساڵی ١٩٦٨،

فەرەنسییەكان بە پرۆژەی ئۆسیراق[1] ناویان دەبرد، كە تێكەڵەیەك بوو لە ناوی ڕیاكتۆری فەرەنسی، ئۆسیریس[2]، لەگەڵ ناوی وڵاتەكەم.

هاوكارانم لە نزیكەوە بەشدار بوون لە ئەنجامدانی گرێبەستەكە لەگەڵ كۆمیسیۆنی وزەی ئەتۆمی فەرەنسا. هێشتا هاوتا فەرەنسییەكانمان نەبینیبوو، كاتێك لە پاییزی ساڵی ١٩٧٩دا، فەرمانی نووسراوم لە ئەلهاشمی بەڕێوەبەری IAEC وەرگرت بۆ ئەوەی گەشت بۆ فەرەنسا و نوێنەرایەتی IAEC بكەم وەك بەڕێوەبەری گروپ. ئەمەش بەو مانایە بوو كە من بەرپرسیار دەبم لە پێناسەكردنی ئەو تاقیكردنەوانەی كە لە ڕیاكتۆرە نوێیەكەدا ئەنجام دەدرێن: ئەمەش شەرەفێكی چاوەڕواننەكراو بوو.

لە مانگی كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٩ بە فڕۆكە گەیشتمە پاریس بۆ گفتوگۆكردن لەسەر پێكهاتەی ڕیاكتۆرەكە لە سەنتەری لێكۆڵینەوە ئەتۆمییەكان لە ساكلی. كارمەندێكی دیاری كۆمیسیۆنی وزەی ئەتۆمی فەرەنسا لە فڕۆكەخانەی شارل دیگۆل هەڵیگرتم. ئەو بە ئینگلیزییەكی ڕەوان قسەی دەكرد، بەڵام لەگەڵ باركردنی جانتاكەم لە ئۆتۆمبێلەكەیدا، هەستم بە بێمتمانەییەكی ناڕوون كرد لەلایەن ئەوەوە.

وتی: "تێدەگەم ئێوە خەریكن تاقیكردنەوەی بۆ ڕیاكتۆرەكە دەكەن." - هیوادارم سەركەوتوو بن.

من، وەك عەرەبێك -كە ڕاهاتووە بە شیعر و گوتەی پڕ لە ڕەوانبێژی- سەرنجی وردییەكانی دیالۆگ و مانا شاراوەكانی پشت

---

[1] Osiraq

[2] Osiris

قسه‌كانی ئه‌و مرۆڤه‌م دا. یه‌كسه‌ر دركه‌ی[١] لێدوانه‌كه‌یم بۆ ده‌ركه‌وت. له كاتێكدا به بێده‌نگی له فرۆكه‌خانه ده‌رچووین، كاریگه‌رییه‌كانی هه‌ڵوێسته‌كه‌یم له‌به‌رچاو گرت. لانی كه‌م له ئاستێكدا فه‌ره‌نسییه‌كان گومانیان له نیازه ڕاگه‌یه‌ندراوه‌كانی عێراق بۆ ڕیاكتۆره‌كه هه‌بوو. ئه‌مه‌ش ده‌توانێت ئه‌ركی پێناسه‌كردنی تاقیكردنه‌وه‌كانم ئاڵۆزتر بكات، چونكه له ژێر هه‌ورێكی گوماناویدا كارم ده‌كرد. له‌كاتێكدا به ئۆتۆمبێله‌كه‌ماندا به پاریسدا ده‌ڕۆیشتین، هه‌ستم به پێویستی كرد كه ئه‌م بێده‌نگییه بشكێنم، چونكه خانه‌خوێ فه‌ره‌نسیه‌كه‌م به ئه‌ده‌به‌وه، به‌ڵام به ساردییه‌وه ئاماژه‌ی به چه‌ند شوێنێكی گرینگ كرد.

كاتێك به‌سه‌ر پردی ڕێڕه‌وی ئاوه‌كه‌دا ڕه‌ت ده‌بووین كه به پاریسدا ده‌ڕوات، وتی: "ئه‌مه ڕووباری به‌ناوبانگی سینه[٢]".

وتم: "ڕووباری 'گوناه؟'"[٣] ، هه‌وڵمدا به زمانی ئینگلیزی وه‌ك بلێی قسه‌یه‌كی زل بكه‌م. «كه‌واته پێم بڵێ، چه‌ند گوناه له‌سه‌ر ڕووباری به‌ناوبانگی 'گوناه' ئه‌نجامدراون؟"

سه‌ره‌تا له یاری وشه گه‌مژانه‌ی من تێنه‌گه‌یشت، بۆیه دووباره‌م كرده‌وه، "ڕووباری گوناه!"

به پێكه‌نینێكی ڕاسته‌قینه‌وه وتی: "ئۆه". - لێره‌دا گوناهی زۆر كراوه، دڵنیاتان ده‌كه‌مه‌وه. زۆر!"

هه‌ردوو لامان پێكه‌نین و به‌مه‌ش كه‌ش و هه‌وای نێوانمان باشتر بوو. كه گه‌یشتینه هۆتێله‌كه، به گه‌رمی ته‌وقه‌ی ماڵئاوایی له‌گه‌ڵدا

---

[١] ئایرۆنی

[٢] Seine River به فه‌ره‌نسی

[٣] Sin به ئینگلیزی

كردم و ڕازی بوو به‌یانیه‌كه‌ی دیكه كۆببینه‌وه و قاوه بخۆینه‌وه. ڕۆژی دواتر بردمی بۆ ساكلی و ئه‌و زانایانه‌ی پێ ناساندم كه تاقیكردنه‌وه‌یان له ڕیاكتۆری ئۆسیریسی فه‌ره‌نسی ئه‌نجام ده‌دا، ئه‌مه‌ش مۆدێلی ئه‌و ڕیاكتۆره بوو كه IAEC كڕیبووی. به‌ڵام هه‌ر كه هاوڕێ نوێیه‌كه‌م ڕۆیشت، ئه‌و نیازپاكییه‌ی ڕۆژێك پێشتر دامه‌زرابوو، هه‌مووی به‌هه‌ڵم بوو. له‌لایه‌ن زانایانی ساكلییه‌وه زۆر به كه‌می هاوكاری كرام. دوای چه‌ند ڕۆژێكی بێزاركه‌ر، به به‌رپرسی ئۆپه‌راسیۆنه‌كانی ساكلیم گوت كه به‌نیازم بگه‌ڕێمه‌وه بۆ عێراق، چونكه ناتوانم ئه‌ركه‌كانم جێبه‌جێ بكه‌م. ئه‌مه‌ش هاوكاره فه‌ره‌نسییه‌كانی خسته بارێكی خراپ، چونكه ئه‌وان ده‌بوو پابه‌ندبن به گرێبه‌ستێكی گرانبه‌ها كه شكاندنی ئه‌سته‌م بوو. له‌بیرمه كه چۆن ئه‌و ئێواره‌یه ژماره‌یه‌ك په‌یوه‌ندی ته‌له‌فۆنی له ئاستی باڵادا ئه‌نجامدران. ڕۆژی دواتر پێم گوترا چاوه‌ڕوانی پێشوازییه‌كی جیاواز بكه‌م له ساكلی.

ئه‌وه‌بوو زانا فه‌ره‌نسییه‌كان به‌جۆرێك له‌گه‌ڵم گۆڕان كه ڕه‌چاوكردنی سیاسییان له پشته‌وه دانا و وه‌ك هاوڕێ و ئه‌ندازیارێك مامه‌ڵه‌یان له‌گه‌ڵ كردم. وه‌رچه‌رخانێك له هه‌ڵوێستیاندا ڕوویدا به‌جۆرێك واهه‌ستم ده‌كرد وه‌ك ئه‌وه‌ی خاوه‌نی شوێنه‌كه بم. به خێرایی شه‌ش تاقیكردنه‌وه‌م دامه‌زراند بۆ تاقیكردنه‌وه‌ی ماده‌كانی ناو ڕیاكتۆره‌كه. چوار له‌وانه كاریگه‌ری نیوترۆنه‌كان له‌سه‌ر مادده پێكهاته‌ییه‌كان ده‌كۆڵنه‌وه و دوو تاقیكردنه‌وه‌ی دیكه فیزیاییش. زانایانی فه‌ره‌نسی سه‌رسام بوون به زانیاری من له‌سه‌ر ئه‌ندازیاری ڕیاكتۆری ئه‌تۆمی، كه به‌شێكی زۆری له ئیتاڵییه‌كان فێری ببووم.

به‌رله‌وه‌ی بگه‌ڕێمه‌وه عێراق، جاك جێنتۆن، به‌رپرسی

تاقیکردنەوەکان لە ساکلی، بانگهێشتی کردم بۆ خوانێکی ئێوارە لە پاریس. دوای نانخواردن لە چێشتخانەیەکی باشی فەرەنسی، سێ پیاو لەگەڵمان بوون کە وەك بەرپرسی باڵای کۆمیسیۆنی وزەی ئەتۆمی فەرەنسی ناسێنران. بە یاوەریی ئەوان بردیانین بۆ دامەزراوەیەك بە ناوی ئەسپی شێت[1]. چووینە ناو هۆڵێکی تاریك، هەرزوو درکم بەوەکرد کە ئەوە یانەی بەدڕەوشتییە. ئەو ژنانەی کە نیمچە ڕووتبوون، لەسەر شانۆ بە شێوازی باڵێ سەمایان دەکرد، کە بە گڵۆپی ڕەنگاوڕەنگ ڕووناك دەکرانەوە. مۆسیقایەکیش لەسەر ڕیتمیك وەك هەناسەدانی قورس بەرز و دەژەنرا.

یەکێك لە فەرەنسییەکان دەستی خستە سەر ئەژنۆم و بە هێمنی وتی: "نیگەران مەبە، ئەمە شوێنێکی ڕاقییە."

سەیر بوو کە یەکەم سەردانم بۆ یانەیەکی ستریپ لەگەڵ زانایانی باڵای دامەزراوەی ئەتۆمی فەرەنسا بێت. منیان بردە سەر مێزێکی تایبەت کە ڕووی لە نمایشەکە بوو و لە شوێنێك دانیشتم کە وەك بڵێی شەرەفمەندبم، ڕاستەوخۆ ڕووم لە سەکۆ بوو. پێدەچوو تەواوی شتەکان بۆ سوودی من داڕێژرابێت، بۆ ئەوەی کەشێك دروست بکەن کە ئینتیمام هەبێت.

یەکێك لە خانەخوێکان -کە جەستەیەکی قەڵەو شێوازی ئاخاوتنی گەرم و گوڕ بوو، لەنێو گروپەکەش لەهەموویان باشتر ئینگلیزی دەزانی- بە شێوەیەکی پیلانگێڕانە بەلای مندا دایەوە و وتی: مەهدی، شتێکم پێ بڵێ.. دەبێت عێراق پارەیەکی زۆری هەبێت. سەیرکە ئەوەندە نەوتەتان هەیە. حەز دەکەم شتێك بپرسم. عێراق چ پێویستی بە ڕیاکتۆری ئەتۆمی هەیە؟"

---

(1) the Crazy Horse

پرسیارەكە دیار بوو، بەڵام لە ناو ئەم بارودۆخ و شوێنە جێگای سەر سوڕمان بوو. ئەوەبوو سەیری سەكۆی نمایشەكەم كرد و بیرم لەوە كردەوە كە چۆن وەڵام بدەمەوە. ئێستا گومانم دەكرد كە ڕەنگە هەندێك لەو پیاوانە بریكاری هەواڵگری فەرەنسی بن و بۆیە دەبوایە هۆشیار بم.

بە پێكەنینەوە گوتم: "وەك دەزانن، عێراق گەلێكە هەوڵدەدات پەیوەندی بە جیهانی پیشەسازییەوە بكات و ببێتە نەتەوەیەكی گەورە وەك فەرەنسا".

یەكێكی دیكە لە خانەخوێكان وتی: تۆ وەك پیاوێكی زیرەك دەردەكەویت. – باشە بۆچی پێشتر تۆمان نەبینیوە؟ لەوەو پێش دكتۆر جەعفەر، دكتۆر شەهرەستانی و دكتۆر هاشمیمان دەناسی. ئایا ئەمانە دیارترین كەس نین لە كۆمیسیۆنی وزەی ئەتۆمی عێراق؟"

بۆ من ڕوون بوو كە خانەخوێكان دەیانەوێت زیاتر دەربارەی پلەبەندی IAEC و هەروەها مەبەستەكانی بۆ ڕیاكتۆرەكە بزانن. لێرەشدا هەستم دەكرد كە دەبێ وریا بم.

بە هەمان ڕۆح سووكیەوە وەڵامم دایەوە: "ئەوان زۆر سەرقاڵم دەكەن".

پێدەچوو فەرەنسییەكان هێڵێكی لێكۆڵینەوەی ڕێكخراویان ئامادە كردبێت. وەك لە یاری باڵەدا، بە نۆرە پرسیاریان دەكرد كە پرسیارەكانیش لەشێوەی لێكۆڵینەوەدا بوون.

یەكێك لە فەرەنسییەكان بەو لای مێزەكەدا كردیەوە و گوتی: "دكتۆر مەهدی، ئێمە دەزانین عێراق وڵاتێكی زۆر پێشكەوتووە،

هه‌وڵده‌دات خۆی بۆ داهاتوویه‌ك ئاماده بكات كه پێویستی به نه‌وت نه‌بێت، به‌ڵام كه‌سانێك هه‌ن كه ڕیاكتۆرێكی ئه‌تۆمی به‌كارده‌هێنن بۆ دروستكردنی بۆمب".

ئێستا هه‌موو كارته‌كان له‌سه‌ر مێزه‌كه بوون. ئه‌م پیاوانه پێیان وابوو من ئێستا شتێك ده‌زانم كه له‌وه‌و پێش نه‌مده‌زانی.

ئه‌وه‌بوو گوتم: بێگومان، زۆرێك له فه‌رمانبه‌ره‌كانتان نیگه‌رانی خۆیان له‌م باره‌یه‌وه ده‌ربڕیوه. به‌ڵام من پێم وایه له وڵاتێكی وه‌ك فه‌ره‌نسا مرۆڤ به بێتاوان داده‌نرێت تا تاوانه‌كه‌ی ده‌سه‌لمێنرێت. ئایا ئه‌مه وا نییه؟"

كاتێك لێكۆڵینه‌وه‌كه له‌وێ كۆتایی هات، منیش هه‌ستم به هێوربوونه‌وه كرد. دوای ئه‌وه‌ی نیوه‌شه تێپه‌ڕی، گه‌رامه‌وه بۆ هۆتێله‌كه‌م و هه‌ستم به ناڕه‌حه‌تی ده‌كرد. جۆرێك له هه‌ستی ناڕه‌حه‌تی كه له نێوان هاوڕێ زاناكانی وڵاتێكی دیكه و هێزه تاریك و لێڵه‌كانی نیشتمان گیرم خواردبوو. هیچ ڕێگه‌یه‌كم نه‌بوو بۆ ئه‌وه‌ی بزانم له ساڵانی داهاتوودا چه‌ندین جار خۆم له‌م دۆخه نائاساییه‌دا ده‌بینمه‌وه. ڕۆژی دواتر به سه‌رێكی پڕ له گومانه‌وه گه‌ڕامه‌وه عێراق.

هاوكات پرۆژه‌ی ڕیاكتۆری ئه‌تۆمی عێراق بووبوو به یارییه‌كی مه‌ترسیدار، چ له ناوخۆ و چ له ده‌ره‌وه‌ی عێراق. هه‌ر زوو دوای گه‌ڕانه‌وه‌م له فه‌ره‌نسا، پیاوانی سه‌ددام، دكتۆر حوسێن شه‌هرستانیان ده‌ستگیركرد به تۆمه‌تی په‌یوه‌ندی به حزبێكی ئیسلامی كه به دوژمنایه‌تی حكومه‌تی به‌عس سه‌یر ده‌كرا. ڕاستی تۆمه‌ته‌كان - شتێك كه مه‌حاڵ بوو له سه‌رده‌می سه‌ددامدا ده‌ستنیشان بكرێت - هه‌رگیز بۆ ئێمه ڕوون نه‌كرایه‌وه. به‌ڵام ئه‌گه‌ر

دكتۆر حوسێن تێكەڵ بە سیاسەتی ئۆپۆزسیۆن بووبێت، ئەوە هەنگاوێکی خۆکوژی بوو بۆ زانایەکی دامەزراو لە نێو حکومەت. چەندین ساڵی لە زیندانێکی تاکەکەسی بەسەر برد. لە لیستی ئامانجەکاندا، دکتۆر جەعفەر لە پلەی دووەمدا بوو. دوای سەردانی هاوسەر و منداڵە سەرلێشێواوەکانی دکتۆر حوسێن کەوتە ژێر گومانەوە و لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠دا بۆ ماوەی بیست مانگی داهاتوو لە ماڵەوەدا دەست بەسەرکرا.

پیلانی بیانی دژی بەرنامەی ئەتۆمی عێراق فشارەکانی زیاتر بەرزکردەوە. لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٧٩دا، تێکدەرەکان چوونە ناو دامەزراوەی هەڵگرتنەکە لە شاری تۆلۆن لە فەرەنسا، کە ناوکەکانی ڕیاکتۆری تەمموز لەوێ هەڵگیرابوون و پێنج بارگەی تەقەمەنییان تەقاندەوە کە زیانێکی زۆری پێگەیاندن. زۆرینەی ئاماژەکان پەنجەیان بۆ دەزگای نهێنی ئیسرائیل، واتە مۆساد درێژ دەکرد. پاشان لە ساڵی ١٩٨٠دا پیلانگێڕییەکان کوشندەتر بوون. لە ماوەی چەند مانگێکدا سێ زانا کە بەناوی بەرنامەی ئەتۆمی عێراقەوە کاریان دەکرد، مردن.

ئەم سێ زانایە، یەکەمیان یەحیا ئەلمەشد بوو، فیزیازانێکی میسری بوو کە لەلایەن عێراقەوە ڕاسپێردرابوو بۆ سەرپەرشتیکردنی یەکپارچەیی سووتەمەنی یۆرانیۆم بۆ ڕیاکتۆرەکە. لە چەند بۆنەیەکدا لە بەغدا چاوم پێی کەوتبوو و بەڕاستی ئەو پیاوەم بەدڵ بوو. لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٠ لە ژووری هۆتێلەکەی لە پاریسدا بە چەقۆ کوژرا و تۆمەتەکە خرایە گەردنی ژنێکی فەرەنسی کە گومانی لەشفرۆشی لێدەکرا، ئەویش دوای ماوەیەکی کەم لە ڕووداوێکی ئۆتۆمبێلدا گیانی لەدەستدا. هەر لەو ساڵەدا ئەندازیارێکی کارەبا بە ناوی سەلمان

ڕەشید کە لەگەڵ دکتۆر جەعفەر کاریان کردبوو، بە نەخۆشییەکی کت و پڕ لە کاتی ئامادەبوونی لە جنێڤ کاتێك سەیری جیاکەرەوەی کارۆموگناتیسی دەکرد، لە پڕ گیانی لەدەستدا. دکتۆر ڕەشید هاوڕێی من بوو، منیش بە مردنی تووشی ترس و دڵەڕاوکێ بووم. دوای شەش مانگ یەکێك لە ئەندازیارانی سەرەکی IAEC کە لە نزیکەوە لەگەڵیدا کارم کردبوو، عەبدولڕەحمان عەبدولڕەسووڵ، لە ئێوارەخوانێکدا لە فەرەنسا ژەهراوی بوو و گیانی لەدەستدا.

ئەم زنجیرە کوشتنانە، بەڕادەیەکی زۆر منیان هەژاند، چونکە تێگەیشتم من لە بەرنامەیەکدا بەشدارم کە کەسێك بڕیاری داوە بە هەر نرخێك بێت ئەم بەرنامەیە بوەستێنێت. بۆیە نیگەرانی ئەوەبووم منیش لە پلەی دووەمی لیستەکەدا بم و لە ترسدا دەژیام. ئەو ڕاستییەی کە دوو لە سێ قوربانییەکان ئەوانەبوون کە کاریان لەسەر ڕیاکتۆری ڕاستەقینە دەکرد، لە کاتێکدا من لە تەنها لە بەشی تاقیکردنەوەکان بووم، هیچی نەکرد بۆ دڵنەوایی من.

لەم کەشوهەوا ناخۆشەدا، ئاژانسی عێراقی وزەی ئەتۆمی دانوستانی لەگەڵ فەرەنسییەکان کرد بۆ چاککردنەوەی ناوەکی ڕیاکتۆرە تێکچووەکان، ئەمەش بووە هۆی دواخستنی گەیاندنیان بۆ زیاتر لە شەش مانگ. تیشکی ئێکس لە ناوکەکاندا ئەوەی دەرخست کە بە درێژایی چینەکانی ناوەوە شکاون. من و چەند هاوکارێکم ئەمەمان بۆ سەرنجی سەرۆکەکانمان لە IAEC ڕوونکردەوە، بەڵام ئەوان شانی خۆیان لە نیگەرانییەکان هەڵکێشا. ئەوان پێداگرییان لەسەر ئەوە دەکرد کە ناوکی ڕیاکتۆرەکە دەتوانێت بۆ ساڵانێك بە سەلامەتی کار بکات پێش ئەوەی هیچ کێشەیەکی ڕاستەقینە دروست بکات. من نەمدەتوانی لە هەڵوێستی

بێباكانەیان تێبگەم. بۆچی كەسێك تەنانەت مەترسییەكی بچووكیش لەگەڵ شتێكی مەترسیدار وەك ڕیاكتۆرێكی ئەتۆمیدا بكات؟

بە ڕێكەوت لەوكاتانەدا بوو كە بڕیار بوو لەگەڵ سەدان زانای دیكە لە سەرانسەری جیهان بەشداری كۆنگرەی نێودەوڵەتی میكانیكی پێكهاتەیی بكەم لە بەرلین. یاریدەدەری سەرۆكی كۆمیسیۆنی ڕێكخستنی ئەتۆمی ئەمریكی وتارێكی سەبارەت بە درز كەوتنی پۆڵای بێ خەوش بەهۆی فشار و ژەنگاوی لە ڕیاكتۆرە ئەتۆمییەكان پێشكەش كرد. دوای وتارەكەی، بردم بۆ لایەك بۆ خواردنەوەی كوپێك چا. بەبێ ئەوەی باسی تایبەتمەندییەكانی ئەو دووفاقییە بكەم كە ڕووبەڕووم بووەوە یان باوەڕم وابوو كە ناوەكی ڕیاكتۆرەكەمان بەهۆی تەقینەوەیەكی ئەنقەستەوە زیانیان پێگەیشتووە، پرسیارم لە بۆچوونی ئەو كرد سەبارەت بە كێشەیەكی گریمانەیی و كەمتر جددی.

پرسیم: "ئەگەر پۆڵای بێ خەوش بەهۆی گەرمبوونەوە بەر فشار بكەوێت، بەڵام هێشتاش كانزاكە بەهێز دەربكەوێت، ئایا هێشتا ناتوانرێت سووتەمەنی بخرێتە ناویەوە؟".

وتی: "هەرگیز، هەرگیز تەنانەت خەونیشم بە بەكارهێنانی ماددەیەكەوە نەبینیوە كە زانیبێتم پێشتر بەركەوتەی فشار بووە."

گەڕامەوە عێراق و بە هاوكارەكانم گوت كە لە هیچ بارودۆخێكدا نابێت سووتەمەنی بخەینە ناو ڕیاكتۆرەكەوە، بەهۆی زیانەكانی یەكپارچەیی ناوكەكە. هەرچەندە مەترسی دزەكردنی تیشكدەر سنووردار بوو، بەڵام دەرئەنجامەكانی كارەساتبار دەبن. چەندین كۆبوونەوەمان كرد كە تێیدا قسەی زۆر ئاڵوگۆڕ كرا. لە

كۆتاییدا نارەزایەتییەكانم هەروا بە سادەیی رەتكرانەوە.

لە دەوروبەری ئەم كاتانەدا رووداوێك هەستی منی پشتراستكردەوە كە ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی پاڵنەرێكی نهێنی هەیە بۆ بەدەستهێنانی رپاكتۆرێك لە فەرەنسا. بەرێوەبەری IAEC، دكتۆر ئەلهاشمیی باڵا كورت و جەستە پڕ، رۆژێك تەلەفۆنی بۆ كردم بۆ ئەوەی لە پێشكەوتنی كارەكانم بپرسێت. داوای لێكردم بێمە ژوورێكی بچووكی كۆنفرانس لە نزیك ئۆفیسەكەی. سەرم سورما كاتێك گەیشتمە كۆبوونەوەكە ژمارەیەك لە بەرێوەبەرانی IAECم لەوێ بینی، لەوانە دكتۆر خالید ئیبراهیم سەعید سەرۆكی بەشی پرۆژەكان و بەرێوەبەری سەرەكی دەفەر سێلبی و دكتۆر هومام. من بەجۆرێك لە جۆرەكام هەستم بە فشار كرد، ئەوەبوو دوای ئەوەی كە دانیشتم؛ دكتۆر ئەلهاشمی راستەوخۆ چووە سەر بابەتەكە.

پرسیاری كرد: "دكتۆر مەهدی، شتەكان لەگەڵ تاقیكردنەوەكان چۆن بەرەو پێش دەچن؟" پرسیارێكی نارِوون بوو، بۆیە منیش بە هەمان شێوەی نارِوون وەڵامم دایەوە. گوتم: "باشە، زۆر باشە."

وتی: مەبەستم ئەوەیە ئێمە لە رووی ستراتیژییەوە چۆنین؟ ئایا رپاكتۆرەكە دەتوانێت پێداویستییە ستراتیژییەكانی خۆی جێبەجێ بكات؟"

یەكێك لە ئەندامانی لیژنەكە كە لە تەنیشتم دانیشتبوو، دەستی خستە سەر قاچە لەرزۆكەكەم و گوتی: مەهدی تكایە ئاسوودەبە. پیاوەكە ترساوە".

من زۆر باش دكتۆر ئەلهاشمیم نەدەناسی، بەڵام دیار بوو

شتێكی نه‌گوتراوی له‌لایه‌. بازدانێكی گه‌وره‌ نه‌بوو به‌وه‌ی خه‌یاڵ بكه‌ین كه‌ پرسیاره‌ نه‌وتراوه‌كه‌ ئه‌وه‌ بوو كه‌ ئایا ده‌توانرێت ڕیاكتۆره‌كه‌ بۆ په‌ره‌پێدانی ماده‌ی پله‌ی بۆمب به‌كاربهێنرێت. ئه‌گینا بۆچی به‌و جۆره‌ گشتگیرانه‌ قسه‌ی ده‌كرد؟ به‌ڵام منیش باشتر ده‌مزانی له‌وه‌ی بپرسم "چ مه‌رجێكی ستراتیژی؟" ناچار بووم به‌ وردی وه‌ڵام بده‌مه‌وه‌.

گوتم: كاكه‌، دڵنیام تاقیكردنه‌وه‌كان هه‌ر چاوه‌ڕوانییه‌كیان لێ داوا بكرێت، به‌دی دێنن.

دكتۆر ئه‌لهاشمی ته‌نیا به‌ به‌شێكی وه‌ڵامه‌كه‌ ڕازی بوو، به‌ڵام خۆی له‌ پرسیاركردنی زیاتر به‌دوور گرت و ڕووی له‌ به‌ڕێوه‌به‌ره‌كانی دیكه‌ی ئاژانسی عێراقی بۆ وزه‌ی ئه‌تۆمی كرد. گوتی: "سه‌یری ئێره‌ بكه‌ن. - هه‌مووتان دڵنیابن كه‌ دواهه‌مین كه‌س سه‌ری من ده‌بڕدرێت."

گرنگی لێدوانه‌كانی ئه‌لهاشمی ڕوون بوون. ڕیاكتۆری ته‌مموز ده‌بوو خزمه‌ت به‌ ئامانجێكی هێنده‌ گرنگ بكات كه‌ سه‌رۆكی ئاژانسی عێراقی بۆ وزه‌ی ئه‌تۆمی ترسی ئه‌وه‌ی هه‌بوو كه‌ شكستهێنان ژیانی به‌فیڕۆ بدات. پرسیاره‌كه‌ی دكتۆر ئه‌لهاشمی سه‌باره‌ت به‌ "پێداویستییه‌ ستراتیژییه‌كان" ئاماژه‌بوو بۆ خواستی حكومه‌ت بۆ په‌ره‌پێدانی چه‌كی ئه‌تۆمی. به‌ڵام ئاره‌زوو شتێكه‌ و هه‌بوونی پلانێكی یه‌كگرتوو بۆ گه‌یشتن به‌ ئامانجێكی دیاریكراو ته‌واو شتێكی تره‌. كاتێك هه‌نگاوم نایه‌ دواوه‌ بۆ ئه‌وه‌ی سه‌یری وێنه‌ گه‌وره‌كه‌ بكه‌م، نه‌گونجانێكم له‌ نێوان بیرۆكه‌ و واقیعدا بینی. ڕه‌نگه‌ به‌ كڕینی ڕیاكتۆری فه‌ره‌نسی، ئاژانسی نێوده‌وڵه‌تی وزه‌ی ئه‌تۆمی چه‌ند هه‌نگاوی یه‌كه‌می له‌ ڕێگای به‌رنامه‌ی چه‌كی

ئەتۆمیدا بنێت. بەڵام ڕیاکتۆرە ٤٠ مێگاواتەکە سووتەمەنی یۆرانیۆمی پێویستی تێدا نابێت بۆ دەوڵەمەندکردنی بۆ چەکێك. هەروەها نزیك بووم لەوەی دڵنیا ببمەوە کە ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی هیچ ستراتیژییەکی نەبووە بۆ گۆڕینی ماددە شکاوەکە بۆ چەك تەنانەت ئەگەر مادەکەش بتوانرێت بەرهەم بهێنرێت.

وەهمەکانی ناو IAEC ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە منەوە نەبوو. بەڵکو بەرپرسیارێتی من تاقیکردنەوەکانی ناو ڕیاکتۆرەکە بوو، لەوە زیاتر هیچی ترنا. زانایان بەگشتی حەز ناکەن تێکەڵ بە سیاسەت ببن و منیش وەك پیشەگەرێکی ئەرکدار، سەرنجم لەسەر ئەرکەکەم هێشتەوە. ئەگەر ئاوڕێك لە دواوە بدەمەوە، پێموایە هەندێك لە بیرۆکە ئایدیالیزمە گەرم و گوڕەکانی گەنجیم پێشتر جێگەی خۆیان بە ڕەچاوکردنی پراکتیکی پیاوێکی خێزانیی لە ناوەڕاستی سییەکانی تەمەنیدا داوە. لە ڕووی زانستییەوە کارەکەم بەناوبانگ بوو و سەرنجڕاکێش بوو و من و لەیلا پێشتر دوو منداڵی بچووکمان هەبوو کە خۆراکیان پێ بدەین.

دوای چەند مانگێك لە شەڕ و پێکدادانەکانی سەر سنوور بەشێوەیەکی ئاست نزم، ئەوەبوو سەددام لە پاییزی ساڵی ١٩٨٠دا هێرشێکی تەواوی لەدژی ئێران دەستپێکرد، فڕۆکە جەنگییەکانی عێراق هێرشیان کردە سەر کێڵگە ئاسمانییەکانی ئێران و باڵاوگەکانی نەوتیان بۆردومان کرد، هاوکات سەربازە زەمینییەکانی سەددام شارە سنوورییەکانی ئێرانیان گەمارۆدا و بەو ڕادەیەی هێندەی گونجاو بوو خاکی ئێرانیان داگیرکرد. ئێرانییەکان بە بۆردومانی بەغدا و شارەکانی دیکەی عێراق تۆڵەیان کردەوە، لەوانەش لێدانێك بوو کە باڵەخانەیەکی لە التویثة

خاپوورکرد، لەگەڵ ئەوەشدا دامەزراوەی ڕیاکتۆرەکەی بێ زیان بەجێهێشت.

سەرەڕای دەستپێشخەرییەکانی ئاشتی دەرەکی، لەگەڵ هەر مانگێکدا دوژمنایەتییەکانی نێوان عێراق و ئێران پەرەی دەسەند. تا ساڵی ١٩٨١ دۆخەکە گەیشتبووە چەقبەستوویەکی ترسناك. سەربازانی عێراق لە ئەهوارەکانی باشووری عێراق لەگەڵ دەیان هەزار سەربازی شۆڕشگێڕی ئێرانی لە شەڕ و پێکدادانێکدا نوقم بوون. منیش وەك زۆرێك لە عێراقییەکان باوەڕم وابوو کە ئەم ناکۆکییە سنوورییە لە ئایندەیەکی نزیکدا یەکلایی دەبێتەوە. کەس پێشبینی نەدەکرد بۆ ماوەی هەشت ساڵ خوێناوی بەردەوام بێت و ببێتە درێژترین شەڕی سەدەی بیستەم.

پێکهاتەکانی کۆتایی بۆ ڕیاکتۆری فەرەنسی لە سەرەتای ساڵی ١٩٨١ گەیشتنە عێراق، لەگەڵ دانانی لە دامەزراوەی التویثة، سەرنجم دا کێشەیەکی دیکە هەیە. بۆری ئەلەمنیۆمی بەرەو بلۆکی ڕیاکتۆرەکە چاڵی تێدا بوو، بەهۆی پارچەیەك لە کانزاکە کە کاتێك پڕکرابووەوە کەوتبووە ناو حەوزەکەوە. هەرچەندە زیانەکان هیچ مەترسییەکی دزەکردنی تیشکدەریان نەخستەڕوو، بەڵام من ئاماژەم بەوەدا کە ئەو کەموکوڕییە لە کۆتاییدا پێویستی بە چاککردنەوە دەبێت و پێدەچوو باشتر بێت پێش ئەوەی ڕیاکتۆرەکە بە سووتەمەنی تیشکدەرەوە بچێتە بواری جێبەجێکردنەوە. بەڵام فەرەنسییەکان ئامادە نەبوون چاکی بکەنەوە و ڕایانگەیاندبوو کە ٢٥ ملیۆن دۆلاری تێدەچێت. گومانم بۆ دروست ببوو کە فەرەنسییەکان لە پرۆژەی تەمموز سارد ببوونەوە، بەهۆی گومان لە مەبەستی ڕاستەقینەی ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی.

لە کاتێکدا لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٨١دا ئامادەکارییەکانی کۆتاییمان بۆ ڕیاکتۆرەکە دەکرد، سەددام بیست ئۆتۆمبێلی نوێی وەك دیاری پێشکەش بە بەرپرسانی باڵا و زانایانی IAEC کرد. چاوەڕوانییەکی سەرسوڕهێنەر بوو. بەڵام من لەهەموو جۆرە بەخشش و دیاریەك دوورخرابوومەوە. ئەگەرچی سەرەڕای ئەوەی سەرۆکی بەشی کەرەستە و یەکێك بووم لە زانایانی باڵا لە IAEC. کاتێك بینیم ئۆتۆمبێل بە ژمارەیەك کارمەندی ژێر پلەکەم بەخشراوە، تەنها یەك هۆکار لەلام ڕوون بوو. بەڕێوەبەرەکانم منیان بە ئامانج گرتبوو، چونکە هۆشداریم دابوو لە بەکارهێنانی بلۆکی ڕیاکتۆرەکە. ئەو ڕۆژە وانەیەکی بەردەوامی دیکە فێربووم: بۆ زانایەك نییە ئەو پرسانە بخاتەڕوو کە بۆ حکومەتی سەددام جێگای ناڕەحەتی بوون.

لە کۆتاییدا ڕیاکتۆری تەممووز هەرگیز وەگەڕ نەخرا. تەنها چەند ڕۆژێك پێش ئەوەی پلانمان هەبێت بۆ دانانی ناوەکی ڕیاکتۆری تیشکدەر، ڕۆژی یەکشەممە ٧ی حوزەیران، هەشت فڕۆکەی شەڕکەری ئیسرائیلی ئێف ١٦ زیاتر لە هەزار میل فڕی بوون بۆ گەیشتن بە بەغدا و بەسەر سنوورەکانی ئوردن و سعودیەدا هاتبوون و لە بەرزاییە نزمەکاندا بەناو ڕۆژئاوای عێراق بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ڕادارەوە دەستنیشان نەکرێن. ئەوان بەسەر پایتەختدا سوڕانەوەو دوای کاتژمێر ٥:٣٠ ی ئێوارە وەك چۆن خۆر ڕاستەوخۆ لە پشتیانەوە لە ڕۆژئاوا دەدرەوشایەوە. بەرگرییە ئاسمانییەکانی عێراق کە بە تەواوی لە بێئاگایی دابوون، کێشەیان هەبوو لە ئامانجکردنی ئەوان دژ بە تیشکی خۆری کوێرکەر. یەکەم فڕۆکەی ئێف ١٦ بۆمبێکی ڕاستەوخۆی خستە سەر قوبەی ڕیاکتۆرەکەدا و کونێك یان درزێکی تێدا کرد. بە وردبینییەکی

باوەڕپێنەكراو، شەش دانە لە حەوت فڕۆكەكەی تر ڕاستەوخۆ بۆمبیان لە كونەكەوە فڕێدایە ناو هۆڵی ڕیاكتۆرەكە و تەقینەوە. تەواوی هێرشەكە كەمتر لە دوو خولەكی خایاند.

دوای پێكانی ئامانجەكەیان، فڕۆكەوانە ئیسرائیلییەكان لە مووشەكە عێراقییەكانی سەرزەوی بۆ ئاسمان دەربازیان بوو و بەبێ زیان گەڕانەوە.

ئەو ئێوارەیە لە ڕادیۆ گوێم لە بۆردومانەكەی نیشتمان بوو. چەند هاوكارێكم لە شەودا تەلەفۆنیان بۆ كردم و باوەڕیان نەدەكرد، ئێمەش ڕێككەوتین كە بەیانی یەكەم شت لە التویثة كۆببینەوە. ڕۆژ بوویەوە یەكەم شت قەبارەی زیانەكانی ئاشكرا كرد. ئەو تیشكە ستوونییەی كە پشتگیری لە قوبڵەكە كردبوو، بە شێوەیەكی خۆڕسك بەرەو لایەك مەیل بوو و قوبەكەش داڕمابوو بۆ خوارەوە لەسەر ناوەكی ڕیاكتۆرەكە. تیشكی خۆر لە سەرەوە هاتبووە ژوورەوە و دەمانتوانی بزانین كە بۆردومانەكە بلۆكی ڕیاكتۆرەكەی بە تەواوی لەناوبردووە. ئەمە قەرەبوو نەدەكرایەوە، ئیتر هەموو شتێك تەواو بوو.

تا ئەوكات كۆمەڵەیەكی زۆر لە بەرپرسان و كارمەندانی ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی لە شوێنەكەدا كۆبوونەوە و بە خەمبارییەوە پشكنینی پاشماوەكانیان دەكرد. ساڵانێك كاركردن ئەنجامەكەی بوو بەم وێرانەیە. لە هەموو دەوروبەری هۆڵی ڕیاكتۆرەكەدا بینای كارگێڕی و پشتیوانی بەبێ خەوش مابوونەوە. بەڵام بەبێ ڕیاكتۆر، ئەم بینایانە.

لەگەڵ پێكەنیندا تووشی سەر سوڕمان ببووم.

- چی ئەوەندە پێكەنیناوییە دكتۆر مەهدی؟ دكتۆر هومام پرسیاری كرد. "ئایا شتێك لەم كارەساتەدا هەیە كە پێویستە بە گاڵتەجارییەوە سەیری بكەین؟"

سەرم لەقاند و گوتم: "بوێرییەكەی، لە ڕۆژێكی ڕووناكدا. هەروەها وردبینییەكەی. سەیركە چۆن هیچ شتێكیان بە ئامانج نەگرتووە جگە لە ڕیاكتۆرەكە".

لە ماوەی دوو هەفتەدا دوای بۆردومانەكە، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان ئیدانەی ئیسرائیلی كرد بەهۆی پێشێلكردنی یاسا نێودەوڵەتییەكان لەو هێرشە خت و خۆڕاییە. سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل، مێناخم بیگین لە بەرامبەردا وتی لە كاتێك ڕیاكتۆری تەمموز چالاك ببووا، بەم زووانە عێراق دەیتوانی ببێت بە هێزێكی چەكداری ئەتۆمی كە هەڕەشە لە وڵاتەكەی بكات. ئیسرائیل بە پێشبینیكردنی زیاتر لە بیست ساڵ بەر لە هۆكاری شەڕی ساڵی ٢٠٠٣ دژی عێراق، ئیدیعای ئەوەی كرد كە مامەڵەكەی لەسەر بنەمای "بەرگریكردن لەخۆی"بوو. ئاماژەی بەوەدا كە ناتوانرێت ڕێگە بە عێراق بدرێت وەك دەوڵەتێكی شەڕانگێز چەكی كۆمەڵكوژی پەرەپێبدات و پێویستە كردەوەی تاكلایەنە بۆ لابردنی هەڕەشەیەكی لەمجۆرە جێبەجێبكرێت.

بۆردومانكردنی ڕیاكتۆری تەمموز مشتومڕێكی نێودەوڵەتیی هەڵگیرساند سەبارەت بەوەی كە عێراق چەندە نزیك بووەتەوە لە پەرەپێدانی چەكی ئەتۆمی و چی بكرێت سەبارەت بە ئارەزووی سەددام بۆ بۆمبی ئەتۆمی. هاوتا فەرەنسییەكانمان لە ساكلی بەناوی عێراقەوە ئاماژەیان بەوەدا كە ڕیاكتۆری تەمموز بۆ بەرهەمهێنانی پلۆتۆنیۆم ناشایستە و پشكنینەكانی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی

ئه‌تۆمی و ته‌كنیكارانی فه‌ره‌نسی ڕێگرییان له‌ خراپ به‌كارهێنانی ڕیاكتۆره‌كه‌ ده‌كرد.

له‌سه‌ره‌تادا فه‌ره‌نسا نیازی خۆی ڕاگه‌یاند بۆ یارمه‌تیدانی دووباره‌ بنیاتنانه‌وه‌ی ڕیاكتۆره‌كه‌ و به‌رده‌وامبوون له‌ هاوكاریكردنی پرۆگرامی ئه‌تۆمی عێراق، به‌ڵام له‌ژێر به‌رنامه‌یه‌كی توندتری پاراستنیدا. به‌ڵام هیچ خشته‌یه‌كی كاتییان بۆ ئه‌و كاره‌ پێشكه‌ش نه‌كرد. له‌ كۆتاییدا پشكنه‌رانی ئاژانسی نێوده‌وڵه‌تی وزه‌ی ئه‌تۆمی گه‌شتیان به‌ دامه‌زراوه‌ی التویثة كرد و یۆرانیۆمی پیتێنراویان ده‌ست نیشان كرد و خشته‌ی پشكنینی داهاتووی ئه‌و ماده‌یه‌یان دانا بۆ ئه‌وه‌ی دڵنیابن له‌وه‌ی عێراق ناتوانێت به‌ نهێنی بۆ ئامانجه‌كانی دیكه‌ به‌كاری بهێنێت. چه‌ند مانگێك تێپه‌ڕی و ئه‌و هاوكارییه‌ به‌ڵێندراوه‌ی فه‌ره‌نسا هه‌رگیز به‌دی نه‌هات. بۆ ئێمه‌ومانان كه‌ ڕۆژگارێك به‌رنامه‌یه‌كی ئه‌تۆمی عێراقمان بۆ به‌رهه‌مهێنانی هێز و ئه‌نجامدانی لێكۆڵینه‌وه‌ی گرنگ پێشبینی كردبوو، ئیدی ئه‌و خه‌ونه‌مان له‌بارچوو.

دوای بۆردومانكردنی ڕیاكتۆری ته‌مموز، كه‌ش و هه‌وای نێو كۆمیسیۆنی وزه‌ی ئه‌تۆمی عێراق پڕ بوو له‌ بێباكی. هه‌موو ڕۆژێك له‌ كاتی خۆیدا ده‌چوومه‌ ئۆفیسه‌كه‌م له‌ دامه‌زراوه‌ی التویثة، به‌ڵام به‌بێ پاڵنه‌رێكی زۆر بۆ كاركردن. هه‌ندێكی تریش تا توانیان دوور كه‌وتنه‌وه‌. ڕیاكتۆری ته‌مموز ساڵانێك بوو سه‌رنجی باوی ئێمه‌ بوو و له‌ناكاو نه‌ما. دڵم وه‌ك ڕاڕه‌وه‌كانی بینای ئیداره‌یی هه‌ستی به‌ چۆڵی ده‌كرد، ئه‌و دڵه‌ چۆڵ و خاڵییه‌ی من به‌ هه‌نگاوی هێواشی ئه‌و چه‌ند زانایه‌ ده‌نگی ده‌دایه‌وه‌ كه‌ به‌ بێزاری ده‌هاتن بۆ سه‌ر كاره‌كانیان.

# بەشی سێیەم
# سەنتەرفیوج[1]

لەدەستدانی ڕیاكتۆری تەمموز بووە هۆی ئەوەی كە ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی لە بنەڕەتدا ڕێڕەوی خۆی بگۆڕێت. لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٢ سەددام بەڕێوەبەرایەتی لێكۆڵینەوەی دامەزراند بۆ لێكۆڵینەوە لە شێوازەكانی بەرهەمهێنانی مادەی بەكارهاتوو بۆ دروستكردنی چەك بەبێ ئاگاداری كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی. حكومەت لە مانگی ئەیلولی ساڵی ١٩٨١ دكتۆر جەعفەری لە زیندان ئازاد كردبوو و ڕایسپاردبوو كە سەركردایەتی ئۆفیسە نوێیەكە و ستافەكەی بكات، لەنێویشیاندا بەشی كەرەستە - كە من تییایدا كارم دەكرد - كە پشتگیری لە بەرنامە گەشە سەندووەكانی دەكرد. من زۆر كەیفم بە دكتۆر جەعفەر دەهات، فیزیازانێكی لێهاتوو و قسە نەرم و نیان بوو لە خێزانێكی ئەرستۆكراتی. هەرچەندە زۆرجار یەكترمان دەبینی، بەڵام هەرگیز نەموێرا پرسیاری ئەزموونی لە زینداندا بكەم. لە عێراقدا ئەمە بابەتێكی تابۆ بوو كە جگە لە كێشە هیچی تری لێ نەدەكەوتەوە، بەڵام من خەیاڵم دەكرد كە ئەو یادەوەرییە ترسناكانە وەك پاڵنەرێكی ڕۆژانە وابن بۆ جێبەجێكردنی بەرپرسیارێتییەكانی. دكتۆر جەعفەر تەكنەلۆژیایەكی پیتاندنی یۆرانیۆمی هەڵبژارد بە ناوی جیاكردنەوەی ئایزۆتۆپی

---

[1] دژە چەق

كارۆموگناتیسی (EMIS)، كه به‌شێكی له‌سه‌ر بنه‌مای ئاشنابوونی به خێراكه‌ر و موگناتیسیه‌كان بوو كه له CERN كه گه‌وره‌ترین تاقیگه‌ی فیزیای ته‌نۆلكه‌كانی جیهانه له سویسرا له ساڵانی حه‌فتاكان به‌ده‌ستی هێنابوو. شێوازی EMIS ئایزۆتۆپه‌كانی یۆرانیۆم جیا ده‌كاته‌وه به به‌كارهێنانی كێلگه كارۆموگناتیسیه‌كان كه له ناوه‌كی ئاسنی زه‌به‌لاحدا دروستكراون. هه‌رچه‌نده پرۆسه‌یه‌كی قورسه و بڕێكی زۆر ده‌سه‌ڵات به‌كارده‌هێنێت، به‌ڵام به‌ڕواڵه‌ت دكتۆر جه‌عفه‌ر هه‌ستی به‌وه كردووه ئه‌مه ئه‌و شێوازه‌یه كه زۆرترین ده‌ستی توانا پیشه‌سازییه‌كانی عێراقه.

هه‌روه‌ها ده‌ستی كرد به لێكۆڵینه‌وه له شێوازێكی پیتاندن كه به بڵاوبوونه‌وه‌ی گازی ناسراوه، كه تیایدا ئۆكسیدی یۆرانیۆمی ڕه‌ق ده‌كرێته پێكهاته‌یه‌كی گازی كه پێی ده‌وترێت یۆرانیۆم هێكسافلۆراید و دواتر به زۆر له ڕێگه‌ی به‌ربه‌ستێكه‌وه كه ئایزۆتۆپه‌كانی یۆرانیۆم ده‌پاڵێوێت. ئه‌مه سه‌رسوڕهێنه‌رێكی زانسته، به‌ربه‌ستی بڵاوبوونه‌وه له په‌ڕه‌یه‌كی كاغه‌ز ته‌نكتره و له هه‌ر سانتیمه‌ترێكی چوارگۆشه‌دا ده هه‌زار ملیار كون له‌خۆده‌گرێت.

په‌ره‌پێدانی ئه‌م دوو شێوازه تا ساڵی ١٩٨٤ ڕاسته‌وخۆ په‌یوه‌ندی به منه‌وه نه‌بوو، كاتێك دكتۆر جه‌عفه‌ر داوای لێكردم ڕاپۆرتێك له‌سه‌ر دروستكردنی به‌ربه‌ستی بڵاوبوونه‌وه ئاماده بكه‌م. سه‌رم سوڕما، چونكه پێشتر تیمێكی حه‌فتا زانای هه‌بوو كه كاریان له‌سه‌ر پرۆژه‌كه ده‌كرد. دكتۆر جه‌عفه‌ر ڕوونی كرده‌وه كه ئه‌و دیدێكی تازه‌ی له كه‌سێكی ده‌ره‌كییه‌وه ده‌وێت، به‌ڵام گومانم هه‌بوو كه كاركردن له‌سه‌ر به‌ربه‌سته‌كه به خراپی به‌ڕێوه‌چووه و فشارێكی زۆری له‌سه‌ره بۆ دۆزینه‌وه‌ی چاره‌سه‌رێكی دیكه. هه‌فته‌یه‌ك له كتێبخانه بووم و كورته‌یه‌كم ئاماده‌كرد كه پێشنیاری به‌كارهێنانی

ئەلەمنیۆمی ئۆکسێنراو بۆ بەربەستەکە دەکرد، لەگەڵ هۆکارێکی ورد بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە بە پشتبەستن بە زانیارییەکانم لەسەر کەرەستە. چەند ڕۆژێك دواتر دکتۆر جەعفەر بە داواکارییەکی سەرسوڕهێنەرترەوە هاتە ناو ئۆفیسەکەمەوە.

ئەو وتی: "ڕاپۆرتەکەت زۆر سەرنجڕاکێشە، خۆشحاڵ دەبم ئەگەر بتوانن بەردەوام بن لە پەرەپێدانی لە ڕووی پراکتیکییەوە." "دەمەوێت کار لەسەر بەرهەمهێنانی بەربەستێکی بڵاوبوونەوەی ڕاستەقینە بکەیت."

من گومانم هەبوو لە وەرگرتنی پرۆژەیەك کە لەگەڵ دوو ساڵ کارکردندا تێکەڵ بوو کە پێشتر لەلایەن تیمێکی دیکەوە ئەنجامدرابوو، بۆیە هەوڵمدا بیرۆکەکە ڕەت بکەمەوە.

ئەوەبوو وتم: "بۆچی کار لەسەر پرۆژەی بڵاوبوونەوە بکەم لە کاتێکدا حەفتا کەست هەیە کە لەسەر هەمان بابەت کاردەکەن؟، بۆیە لام وایە ئەمە هیچ سوودی نییە".

دکتۆر جەعفەر وتی: بەداخەوە ئەمە بڕیاری IAEC ە نەك تەنها بڕیاری من. بۆیە لەم بابەتەدا بژاردەیەکی کەم لەبەردەست دایە".

کاتێك دکتۆر جەعفەر باسی "هەڵبژاردەی کەم"ی دەکرد، دەمزانی لە ئەزموونێکی ترسناکەوە قسە دەکات. داوام لە دوو ئەندازیارەکانم کرد کە هەموو ئەو کارانەی پێشوو کراون لەسەر تەکنیکەکانی بڵاوبوونەوە کۆبکەنەوە کە هێشتا لێکۆڵینەوەمان لەسەر نەکردبوو، دەستمان کرد بە تاقیکردنەوەی ئەلەمنیۆمی ئۆکسێنراو لە بەشی کەرەستە. ئێمە بە خێرایی و حەماسەتەوە بەرامبەر هەوڵێکی نوێ وەستابووین. من شێوازێکی ئاڵۆزی

ئه‌لكترۆكیمیاییم په‌یڕه‌و كرد كه‌ ته‌واو جیاواز بوو له‌و پرۆسه‌یه‌ی كه‌ تیمه‌كه‌ی تری IAEC به‌كاریان ده‌هێنا. به‌ربه‌ستێك له‌ شریتێكی ئه‌له‌منیۆم پێكدێت، ئه‌وه‌نده‌ ته‌نكه‌ كه‌ نیمچه‌ ڕووناك ده‌بێته‌وه‌. له‌ ڕووی تیۆریه‌وه‌ پێكهاته‌ی ماده‌كه‌ تۆڕێكه‌ له‌ شه‌ش گۆشه‌ پێكهاتووه‌، هه‌ریه‌كه‌یان كونێكی بچووكی هه‌یه‌ كه‌ له‌ ناوه‌نده‌كه‌یدا كون كراوه‌، به‌جۆرێك له‌ ژێر مایكرۆسكۆپدا له‌ شانه‌ هه‌نگوینێك ده‌چێت. دوای چه‌ند هه‌فته‌یه‌ك له‌ تاقیكردنه‌وه‌ ده‌ستم كرد به‌ بینینی پێشكه‌وتن و له‌ ڕۆژی په‌نجاهه‌مدا سه‌یری پارچه‌ ئه‌له‌منیۆمێكمان كرد كه‌ دروستمان كردبوو و بۆمان ده‌ركه‌وت كه‌ سه‌ركه‌وتوو بووین. كاتێك له‌ مایكرۆسكۆپه‌كه‌ ورد بوومه‌وه‌، سه‌رم سوڕما كه‌ بینیم پێكهاته‌كه‌ شێوه‌ی شه‌ش گۆشه‌ی هه‌یه‌. له‌ كاتێكدا من و ئه‌ندازیاره‌كانم دڵمان خۆش بوو و ئاهه‌نگمان گێڕا به‌م بۆنه‌یه‌وه‌، پێشنیارم كرد كه‌ ده‌ستكه‌وته‌كانمان به‌ نهێنی بهێڵینه‌وه‌ چونكه‌ ده‌توانین وه‌ك سوپرایزێك له‌ سیمینارێكی داهاتووی IAEC سه‌باره‌ت به‌ ته‌كنیكه‌كانی بڵاوبوونه‌وه‌ پێشكه‌شی بكه‌ین.

سیمیناره‌كه‌ دوای یه‌ك دوو هه‌فته‌ له‌ هۆڵێك له‌ باره‌گای IAEC به‌ڕێوه‌چوو و بڕیار بوو دوا وتار له‌لایه‌ن منه‌وه‌ پێشكه‌ش بكرێت. له‌ كاتێكدا هاوكاره‌كانم پرۆجێكشنیان به‌كارده‌هێنا بۆ وێناكردنی لێكۆڵینه‌وه‌كانیان له‌سه‌ر جۆره‌كانی نیكل كه‌ ئه‌مریكییه‌كان و ئینگلیزه‌كان به‌كاریان ده‌هێنا و ئه‌و ئه‌لومینایه‌ی كه‌ فه‌ره‌نسییه‌كان كاریان پێده‌كرد، من له‌ناو ئاماده‌بووان دانیشتبووم و به‌ تامه‌زرۆییه‌وه‌ هاتمه‌ سه‌ر سه‌كۆكه‌. له‌ كۆتاییدا نۆره‌ی من هات. له‌ناو گلۆپه‌ كاڵبووه‌كاندا له‌ لای كۆشكه‌كه‌ وه‌ستام و ڕامگه‌یاند كه‌ پێویست ناكات پرۆجێكشن به‌كاربهێنم، چونكه‌ تیۆریه‌كه‌مان

كردووە بە واقیعێكی بەرجەستە. داوای داگیرساندنی گڵۆپەكانم كرد و بۆرییەكی بەربەستی ئەنۆدایزم بەرزكردەوە تا هەمووان ببینن. ئامادەبووان لە جەنجاڵیدا زەقبوونەوە و ژمارەیەك لە هاوكارانی IAEC كاتێك پێكهاتەی مادەكەیان بینی، بە ئیرەییەوە پیرۆزباییان لێكردم.

بۆ زانایەك ساتێكی لەو شێوەیە، لوتكەی دەستكەوتە. من باش لە خەیاڵمە كە ئەم سەركەوتنە وەك ئەو پەلەكردنەی یاریزانی تۆپی پێ وایە دوای تۆماركردنی گۆڵی بردنەوە، یان ئەوەی كە شاخەوانێك هەستی پێدەكات دوای ئەوەی دەتوانێت سەربكەوێت بەسەر چیای ئێڤرێستدا. منیش لە ستایشی هاوكارەكانمدا خۆمم خۆش كرد، بێ ئاگابووم لەوەی كە ئەم دەستكەوتە چۆن دەمخاتە ژێر سەرنجی چەتە بەهێزەكانی سەددام حوسێن.

* * *

شەڕ لەگەڵ ئێران بە شێوەیەكی كارەساتبار درێژەی كێشا. ژمارەی سەربازانی عێراقی لە دوو بە یەك زیاتر بوو، سەربازانی عێراق لە زۆربەی ئەو خاكانەی دەستبەسەریان كردبوون پاشەكشەیان كردبوو و سەربازە شۆڕشگێڕەكانی ئێران ڕووباری شەتولعەرەبیان بەزاند و هێرشی دووبارەیان كردە سەر بەرگرییەكانی دەوروبەری ئەو ملیۆن دانیشتووانەی لە شاری بەسرە لە باشووری عێراق بوون. سەددام زۆر پێویستی بە چەكی نوێ بوو، بەڵام ئەو پشتیوانییەی لە ئەمریكا و بەریتانیا و وڵاتانی دیكەوە وەریگرت لە باشترین حاڵەتدا جێی متمانە نەبوو. لە ساڵی ١٩٨٦دا ڕوون بووەوە كە ئەمریكا پشتگیری لە هەردوو لایەن دەكات كاتێك دانی بەوەدانا كە چەكی بە حكومەتی ئێران فرۆشتووە لە

ڕێكەوتنێكی نهێنیدا كە ئامانجی هەم دەستەبەركردنی ئازادكردنی بارمتە ئەمریكییەكان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەم دابینكردنی پارە بۆ كۆنتراكانی دژە حكومەت بەنهێنی لە نیكاراگوا.[1]

فشارەكان لەسەر ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی لە ناوەڕاستی هەشتاكانی سەدەی ڕابردوودا زیادیان كرد، چونكە دیار بوو سەددام لە ئەنجامەكاندا بێ تاقەت بوو. هەرچەندە چێژم لە تەحەدای زانستی وەرگرتبوو، بەڵام لە دڵمدا هەستم دەكرد كە تەكنیكی بڵاوبوونەوە شێوازێكی پراكتیكی نییە بۆ عێراق. پێویستی بە هەزاران قۆناغ هەیە، كە چەندین جۆری جیاوازی كۆمپرێسەری زۆر پێشكەوتوو و ئامێری دیكە لەخۆدەگرێت بۆ پاڵێوانی هێكسافلۆرایدی یۆرانیۆم لە ڕێگەی بەربەستەكانەوە. عێراق ئەوەندە كۆمپرێسەرەی لە كوێ دەست دەكەوێت، لە كاتێكدا هێنانی ئەم ئامێرانە بۆ عێراق قەدەغەكرابوون وەك ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی چەكی ئەتۆمی؟ بەرهەمهێنانیان لە عێراق لە دەستەبەر نەبوو. وڵاتەكە ژێرخانی ئەوتۆی نەبوو. من لەسەر پرۆژەیەكی بچووككراو جێگیر بووم، بەربەستێكی نموونەیی تێدابوو كە دوو كۆمپرێسەری تێدابوو. من ئەوەم بە مەشقێكی زانستیم زانی، نەوەك شتێك كە بتوانێت ببێتە هۆی پیتاندنی یۆرانیۆم بۆ بۆمبی ئەتۆمی.

كاتژمێر ١٠ی پاشنیوەڕۆ. لە شەوێكی هەینی گەرمی مانگی تەمموزی ١٩٨٧دا، زەنگی تەلەفۆنیماڵەوەم لێیدا. لە ژووری میوان سەیری تەلەفزیۆنم دەكرد، لە ژووری تەنیشتەوە گوێم لێ بوو لەیلا وەڵامی دایەوە.

---

[1] بۆ ڕاستی ئەو بابەتە خوێنەری بەڕێز دەتوانێت سوود لە كتێبی (مامە سام چی دەوێت؟)ی نوام چۆمسكی ببینێت.

- به‌ڵێ،... كێ قسه‌ ده‌كات تكایه‌؟" ده‌ستی به‌سه‌ر ده‌می ته‌له‌فۆنه‌كه‌دا و نیگایه‌كی سه‌رسوڕهێنه‌ر به‌ ده‌موچاویه‌وه‌ دیاربوو و هاته‌ ژووری میوان.

به‌ چرپه‌وه‌ گوتی: "ئه‌وه‌ حوسه‌ین كامله‌". واته‌: ده‌ڵێت گرنگه‌. زاوای سه‌رۆك. ئه‌وه‌بوو ده‌سكی ته‌له‌فۆنكه‌م وه‌رگرت، ده‌نگه‌كه‌ی تر وشه‌كانی به‌ ئه‌ده‌به‌وه‌ ده‌گوت، به‌ڵام تۆنه‌كه‌ی له‌ناكاو بوو.

- لێم ببوره‌ كه‌ ئه‌وه‌نده‌ دره‌نگ په‌یوه‌ندیم كرد، به‌ڵام ده‌بێت ئه‌مشه‌و بتبینم. ده‌توانم بێم بۆ ماڵه‌كه‌ت؟"

دره‌نگانی شه‌و بوو له‌ دوا ڕۆژی هه‌فته‌، كاتێكی سه‌یر بوو بۆ وه‌رگرتنی په‌یوه‌ندییه‌كی به‌په‌له‌ له‌لایه‌ن كه‌سێكی نامۆی به‌هێزه‌وه‌. خه‌ریك بوو قسه‌م بۆ نه‌یه‌ت، ئه‌وه‌بوو ناونیشانی ماڵه‌كه‌م پێدا و گوتم له‌ گه‌ڕه‌كی ئه‌لغه‌زالییه‌. گه‌ڕه‌كه‌كه‌مان گه‌ڕه‌كێكی خۆشی چینی ناوه‌ند بوو له‌ ڕۆژئاوای ناوه‌ندی شار، له‌ ساڵانی پێش هاتنه‌ سه‌ر ده‌سه‌ڵاتی سه‌ددام بۆ كه‌سانی خوێنده‌وار دروستكرابوو. كاتێك خه‌ریك بوو ناونیشانه‌كه‌مم پێده‌دا، حوسه‌ین كامل قسه‌كانی منی بڕی.

وتی: "ئه‌و ناونیشانه‌ قورسه‌." - با له‌ شوێنێكی تر یه‌كتر ببینین. پێشنیاری شوێنی وه‌ستانی ئۆتۆمبێلی كرد له‌ نه‌خۆشخانه‌ی هیلال له‌ مه‌نسور، كه‌ یه‌كێكه‌ له‌ باشترین ناوچه‌ نیشته‌جێبووه‌كانی به‌غدا، و نزیك ماڵی حوسه‌ین كامل بوو. وتم یه‌كسه‌ر به‌ڕێده‌كه‌وم. له‌ كاتێكدا خه‌ریك بوو ڕێگاكه‌م ده‌بڕی به‌ درێژایی ڕێگای خێرایی ئه‌بوغرێبدا، هه‌ستێكی ترس و تۆقاندن هاته‌ ناو دڵمه‌وه‌. باشه‌ بۆچی حوسه‌ین كامل ده‌یه‌وێت چاوی پێم بكه‌وێت و بۆچی له‌ كاتژمێرێكی وا دره‌نگدا؟ چه‌ند هه‌فته‌یه‌ك پێشتر ته‌نها جارێك به‌

كورتی لە IAEC كۆبووینەوە، دوای ئەوەی سەددام ئەوی بۆ سەرپەرشتیكردنی MIC دەستنیشان كرد.

ئەوەبوو تۆیۆتا سیدانەكەم بردە ناو گەراجی ئۆتۆمبێلەكانی نەخۆشخانەی هیلال و بینیم حوسەین كامل لە ژێر گلۆپێكی خزمەتگوزاری تاقانەدا لە تەنیشت لیمۆزینە مێرسیدسەكەی وەستاوە. لە كاتێكدا لە ئۆتۆمبێلەكەم هاتمە دەرەوە، ئەو لەژێر سێبەری تاریكییەكاندا بەرەو لای من هات. ئەو باڵای لە من كورتتر بوو، بەڵام بە لاف و گەزافی دەسەڵاتەوە دەڕۆیشت، سنگی پاڵ دەنا بۆ پێشەوە بە هەمان شێوەی هەندێك ئاژەڵ خۆیان هەڵدەئاوسێنن بۆ ئاگاداركردنەوەی نێچیرەكان. تەوقەمان كرد و سڵاوی ئاساییمان گۆڕیەوە، "السلام علیكم." لەژێر ڕووناكی گلۆپەكاندا دەمتوانی لوتی پەپوولەیی و چاوە بچووك و توندەكانی بناسمەوە كاتێك بۆ چەند ساتێك لە دەموچاوەكەیم ڕوانی. هەستەكانم پێیان وتم ئاگاداری ئەم پیاوە بە. ئیشارەتی بۆ كردم كە سەركەومە نێو ئۆتۆمبێلەكەی ئەو.

بە ئۆتۆمبێلەكەیدا بە شەقامی ئەلزەیتون، لە نێوان ماڵە ڕەنگ خۆڵییەكانی گەڕەكی قادیسیە و باخەكانی ئەلزەوورادا ڕۆیشتین و بە تەنیشت ڕووباری دیجلەدا ڕابوردین لەولایەدا كە بە درەختەكانی كالیپتۆسەوە تەندرابوو و بەرەو كۆشكی كۆماری دەڕۆیشت. بیرم هاتەوە كە دوایین جار لە ساڵی ١٩٦٨دا چوومە ئەم ناوچەیە، كاتێك هێشتا لە وەزارەتی نەوت كارم دەكرد، بۆ ئەوەی هاوكارێكم لە پاڵاوگەی دۆرەی بەغدا هەڵبگرم. لەو كاتەدا گەڕەكێكی دەوڵەمەندی نیشتەجێبوون بوو، بەڵام لەو كاتەوە سەددام خێزانەكانی لە ماڵەكانیان دەركردبوو و تەواوی ناوچەكەی كردبووە گۆڕەپانی كۆشك و شوێنی نیشتەجێبوونی

فەرمی. ئێستا زۆربەی بەغدادییەكان زۆر لە ناوچەكە دەترسان و نەیاندەتوانی بە هیچ جۆرێك لەم نزیكانە هیچ سەركێشیەك ئەنجام بدەن.

حوسەین كامل لەكاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبێلدا بە شێوەیەكی سەیر بێدەنگی لێ نیشتبوو. من ئەو شتانەم لەبەرچاو گرت كە لەبارەی ئەو پیاوەوە دەمزانی. چوون ئەو ئامۆزای سەددام بووە و خەڵكی تكریتە، لە ساڵانی حەفتاكانی سەدەی ڕابردوودا وەك شۆفێر و پاسەوانی تایبەتی سەددام كاری كردووە و دواتر فەرماندەیی نوخبەی پاسەوانی كۆمارییەكانی كردووە. لە ساڵی ١٩٨٦ لەگەڵ كچە پانزە ساڵانەكەی سەددام، ڕەغد هاوسەرگیری كرد كە گوایە خۆشەویسترینی سەرۆك بوو. لە كولتوورێكدا كە چەمكی متمانە، دڵسۆزی بۆ خێڵ و بنەماڵە، زاڵ بوو بەسەر ژیانی كۆمەڵایەتی و سیاسیدا، ئەو نزیكترین یان متمانەپێكراوترین بوو لەلایەن سەددامەوە.

لەكاتێكدا بە ئۆتۆمبێلەكەمان دەچووینە ناو كۆمەڵگەی سەرەكی كۆشكەكە، پەنجەرەكەی كەمێك هێنایە خوارەوە و دوای ئەوەی لەلایەن یەكێك لە پاسەوانەكانەوە ناسرا، ئەوەبوو ڕێنمایی كرا.

حوسەین كامل بە ڕێگایەكی خزمەتگوزاریدا لە لای ڕاستی سەرەكی ڕۆیشت و لە پشت بارهەڵگرێكی گەورەی ترێلەرەوە وەستاین. پشتی بارهەڵگرەكە كراوە بوو، حوسەین كامل ئیشارەتی بۆ كردم كە بەدوایدا بچم. دڵم لە ترسدا وەك دەهۆڵ وابوو. ئەوەبوو پرسیارم كرد كە ئایا لەناو ترێلەكەدا پاسەوان هەیە؟ ئایا

دەمبەنە زیندان؟ ئەگەرچی دوودڵ بووم بەڵام بەدوایدا ڕۆیشتم، لە كاتێكدا ئەو سەركەوتە سەرەوە بۆ ناو تاریكییەكە.

حوسەین كامل فلاش لایتێكی داگیرساند و منیش هەناسەیەكی ئارامم هەڵمژی كاتێك تیشكەكەی ئاراستەی ئامێرێكی گەورەی پشتەوەی تڕێلەكە كرد. كۆپییەكی تەواوی كۆمپرێسەرێكی زۆر تایبەتمەند بوو كە بەم دواییە بە ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمیم گوتبوو كە پێویستمانە بۆ نموونەی بەربەستی بڵاوبوونەوە. سەرسام بووم كە حوسەین كامل توانیبووی لە ماوەیەكی وا كورتدا بەدەستی بهێنێت.

حوسەین كامل وتی: "پێم وایە ئەمە ئەو ئامێرەیە كە داواتان كردبوو دروست بكرێت"، منیش سەری ڕەزامەندییم لەقاند. ئەو بەردەوام بوو لەسەر قسەكردن و وتی: هیوادارم ئەمە وەك نیشانەی پشتیوانی لە كارەكانتان قبوڵ بكەن. بەڵام ئەمە تاكە هۆكار نییە كە داوام لێكردبووی ئەمشەو چاوم پێت بكەوێت".

كاتێك من هیچ قسەیەكم نەگوت، ئەو بەردەوام بوو لە قسەكردن.

ئەو وتی: "لە سبەینێوە پەیوەندی بە ئامێری ئاسایشی تایبەتەوە دەكەیت كە لە ژێر فەرماندەیی مندایە، لەگەڵ ئەو دوو سەد ئەندازیار و تەكنیكارەی كە ئێستا لە IAEC سەرپەرشتی دەكەیت. تۆ و گروپەكەت سەركردایەتی بەرنامەیەكی پیتاندنی یۆرانیۆم دەكەن جیاواز لە كارەكانی التویثة. پڕۆژەكە بە تەواوی نهێنی دەبێت، تێگەیشتی؟" لە ژیانماندا ساتێك هەیە كە وا دەردەكەوێت وەك بڵێی تیایدا كات دەوستێت، بەتایبەت كە هەست و سۆزە ناكۆكەكان شەڕ لەگەڵ یەكتر دەكەن بۆ باڵادەستی. من هەستم

بە حەماسەتی نیشتمانپەروەری و شانازی دەكرد كە حكومەت ددانی بە كارەكانمدا ناوە. ئەمە بۆ من متمانەیەكی گەورە بوو. ڕێنماییەكانی حوسەین كامل ئەو مانایەی دەدا كە ستافەكەی من لە دوو سەد كەس پێكهاتبوون و منیش ڕاستەوخۆ كێبڕكێم لەگەڵ بەرنامەكانی دكتۆر جەعفەر و IAEC و زیاتر لە حەوت هەزار كارمەندەكەی تر دەكرد. بەڵام كاتێك بیرم لەو بەرپرسیارێتییە قورسە دەكردەوە كە دەخرێتە سەر شانم و ڕەنگە سزای شكستیشی بەدوا دابێت، ئەوەبوو دڵەڕاوكێم بۆ دروست بوو. زاوای سەرۆك ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی كارەكانمانی دەكرد و منیش لێپرسینەوەم لەگەڵ دەكرا لە گەیشتن بە ئامانجە ئەتۆمییەكانی حكومەت. هەستم دەكرد لە لێواری كۆتاییەكی ترسناكدام كە بە ئاسانی دەتوانێت لە تاریكیدا هەڵملوشێت. لەگەڵ ئەوەشدا پێم وابوو تازە ئیتر دووركەوتنەوە لەمە هەڵبژاردە نییە و ناچارییە.

لە تاریكی تڕێلەكەدا، لەوەدەچوو حوسەین كامل سەرنجی نیگای بێ بڕیاری لەسەر ڕووخسارم دابێت.

ئەوەبوو وتی: "د. مەهدی"، بە تۆنێكی نزیك لە داوای لێبوردن ئەم قسەیەی كرد: "تكایە هەوڵبدە تێبگەیت كە ئەمە تەنها بڕیاری من نییە. ئەمە فەرمانی ڕاستەوخۆی سەددام حوسێن، سەرۆك كۆماری عێراقە".

حوسەین كامل لە تڕێلەكەوە بردمی بۆ دەرەوە بۆ ئۆفیسێك لە باڵەخانەیەكی تازە دروستكراو لە گۆڕەپانی كۆشكەكەدا. پەرداخێك ئاوی پرتەقاڵی بۆ تێكردم، كە قوڕگمی هێور كردەوە و ئارامم بویەوە. پیاوێكی تر چووە ژوورەكەوە. حوسەین كامل

به ئه‌بو ڕوگه‌یبا بانگی كرد، كه كیمیاكارێكه له دامه‌زراوه‌ی (القعقاع) MIC كه ئه‌ركی یارمه‌تیدانی منی پێده‌سپێردرێت، دواتر ده‌ستیكرد به پرسیاركردن.

وتی: "من له‌باره‌ی كاره‌كانتانه‌وه واته په‌ره‌پێدانی به‌ربه‌ستی بڵاوبوونه‌وه شتم بیستووه، كه ده‌شێت وه‌ك دڵی به‌رنامه‌یه‌كی بڵاوبوونه‌وه سه‌یر بكرێت، ئه‌ی وانییه؟" حوسه‌ین كامل پرسیاری كرد. - له‌و باره‌یه‌وه زیاتر پێم بڵێ. ئه‌مه چۆن به‌رهه‌م ده‌هێنرێت؟"

گفتوگۆیه‌كی كورتمان كرد، تێبینیم كرد كه حوسه‌ین كامل به وردی گوێی گرتبوو. ڕوونم كرده‌وه كه به‌ربه‌سته‌كه دروستكردنی ئاسان نییه و هه‌ر سانتیمه‌ترێكی چوارگۆشه ده هه‌زار ملیار كون له‌خۆده‌گرێت. كێشه‌ی ته‌كنیكی زۆر هه‌بوو كه ده‌بوو چاره‌سه‌ر بكرێن. پێم گوت كه له ساڵانی چله‌كاندا ئه‌مریكییه‌كان و ئینگلیزه‌كان ساڵانێك لێكۆڵینه‌وه‌یان له سه‌دان تاقیگه‌دا ته‌رخان كردووه بۆ په‌ره‌پێدانی به‌ربه‌ستێكی بڵاوبوونه‌وه و له ماوه‌ی هه‌شتاكانی سه‌ده‌ی ڕابردوودا ئه‌مریكییه‌كان زیاتر له ملیارێك دۆلاریان خه‌رج كردووه بۆ باشتركردنی به‌ربه‌ستێك بۆ به‌رنامه‌ی وزه‌ی ئه‌تۆمییان.

حوسه‌ین كامل پرسیاری كرد: "چۆن به‌رهه‌م ده‌هێنرێت؟"

گوتم: ئه‌مریكییه‌كان له پاوده‌ری نیكل دروستی ده‌كه‌ن. "پاوده‌رێكی زۆر تایبه‌ت و ورده، و به‌ده‌ستهێنانی له‌ڕاده‌به‌ده‌ر قورسه." ئه‌بو ڕوگه‌یبا پێشنیاری كرد: ده‌توانین تۆزی نیكل دروست بكه‌ین. نه‌متوانی خۆم له لادانی چاوه‌كانم بپارێزم، چونكه به‌رهه‌مهێنانی ئه‌م پاوده‌ره له‌ده‌ره‌وه‌ی شاره‌زایی ته‌كنیكی عێراقی بوو له‌و كاته‌دا.

حوسەین كامل بە پشتگوێخستنی پێشنیارەكەی ئەبو ڕوگەیبا وتی: تێدەگەم ئێوە بەربەستی خۆتان دروست دەكەن. — بەڵام ئایا هەمان ئەو جۆرەی كە ئەمریكییەكان دروستیان كردووە؟

ڕوونم كردەوە كە بەربەستەكەمان جیاوازە چونكە لە ئەلەمنیۆمی ئۆكسێنراو دروستكراوە، كە مادەیەك بووە كە پێشتر بە سەركەوتوویی بەكارنەهێنراوە. بەڵام ئەگەر سەركەوتوو بووین، ڕەنگە بەربەستەكەمان تایبەتمەندی باشتری هەبێت لە هەر بەربەستێك كە هێشتا لەلایەن هەر وڵاتێكەوە پەرەی پێدراوە. حوسەین كامل سەری ڕەزامەندی لەقاند و پاشان ئەبو ڕوگەیبەی بەرێ كرد.

جارێكی تر بەتەنیا ماینەوە، وتی: "هەروەها بیستوومە كە ئێوە ڕەخنەی دیكەتان هەیە سەبارەت بە تەكنیكەكانی بڵاوبوونەوە." - پێم بڵێ ئەوان چین.

من كێشەی پراكتیكی بەدەستهێنانی هەزاران كۆمپرێسەر و بڵاوكەرە تایبەتمەندییە جیاوازەكانم باسكرد. من پێم وابوو كە كارگەیەكی بڵاوبوونەوەی ئاستی بەرهەمهێنان لە عێراقدا مەحاڵ دەبێت. هەروەها، وتم، تەنانەت ئەگەر بتوانین ئەو بڕە زۆرەی كەرەستەی پێویستیش بكڕین و دروستی بكەین، ئەوا مەحاڵە دەبێت كە پرۆژەیەكی وەها گەورە لە چاوی كۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا بە نهێنی بهێڵینەوە. وا دیار بوو حوسەین كامل یەكسەر لەم كەموكوڕییە تێگەیشتبێت. هەرچەندە لە ڕووی تەكنیكییەوە پیاوێكی خوێندەوار نەبوو، بەڵام پێدەچوو خاوەنی ئەو جۆرە زیرەكییە خامەیە بێت كە مرۆڤ لە نێو هۆزەكانی بەدەویدا دركی پێدەكات. بە پێچەوانەی زۆرێك لە ئەندامانی

ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی، بە لەبەرچاوگرتنی ژێرخانی خراپی عێراق و ئەو پێگە سیاسییەی کە لە جیهاندا هەیبوو، بە خێرایی لە بێهیوایی بنەڕەتی شێوازی بڵاوبوونەوە تێگەیشت. ئەوەبوو نیگایەکی نیگەرانی قووڵ لەسەر ڕووخساریدا نیشت.

وتی: "دکتۆر مەهدی، ئایا هیچ شێوازێکی تر بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم نییە کە عێراق هێشتا لێی نەکۆڵیبێتەوە؟"

لە پرسیارێکی وەها سادە و بنەڕەتی سەرم سوڕما. چونکە هەمان پرسیار بە درێژایی کارەکانم لەسەر بەربەستی بڵاوبوونەوە بە شێوەیەکی ئەبستراکت مێشکمی داگیرکردبوو. چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد ئەم ئامۆزای سەددامە شتێکی لەو شێوەیە بپرسێت.

گوتم: شێوازێکی دیکە هەیە.

- "باشە ئەوە چییە؟" حوسەین کامل بە بێ تاقەتی پرسی.

وتم: "پێی دەوترێت سەنتەرفیوج".

وتی: "بیستوومە. بەڵام پێم بڵێ ئەو سەنتەرفیوجە چییە؟"

ڕوونم کردەوە کە سلندەری سەنتەرفیوجی گازی بە خێرایی زۆر لەسەر میحوەرێکی ڕاست دەسوڕێتەوە بۆ دروستکردنی هێزێکی سەنتەرفیوجی گەورە، کە تێکەڵەیەکی گازی ئایزۆتۆپەکانی یۆرانیۆم جیا دەکاتەوە. ئایزۆتۆپی قورستر، یۆرانیۆم-٢٣٨، لە یۆرانیۆم-٢٣٥ی سووکترەوە بە هەمان شێوەی ئامێری جل شۆردن. لە ڕاستیدا بیرۆکەی سەنتەرفیوج لەسەر هەمان بنەمای جیاکەرەوەی کرێمی شیرەمەنی بوو. کاتێك ئایزۆتۆپە قورسەکان دەکێشرانە دەرەوە، لەوانەیە یۆرانیۆمی زۆر پیتێنراو لە ناوەڕاستدا لە سلندەرەکەوە دەربهێنرێت. سەنتەرفیوج بەهۆی

کارابیەکەیەوە لە تەکنیکەکانی بڵاوبوونەوە زیاتر پراکتیکی بوو. سەنتەرفیوج تەنها پێویستی بە دەیان قۆناغ هەیە لەبری ئەو هەزاران قۆناغەی کە پێویستە بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم لە ڕێگەی بڵاوبوونەوە.

هەرچەندە ئەوەی بۆ حوسەین کامل وەسفم کرد بە سادەیی دەهاتە بەرچاو، بەڵام قورسی و سەختیەیەکەی لە ئەندازیاریکردنی سلندەرێکی شەش ئینج پان بوو کە دەتوانێت زیاتر لە پەنجا هەزار خول لە خولەکێکدا بخولێتەوە، لانیکەم بیست هێندە خێراتر لە پێشکەوتووترین ماتۆڕ کە عێراق تا ئێستا بینیبێتی. بە حوسەین کاملم وت، سەنتەرفیوجێکی سەرکەوتوو، موعجیزەیەکە لە ئەندازیاریدا و یەکێکە لەو نهێنییانەی کە لە نزیکەوە پارێزگاری لێدەکرێت لەلایەن ئەو چەند وڵاتەوە کە پەرەیان پێداوە. لە ڕووی تەکنەلۆژیاوە، بیرۆکەیەك بوو لە لێواری خەیاڵدا دەرچووبوو. ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی لای وابوو کە پەرەپێدانی بەرنامەی سەنتەرفیوج لە عێراقدا ئەوەندە دوورە وەك ئەوە وایە هەوڵی دروستکردن و هەڵدانی موشەکێك بدەن بۆ بۆشایی ئاسمان.

حوسەین کامل پرسیاری کرد: "کێ ئەم تەکنیکە بەکاردەهێنێت؟".

گوتم: چەند دەیەیەك لەمەوبەر لە ئەمریکا پەرەی پێدراوە، بەڵام ئێستا بە شێوەیەکی سەرەکی لەلایەن ئەورووپییەکانەوە بەکاردەهێنرێت. بەڕازیلییەکان تاقیکردنەوەیان لەسەر کردووە، تا ئێستا سەرکەوتوو نەبوون. هەروەها دەوترێت پاکستانییەکانیش کار لەسەر بەرنامەی سەنتەرفیوج دەکەن".

"پاکستانییەکان!" حوسەین کامل بەتەواوی لە هەناسەدان

وه‌ستا. وتی: "به دڵنیاییه‌وه ئه‌گه‌ر پاكستانییه‌كان بتوانن شتێكی له‌و جۆره په‌ره‌پێبده‌ن، ئه‌وا ئێمه‌ش ده‌توانین. عێراق لانیكه‌م به‌قه‌د پاكستان پێشكه‌وتووه!"

هه‌رچه‌نده كاتژمێر نزیكه‌ی ٢ی به‌یانی بوو، به‌ڵام وه‌ك منداڵێكی تامه‌زرۆ له دوكانێكی شیرینیدا ئازاد بكه‌یت، ئاوا بازێكی به‌سه‌ر بیرۆكه‌كانی دا. پێده‌چوو ئه‌و بیرۆكه‌یه‌ی كه نه‌ته‌وه‌یه‌كی دیكه‌ی موسڵمان به‌رنامه‌یه‌كی سه‌نته‌رفیوج په‌ره‌پێده‌دات، ئیلهامبه‌خش بووبێت بۆی. له‌سه‌ر كورسیه‌كه‌ی خۆی بێده‌نگ بوو، پاشان له‌ناكاو جوڵه‌یه‌كی كرد.

وتی: با باسی چوارچێوه كاتییه‌كه‌ی بكه‌ین. "چه‌ند كات ده‌خایه‌نێت بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌م شێوازه سه‌نته‌رفیوجه په‌یڕه‌و بكه‌یت؟"

له‌به‌ر ئه‌وه‌ی بیرۆكه‌كه‌م ته‌نیا وه‌كو گریمانه‌یی له‌به‌رچاو گرتبوو، هیچ چوارچێوه‌یه‌كی كاتییم له مێشكمدا نه‌بوو. به‌ڵام هه‌ستم ده‌كرد كه لانیكه‌م دوو ساڵ ده‌خایه‌نێت بۆ دروستكردنی نموونه‌یه‌كی بنه‌ڕه‌تی، به‌و گریمانه‌یه‌ی كه ده‌توانین زانیاری و ته‌كنه‌لۆژیای پێویست به‌ده‌ست بهێنین. به‌ڵام هه‌ستم كرد كه دوو ساڵ بۆ حوسه‌ین كامل قبوڵ ناكرێت چوون دیاربوو له ژێر فشارێكی زۆردابوو.

گوتم: ڕه‌نگه له ماوه‌ی ساڵێكدا بتوانین نموونه‌یه‌كی سه‌ره‌تایی ئاماده بكه‌ین، به‌ڵام گه‌وره‌م. "بێگومان هیچ گه‌ره‌نتییه‌ك نییه كه كار بكات".

حوسه‌ین كامل وه‌ك بڵیی له‌دڵی خۆیدا بڵێت: ساڵێك، كاتێكی زۆره.

پاشان فه‌رمانی كرد و وتی له ماوه‌ی سێ ڕۆژدا پێویسته به‌رنامه‌یه‌ك بۆ ئه‌و پرۆگرامه دابرێژم، كه پێی ده‌وترێت به‌رێوه‌به‌رایه‌تی دیزاینی ئه‌ندازیاری. من ده‌بێت ئامێره‌كه دابین بكه‌م بۆ به‌رده‌وامبوون له به‌رنامه‌ی بڵاوبوونه‌وه، هه‌روه‌ها له‌هه‌مان كاتیشدا بۆ ئه‌وه‌ی به‌رنامه‌یه‌كی نوێی سه‌نته‌رفیوج ده‌ستبه‌جێ ده‌ستپێبكات. هه‌ردوو به‌رنامه‌كه له یه‌ك كاتدا به‌رده‌وام بن. حوسه‌ین كامل وتی كه تا ڕۆژی دووشه‌ممه ده‌بێت لیستی كه‌ره‌سته و پێداویستییه‌كانی دیكه‌ی بۆ دابین بكه‌م، ئه‌ویش به شێوه‌یه‌كی شه‌خسی ئاگاداری داواكارییه‌كانمان ده‌بێت. ئاماژه‌ی به‌وه‌شكرد، كه پڕۆژه‌كه به‌ته‌واوی به‌نهێنی ده‌بێت؛ ته‌نانه‌ت ئاژانسی عێراقی بۆ وزه‌ی ئه‌تۆمی ورده‌كارییه‌كانیشی نه‌ده‌زانی. كاتێك حوسه‌ین كامل بردمیه‌وه بۆ نه‌خۆشخانه‌ی هیلال، مێشكم خه‌ریك بوو ده‌تۆقی، كاتێك بیرم له گه‌وره‌یی ئه‌و ئه‌ركه ده‌كرده‌وه كه له پێشمدایه. نزیك به به‌یانی بوو كه گه‌یشتمه ماڵه‌وه. به هێمنی به‌ره‌و ده‌رگای پێشه‌وه ڕۆیشتم، به‌و هیوایه‌ی خێزانه‌كه‌م به‌ئاگا نه‌هێنمه‌وه، به‌ڵام له‌یلا چاوه‌ڕێی ده‌كردم. ئه‌و كاته دووگیان بوو به كچه بچووكه‌كه‌مان ئایه‌ت و منیش به نه‌رمی پێم گوت ده‌بوو به‌بێ من بخه‌وێت. به‌ڵام ئه‌ویش وه‌ك من خه‌می ئه‌وه‌ی بوو كه من له‌گه‌ڵ زاوای سه‌ددام ده‌رچوویمه. باسی كۆبوونه‌وه‌كه‌م له كۆشكی كۆمارییه‌كان بۆ كرد و جه‌ختم له‌وه كرده‌وه كه له‌مه‌ودوا كاره‌كانم ده‌بێت به نهێنییه‌كی توند له نێوانماندا بمێننه‌وه.

گوتم: هه‌واڵه خۆشه‌كه ئه‌وه‌یه كه پله به‌رزكردنه‌وه‌م پێدراوه.
- هه‌واڵه ناخۆشه‌كه‌ش ئه‌وه‌یه كه هه‌رگیز ناتوانم بۆ كه‌س باسی بكه‌م.

ڕۆژی دواتر ئەو خشتانەم وەرگرت کە بۆ چەند ساڵی داهاتوو بەسەر ژیانمدا زاڵ دەبێت. بەیانی زوو بریکارێکی ئەمنی پەیوەندی کرد بە لیستی ئەو ئاسانکاریانەی کە بەردەستن بۆ بەڕێوەبەرایەتی دیزاینی ئەندازیاری نوێ. دوای سەیرکردنی دەیان شوێن، دواجار ناوەندێکی توێژینەوەی ئاودێریم لە شاری ڕەشیدیەی باکووری بەغدا هەڵبژارد کە لەلایەن وەزارەتی کشتوکاڵەوە بەڕێوەدەبرا. پەرژینێکی دیواری هەبوو کە چەند دۆنم زەوی و بینای تێدابوو، شوێنی زۆری هەبوو بۆ ئەو دامەزراوە توێژینەوە و دیزاینانەی کە من پێشبینیم دەکرد. جگە لە بینایەکی ناوەندی ئۆفیس، تاقیگە و هۆڵ و شانۆیەکی بچووك و کتێبخانەی تێدابوو. هەروەها سەنتەری ئاودێری لە ڕووی پێداویستییە ئەمنییەکانەوە تەواو بوو. لە لێواری گەڕەکێکی نیمچە گوندنشینی باکووری بەغدا، لێواری ڕۆژئاواییەکەی بە کەنارێکەوە کەوتبوو کە کێڵگە چۆڵەکانی لە لایەکی چاڵە ئاوەکانی تەنیشت ڕووباری دیجلە جیا دەکردەوە. لە باشوورەوە دەرگای سەرەکی بەسەر بێستانێکی دارخورما و ڕێگایەك کە چەند خانوویەکی بچووکی کێڵگەیی تێدابوو دەیڕوانی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندە نزیك بوو لە شارەکە کە گونجاو بوو و لەهەمان کاتیشدا وەك بڵێی شوێنێکی گۆشەگیر بوو. لە ڕاستیدا، هاوڕێ پاسەوانەکانم ئاگاداریان کردمەوە، کە ناوچەکە بە "هێلانەی خۆشەویستی" ناسرابوو، کە چۆن ناوبەناو کەپڵەکان دەهاتن وەك ژوانێکی خۆشەویستی بەکاریان دێنا و لەنێو ئۆتۆمبێلەکانیان دەمانەوە.

ڕۆژی دواتر، خزمەتگوزارییە ئەمنییەکان تەواوی دامەزراوەکەیان لە کارمەندانی وەزارەتی کشتوکاڵ و کەرەستەی تایبەتی خۆیان پاککردەوە. نازانم چ ڕوونکردنەوەیەك بۆ توێژەرە

سەرسوڕهێنەرەكان درا بۆ ئەو چۆلکردنە بەپەلەیە، بەڵام بێ گومان باشتر دەیانزانی کە بێدەنگ بن لەوەی کە ڕێکخراوی ئاسایشی تایبەتی سەددام بخەنە ژێر پرسیارەوە. من و ستافەکەم کە دوو سەد کەس بووین بەیانی دووشەممە چووینە سەر شوێنەکە بۆ ئەوەی سەرێك لە شوێنەکە بدەین و بزانین کە هەموو کەل و پەلەکانیان بردووە، بینیمان هەندێك کەل و پەل مابوو لەنێویاندا هەموو کتێبەکانی کتێبخانەی وەزارەتی کشتوکاڵ هێشتا لە ڕەفەکانیاندابوو. تیمەکەمم[1] دابەش کرد بەسەر پێنج بەشدا و هەریەکەیان بەشێکم لە بینای سەرەکی چوار نهۆمی بە ڕێکوپێکی کە هاوتای هەنگاوەکانی بەرنامەکە بوو، دیاری کرد. نهۆمی خوارەوە بەشی کەرەستەی تێدابوو، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بنەماکانی بنیاتنانی بەرنامەکەمان. بەشی میکانیکی و بەشی پرۆسەی فیزیایی کە سەرپەرشتی جیاکردنەوەی یۆرانیۆمی پیتێنراویان دەکرد، نهۆمی دووەمیان داگیرکردبوو. نهۆمی سێیەمم بۆ بەشی پرۆسەی کیمیایی کە بەرپرسی بەرهەمهێنانی هێکسافلۆرایدی یۆرانیۆم بوو، نهۆمی چوارەمیشم بۆ ئۆفیسەکان دانا بۆ کارگێڕی و پشتیوانی. ئۆفیسەکەم لە گۆشەیەکی نهۆمی دووەمدا دیمەنێکی گەورەی ڕووبارەکە و کێڵگەیەکی خورمای بەسەرەوە بوو. لە تەنیشتیەوە ژوورەکانی پڕ لە مێز بوو کە ڕووناکی سروشتییان لە پەنجەرەی ڕوو لە ڕۆژئاوا وەردەگرت.

---

[1] لەبارەی ئەم کەسانی نێو ئەم تیمە و چارەنووسیان دوای داگیرکاری ئەمریکا زۆر شت نەگوتراون. نووسەر لە بەشەکانی داهاتوو بە ئاشکرا نیگەرانی خۆی دەردەبڕێت سەبارەت بەمە و چوون ڕەنگە لەداهاتوو ئەمانە لەلایەن حکومەتانی جیهان بەکاربێن بە دروستکردنی بەرنامەی ئەتۆمی.

لە كاتێكدا ستافەكەم[1] پەلەیان دەكرد لە دانانی ئەو كەل و پەلانەی كە لە ئاژانسی وزەی عێراقی هێنرابوون، سەرۆكی ڕێكخراوی ئاسایشی تایبەت گەیشتە لام بۆ ئەوەی باسی ڕێكخستنە ئەمنییەكان بكات لەگەڵم. وتی بەڕێوەبەرایەتی دیزاینی ئەندازیاری بیست پیاوی ئاسایشی بۆ دیاری دەكرێت كە ئۆتۆمبێلی ناحكومی لێدەخوڕن بۆ ئەوەی سەرنجی ناڕەوا نەخەنە سەر دامەزراوەكە. هەرگیز هیچ كەسێكی دەرەكی نەدەبوو سەردانی شوێنەكەمان بكات و هەر كۆبوونەوەیەك كە ستافەكەم پێویستی بە ئەنجامدانی هەبوو دەبوو لە دەرەوەی ڕەشیدیە ئەنجام بدرێت. لە كۆتاییدا وتی، حوسەین كامل فەرمانی داوە كە لە هەموو كاتێكدا پاسەوانێك لەگەڵم بێت. ئاماژەی بەوەشكرد، ئەگەر هاتوو هەواڵگرییە بیانییەكان كارەكانمان بدۆزنەوە، ڕەنگە ببمە ئامانجی تیرۆركردن. من بە توندی ناڕەزایەتیم بەرامبەر بەم بیرۆكەیە هەبوو. لە عێراقدا زۆرجاران "پاراستن" وشەیەكی تر بوو بۆ چاودێری و هەستم دەكرد هەبوونی پاسەوانێكی بیست و چوار كاتژمێری نەك هەر جێگای ئاسوودەیی نییە، بەڵكو ژیانی تایبەتی خێزانەكەشم دەخاتە مەترسییەوە.

ئەوەبوو من پێداگریم كرد: "ئەگەر كەسێك بیەوێت بمكوژێت زۆر ئاسانە، تەنانەت لەگەڵ پاسەوانێكیشدا." "بكوژێك دەتوانێت لە بازاڕ یان لە كاتێكدا لە ماڵەوە لە باخچەكەمدا دانیشتووم تیرۆرم بكات."

---

[1] هەر لەبارەی ئەم تیمە و لە پەیوەندییەكی تەلەفۆنیماندا لەگەڵ نووسەر، باسی لە زانا كوردەكانی نێو تیمەكەی بۆ كردم و ناوی چەندین كەسی هێنا كە ئێستا زۆربەیان لە ژیاندا ماون، بەڵام لەبەر هۆكاری سەلامەتی ناتوانین ئاماژە بەناوی هیچ كەسێك بدەین. نووسەر باسی ئەوەی كرد كە زانا كوردەكان بە زیرەكی و پڕ لە وزەو چالاكی ناسرابوون .

بەرپرسی ئاسایش وتی کە بڕیارەکە هی خۆی نییە، بەڵام من هێندە بە توندی ناڕەزایەتیم دەربڕی کە ڕازی بوو زیاتر پێداچوونەوە بەو بابەتەدا بکات و لە کۆتاییدا ئەوەبوو بیرۆکەکە پەراوێزخرا.

•

هەر دوای نانخواردنی نیوەڕۆ، حوسەین کامل تەلەفۆنی بۆ کردم و پرسیاری لە کارەکانمان کرد و ئاخۆ پێویستمان بە هیچ شتێك هەیە؟ بە هۆکارێك باسی خراپی دۆخی ژەمە نیوەڕۆکەم کرد، کە لەلایەن چێشتلێنەرانی سوپاوە دابینکرابوو و لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانەوە گەیاندرابوو. ژمارەیەك لە کارمەندەکانم گلەیی ئەوەیان کردبوو کە گۆشتەکە بە خراپی کوڵاوە و برنجەکە پیس دەردەکەوێت. دەبێ حوسەین کامل قسەکەی منی بە بەجددی وەرگرتبێت. چوون لە ماوەی کاتژمێرێکدا کەسێك بە گونییەکەوە گەیشت کە ٥٠ هەزار دیناری عێراقی کاش تێدابوو، ئەو بڕە پارەیە بە نزیکەیی یەکسان بوو بە ١٥٠ هەزار دۆلار لەو کاتەدا، ئەمەش تەرخان کرابوو بۆ بەکرێگرتنی خواردنگەیەکی تایبەت. سەخاوەتی لەمجۆرە هەرگیز تایبەتمەندیی کەسێکی نێو ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی نەبووە و من سەرسام بووم بەو پارەیەی کە لەوکاتەدا لەبەردەستی حوسەین کاملدا بوو. پێدەچوو بتوانێت دەروازەیەك یان لافاوێك لە پارە بۆ بەرنامە ئەتۆمییەکە بکاتەوە کە پێش ئەوەی بەرپرسیارێتی لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٧دا بگرێتە ئەستۆ، ئەوکات بە توندی سنووردار کرابوو. لە ڕاستیدا تا ئەو کاتەی حوسەین کامل دەستبەکاربوو، ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی گروپێکی جیاوازی پێکهێنا بۆ لێکۆڵینەوە لە ئامێرێکی تەقەمەنی بۆ ئەو ماددە ئەتۆمییە. سەرەتا بەرپرسیارێتی هەوڵی چەکسازییەکەی دا بە

دكتۆر خدر هەمزە، بەڵام دوای چەند مانگێك وازی لێهێنا و بەرپرسیارێتییەكەی گواستەوە بۆ دكتۆر خالید ئیبراهیم سەعید.

دواتر پاشنیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، خودی حوسەین كامل گەیشتە لامان بۆ ئەوەی دۆخی ئێمە بزانێت، منیش لیستێكی سەرەتاییم پێدا كە ئامێرەكانی پێویستەكانی بۆ تاقیگەكان تێدابوو. بەیانیەكەی دیكە بەبێ ئاگاداركردنەوە هاتەوە، چونكە ستافەكەم نیشتەجێ ببوون. بەپەلە كۆبوونەوەیەكم لەگەڵ بەرپرسانی بەشەكانم ڕێكخست لە ژوورێكی كۆنفرانسدا كە هێشتا بە وێنەی وەزارەتی كشتوكاڵ لەسەر دیوارەكان ڕازێنرابووەوە.

كاتێك هەمووومان دانیشتبووین، حوسەین كامل پرسی:

- پێم بڵێ دكتۆر مەهدی، خشتەی سەنتەرفیوجەكەت چۆنە؟

بۆ ساتێك دوودڵ بووم. لە IAEC، چونكە من و سەرۆكی بەشەكانم خوومان بە خشتەی زانستی توند گرتبوو بۆ زۆربەی تاقیكردنەوەكان كە نزیكەی دوو ساڵ بوو. لەگەڵ ئەوەشدا پێشتر ئەو خشتەیەی یان ئەوكاتەی كە پێویست بوو بۆ ئەنجامدانی كارەكان كردبوومە نیوە لەبەردەم حوسەین كاملدا.

گوتم: "گەورەم، ڕەنگە لەبیرت بێت كە وتم دەتوانین لە ماوەی ساڵێكدا نموونەیەكی سەرەتایی سەنتەرفیوجەكەمان ئامادە بكەین، بۆیە ئەگەر ئێمە كاتژمێری زیادە كار بكەین، من پێموایە ئەم بیرۆكەیە زۆر باشە، بەڵام هێشتا هەر ئەگەرە."

حوسەین كامل مشتەكانی خستە سەر مێزەكە و چاوە زەقەكانی خستە سەر بەرەو من و بەرپرسانی بەشەكەم.

وتی: ئەوە جێگای قبوڵ نییە، تەنها مانگ و نیوێكت هەیە و

هیچیتر. هەر كەرەستەیەك پێویستت پێی بێت من دابینی دەكەم، بەڵام دەبێت لە ماوەی چل و پێنج ڕۆژدا سەنتەرفبوجی تەواوت دەستەبەر بكەیت. ئەمە فەرمانە". پاشان هەستا و چووە دەرەوە.

من و بەرپرسانی بەشەكەم سەرمان سوڕما و لە دەوری مێزی كۆنفرانسەكە دانیشتین. شتێكی بێهیوا بوو كە سەنتەرفیوجێك كە هەرگیز لەوەو پێش لەلایەن هیچ كام لە ئێمەوە نەبینراوە، بتوانرێت لە ماوەی مانگ و نیوێكدا دیزاین بكرێت و دروست بكرێت و كۆبكرێتەوە و تەنانەت كاریش بكات. چوونە سەر مانگ ئاسانتر بوو لەو كارە. بەڵام هەموومان دركمان بەوە كرد كە فەرمانەكانی زاوای سەددام بە شێوەیەكی كوشندە جددی بوون و یان بیركردنەوە لە وازهێنان لێی كوشندەتر بوو.

خشتەی گریمانەییم بۆ شەش هەفتەی داهاتوو داڕشت: هەفتەیەك بۆ دیزاینی سەنتەرفیوج، سێ هەفتە بۆ بەرهەمهێنان، هەفتەیەك بۆ كۆكردنەوە و هەفتەی كۆتایی بۆ تاقیكردنەوە و كارپێكردن. لە كاتژمێر هەشتی بەیانی تا دەی شەو كارمان دەكرد، هەمووان ڕۆژانە پشوویەكی تەواویان دەدا بۆ ئەوەی مێشكمان سەرلەنوێ تازە بێتەو. بەڵام تەنانەت ئەو كاتەش خشتەیەكی لەو شێوەیە وەك خەونێكی بێ هیوا دەهاتە بەرچاو. لە كاتێكدا سەیری ڕووخساری نیگەرانی بەرپرسانی بەشەكانمم دەكرد، شتێك لانیكەم تیشكێكی متمانەی پێبەخشیم. لە دەوروبەرم دانیشتبوو، بە بۆچوونی من، یەكێك بوو لە باشترین تیمە زانستییەكان كە عێراق تا ئێستا كۆی كردبوویەوە. ئەم پیاوانە ساڵانێك بوو لە IAEC كاریان بۆ كردم و هەستم دەكرد ئەگەر كەسێك بتوانێت مەحاڵەكە بەدەستبهێنێت ئەوە گروپەكەمانە.

دكتۆر فەرید بەشیر سەرۆكی بەشی میكانیك، یەكێك بوو لەو پیاوە زیرەكانەی كە تا ئەوكات ناسیبێتم. لە بەسرە لەدایكبووە، بەڵام ڕوخسارە لاواز و سیما وردەكانی، هەمان تایبەتمەندی مەسیحیەكانی باكووری عێراقی هەبوو. پیاوێكی بێدەنگ و خۆپارێز بوو، چاوەكانی زیرەكییەكی ترسناكیان دەردەخست كە لە گەنجیەوە لە باشترین قوتابخانەكانی ئینگلتەرادا هەڵبژێردرابوو. دكتۆر فەرید بەرپرسی میكانیكی سەنتەرفیوجەكە وەك دەستی ڕاستم دانابوو. دكتۆر عادل ڕیدا كە لە تەنیشتی دانیشتبوو، سەرۆكی بەشی كەرەستە بوو. ڕوخسارێكی جوان و سكی ڕێك بوو ئەمەش بەهۆی خواردنی تەندروستەوە، ڕیشێكی ئەستووری هەبوو كە لە ساڵانی داهاتوودا مووەكانی سپی بوون. جگە لە لێهاتوویی خۆی وەك زانایەك، دكتۆر عادل كە لەبەریتانیا خوێندبووی، خاوەنی هەستێكی گەرم و قۆشمەبازیی و شێوازێكی دیپلۆماسی بوو بۆ پەیوەندیكردن، كە ئەمەش زۆر یارمەتیدەر بوو بۆ هێشتنەوەی ڕۆحی ستافەكەم بە گەرم و گوڕی. دكتۆر عەبدولفەتاح، سەرۆكی بەشی پرۆسەی كیمیایی، گازی هێكسافلۆرایدی یۆرانیۆمی بۆ هەردوو بەرنامەی بڵاوبوونەوە و سەنتەرفیوج بەرهەم دەهێنا. سەرۆكی بەشی پرۆسەی فیزیایی، دكتۆر میقدام، لە ئەمریكا لە بواری ئەندازیاری ئەتۆمیدا ڕاهێنانی پێكرابوو. لەو شەش كەسە كە لەسەر مێزەكە بووین، زۆرترین ترسی لە بیرۆكەی كاركردن لە سەردەمی حوسەین كاملدا دەركەوت و هەرچەندە ئەو لەڕادەبەدەر لێهاتوو بوو، بەڵام نیگەران بووم لەوەی كە ڕەنگە لە ژێر فشارەكەدا هەرەس بێنین. لە كۆتاییدا دكتۆر فارس عەبدولعەزیز بەشی پشتیوانی ئەندازیاری بەڕێوەدەبرد و سەرپەرشتی زۆرترین ژمارەی ستافی دەكرد.

هەرچەندە دكتۆر فارس زیرەكییەكەی بەقەد دكتۆر فەرید نەبوو، بەڵام بە وزە و حەماسەتی خۆی قەرەبووی ئەو زیرەكییەی كردبوویەوە. لە ساڵانی دواتردا هەمیشە گاڵتەم پێدەكرد كە ئەو گەورەترین كارەكەر[1] بووە لە مەزرای ئاژەڵانی جۆرج ئۆرویڵ دا. ئەو كەسێكی جدی و میهرەبان بوو، و منداڵەكانم زۆر كەیفیان پێدەهات، زۆرجار دەیانپرسی كەی "مامە" فارس سەردانمان دەكات.

دكتۆر عادل بە پوختی وتی: باشە، پێدەچێت كارەكانمان بۆ دیاری كرابێت. لە كوێوە دەست پێ بكەین؟

داوام لە ئەندامێكی ستافەكەم كرد كە كتێبخانەی IAEC بپشكنێت بۆ هەر ماددەیەك كە دەتوانێت سوودی هەبێت، و سەرم سوڕما كاتێك دوای چەند كاتژمێرێك گەڕایەوە بە دیزاینە ئەمریكییەكان بۆ سەنتەرفیوجی بنەڕەتی. دیزاینەكانی ساڵانی چلەكان بوون. ئەو دیزاینانە سەرەتاییترین سەنتەرفیوجی كاركردنیان نیشان دەدا كە لەلایەن مامۆستای زانكۆی ڤێرجینیا جێسی بیمزەوە پەرەی پێدراوە وەك بەشێك لە پرۆژەی مانهاتن لە كاتی جەنگی جیهانی دووەمدا. لە كۆتاییدا ئەمریكییەكان تەكنیكەكەی سەنتەرفیوجیان لە بەرژەوەندی تەكنیكی بڵاوبوونەوە وەلا نا بە هۆكاری پراكتیكی: سەنتەرفیوجی كۆرپەیی بیمز هێزێكی زۆری بەكاردەهێنا و بە بەراورد لەگەڵ شێوازی بڵاوبوونەوە چوون بە شێوەیەكی ناعەقڵانی گران بوو. هەروەها سەنتەرفیوجی غاز دوای پێشكەوتنی نوێ لە دیزاینەكەیدا لە

---

[1] Workhorse ئاماژەیە بە كاراكتەری بۆكسەر، كە ئەسپێكی دڵسۆز، خۆمخۆر و ماندوو نەناس و ئازا بوو. بەرازەكان بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەكاریان دێنا.

ماوەی سالانی شەستەکاندا بووبووە بژاردەیەکی واقیعی. بەلام مۆدێلی بیمز کاریگەری هەبوو. ئەو هەر ئەم دیزاینانەی بۆ سەنتەرفیوجێك بەکارهێنا کە بە سەرکەوتوویی یۆرانیۆمی لە تاقیگەکانی زانکۆی ڤێرجینیادا پیتاند. هەروەها لەبارەی ئەوەی کە عێراق کۆپی ئەسلی ئەوانەی لەلابوو، ئەوا مانای وابوو کە ئێمە زۆر خۆشبەختین.

هەرگیز نەمزانی کە چۆن ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی دەستی بە ڕاپۆرتەکانی بیمز گەیشتووە، بەلام گومانم هەبوو لە ماوەی سالانی ١٩٥٠دا دابینکرابن، لە قۆناغە سەرەتاییەکانی بەرنامەی ئەتۆمی عێراقدا کە سنووردارکردنە نێودەولەتییەکان هێشتا شلتر بوون.

لەو پاشنیوەڕۆیەوە، ئێمە بە پەرۆشەوە کارمان کرد بۆ گۆڕینی بەلگەنامەکانی بیمز بۆ دیزاینێك کە بتوانرێت بۆ بەرهەمهێنان لەلایەن باشترین کۆمپانیا پیشەسازییەکانی عێراقەوە کاری لەسەر بکرێت. حوسەین کامل ڕۆژانە دەهات بۆ ئەوەی سەرمان لێبدات و دلمان بگرێت، بەلام لەگەل ئەوەشدا ئەو پێکهاتانەی کە پێویستمان بوو، دابینی دەکردن. ئەو بەشە ستوونییەی کە دەخولێتەوە و پێی دەوترێت ڕۆتۆر[1]، درا بە کۆمپانیای ناسر و سەددام کە تۆپ و چەکی دیکەی بۆ کۆمپانیای MIC دروست دەکرد. هەروەها دامەزراوەیەکیش لە قادیسیە کە دۆشکەی دروست دەکرد، پارچەی وردی دیکەیشی دروست دەکرد. ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی ڕۆنی تایبەتی بۆ هەلسوڕێنەری خوارەوە دابین کرد؛ تەکنیکارانی پالاوگەی نەوتی دۆرە،

(1) Rotor

ڕۆتۆره‌كه‌یان له‌سه‌ر میحوه‌ره ڕاسته‌كه‌ی هاوسه‌نگ كرد.

له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هیچ كام له ئێمه نه‌مانده‌توانی پێشبینی ئه‌وه بكه‌ین كه ئه‌گه‌ر بێت و سیسته‌مه‌كه به خێرایی زۆر بشكێت چی ڕووده‌دات، بۆیه من ڕێوشوێنی خۆپارێزیم گرته‌به‌ر كه ڕیمۆنت كۆنترۆڵێك دروست بكه‌م تاوه‌كو سه‌نته‌رفیوجه‌كه له ڕێگه‌ی كۆنترۆڵه‌وه له دووره‌وه كارپێبكرێت. هه‌مووومان دڵخۆش بووین كاتێك تاقیكردنه‌وه ده‌وره‌یه‌كی خێرایی پێنج هه‌زار خولانه‌وه‌ی له خوله‌كێكدا به‌ده‌ستهێنا. هه‌رچه‌نده ئه‌مه كه‌متر بوو له یه‌ك له‌سه‌ر ده‌ی خێرایی پێویست بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم، به‌ڵام نزیكه‌ی دوو هه‌زار له خوله‌كێكدا خێراتر بوو له هه‌ر شتێك كه پێشتر له عێراقدا به‌رهه‌م هێنرابوو. له‌و كاته‌دا حوسه‌ین كامل له‌گه‌ڵ سه‌ددام له گه‌شتێكی لوتكه‌ی عه‌ره‌بی له عه‌ممانی پایته‌ختی ئوردن بوون و كاتێك گه‌ڕانه‌وه به‌غدا و هه‌واڵه‌كه‌ی بیست، فه‌رمانی سه‌ربڕینی ده سه‌ر مه‌ڕ بۆ ژه‌مێكی ئاهه‌نگگێڕان له دامه‌زراوه‌ی ڕه‌شیدیه ده‌ركرد. هه‌رچه‌نده ئه‌وكات مانگی تشرینی دووه‌م بوو و خشته‌ی شه‌ش هه‌فته‌ییه‌كه‌ی گۆڕابوو بۆ چه‌ند مانگێك، به‌ڵام حوسه‌ین كامل بۆ ماوه‌یه‌كی كاتی لێمان خۆش بوو، چونكه كاره‌كانمان پێشكه‌وتنیان نیشان ده‌دا. به‌ڵام ڕۆحی لێبورده‌یی ئه‌و ته‌نها چه‌ند كاتژمێرێكی خایاند. چوون پێش ئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ پیاوانی سیكیوریتی دا بڕوات، فه‌رمانی پێكردین تا كۆتایی ساڵ سه‌نته‌رفیوجه‌كه بگه‌یه‌نینه په‌نجا هه‌زار خول له خوله‌كێكدا.

تا ئه‌وكات دروستكردنه‌كه نزیك بوو له ته‌واوبوون له‌نێو بینایه‌كی گه‌وره‌تر بۆ زیاتر تاقیكردنه‌وه‌ی نموونه سه‌ره‌تاییه‌كه. له ناوه‌وه ژوورێكی تایبه‌ت بۆ سه‌نته‌رفیوجه‌كه دروست كرابوو كه بیست پێ به‌رز بوو و دیواره‌كانی به‌هێزتر بوون و

ئەستووریەکەشی سێ پێ بوو. لە سەکۆیەکی کۆنترۆڵەوە دەمانتوانی لە پەنجەرەیەکی شووشەی ئەستوور چاودێری سەنتەرفیوجەکە بکەین.

لە بەیانییەکی سارد لە سەرەتای مانگی یەکدا، هەستم کرد ئامادەم خێراییەکەی بە قۆناغ زیاد بکەم. من و پێنج بەرپرسی بەشەکەم لەسەر سەکۆی چاودێری وەستاین کاتێك فەرمانم دەدا کە ئاستی خول لە خولەکێکدا بەرز بکرێتەوە. ئەوەبوو مۆنیتەرەکەی بەردەممان دە هەزاری خوێندەوە. پاشان پانزە هەزار. لەگەڵ نزیکبوونەوەی میلەکە لە هێمای هەژدە هەزار، گوێمان لە دەنگێکی شێوە فیشەکی کز بوو کە لە تۆنەکەدا بەرزبووەوە و نزیك بوو لەوەی گوێچکەمان کەڕ بکات. من و دکتۆر فەرید نیگایەکی ترسناکمان ئاڵوگۆڕ کرد. پێش ئەوەی فەرمانی کەمکردنەوەی خێرایی بکەم، گوێمان لە تەقینەوەیەك بوو وەك درزی تەقەی دەمانچە. هاوارم کرد بۆ تەکنیکارێك کە وزە لە ماتۆڕەکە ببڕێت. دوای ئەوەی کۆتایی هات و وەستا، بەپەلە چووینە ژووری سەنتەرفیوجەکە. کاتێك ڕۆتۆرەکەمان لابرد، پەڵەیەکی ڕەنگ گۆڕاوم لە کانزاکەیدا بینی، ئیدی تەواو وێران بووبوو.

دواجار ڕۆتۆری ئەلەمنیۆمەکە ئەو ترسانەی پشتڕاستکردەوە کە بە درێژایی پرۆسەکە بیرم لێکردبوویەوە. ڕاستییەکەی ئێمە بە باشی لە فشارەی سەر ئەو ماددانە تێنەگەیشتین کە لەم جۆرە خێراییە ستراتۆسفێریکانەدا ڕوودەدەن. چوون هێزی ناوەندگەرایی فشارەکانی بەرهەدەمهێنا کە ڕەنگە تەنها لە ڕێگەی زانیارییەکی پێشکەوتووەوە توانیبامان لێی تێبگەین. ئێمە هەوڵمان دابوو زانستە قورسەکەی داینامیکی ڕۆتۆر کورت بکەینەوە و ئەوەبوو

سەنتەرفیوجەكەمان لە ژێر فشاردا درزی تێكەوت.

بە ترسەوە تەلەفۆنم بۆ حوسەین كامل كرد.

گوتم: گەورەم، كێشەیەك لە سەنتەرفیوجەكەدا هەیە. "چی؟" حوسەین كامل بە دەنگێكی نزم پرسی.

"ڕۆتۆرەكە شكاوە."

حوسەین كامل دوای چەند خولەكێك گەیشتە ئەوێ. دەیبینی كە هەموو ستافەكەم دڵیان شكاوە، بەڵام یەك وشەی نەوت. ڕۆیشت بۆ سەر مێزەكە كە تەكنیكارەكانم خەریكی جیاكردنەوەی پارچەكانی ڕۆتۆرەكە بوون، هەڵیگرت و بۆ چەند ساتێك گرتی. لێوەكانی دەستیان كرد بە لەرزین و فرمێسكی توڕەیی لە چاوەكانیدا دیاربوون. پاشان ڕۆتۆرەكەی خستە سەر مێزەكە و ڕووی كردە ئۆتۆمبێلەكەی كە چاوەڕوانی بوو. منیش بەدوایدا ڕۆیشتم و كاتێك چووە ژوورەوە، بە بەكارهێنانی دەستەواژەی عەرەبی داوای لێبوردنم لێ كردو وتم: "گەورەم، ئێمە هەوڵمان داوە بەسەر كاتدا زاڵ بین، بەڵام لەجێتی ئەوە كات تۆڵەی لێكردینەوە".

حوسەین كامل بۆ ساتێك وەستا، منیش پێم وابوو شتێك دەڵێت، بەڵام هەرتەنها بە نیگایەكی هێندە هەڕەشەئامێزەوە سەیری كردم كە یەكسەر هەنگاوێكم بۆ دواوە نا. پاشان دەرگاكەی بە دەموچاوما داخست لەدەروازەكان چووە دەرەوە.

هەمووماں لە ڕەفتاری حوسەین كامل ترسابووین. سەرانسەری عێراقدا ناوبانگی بە دڕندەیی بڵاوببوویەوە، لەكاتێكدا پێگەی خۆی وەك دەستە ڕاستی سەددام چەسپاندبوو. لەڕاستیدا ئەو ببوو

بە سەددامێکی بچکۆڵە. ستافەکەم دەستیان کرد بە قسە لەسەر ئەو سزا ترسناکانەی کە ڕەنگە بەهۆی شکستی سەنتەرفیوجەکەوە بەسەریاندا بسەپێنێت. بڕیارمدا هەوڵ بدەم لە داهاتوودا تا دەتوانم ستافەکەم لە ئامادەبوونی حوسەین کامل بیانپارێزم. ئەم ڕووداوە تەواو دکتۆر میقدامی ترساندبوو، بەجۆرێك منی بردە لایەك و پێی وتم ئەو لە ژیانی خۆی دەترسێت و داوای لێکردم لە بەرپرسیارێتیەکەی ببەخشم. ئەوەندە توڕەو و ترساو دەرکەوت کە ترسم لە تەندروستی دەروونی ئەو زیاتر بوو. بەڕاستی بەزەییم بەو پیاوەدا هاتەوە. دوای چەند ڕۆژێك حوسەین کاملم ئاگادار کردەوە کە دکتۆر میقدام تووشی نەخۆشی چاو بووە و پێویستم بە جێگرەوەیە و دکتۆر میقدامیش بە سەلامەتی گواسترایەوە بۆ زانکۆی بەغدا.

دیارە ئەمە بۆ باقی کارمەندەکانم بژاردەیەك نەبوو. ڕوون بوو کە دەبێت بیر لە ستراتیژی خۆمان بکەینەوە و هەوڵی دووبارە بدەینەوە و شکستی سەنتەرفیوج نەك هەرتەنها کۆتایی کارەکانمان نەبوو، بەڵکو سەرەتایەك بوو.

# به‌شی چواره‌م
# نیگای توند و سه‌رنجئامێزی سه‌ددام

ڕۆتۆری سه‌نته‌رفیوجه‌كه‌ وه‌كو ته‌رمێك دوای پشكنینی جه‌سته‌یی له‌سه‌ر مێزێك له‌ تاقیگه‌كه‌ماندا به‌ شێوه‌یه‌كی پارچه‌ پارچه‌كراو كه‌وتبوو. من و ته‌كنیكاره‌كانم بێ هیچ قسه‌یه‌ك و به‌بێ ده‌نگی به‌ ده‌وریدا ده‌خولاینه‌وه، له‌ كاتێك ئه‌و فه‌وزایه‌ی ده‌وری ستانده‌كه‌مان پاك ده‌كرده‌وه‌ كه‌ له‌وێ دروست ببوو، و به‌شێكی زۆری ئامێره‌كانمان لێك هه‌ڵوه‌شانده‌وه. دیاربوو ڕۆن دزه‌ی كردبووه‌ سه‌ر به‌شه‌كانی تری ئامێره‌كان و ئێمه‌یش ده‌سته‌كانمان به‌و ڕۆنه‌ ببوو. به‌ بێزارییه‌وه‌ ده‌سته‌كانم به‌خاولییه‌ك سڕییه‌وه. جیاوازی نێوان ئه‌و وێنه‌ چه‌مكییه‌ ڕێك و پێك و ئامانجه‌ به‌رزانه‌ی كه‌ له‌ سه‌ره‌تاوه‌ هه‌مانبوو و له‌گه‌ڵ واقیعی ناڕێك و پێكی ڕۆتۆری شكاو دا، خواستی ئه‌ندازه‌كه‌مانی بۆ ده‌رئه‌نجامێكی ته‌واو بێ هیوا به‌رزكردبوویه‌وه.

ترسی من له‌ كاردانه‌وه‌كانی حوسه‌ین كامل له‌گه‌ڵ ئه‌و هه‌سته‌ دڵته‌نگكه‌ره‌ی كه‌ له‌گه‌ڵ شكستدا دێت، تێكه‌ڵ یه‌ك ببوو. به‌ڵام ده‌مزانی ناتوانم وازی لێ بێنم. حكومه‌تی سه‌ددام به‌و ئاسانییه‌ ڕێگه‌ی نه‌ده‌داین له‌ قه‌ڵغانه‌كه‌ ده‌ربچین. ناچار بووم چاره‌سه‌رێكی تر بدۆزمه‌وه. وێنه‌ی باوكمم بیركه‌وته‌وه‌ كه‌ له‌سه‌ر شانێكی خاكه‌نازێك و قۆڵه‌كه‌ی تری به‌ گه‌چه‌وه‌ به‌سترابوویه‌وه‌ و به‌ره‌و

باخچەکەمان دەڕۆیشت، هاتەوە بەرچاوم. بۆیە بڕیارمدا لە ئەرکەکەمدا خۆڕاگر بم.

ئەو وانانەم لەبەرچاو گرت کە لە تاقیکردنەوەکەمان لەگەڵ سەنتەرفیوجی ڕۆنی بیمز فێربووم. یەکەمیان ئەوە بوو کە خاوەنداریێتی دیزاینەکان بە تەنیا نامانباتە سەر سەنتەرفیوجێکی کارا، هەروەك چۆن هەبوونی نەخشی جلێك مرۆڤ ناکاتە دیزاینەری جلوبەرگ. تێگەیشتن لە بنەمای دیزاینەکان، گونجانی ماددەکان، ئەو ژینگەیەی کە تێیدا بەکاردەهێنرێن و پرسەکانی پەیوەست بە هاوسەنگی بە هەمان شێوە گرنگ بوون. بێگومان من واگومانم دەبرد، هەر بۆیە ئەمریکییەکان ڕێگەیان دابوو دیزاینەکانی سەنتەرفیوجی ڕۆنی بیمز لە ساڵانی ۱۹٥٠دا بخرێنە ناو کتێبخانە کراوەکان و هەموو کەس دەستیان پێ بگات. دیزاینەکان خۆیان زۆر بنەڕەتی بوون و نەیاندەتوانی بناغەیەکی بەهێزی پێویست بۆ بەرنامەی سەنتەرفیوج دابین بکەن.

من گەیشتمە ئەو قەناعەتەی کە سەنتەرفیوجی بیمز بۆ مەبەستەکانمان دەست نادات. بۆ ئۆپەراسیۆنێکی شاراوەی وەك ئێمە، مەترسی بەرکەوتنی لەگەڵ خۆیدا بوو. چەندین کیلۆوات وزەی بەکاردەهێنا و لە خێراییە بەرزەکاندا دەنگێکی بەرزی دەردەکرد کە لە نیو میل دوورەوە دەبیسترا. سەدان سەنتەرفیوجی بیم کە لە یەك کاتدا کاردەکەن، شاردنەوەی قورس بوو.

سەرنجم خستە سەر سەنتەرفیوجی موگناتیسی پێشکەوتوو. لە کۆتاییەکانی چلەکاندا لە ڕووسیا بیری لێکرایەوە و دواتر لە ئەمریکا و ئەوروپا پاڵاوتە کرا. بەکارهێنانی کارۆموگناتیسی بۆ پشتگیریکردنی ڕۆتۆر شۆڕشێکی گەورەی لە تەکنەلۆژیای

سەنتەرفیوجدا كردبوو. سەنتەرفیوجی موگناتیسی لە بۆشاییدا لەسەر خولەكانی خۆلێدانی سفر هاوسەنگ دەكات. وەك ئامێرێكی شێوە تارمایی، لە بێدەنگیدا دەسوڕێتەوە، دەست لە هیچ شتێك نادات. جوانی جوولەكەی پێدەچێت دیاردەیەكی وەك بلێی سەروو سروشتی بێت. وزەیەك بەكاردەهێنێت كە بە وات پێوراوە نەك بە كیلۆوات. ئەوەندە كارامەیە كە دەتوانرێت دامەزراوەیەك بۆ بەرنامەیەكی بچووك، بەڵام مەترسیدار، چەكی ئەتۆمی لەناو یەك كۆگادا بشاردرێتەوە. بۆ عێراق و وڵاتانی دیكە كە دەبوو خواستە ئەتۆمییەكانیان بشارنەوە، بەرنامەی سەنتەرفیوجی موگناتیسی چارەسەرێكی ئایدیاڵی بوو.

ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی زۆر لەمەوبەر بیرۆكەی دروستكردنی سەنتەرفیوجی موگناتیسی وەك خەیاڵێكی مەحاڵ ڕەتكردبووەوە، كە شتێكی زانستی-خەیاڵییە. هەستیان دەكرد عێراق هەرگیز ناتوانێت شتێك بە ئەنجام بگەیەنێت كە لە پێشكەوتووترین وڵاتانی جیهاندا لە ڕووی تەكنەلۆژیاوە ساڵانێك پێوەی خەریك بووینە. بەڵام من پێم وابوو كاتی ئەوە هاتووە كە هەڵسەنگاندن بۆ ئەنجامەكانیان بكەمەوە. سەرەڕای شكستمان لەگەڵ سەنتەرفیوجی بیمز، بەڵام بە شانازییەوە بیرم لە دەستكەوتەكانی تیمەكەم دەكردەوە. ئەندازیار و فیزیازانەكانی ستافەكەم لە گەورەترین عەقڵەكانی عێراق بوون، بەقەد باشترین زانایانی ڕۆژئاوا زیرەك بوون. لە ماوەی چەند مانگی ڕابردوودا خۆیان سەلماندبوو كە فێرخوازێكی خێران و توانایەكی زگماكییان هەیە بۆ گونجاندن. ئەو بەربەستانەی كە پێشبینیمان دەكرد بەڕاستی ترسناك بوون. كێشەی بنەڕەتی ئەوە بوو كە نە دیزاینەكانی سەنتەرفیوجی موگناتیسیمان هەبوو و نە شارەزاییمان

هەبوو بۆ لێكدانەوەی ئەو جۆرە دیزاینانە. هەروەها پێشبینیم كرد كە عێراق ژێرخانی دروستكردنی پێكهاتەكانی نییە. وەك شكستی ئێمە لەگەڵ سەنتەرفیوجی بیمز دەریخست، كارەكە بۆ كارگەكانی تۆپخانەی عێراقی زۆر ئاڵۆز بوو. ئەگەر ئێمە بەرنامەی سەنتەرفیوجی موگناتیسی ئەنجام بدەین، پێویستمان بە هاوكاری دەبێت لە هەموو هەنگاوێك دا لەلایەن بیانییەكانەوە كە ڕەنگە ئەوانیش گومان لە هەنگاوەكانمان بكەن. كە ئەمەش خاڵی هەرە لاوازی بابەتەكە بوو.

چەند ڕۆژێك دوای تێكشكانی سەنتەرفیوجەكەمان، حوسەین كامل لە ڕەشیدیە دەركەوتەوە. ئەمجارە من بەتوڕەییەوە بردمە ناو ئۆفیسەكەمەوە وەك هەوڵێك بۆ پاراستنی كارمەندەكانم لە تووڕەیی ئەو. دیارە كە خەریكی خەفەت و سەرقاڵی بابەتەكە بوو، هێشتا بەهۆی شكستەكەمانەوە ئاگری لێ هەڵدەستا لەتوڕەیی و لە حاڵێكی مەترسیداردا بوو. داوای كرد بزانێت لە داهاتوودا بەنیازین چی بكەین و منیش ئارام بوومەوە كە لانیكەم پلانێكی تیۆریم هەبوو. جوانی سەنتەرفیوجی موگناتیسیم ڕوونكردەوە، لەگەڵ كەموكوڕییە پراكتیكییەكانی دروستكردنی.

ئەوەبوو هاوارێكی بەسەرداكردم: "نامەوێت گوێم لە وشەی بەربەستەكان بێت، تەنها دەمەوێت پێشكەوتن ببینم، ئێستا لێم تێدەگەیت؟"

من بە تەواوی تێگەیشتم كە حوسەین كامل لە ژێر فشارێكی زۆردایە بۆ ئەوەی ئەنجامەكان پیشانی سەددام بدات، بەڵام ئەوەشم دەزانی كە بۆ ئەوەی ژیانمان ڕزگار بكەین، پێویستم بە هەندێك ئیمتیاز هەیە لە چوارچێوەی ماوە كاتییەكەدا. ئێمە

نه‌مانتوانی سه‌نته‌رفیوجێكی موگناتیسی به‌رهه‌م بهێنین له‌سه‌ر بنه‌مای حه‌زێكی كت و پڕ.

گوتم: پێویستم به گه‌شتكردن ده‌بێت بۆ ئه‌مریكا، هه‌روه‌ها حه‌ز ده‌كه‌م دكتۆر فه‌رید له‌گه‌ڵ خۆم ببه‌م.

ڕوونم كردەوه كه به‌پێی لێكۆڵینه‌وه‌كانمان بێت كۆمه‌ڵێك له یه‌كه‌م تاقیكردنه‌وه گشتگیره‌كان له‌سه‌ر سه‌نته‌رفیوجی موگناتیسی له‌لایه‌ن فیزیازانێكی نه‌مسایی به ناوی گه‌رنۆت زیپه‌وه له كۆتاییه‌كانی په‌نجاكانی سه‌ده‌ی ڕابردوودا ئه‌نجامدراوه. ئه‌و فیزیازانه له زانكۆی ڤێرجینیا كاری كردبوو و گوایه هه‌ندێك له ڕاپۆرته‌كانی هێشتا به كراوه‌یی له‌وێدا به‌رده‌ست بوون. ئه‌م ڕاپۆرتانه ده‌توانن بنه‌مایه‌كی به‌نرخ دابین بكه‌ن له‌سه‌ر بنیاتنانی به‌رنامه‌یه‌كی سه‌نته‌رفیوجی مۆدێرنتر. هه‌روه‌ها، وتم، كۆمپانیایه‌كی ئه‌مریكی له باكووری ویلایه‌تی نیویۆرك، به ناوی كۆمپانیای ته‌كنۆلۆژیای میكانیكی ئاڵۆزترین به‌رنامه‌ی كۆمپیوته‌ریی جیهانی په‌ره‌پێداوه كه په‌یوه‌ندییان به بڕگه‌ی ئامێره سووڕاوه‌كانه‌وه هه‌یه. به‌رنامه‌كان به سه‌نته‌رفیوجی بیمزه‌وه گه‌یشتنه دڵی شكسته‌كه‌مان. به حوسه‌ین كاملم گوت، كه ئه‌گه‌ر هاتوو توانیمان له ژێر ڕاداری ئه‌مریكییه‌كان بخلیسكێین و هه‌ستمان پێنه‌كه‌ن و ئه‌م شتانه به‌ده‌ست بهێنین، ئه‌وا مانای وایه كه تۆو و بناغه‌ی پێویستمان له ده‌ستدایه بۆ گه‌شه‌پێدانی به‌رنامه‌یه‌كی ئه‌تۆمی ڕاسته‌قینه.

حوسه‌ین كامل ده‌ستێكی به‌سه‌ر برۆیدا هێنا و پێده‌چوو كاریگه‌رییه‌كانی ئه‌و شته‌ی كه من ده‌یڵێم له‌به‌رچاو گرتبێت: واته كه به‌رنامه‌ی سه‌نته‌رفیوجی موگناتیسی ساڵانێكی زۆری ده‌وێت نه‌وه‌ك چه‌ند مانگێك. خه‌ریك بوو له‌و ساته‌دا به‌زه‌ییم پێدا بێته‌وه.

هەروەك چۆن من لە نێوان داواكارییەكانی و واقیعی زانستدا گیرم خواردبوو، ئەویش لە نێوان من و هەوڵی كوێرانەی سەددام بۆ بۆمبێك گیری خواردبوو.

وتی: "باشە كەوابوو برۆ بۆ ئەمریكا" و نیگایەكی پڕ لە بێمتمانەیی ئاڕاستە كردم. وتیشی: "بەڵام باشترە ئەگەر بە تەنیا بچیت."

دەبێ حوسەین كامل زانیبێتی كە دكتۆر فەرید برایەكی هەیە كە لە ئەمریكا دەژی و لە ڕووخساریدا دەمتوانی گومانێكی كاتی بخوێنمەوە كە ڕەنگە دكتۆر فەرید، یان هەردووكمان هەوڵی نەهاتنەوە بدەین. بیرۆكەیەك بوو كە لەوەو پێش بیری لێ نەكرابوویەوە. هەردووكمان خێزاندار بووین و منداڵەكانمان لە بەغدا دەمانەوە، هەرگیز دەستبەرداریان نابین. هەروەها لە ماوەی بیست و پێنج ساڵی ڕابردوودا سەفەری زۆرم بۆ دەرەوەی وڵات كردبوو بەبێ ئەوەی وڵاتەكەم بەجێبهێڵم.

گوتم: "گەورەم، تۆ بەرپرسیارێتییەكی گەورەت خستۆتە ئەستۆی ئێمە. دەبێت ڕێگەم پێبدرێت پشت بە ستافەكەم ببەستم. ئەگەر متمانەت بە یەكێك لە هاوكارەكانم نەبوو ئەوا لە بەشەكەم دووری بخەرەوە. ئەگینا لێت دەپاڕێمەوە كە با فەرمانەكانم جێبەجێ بكەن".

حوسەین كامل شانی هەڵكێشا. گوتی: لە ئەستۆی تۆ دایە، هەروەها بزانە كە من پێشبینی دەكەم ئەنجامەكان ببینم."

نیگای گوماناوییەكەی خەمی منی قووڵتر كردەوە بەوەی ڕەنگە خێزانەكانمان بخاتە ژێر چاودێرییەوە. بەمجۆرە ڕەنگە بەردەوام پۆلیسی نهێنی بەدوامدا بكەون و گوێ لە گفتوگۆ

تایبەتەکانم بگرن. بێگومان هەرگیز نەمدەتوانی دڵنیا بم. ئەمە بەشێکە لە نیشانە و کاریگەرییەکانی دەوڵەتی پۆلیسی. ترس لە شێوەی سێبەرێك بەدواماندا دەبێت و وامان لێدەکات ڕەفتارەکانمان بگۆڕین. کەشوهەوای چاودێری گشتی وایکرد کە هەموو خێزانەکەمان وریا و هۆشیار بن. هەروەها پێگەی من لە دیمەنی دووەم بەهێزترین پیاوی عێراقدا، من و بەرپرسانی بەشەکەمی ڕاستەوخۆ خستە هێڵی ئاگرەوە.

کاتێك من و دکتۆر فەرید لە نیسانی ١٩٨٨دا لە ڕێگەی ئەڵمانیاوە سواری فڕۆکە بووین بۆ ئەمریکا، بیرم لەوە کردەوە کە هۆشداری توندی حوسەین کاملی پێ بڵێم بەڵام دواجار بڕیارمدا وانەکەم. دکتۆر فەرید پیاوێك بوو لە شتەکان تێدەگەیشت بەبێ ئەوەی پێویست بکات پێی بڵێین. لە کاتی سەفەرەکانماندا وەك یاسایەکی نکۆڵی لێ نەکراو دەبوو سروشتی ڕاستەقینەی کارەکانمان بشارینەوە. تەنانەت لەگەڵ یەکتریشدا، من و دکتۆر فەرید باسمان لە بەدەستهێنانی "ڕاپۆرتەکە" کرد نەوەك "ڕاپۆرتەکەی زیپ" یان باسکردنی وشەی "سەنتەرفیوج". نهێنییەکانمان لەنێو دڵ حەشاردابوو.

ئەوە یەکەم گەشتم بوو بۆ ئەمریکا لە دوای بیست ساڵدا. لە گەشتەکەی پاشنیوەڕۆدا لە فڕۆکەخانەی جۆن ئێف کێنێدی نیویۆرکەوە بۆ فڕۆکەخانە ئاسمانییە بچووکەکەی شارلۆتسڤیل لە ویلایەتی ڤێرجینیا، لە سەرووی هەورەکانەوە چاوم بە کێڵگە سەوزەکانی پێنسیلڤانیا و میریلاند کەوت و یادەوەریم گەڕایەوە بۆ ڕۆژانی کۆلێژم لە قوتابخانەی کۆلۆرادۆ لەنێو کانەکان. قسە زۆرو زەبەندەکانم بیرکەوتنەوە لەگەڵ هاوڕێی گەشتەکەم دەیڤید جۆنسۆن و هاوڕێم بیل هونزیکەر و کاپتنی تیپی مەلەوانیمان و

هاوڕێ عێراقییەکەم حەمید ئەلحەکیم. هەموومان پلانمان هەبوو بۆ ئەوەی جیهان بگۆڕین بۆ شوێنێکی باشتر. ئەو ڕۆژانەی تژی بوون لە ئازادی ئێستا دوور دەهاتنە بەرچاو. من نەمدەتوانی بیهێنمە پێش چاوم کە ئەگەر هاتوو ئەو هاوڕێیانەم ببینن و بزانن من داڕێژەری بەرنامەی سەنتەرفیوجی سەددام حوسێنم ئەوا چیم پێ دەڵێن. دوای تەواوکردنی خوێندن پەیوەندیمان پچڕا و منیش دوای پرسیارکردن بۆم دەرکەوت کە هەر یەکەیان خەریکی ژیانی خۆیەتی.

بەیانیەکەی دیکە من و دکتۆر فەرید سەردانی زانکۆی ڤێرجینیامان کرد، کە تیایدا جێسی بیمز و گەڕنۆت زیپ پێشەنگی تەکنیکەکانی سەنتەرفیوج بوون بۆ ماوەی دوو دەیە. بەپێی ئامارەکانی ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی بێت، ڕاپۆرتەکەی زیپ یەکێك بووە لە دوا بەڵگەنامەی پۆلێن نەکراو لەسەر سەنتەرفیوجی موگناتیسی و نوسخەی کەمی لێ هەبووە. هەرچەندە دیزاینی ڕاستەقینەی نەبوو، بەڵام زانیارییەکی گرنگی تێدابوو. زیپ ڕاپۆرتەکەی لەسەر داوای کۆمیسیۆنی وزەی ئەتۆمی ئەمریکا ئامادە کردبوو، دوای پیشەیەك کە بەهۆی ڕووداوە نێودەوڵەتییەکانی سەردەمی خۆیەوە لە قاڵب درابوو.

هەستم بە جۆرێك لە لێکچوون یان خزمایەتیەکی دوور دەکرد لەگەڵ زیپ. چوون ئەویش لە دەوڵەتێکی تۆتالیتاریدا فشار خرابووە سەری بۆ خزمەتی بەرنامەیەکی چەکی ئەتۆمی. لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەمدا، بریکارەکانی سۆڤیەت دەستیان بەسەردا گرت و خستیانە سەر کار لەسەر بەرنامەی سەنتەرفیوجی ئەتۆمی یەکێتی سۆڤیەت. دواجار سۆڤیەت ڕێگەی پێدا لە ساڵی ١٩٥٦ بگەڕێتەوە نیشتمان، بەڵام ئەمریکییەکان بە خێرایی ڕازییان

کرد کە هەندێك لەو کارانەی لە ڕووسیا کردبووی دووبارە دروستی بکاتەوە. گوایە ئەوەی زیپ لە زانکۆی ڤێرجینیا بەرهەمی هێناوە ئەوەندە گشتگیر بووە کە بنەمای پەرەپێدانی سەنتەرفیوجی موگناتیسی لە ڕۆژئاوا پێکهێناوە.

یەکەم وێستگەمان لە بەشی ئەندازیاری میکانیکی بوو، کە دوور نەبوو لە بەشی فیزیا، کە زیپ و بیمز لەوێ کاریان کردبوو. ئێمە تامەزرۆی بینینی ئەم شوێنە ئەفسانەییە بووین بە چاوی خۆمان. چووینە ناو شوێنی پێشوازی بەشی ئەندازیاری میکانیك، هەر لەو کاتەی پێشوازیکارەکە پرسیاری ئەوەی کرد کە ئایا دەتوانێت یارمەتیمان بدات، ناوی بەرپرسی بەشەکەم لەسەر دەرگای ئۆفیسەکەی بینی.

پرسیم: "تکایە دەتوانین دکتۆر تاونسێند ببینین؟".

وتی: "پێشوەختە ئاگادارت کردۆتەوە؟"

چاوێکم لە دکتۆر فەرید کرد و گوتم: "بەداوای لێبوردنی زۆرەوە، ئێمە عادەتەن وا ناکەین، لەڕاستیدا ئێمە مامۆستای زانکۆی بەغداین لە عێراق. تا ڕادەیەك قورس بوو لەوێوە پێشوەختە تەلەفۆن بکەین، بەڵام هیوامان خواست بەڵکو دکتۆر تاونسێند چەند خولەکێکمان پێببەخشێت".

پێدەچوو پێشوازیکارەکە تێگەیشتبێت و ئەوەبوو پەیوەندییەکی تەلەفۆنی کورتی ئەنجام داو دواتر سەرۆکی بەشەکە لە ئۆفیسەکەیەوە هاتە دەرەوە. دکتۆر مایلز ئەی تاونسێند پیاوێکی قژ خۆڵەمێشی و ڕوخسارێکی ڕێك و جەستەی مامناوەند بوو. تۆقەی لەگەڵدا کردین و بە میهرەبانییەوە بانگهێشتی کردین بۆ ناو ئۆفیسەکەی. پێم گوت کە ئامێری سووڕاوە بابەتێکی نوێی

لێكۆڵینەوەیە لە زانكۆی بەغدا و ئەوەبوو ئەویش یەكسەر تەلەفۆنی بۆ دوو یاریدەدەری بچووكی كرد تا بەشەكەمان پیشان بدەن.

زانكۆی ڤێرجینیا چیتر بەرنامەی توێژینەوەی سەنتەرفیوجی نەبوو. بەڵام جێ پەنجەكانیم دەبینی. بەشی ئەندازیاری میكانیكی هێشتا سەرنجی زۆری لەسەر ڕۆتۆری خێرایی بەرز بوو بۆ كارە جیاوازەكان، وەك تۆربایین بۆ هێلیكۆپتەر و هەروەها مۆلیدەی كارەبا.

من و دكتۆر فەرید پرسیار بارانمان كردن و پێدەچوو سەریان سوڕمابێت لە تێگەیشتنمان لە بابەتەكە. ئێمە لە ئاستێكی زۆر ئاڵۆزدا باسی داینامیكی ڕۆتۆرمان كرد. هەستم بە شەرەفمەندی كرد كە ئەم ئەندازیارە بەتوانایە ئەمریكییانە بە خێرایی ئێمەیان وەك هاوتای زانستی خۆیان مامەڵە لەگەڵ كرد. هەروەها ئاسوودە بووم كە وا دیار بوو بە تەواوی باوەڕیان بە چیرۆكەكەی ئێمە كردووە. هەروەها هەرگیز پرسیاریان نەكرد كە ئاخۆ زانكۆی بەغدا فاكەڵتییەكی وا لێهاتووی لەو بوارەدا هەیە.

سەرنجەكەم زۆر زیاتر بوو كاتێك ئێمەیان بردە تێرمیناڵێكی تژی لە كۆمپیوتەر بۆ ئەوەی بەرنامەیەكمان پیشان بدەن كە بۆ هاوشێوەكردنی هێزی خولانەوەی دروستیان كردبوو. بە داخلكردنی گۆڕاوە جیاوازەكان، دەتوانرێت بەكاربهێنرێت بۆ تێگەیشتن لە داینامیكی بنەڕەتی هەر شتێك كە دەسوڕێتەوە، لە ئەكسیلی بارهەڵگرەوە تا دەگاتە سەنتەرفیوج. یەكسەر بۆم دەركەوت كە ئەم ئامرازە چەندێك دەتوانرێت سوودی لێ ببینرێت و بەنرخ بێت لە دەستی ئێمەدا. بەڵام كاتێك گەڕامەوە بۆ ئۆفیسی دكتۆر تاونسێند بۆ ئەوەی پرسیار لەبارەی كڕینی

بەرنامەكە بكەم، پێشوازیكارەكە پێی وتم كە سەرقاڵە. پێشنیارم كرد كە دواتر پاشنیوەڕۆ بگەڕێینەوە، و ئەوەبوو داوای ڕێنماییم لێكردن تاوەكو كتێبخانەم نیشان بدەم. چوون لەوێ هیوادار بووم ڕاپۆرتەكەی زیپ بدۆزینەوە.

من هیچ كێشەیەكم نەبوو لە دۆزینەوەی ژمارەی كەتەلۆگەكە و من و دكتۆر فەرید بە جۆشێكی زۆرەوە چووینە ناو ڕەفەكانی كتێبخانەكەوە. بەڵام لەو شوێنەی كە دەبوو ڕاپۆرتەكەی زیپی لێ بێت تەنیا كاغەزێكمان دۆزیەوە كە ڕێنمایی تایبەتی لەسەر بوو بۆ ئەوەی داواكاری تایبەت بنووسین تاوەكو لەنێو كتێب و دەسنووسە دەگمەنەكاندا نیشانمان بدەن.

لە كتێبەوانە[1] چاویلكەدارەكە و ژمارەی كەتەلۆگەكەیەوە نزیك بوومەوە و بۆئەوەی داواكارییەكەی پێ بگەیەنم، ئەوەبوو ئەویش لە ناوچەیەكی داخراوی كتێبخانەكەدا ون بوو. پاشان كاتێك دوای چەند خولەكێك گەڕایەوە، فۆڕمێكی درێژ و قەڵەمێكی پێدام.

وتی: "دەبێت سەرەتا ئەمە پڕبكەیتەوە. بۆ مەبەستی ئەمنی. هەروەها پێویستم بە ناسنامەكەتان دەبێت".

ئەمەش منی خستە دۆخێكی ناڕەحەت، چونكە پڕكردنەوەی ئەو جۆرە فۆڕمانە شوێنەواری مەترسیدار بەجێدەهێڵێت. بە دڵنیاییەوە هەواڵگری ئەمریكی دەزانن كە دوو پیاوی عێراقی داوای بینینی ڕاپۆرتێكی سەنتەرفیوجیان كردووە لە زانكۆی ڤێرجینیا. ئێمەش توانای ئەوەمان نەبوو بەڵگەیەكی وەها ئاشكراكەر

[1] Liberarian

بەجێبهێڵین، بەتایبەتی لە سەرەتای بەرنامە نهێنییەكەماندا.

پرسیارم كرد: ئایا دەكرێت پێش ئەوەی ئەو فۆرمە پڕبكەینەوە دڵنیا بین لەوەی كە ڕاپۆرتەكە بەڕاستی لێرەدایە؟

كتێبەوانەكە بە نیگایەكی بێزاركەر سەیری كردم، پاشان گەڕایەوە بۆ بەشی پشتەوەی كتێبخانەكە. لەسەر مێزەكەی چاوەڕێی بووین وەك ئەوە وابوو كە چەند كاتژمێرێكە چاوەڕێین. لە تەنیشتمەوە دكتۆر فەرید ئارەقەی شین و مۆری دەردابوو.

دكتۆر فەرید بە چرپەوە وتی: پێت وایە پەیوەندی بە دەسەڵاتەوە بكات؟

وتم: "نیگەران مەبە، ئێمە لە نێو زانكۆداین، داواكارییەكمان هەیە كە ڕۆژانە دەكرێت. پێدەچێت كێشەی دۆزینەوەی ڕاپۆرتەكەی هەبێت".

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەك ئەو نیگەران بووم. وشەی "ئاسایش یان دەسەڵات" كاردانەوەی نائاگایی پڕ لە ترسی لە هەردووكماندا هێنایە ئاراوە. چونكە لە عێراقدا ئەم وشانە بەزۆری بە مانای تەواو پێچەوانە بوو. ئەو چەمكە بەڕواڵەت ناعەقڵانییەی دكتۆر فەرید لەناكاو دەستی بەسەرمدا گرت. چی دەبوو ئەگەر داواكارییەك بۆ ڕاپۆرتەكەی زیپ ئاگاداركردنەوەی ئاسایشی بەشێوەی ئۆتۆماتیكی لێكەوتەوە؟ ئەگەر كتێبەوانەكە پەیوەندییەكی تەلەفۆنی بكردایە و لێپرسینەوەمان لەگەڵ بكرایە، بەزەحمەت باوەڕیان بە چیرۆكەكەمان دەكرد كە گوایە لە زانكۆی بەغدادین. بیرم لە دەرئەنجامە ترسناكەكان دەكردەوە ئەگەر حوسەین كامل بزانێت ئێمە لە ڕێگەی هەڵەیەكی گەمژانەی ئاوادا خۆمان ئاشكرا كردووە.

دواجار كتێبەوانەكە گەڕایەوە لەدەستیدا كۆمەڵێك كاغەز هەبوو كە وایكرد ئاسوودە بم.

وتی: "ئا ئەوەیە" پاشان وتی "ئێستا تكایە ئەم فۆرمانە پڕبكەنەوە."

پرسیم: "دەتوانم بۆ ساتێك ببینم تا دڵنیا ببمەوە كە بەڵگەنامەیەكی دروستە؟".

ڕاپۆرتەكەی دایە دەستم و لە نزیكەوە سەیری كرد كاتێك بردمە سەر مێزێكی نزیك و لاپەڕەكانیم هەڵدەدایەوە. هەروەك هیوام بۆ خواستبوو، ڕێك وەها دەرچوو كە بەڕاستی كارێكی پڕ بایەخ بوو. نەخشە و ڕەهەندەكانی پارچەی سەنتەرفیوجی تێدا نەبوو بەڵام دیدێكی فراوانی لە بنەما ئەندازیارییەكانی پشت سەنتەرفیوجی موگناتیسی تێدابوو. ئەوە ڕێك ئەو پرایمەرە بوو كە تیمەكەمان پێویستی پێی بوو. بەڵام هیچ ڕێگەیەك نەبوو بۆ خوێندنەوەی بەبێ پڕكردنەوەی فۆڕمی بڵاوكردنەوە، هەروەها بە دڵنیاییەوە هیچ ڕێگەیەك بۆ كۆپیكردنی نەبوو. سەرنجم دا كتێبەوانەكە چەند پێیەك لە دوورەوە چاوەكانی لەسەرم بوو. من بە وردی سەردێری بابەتەكانی ڕاپۆرتەكەم سكان كرد لە كاتێكدا هەوڵم دەدا وا دەركەوم كە تەنها لاپەڕەكان دەگەڕێم و سەیر دەكەم.

- ئایا ئەمە ئەوەیە كە تۆ بەدوایدا دەگەڕێیت؟ كتێبەوانەكە بە بێ تاقەتی پرسی. گوتم: "هێشتا دڵنیا نیم".

دەمزانی تەنها چەند چركەیەكی ترم ماوە بۆ ئەوەی سەیری ڕاپۆرتەكە بكەم. پاشان گەیشتمە پاشكۆیەك كە وەرگرانی ڕاپۆرتەكەی تێدابوو كاتێك بۆ یەكەمجار لە ساڵی ١٩٦٠دا

دەرچوو: خاوەنی ئەو چەند نوسخە بەنرخە. لەكاتی سەیركردنی لیستەكە، ناوی پرۆفیسۆرێكم ناسیەوە لە میلانۆ كە پەیوەندی بە بەرنامەی ئەتۆمی ئیتالیا هەیە. ئەوە ئەو زانیارییە بوو كە پێویستم بوو.

گوتم: "نەخێر، دەترسم ئەمە ئەو بەڵگەنامەیە نەبێت كە ئێمە بەدوایدا دەگەڕاین" و ڕاپۆرتەكەم دایەوە بە كتێبەوانەكە.

- بەڵام سوپاس بۆ كاتەكەت.

لەگەڵ دەرچوونمان لە كتێبخانە، باسەكەم لە دكتۆر فەرید شاردەوە.

گوتم: "وا دیارە پێویستم بە گەشتێكی دیكە دەبێت بۆ لای هاوڕێكانمان لە ئیتاڵیا. ئەگەرچی كاتێكی زۆریشی بەسەردا ڕۆشتووە. بۆیە هیوادارم منیان بیر مابێت".

درەنگانی ئەو نیوەڕۆیە گەڕاینەوە بەشی ئەندازیاری میكانیكی و دكتۆر تاونسێندمان لە میزاجێكی باش دا بینی. دەبێ یاریدەدەرەكانی بە شێوەیەكی باش باسیان لە پرۆفیسۆرە شارەزاكانی زانكۆی بەغدا كردبێت، چونكە وەك هاوتەمەن سڵاوی لێكردین و گوتی كە لە خزمەتماندایە. وەك بیرۆكەیەك بە مێشكمدا هات پێی بڵێم كە هەندێك لە تەكنیكارەكانم دەتوانن لە تاقیگەكانی دكتۆر تاونسێندا شتی زۆر باش فێربن.

گوتم: "ئێمە ئارەزووی ئەوەمان هەیە چەند خوێندكارێكی پۆست دكتۆرا بنێرین بۆ ئێرە بۆ ئەنجامدانی توێژینەوەكانیان، بێگومان چاوەڕوانی سكۆلەرشیپیش ناكەین بەڵكو زانكۆكەمان هەموو تێچوونەكانی پەیوەست بەم خوێندنەوە لەخۆ دەگرێت".

بیرۆكەكە دكتۆر تاونسێندی دڵخۆش كرد. پرسیاری لەبارەی تاقیگەكەنمان كرد لە بەغدا كرد.

منیش گوتم: ئەوەی ئەوان لەگەڵ هی ئێوە بەڕاستی بەراورد ناكرێت.

سەبارەت بە كڕینی كۆپییەكی بەرنامەی دینامیكی ڕۆتۆر، قەناعەتم بە دكتۆر تاونسێندی كردبوو. ئەویش بەبێ چاوتروكاندن ڕازی بوو، ئێمەش بە نرخی ٩٠ هەزار دۆلار یەكلایی بووینەوە.

هەرچەندە بەسوود بوو، بەڵام بەرنامەكە یارمەتیدەرمان نەبوو بۆ چارەسەركردنی هەموو ئەو كێشە ئاڵۆزانەی پەیوەستن بە دینامیكی ڕۆتۆرەوە. چوون وەك هەر كەسێكی ئاسایی كە گوێی لە لەرزینی ئامێری جل شۆردن بووە لە كاتی خولی خولانەوەیدا، ئەوا دەزانێت كە سلندەرێكی سووڕاوە بە ئاسانی لە هاوسەنگی دەردەچێت. سەنتەرفیوجێك كە تیرەكەی نزیكەی شەش ئینج بێت و بە خێرایی ٦٠ هەزار خول لە خولەكێكدا یان زیاتر دەخولێتەوە- نزیكەی ١٠٠٠ خولانەوەی لە چركەیەكدا- ئەمە پێویستی بە زانستێك هەیە كە بە شێوەیەكی خەیاڵی پێی دەوترێت ژمێریاری ئاڵۆز[1]. لەگەڵ خولانەوەی دیوارەكانی سەنتەرفیوج بە خێرایی زیاتر لە خێرایی دەنگ، پرسەكانی بڕگە و لەرزینەكانی هارمۆنی وێرانكاری لەگەڵ پێكهاتەی كەرەستەكاندا دروست دەكەن، بەمجۆرە شتە نەزانراوەكان دەخەنە ڕوو كە تەنها لە ڕێگەی حیساباتی ئاڵۆزەوە چارەسەر دەكرێن.

كۆمپانیای MTI لە شاری لاثام لە ویلایەتی نیویۆرك یەكێك بوو لەو كۆمپانیا كەمانەی جیهان كە لە ڕێگەی بەرنامەیەكی

(1) Hairy mathematics

كۆمپیوتەردا ئەم نهێنییە بیركاریانەی ئاشكرا كردبوو. زۆربەی بەرهەمهێنەرانی سەنتەرفیوجی گەورە وەك ویێستینگهاوس لە ئەمریكا یان یورێنكۆ لە ئەورووپا لە ناوخۆدا ئەم بەرنامانە پەرەپێدەدەن و وەك نهێنی كۆمپانیا پارێزگارییان لێدەكەن. بەڵام MTI جیاواز بوو. ، بەپێی لێكۆڵینەوەكانم وەك بەڵێندەرێك نەك تەنها مامەڵەی لەگەڵ پرۆژەی بزوێنەر و ڕۆتۆری پۆلێنكراوی بەرز بۆ سەربازی ئەمریكا و ناسا كردووە، بەڵكو لەگەڵ كۆمپانیا تایبەتەكانیشدا مامەڵەی كردووە. دەستكەوتنی ئەم بەرنامەیە دەیتوانی ساڵانێك لەو كاتە كەم بكاتەوە كە پێویستە بۆ پەرەپێدانی سەنتەرفیوجی عێراقی.

ئێمە پێشوەختە داوای چاوپێكەوتنمان لەگەڵ بەڕێوەبەری تەكنەلۆژیا كرد، خۆمان وەك ئەندازیار لە وەزارەتی نەوتی عێراق ناساند. بەڵام كاتێك بە تەكسی لە شاری نیویۆركەوە بەرەو باكوور دەڕۆیشتین، من و دكتۆر فەرید دڵنیا نەبووین لەوەی كە چ ئاستێكی ئاسایش دەدۆزینەوە یان كارگێڕانی MTI چەندە كراوە دەبن بەرامبەر بە دوو زانای بەغدا. درەنگانی پاشنیوەڕۆ گەیشتینە مۆتێلێك لە (لاثام)، لەوێ پرۆڤەمان لەسەر داڕشتنی چیرۆكی ڕێكەوتنەكە كرد. بینا مۆدێرنەكانی كۆمپانیای MTI لە دەرەوە لە كۆمپانیایەكی تەكنەلۆژی ئاسایی دەچوو، بەڵام هەر كە من و دكتۆر فەرید چووینە نێو ناوچەی پێشوازی، ڕووبەڕووی هەڵبژاردنی دوو هێڵ بووینەوە: یەكێكیان بۆ سەردانكەرانی كاروباری پۆلێنكراوی و ئەوی دیكەیان بۆ بازرگانی پۆلێن نەكراو. پێشتر شتێكی وام نەبینیبوو؛ وەك ئەوە وابوو لە فرۆكەخانەیەكی نێودەوڵەتیدا بە گومرگدا تێپەڕیت. ئەوەبوو بەبێ دوودڵی دكتۆر فەریدم بەو ڕێگایەدا برد كە لێی نووسرابوو بازرگانی ناپۆلێنكراو.

دوای ئەوەی لەو ڕێچکەیە هاتنیە دەرەوە کە ئاسایشێکی کەمی لێبوو، پیاوێك بە ناوی بۆب هات و ئێمەی بردە ژوورێك. کەسێکی باڵابەرز و قۆشمەبازی لێبوو کە چاوەکانی زەق زەق بوون. ئەوەبوو نەختێك پێکەنین و قسەی خۆشمان ئاڵوگۆڕ کرد و دواتر هاتینە سەر خاڵی مەبەست. بە بەکارهێنانی زانیارییە نزیکەکانم لەسەر بازرگانی نەوت لە عێراق، ڕوونکردنەوەیەکی باوەڕپێکراوم بە بۆب دا سەبارەت بە پێویستی وەزارەتی نەوت بۆ بەرنامەی MTI cadence بۆ ئامێرە سووڕاوەکانمان وەك پەمپ، بلۆوەر و کۆمپرێسەر.

گوتم: هەرکات پارچەیەك لەو ئامێرانەی کە دەخولێنەوە شکا، دەبێت ڕەوانەی دەرەوەی وڵات بکەین بۆ شیکاری و چاککردنەوە. ئەوکات کێشەمان هەیە لە پاراستنی بەرهەمهێنانی نەوتمان، کە وەك دەزانن نەوت بزوێنەری ئابووری عێراقە. ئێمە دەمانەوێت بتوانین لەڕێگەی خۆماڵییەوە ئەو کارە بکەین لەبری ئەوەی بانگەوازی پسپۆڕانی بیانی بکەین. چوون ئەمە دەتوانێت ملیۆنان دۆلارمان بۆ پاشەکەوت بکات.

بۆب لۆژیکی ئەم ئارگیومێنتەی بینی. دوای ئەوەی کۆمەڵێك پرسیاری تەکنیکی لێکردم، تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و پەیوەندییەکی ئەنجام دا.

ئەو وتی: دەیڤد، نەختێك کاتت هەیە؟ دەمەوێت ئەم کەسانە بناسیت.

کاتێك دەیڤد گەیشتە لای ئێمە دیسانەوە چیرۆکەکەمان زیاتر بە وردی ڕوون کردەوە. پیاوێکی لاواز و بێدەنگ، دەیڤد قاوەیەکی پێشکەش کردین و چووە لای ئامێرێکی قاوە فرۆشتن

و دراوێکی لە گیرفانی خۆیەوە دەرکرد و قاوەی بۆ کڕین و منیش نەمتوانی زەردەخەنەی پێزانینی بۆ نەکەم. لە عێراق بەڕێوەبەرانی وەك دەیڤید لایان وایە کە ئەوان کەسی زۆر گرنگن، لەوە گرنگترن کە قاوەیەك پێشکەش بە کەسێك یان میوانێك بکەن، بۆیە بۆ ئەم مەبەستە سکرتێر یان خزمەتکاریان داناوە.

پاش ئەوەی گەڕانێکمان کرد بە هەندێك لە تاقیگەکانی MTI، بۆب و دەیڤد بانگهێشتیان کردین بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ لە چێشتخانەیەکی جوان لە ناوەڕاستی یاریگایەکی گۆلفی لەم دەوروبەرە. گەڵا بەهارییەکانی سەر درەختەکان شنەیان لێوەدەهات لەنێو ئەو چیمەنە گەشاوەی کە یاریزانانی گۆلف لە دوورەوە تێیدا دەڕۆیشتن و چیمەنەکە لە ژێر خۆری نیوەڕۆدا دەدرەوشایەوە. لەم شوێنە بێدەنگەدا کە پڕ بوو لە سەوزایی و گۆرانی باڵندە، گفتوگۆکەمان لە بازرگانی دوورکەوتەوە و کەوتە سەر بابەتگەلێکی گشتیتر لە زانست و ژیانی پیشەییمان. بۆب و دەیڤد زۆر پرسیاریان لەبارەی پیشەسازی نەوتی عێراقەوە کرد و منیش بە وردی باسم کرد. کاتێك لێم پرسین کە ئایا یاری گۆلف دەکەن ئەوان پێکەنین و هەردووکیان دانیان بەوەدا ناوە کە ئالودەی ئەو وەرزشە بوون. من سەرسام بووم بە ژیانی بێ خەم و خەفەتیان لە ئەمریکا، چوون ئەوان کاتیان تەرخان کردبوو بۆ ئەم شتانەی وەك گۆلف و پشوودان. هەرگیزیش ترسی ئەوەیان نەبوو کە حکومەت بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو ئەوان یان خێزانەکانیان فڕێ بداتە زیندانەوە. بە خەیاڵمدا هات کە ئەمە بەشێکە لەوەی کە وای لێکردوون ئەوەندە باوەڕپێکراو بن. چونکە کولتوری ڕاستگۆیی و متمانەیان لە نێوان مرۆڤەکاندا لانیکەم بەشێکی دەرئەنجامی نەبوونی ترس بوو. یارمەتی ئەمریکییەکانی

دابوو بۆئەوەی نەتەوەیەکی گەورە دروست بکەن. بەڵام منیش سوودم لە کراوەیی کەسانی وەك دەیڤد و بۆب و دکتۆر تاونسێند بینی، و ئەمە کارەکەی منی ئاسانتر کردو وای کرد ئەوان باوەڕ بەم چیرۆکە هەڵبەستراوەی من بکەن.

کاتێك لە نانخواردنی نیوەڕۆ گەڕاینەوە بۆ ڕێکخستنی کڕینی پرۆگرامی کادەنس، دەیڤد ئاگاداری کردمەوە کە داواکارییەکە پێویستی بە واژۆی بیست و دوو کەس هەیە، لەنێویاندا بەرپرسانی حکومەتی ئەمریکا، ئەمەش بەهۆی هەستیاری مادەکە.

ئەو وتی: "وەك دەزانن، ئەم بەرنامەیە دەتوانێت ببێتە هۆی بەکارهێنانی لە کۆمەڵێك پرۆژە کە پۆلێنبەندییەکی بەرزیان هەیە، بۆیە دەبێت زۆر وریا بین لەگەڵیدا.

بیست و دوو واژۆ! هەستم کرد جارێکی تر نیگەرانییەکانم سەرلەنوێ زیتر دەبنەوە. بە دڵنیاییەوە کەسێك لێکۆڵینەوەی زیاتر دەکا پێش ئەوەی بیست و دوو کەس واژۆ لەسەر گرێبەستەکە بکەن. بۆیە منیش بەو بیرکردنەوە خۆم ئارام کردەوە کە بە پێچەوانەی ڕاپۆرتەکانی سەنتەرفیوج لە زانکۆی ڤێرجینیا، پرۆگرامی MTI بەکارهێنانی شەرعی جۆراوجۆری هەیە و ئێمەش هەموو کاغەزەکان لە ڕێگەی وەزارەتی نەوتی عێراقەوە دەخەینە ڕوو. بەڵام هێشتاش پێدەچوو پێویستی بە لێکۆڵینەوەی ورد هەبێت.

منیش هەوڵمدا کە دڵەڕاوکێیەکەم بشارمەوە و پرسیم: ئایا کاتێکی زۆری دەوێت تا پەسەند بکرێت؟

دەیڤد وتی: لام وانییە زۆری بوێت، من سەیری دەکەم بزانم چەندێك کاتی دەوێت.

لەوە دەچوو متمانەی هەڵەی دەیڤد بە ئێمە زۆر بوو بێت، چونکە دەسەڵاتدارانی ئەمریکا دوو ڕۆژ دوای کۆبوونەوەکەمان مۆڵەتی فرۆشتنیان پێدایین. بە نرخی نزیکەی ٢٠٠ هەزار دۆلار، ئەگەرچی ئەم بەرنامە پۆلێنبەندییە نرخەکەی هەرزان نەبوو، بەڵام سەلماندی کە بێ ئەندازە بەنرخ بوو بۆ هەوڵەکانمان.

دوای سەرکەوتنمان لە لاثام، بڕیارم دابوو گەشتێك بۆ زانکۆی پێشووم بکەم، لانیکەم بۆ ماوەی دوو ڕۆژ هەوڵبدەم لە ڕووی دەروونییەوە لە چنگی حوسەین کامل و بەرنامەی سەنتەرفیوجی عێراقی دوورکەومەوە. لەگەڵ دابەزینی گەشتەکە بۆ ناو فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی دێنڤەر، شاخەکانی ڕۆکی کە بە بەفر داپۆشرابوون، دەرکەوتن. لە کاتێکدا من و دکتۆر فەرید لە تێرمیناڵەکە دەرچووین، هەوای شاخاوی بە پەلەقاژە یادەوەرییەکانی هێنایەوە مێشکم. بە ئۆتۆمبێل چووین بۆ کەمپی قوتابخانەی کانەکانی کۆلۆرادۆ. شتەکان ئەوەندە زۆر گۆڕابوون. چوون شارۆچکەکە لە غیابی مندا گەورە بووبوو و بووبووە شارێکی بچووك. لەڕێگەی فەرمانگەی کارگێڕییەوە زانیم کە زۆربەی پرۆفیسۆرە کۆنەکانم خانەنشین بوون. بۆ ماوەیەکی کورت وەستام لە لای دکتۆر ستێرمۆل، کە ئەو مامۆستایەکی گەنج بوو لەو کاتەی خوێندکار بووم، دڵتەنگ بووم کە زانیم دکتۆر دیکسۆن، سەرۆکی بەشی ئەندازیاری کیمیایی کە سەرپەرشتی کارەکانی ماستەرەکەی دەکرد، کۆچی دوایی کردبوو. ئەو پۆل و تاقیگانەم پیشانی دکتۆر فەرید دا کە وەك خوێندکاری ئەندازیاری یەکەم هەنگاوم لێ ناوە و ئەو گردانەی کە نەخشەسازی کۆمپاس و ڕووپێوی تێدا خوێندبووم.

ئێوارەی ڕۆژی دواتر لەگەڵ خۆشەویستەکەی ئەو سەردەمی

كۆلێژم فیلیس مولهاوسن و دایكی له چێشتخانه‌یه‌ك نانمان خوارد. ئه‌وان بۆ من وه‌ك خێزانی دووه‌م بوون و تاكه "خزم" بوون كه توانیبوویان له ساڵی ١٩٦٧دا به‌شداری ئاهه‌نگی ده‌رچوونم بكه‌ن، كاتێك چووینه ناو چێشتخانه‌كه به زه‌رده‌خه‌نه‌وه وه‌ستان و په‌له‌یان كرد بۆ ئه‌وه‌ی له باوه‌شم بگرن. كاتێك من دكتۆر فه‌ریدم پێ ناساندن، تا ڕاده‌یه‌ك له‌لای ئه‌ودا گرمۆڵه بوون و ده‌وریان دا. فیلیس وێنه‌ی هاوسه‌ره‌كه‌ی پیشاندام كه دوای دوو ساڵ له ده‌رچوونم هاوسه‌رگیری له‌گه‌ڵدا كرد. منیش باسی له‌یلای هاوسه‌رم و چوار منداڵه‌كه‌ی خۆمم بۆ كرد. زۆری نه‌خایاند ڕۆژانی كۆلێژ و هاوڕێ هاوبه‌شه‌كانمان بیر ده‌هاته‌وه. گفتوگۆكه ئه‌وه‌نده خۆش بوو كه نزیك بوو له‌بیرمان بچێت ژه‌مه‌كانمان بخۆین.

دایكی فیلیس وتی: به‌ڵام مه‌هدی. تۆ هیچ شتێكت له‌باره‌ی كاره‌كه‌ی خۆت نه‌گوت، تۆ له‌كوێ كارده‌كه‌یت؟

ئێستیكم كرد و بیرم له‌وه نه‌كردبووه‌وه كه چۆن چیرۆكێك بۆ هاوڕێ كۆنه‌كانم ئاماده بكه‌م.

تا توانیم ده‌ستم به ڕاستییه‌كانه‌وه گرت و گوتم: وه‌زاره‌تی نه‌وت بۆ دكتۆرا ناردمی بۆ ویلز. كه‌واته من ئێستا دكتۆر مه‌هدیم.

ئه‌وه‌بوو دایكی فیلیس به زه‌رده‌خه‌نه‌وه گوتی: واته هێشتا له‌گه‌ڵ وه‌زاره‌تی نه‌وت كارده‌كه‌یت دكتۆر مه‌هدی؟

به ڕوونی نه‌متوانی به فیلیس و دایكی بڵێم كه من سه‌ركردایه‌تی به‌رنامه‌یه‌كی زۆر نهێنی ده‌كه‌م بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم.

ڕاستییه‌كه‌ی درۆم كرد و وتم: به‌ڵێ. من و دكتۆر فه‌رید ئه‌ندازیارین له وه‌زاره‌تی نه‌وت.

فیلیس پرسی: ئینجا حەزت لە كارەكەت هەیە؟

دكتۆر فەرید بەبێ ئەوەی سەیری من بكات وتی: ئای بەڵێ. ئەوێ شوێنێكی زۆر جوانە بۆ كاركردن.

هەستم بە شەرمەزاری كرد. دروستكردنی چیرۆكێك بۆ گرێبەستەكە لە MTI و زانكۆی ڤێرجینیا بەشێكی پێویست بوو لە ئەركەكەم لەلایەن حوسەین كاملەوە. بەڵام كە ناچار بووم ئەم كەسانە فریو بدەم كە لە ڕۆژانی خۆشمەندیدا زۆر ئازیز بوون بۆ من ئەوا بەڕاستی شتێكی ناخۆش بوو، ئەمە بەرهەمی لاوەكی دڕندانەی پێگەی من بوو لە دڵی ڕژێمی نهێنی سەددامدا. لە كاتێكدا بەردەوام بووم لە زەردەخەنە و گفتوگۆكردن لەگەڵ فیلیس و دایكی، هەستێكی خەمۆكی بەسەرمدا هات. هەوڵم دابوو لەسەر بنەماكانی ڕاستگۆیی بژیم. بەڵام ئێستا بینیم ڕاستییەكان وەك كیشوەرێكی پاشەكشەكراو لێم دوور كەوتەوە، لە كاتێكدا پێویستیم بە فریودان، بێدەسەڵاتانە بردمییە دەرەوە بۆ نێو ئاوە قووڵەكان. ئەو كۆمەڵە بچووكە كەسانەی كە دەمتوانی نهێنییەكانیان بۆ باس بكەم، لە خێزانەكەم و چەند هاوكارێكمدا كورتكرانەوە. تەنانەت لەناو ئەو گروپە بچووكەشدا لە عێراقدا، ناچار بووم وردەكارییەكان نەدركێنم. نەمدەتوانی مەترسی ئەوە بكەم كە سروشتی ڕاستەقینەی كارەكەم بە منداڵە بچووكەكانم یان هاوڕێكانی خێزانەكەم بڵێم. ئەوان تەنیا ئەوەیان دەزانی كە من بەشدارم لە توێژینەوە ئەندازیارییەكاندا. هەروەها نەمتوانی هەستە ناكۆكەكانم سەبارەت بە بەرنامەی ئەتۆمی لەگەڵ هاوكارەكانم باس بكەم. تاكە كەسێك كە دەمتوانی متمانەی لەو جۆرە لەگەڵیدا هاوبەش بكەم، لەیلا بوو. بۆیە لەناكاو، لەدووری حەوت هەزار میل لە نیشتمانەوە، هەستم بە تەنیایی زۆر كرد.

دوای نانخواردنی ئێوارە بە میهرەبانییەوە لەیەك جیا بووینەوە و ڕۆژی دواتر من و دکتۆر فەرید بە فڕۆکە بەرەو نیویۆرك ڕۆشتین، هەروەها وەستانێکی کاتیمان هەبوو کە دە کاتژمێر بەر لە گەڕانەوەمان بوو بۆ ئەڵمانیا. دکتۆر فەرید بانگهێشتی کردم بۆ سەردانێکی کورت و خێرا بۆ ماڵی براکەی لە نیوجرسی، بەڵام من ویستم بازاڕ بکەم تاوەکو هەندێك دیاری لە مانهاتن بکڕم بۆ خێزانەکەم. ئەوەبوو ڕێککەوتین لە فڕۆکەخانەی کێنێدی کۆببینەوە.

ئەو ئێوارەیە لە دەروازەکەدا چاوەڕێم دەکرد، لەگەڵ نزیکبوونەوەی کاتی ڕۆشتنمان دڵەڕاوکێم زیاتر بوو. چونکە تیمی فرینەکە تەلەفۆنیان بۆ گروپی یەکەمی سەرنشینەکان کرد کە دەستیان بە سواربوون کردبوو، پاشان دووەمیان. بە پەرۆشەوە سەیری دەوروبەرمم دەکرد بۆ دکتۆر فەرید، بەڵام لە هیچ شوێنێك دیارنەبوو. ئەوەبوو لەگەڵ گروپی کۆتاییدا سواری فڕۆکەکە بووم و لەگەڵ دانیشتنم تەواو لەنێو ئەو بیرۆکەدا نوقم بووم کە ڕەنگە ئەو جیابووبێتەوە و مانەوەی هەڵبژاردبێت، و دەرئەنجامەکانی گەڕانەوەم بەتەنیا بۆ نیشتمان سەخت بوو. حوسەین کامل بەرپرسیارێتی دکتۆر فەریدی خستبووە سەر سەرم. پاشان بیرم لە ژن و منداڵەکانی دکتۆر فەرید دەکردەوە. وا دیار نەبوو کە ئەو بەجێیان بهێڵێت، چونکە بە دڵنیاییەوە پیاوە ئەمنییەکانی سەددام دەیانخەنە زیندانەوە. ئایا دکتۆر فەرید پلانێکی نهێنی هەبوو؟ ڕەنگە لە کاتی گەشتەکەمان بۆ ئەمریکا ڕێکی خستبێت بەوەی کە خێزانەکەی لە وڵات هەڵبێنن. بەڵام لە کاتی وەستانەکەدا بانگهێشتی ماڵی براکەی کردبووم. بۆیە هیچ مانایەکی نەبوو. ئایا ئەوە بەشێك بوو لە فێڵەکە؟ سەیری کورسییە چۆڵەکەی

تەنیشتمم کرد و دەستم کرد بە ترس و دڵەڕاوكێ کاتێك بیرم لەو سزایانە دەكردەوە كە حوسەین كامل بەسەرمدا دەسەپێنێت.

چەند كەسێك كە دواكەتبوون سواری فڕۆكەكە بوون و بەدوای شوێنی چۆڵدا دەگەڕان. کاتێك ڕووخساری دڵەڕاوكێی دكتۆر فەریدم لە پشتیانەوە بینی، بە ئاسوودەیی ئاهێكم هەڵكێشا.

کاتێك خۆی خستە ناو كورسیەكەی تەنیشتمەوە وتی: "زۆر داوای لێبوردن دەكەم، هاتووچۆ زۆر لەوە قەرەباڵغتر بوو كە بیرم لێكردبوویەوە".

گوتم: "تۆ زۆر منت ترساند". ئەوەبوو دكتۆر فەرید یەكسەر لەماناكە گەیشت.

گوتی: نەدەبوو خەمی ئەوەت هەبێت، چوون ئێمە لە یەك بەلەمدایین.

دوای وەستانمان لە ئەڵمانیا، ڕاستەوخۆ بە فڕۆكە ڕۆیشتم بۆ میلانۆ بەدوای كۆپییەكی ڕاپۆرتەكانی زیپدا. بێهیوا بووم لەوەی دەستم بەم بەڵگەنامە گرنگە بگات، چوومە هۆتێلێك لە نزیك ئۆپێراخانەی لا سكالا و تەلەفۆنم بۆ برادەرێكی كۆن كرد.

دكتۆر جۆرجیۆ مۆراندی لە ساڵانی حەفتاكانی سەدەی ڕابردوودا لە كاتی كاركردن لەسەر كۆمپلێكسی ڕیاكتۆری ئەتۆمیدا نزیكترین هاوكارم بوو لە ئیتاڵیا. چەند مانگێك لە بەغدا وەك بەڕێوەبەری پرۆژەی ئیتاڵی بە گرێبەستێكی ٥٠ ملیۆن دۆلاری بۆ دروستكردنی دامەزراوەی تاقیكردنەوەی كەرەستە و دروستكردنی سووتەمەنی و پرۆسێسكردن بەسەر بردووە. سەرسامی من بە بەهرەكەی بەجۆرێك بوو كە كاتێك دیزاینی بۆ

کارکردنی ناوەوەی ڕیاکتۆری ڕووسی دەکێشا، من ناوم نابوو لیۆناردۆ داڤینشیی نێو کێڵگەی ئەتۆمی. هەمیشە چێژمان لە کاتەکانمان دەبینی بەیەکەوە کاتێك بە زمانی باوی ئەندازیاری قسەمان دەکرد و منیش ئەوم بە هاوڕێی خۆم دەزانی.

"سڵاو جۆرجۆ؟ من مەهدییم" کاتێك وەڵامی دایەوە وتم. - من لە میلانۆم.

- مەهدی! دوای ئەم هەموو ساڵە لە شارەکەم چی دەکەیت؟"

گوتم: "ئۆە، هیچ نییە تەنها مەبەستی گەشتکردنم هەبوو، تامەزرۆی بینینی تۆم."

جۆرجیۆ پێکەنی و وتی: باوەڕ ناکەم مەبەستی تۆ تەنها گەشتکردن بیت. "

"ئایا ئەمشەو هیچ پلانێکت هەیە بۆ نانخواردنی ئێوارە؟"

لە چێشتخانەیەکی نایابی میلانۆ یەکترمان بینی و نزیکەی دە ساڵ یادگاری ژیانی تایبەتی خۆمانمان بیرخستەوە. دوای ئەوەی گارسۆنەکە مێزەکەمانی پاککردەوە و قاوەیەکی پێشکەش کرد، دکتۆر جۆرجۆ سەبیلەکەی داگیرساند و پرسیاری کرد:

- دەزانم تۆ بۆ بینینی ئۆپێرا نەهاتوویت. بەڕاستی چی تۆی هێناوەتە میلانۆ مەهدی؟"

دڵنیا نەبووم کە چۆن بابەتەکە بخەمەڕوو، بە شێوەیەکی گشتی ڕوونم کردەوە کە کار لەسەر پرۆژەیەکی نوێ دەکەم، و لە فەرەنسا بەدوای کۆمپرێسەردا گەڕام و پێویستم بە جۆرەکانی تری یارمەتی دەبێت لە دەرەوە. دکتۆر جۆرجییەوە بە نیگایەکی خۆبەخشییەوە زەردەخەنەی کرد.

گوتی: مەهدی، تۆ لە دەوری بابەتەكە دەسوڕێیتەوە و نایڵێیت. بیڵێ بزانم مەبەستت چییە.

گوتم: "من بەدوای ڕاپۆرتی زیپدا دەگەڕێم سەبارەت بە سەنتەرفیوجە موگناتیسییەكان" ئەوەبوو ڕاستەوخۆ هاتمە سەر بابەتەكە. دەزانم كە یەكێك لە نوسخە ئەسڵییەكان كاتی خۆی بۆ یەكێك لە هاوكارەكانت هاتووە.

ناوی هاوكارەكەیم هێنا و دكتۆر جۆرجۆ دانیشت و بە بیردا چوو مژێكی قووڵی لە سەبیلەكەی دا. هەرچەندە خودی ڕاپۆرتەكە پۆلێن نەكرابوو، بەڵام پێدەچوو سەری سوڕمابێت لە كاریگەرییەكانی داواكارییەكەم. بەڵام هەر زوو هاتەوە سەرخۆی.

گوتی: دوو كێشـــە لەبەردەســـتدایە. یەكەمیان ئەوەیە كە من چیتر ڕاســـتەوخۆ لەگەڵ ئەو بەڕێزەی باســـت كرد كار ناكەم. دووەمیان ئەوەیە كە بە سروشت دوودڵە.

گوتم: "مەبەستم ئەوە نییە كە بێهیوا دەربكەوم، بەڵام جۆرجۆ بەڕاستی پێویستم بەو ڕاپۆرتە هەیە."

دكتۆر مۆراندی بە جۆرێك لە تووڕەبییەوە سەری لەقاند.

گوتی: مەهدی تۆ هەموو ڕێگاكانم لێدەگریت. بەڵام چۆن هاوڕێیەكی كۆنم ڕەت بكەمەوە؟

ڕۆژی دواتر بە فڕۆكە گەڕامەوە بۆ بەغدا و لە ماوەی دوو هەفتەدا ڕاپۆرتی زیپ گەیشـــتە دەســـتمان. وەك ڕووناكی مەشـــخەڵێك بوو لە تاریكیدا. وردەكارییەكانی هەموو ئەو تاقیكردنەوە ســـەرەتاییانەی دەخســـتەڕوو كە بە ســـەنتەرفیوجی موگناتیســـی ئەنجامدراون و ئاماژەی بەو بەربەســـتانە دەكرد كە

پێویستە تێپەڕێنین. تاقیکردنەوەکان گەورەیی زیپیان وەك زانایەك ئاشـــکرا کرد. ئەم بابەتەم دەخوێندەوە وەك ئەوەی ڕۆمانێکی وروووژێنەر بخوێنمەوە.

بەڵام ڕاپۆرتەکە تەنها دەستگرتنێکی بە تیۆری پێداین. سروشتی قوفڵەکەمان دەبینی، بەڵام کلیلی کردنەوەی قوفڵەکەمان نەبوو. بۆ ئەوەی بەڕاستی سەنتەرفیوجی موگناتیسی دروست بکەین، دەبوو وێنەکێشان و نەخشەی پۆلێنکراوی بەدەست بهێنین. دەمزانی هاوکاری دکتۆر مۆراندی دواجارە کە بتوانم داوای چاکەیەك لە هاوڕێیەکی دێرین بکەم و نەمدەویست مەترسی ئەوە بکەم کە سەرنجی ئەمریکا بۆ هەوڵەکانمان ڕابکێشم بە گەڕانەوە بۆ ئەوێ بۆ دیزاین کە بە دڵنیاییەوە لە ژێر ئاسایشی توندا قفڵ دەکرا. پێویستم بە پەیوەندییە بیانییە نوێیەکان بوو. هەرچەندە زۆرێك لە کارە تاقیگەییە سەرەتاییەکان لەسەر سەنتەرفیوجەکان لە ئەمریکا ئەنجامدرابوون، بەڵام ئەمریکییەکان تاڕادەیەکی زۆر دەوڵەمەندکردنی سەنتەرفیوجەکانیان لە ڕەفەدا لە بەرژەوەندی تەکنیکەکانی بڵاوبوونەوە و شێوازەکانی دیکەدا دانابوو. ئەوە ئەوروپییەکان بوون کە تەکنەلۆژیایان بۆ مەبەستی بازرگانی پەرەپێدا و کامڵیان کرد. من گومانم دەکرد، کە دەبوو نەخشەکە لە کەرتی تایبەتی ئەوروپادا هەبێت. لە ماوەی چەند مانگی داهاتوودا چەندین هەوڵم دا بۆ چوونە ناو ئەو کۆمپانیایانە کە سەنتەرفیوجیان بەرهەم دەهێنا بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم بۆ ڕیاکتۆرە کارەباییەکان.

کۆمەڵەیەکی هۆڵەندی-بەریتانی-ئەڵمانی بە ناوی ئورێنکۆ لە هۆڵەندا، بە دایکی سەنتەرفیوجی بازرگانی دادەنرا، کە بۆ یەکەمجار لە ساڵانی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا دۆزینەوە

بیركارییەكەی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی سەنتەرفیوجی موگناتیسی بە قەبارەیەكی گەورە چارەسەر كردبوو. هەروەها مێژوویەكی هەبوو لە ئاشكراكردنی نهێنییەكانی ئەو ئامێرە. زانای پاكستانی عەبدولقادر خان بۆ ماوەی دوو ساڵان لە لوتكەی بەرنامەی پەرەپێدانی كۆمپانیای ئورێنكۆدا دزەی كردە ناو كۆمپانیای ئورێنكۆ و لە ساڵی ١٩٧٥دا گەڕایەوە بۆ زێدی خۆی بە كۆمەڵەیەكی تەواو لە دیزاین و حیسابات و پەیوەندی كۆپیكراو بۆ بەرهەمهێنەرانی پێكهاتەكان كە بنەمای تەواوی پێكهێنا بۆ بەرنامەی چەكی ئەتۆمی لە پاكستان. ئەو لە ئەوروپا خوێندوویەتی، دكتۆر خان بەشێكی لەبەر ئەوەی بە زمانی هۆڵەندی قسەی دەكرد و هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێكی ئەفریقای باشوور كردبوو كە بە هۆڵەندی قسەی دەكرد، بۆیە وەك هاووڵاتییەكی ئەو وڵاتە سەیر دەكرا. من هەرچەندە ئەم پەیوەندیانەم نەبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەمویست بە تامەزرۆییەوە بزانم كە ئاخۆ لە هۆڵەندا چ جۆرە پێشوازییەكم لێ دەكرێت.

سەردانێكم بۆ كۆمپانیایەكی گەورەی هۆڵەندی ڕێكخست كە ناوی ئەلمێلۆ بوو، كە لەنێو دروستكراوەكانیدا شلەمەنی بۆ سەنتەرفیوج دروست دەكرد و پەیوەندییەكی نزیكیان بە ئورێنكۆوە هەبوو. لەگەڵ دكتۆر فەرید، دكتۆر عادل، و عەلی موتەلیب عەلی، كە لە ماوەی دە ساڵی ڕابردوودا نێردەی ڕۆشنبیری بووە لە باڵیۆزخانەی عێراق لە ئەڵمانیا و ڕۆڵێكی چارەنووسسازی لە تۆڕی مامەڵەكانماندا گێڕاوە. ئەو بوو بە هۆكاری پەیوەندیكردنمان لە سەرانسەری ئەوروپا. ئەو پێستێكی سپی و جەستەیەكی ئاسایی مامناوەند و ڕەفتارێكی بەڕێزی هەبوو

وەك دیپلۆماتكارێك، عەلی هەمیشە ڕێك پۆش بوو و چێژی لە خواردن لە باشترین چێشتخانەكان دەبینی. ئەو بە زمانی ئەڵمانی ڕەسەن قسەی دەكرد و بە جوانی مامەڵەی لەگەڵ هەر ئاڵنگارییەكی لۆجستیدا دەكرد كە دەهاتە سەر ڕێگامان، جا چ كردنەوەی هێڵی قەرز بێت لە بانكە بیانییەكان، دانوستان بێت لەگەڵ كۆمپانیا ئەڵمانییەكان، یان ڕێكخستن لە چێشتخانە و نوسینگەی ئۆتۆمبێلی كرێدا.

بەرپرسانی ئەلمێلۆ بە ڕێزەوە پێشوازییان لێكردین، بەڵام یەكسەر دركم بەوەكرد كە ئەوان بە ئاگادارییەوە مامەڵەمان لەگەڵ دەكەن. ئێمە وامان تێگەیاندبوون كە هۆكاری گرنگیدانمان بەم بابەتە بریتییە لە پاككردنەوەی وێستگەكانی ئاوی عێراق، ئەمەش بوارێكی دیكەی كارەكانیان بوو، بەڵام دەمتوانی بزانم هەستیان كردووە ئێمە لە ئاستێكی بەرزترین لە زاناكان كە بە شێوەیەكی ئاسایی بۆ پرۆژەیەكی لەو شێوەیە لێیان نزیك دەبنەوە. ئەوەبوو گەڕانێكی كورتیان بە ئێمە كرد بەنێو كۆمپانیاكەدا بەڵام ڕەتیانكردەوە ناوچە هەستیارەكانمان پیشان بدەن، لەنێویاندا ئۆپەراسیۆنی سەنتەرفیوج. وا دیار بوو سیخوڕی دكتۆر خان كە لە هۆڵەندا زریانێكی بانگەشەی نەرێنی لێكەوتەوە، وای كردبوو كە بەرپرسانی ئەوێ لە ڕادەبەدەر وریابن. پێش ئەوەی ئەمستردام بەجێبهێڵم سەردانی نەمامگەیەكی ناوماڵم كرد و درەختێكی بچووكی لیمۆم بۆ باخچەكەم كڕی، كە ئەمەش تەنها شتێك بوو دەبوو پیشانی بدەم لە گەشتەكەم بۆ هۆڵەندا.

كۆمپانیایەكی ئەڵمانی بەرهەمهێنەری سەنتەرفیوج، كۆمپانیای زەبەلاحی M.A.N. تەكنەلۆژیای نوێ لە میونشن، بە هەمان شێوە سەلماندی كە ئەوانیش یارمەتیدەرمان نین لەم بابەتە. ئەم كۆمپانیایە

بەرهەمهێنەری هەموو شتێك بوو لە بارهەڵگری ترێلەوە تا موشەك هەڵگر، هەروەها ئەم کۆمپانیایە سەنتەرفیوجی پەرەپێدابوو بۆ بەرهەمهێنانی سووتەمەنی بۆ ڕیاکتۆرەکانی وزەی ئەتۆمی دوای ئەوەی دکتۆر زیپ گەڕابوویەوە ئەڵمانیا و ساڵانی کۆتایی کارکردنی لە کۆمپانیاکە لە ساڵانی شەستەکاندا بەسەر برد. بەو هیوایەی کە ئەمە کردنەوەی پەیوەندییەکی بازرگانی سەرەتایی بێت، ئەوەبوو ڕێککەوتنمان کرد بۆ کڕینی چەند شتێك لە M.A.N. وەکو دە ترێلەی بارهەڵگر بۆ بەکارهێنانی موشەکهاوێژی تۆپخانە. دوای ئەم دەم شیرین کردنە، گەشتێکم بۆ دکتۆر عادل ڕێکخست بۆ ئەوەی سەردانی کۆمپانیاکە بکات لە میونشن بۆ بینینی بەشی کەرەستە کە پارچەکانی سەنتەرفیوج تێیدا دروستکراون. سەرەتا مۆڵەتی پێدرا، بەڵام کاتێك گەیشتە M.A.N. ستافەکان ڕێگەیان پێ نەدا بچێتە ناو هەموو بەشە هەستیارەکانەوە، بە ئاماژەدان بە کارە پۆلێنبەندییە بەردەوامەکان لەسەر بەرنامەی موشەکی بۆشایی ئاسمانی ئەورووپی، ئاریان. بەڕاستی من بۆم دەرنەکەوت کە ئایا ئەمە نیگەرانییەکی ئەمنی ڕەوایە یان تەنها بیانوویەکی درۆینەیە بۆ ئەوەی ڕێگریمان لێبکەین بچینە ناو دامەزراوەی سەنتەرفیوجەکەوە، چونکە گومانیان لە مەبەستەکەی ئێمە هەبوو.

تا ئەوکات نەمتوانی هیچ پێشکەوتنێکی گەورە لەسەر وەشانی موگناتیسی سەنتەرفیوجەکە نیشان بدەم. ئێمە سەنتەرفیوجی ڕۆنی بیمزمان بە ڕۆتۆرێکی نوێ دروستکردبووەوە، کە بە تێپەڕبوونی کات بەسوود بوو بۆ لێکۆڵینەوە لە چەمکە بنەڕەتییەکان. بەڵام ئەمە لەگەڵ ئەو ڕاستییەی کە ئێمە خەریکی بەدەستهێنانی زانیاری گرنگ بووین لە ڕاپۆرتەکانی زیپەوە، بەس نەبوو بۆ

دڵخۆشکردنی حوسەین کامل کە دەیەوێت ئەنجامێکی بەرجەستەی لەبەردەست دا بێت. تا مانگی تەمموزی ساڵی ١٩٨٨ بەڕێوەبەرایەتی دیزاینی ئەندازیاری خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی لە MIC و ناوی گۆڕی بۆ سەنتەری دیزاینی ئەندازیاری. کەمتر سەردانی ڕەشیدییەی دەکرد و هەر جارێك دەگەیشت، ڕەفتاری شەڕانگێزتر و پرسیارەکانی گاڵتەجاڕتر بوو. دەبوو بەخێرایی کارێك بکرێت چوون وەك بڵێی هەستمان بە نوکی چەقۆکەی حوسەین کامل دەکرد لە ملی خۆمان. لە کۆتاییدا داوام لێکرد پەیوەندی بە دکتۆر سەفا حەبۆبی، بەڕێوەبەری گشتیی دامەزراوەی ناسر، یەکێکە لەو کۆمپانیا زۆرانەی کە بۆ کڕینی چەك بۆ حکومەتی عێراق بەکاردەهێنرا بکەین. دکتۆر سەفا ئەم کۆمپانیایانەی بەکارهێنا بۆ دروستکردنی پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ کۆمپانیاکانی وڵاتانی دیکە، بە مەبەستی داپۆشین و شاردنەوەی کڕینی ئەو پارچە چەکانەی کە سنووردارکردنی هەناردەکردنیان پێشێلکردبوو. تۆڕی نێوان کۆمپانیاکانی بەرەی عێراقی و دابینکەرانی بیانی کلیلی مامەڵە نایاساییەکانمان بوو. زوو درکم بەوەکرد کە دکتۆر سەفا هاوبەشییەکی نهێنی لە کۆمپانیایەکی ئەڵمانیدا هەبوو بە ناوی H&H Metalform کە مامەڵەی بازرگانی لەگەڵ کۆمپانیای M.A.N.بوو.

حوسەین کامل تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی کە خەریەکە سەبری نامێنی و دەگاتە کۆتایی.

هەروەها وتی: دکتۆر سەفا، دکتۆر مەهدی دەنێرم بۆ بینینی تۆ. تۆ دەبێت هەموو هەوڵەکانت بۆ یارمەتیدانی تەرخان بکەیت. بێ هیوام مەکە، وەگەرنا لە پۆستەکەت دەردەکرێیت.

پاشان ڕووی سوڕاند و ڕاسته‌وخۆ سه‌یری چاوه‌كانی كردم.

وتی: ئه‌مه دوا ده‌رفه‌ته بۆ ئێوه. ده‌زانی ئه‌گه‌ر شكست بهێنیت مانای چییه. چوون من بایی ئه‌وه‌نده شكستم هێناوه كه بێتاقه‌ت بوویمه.

ڕاسته‌وخۆ به ئۆتۆمبێله‌كه‌م ڕۆیشتمه ئۆفیسی دكتۆر سه‌فا، له‌وێ بنه‌ماكانی به‌رنامه‌ی سه‌نته‌رفیوجی شاراوه‌مان بۆ ڕوونكرده‌وه. پێویست نه‌بوو به دكتۆر سه‌فا بڵێین ئه‌م زانیاریانه به نهێنی بهێڵه‌ره‌وه. ئێمه تێبینیه‌كانمان به‌راورد كرد له‌سه‌ر H&H Metalform و M.A.N. دیاربوو هاوكارییه‌كان له‌لایه‌ن كۆمپانیا ئه‌ڵمانیه‌كه‌وه باش بوو. دكتۆر سه‌فا نه‌ك هه‌ر گرێبه‌ستێكی پڕ قازانجی به‌و كۆمپانیایه دابوو بۆ دروستكردنی بۆری بۆ موشه‌كه‌كانی تۆپخانه‌ی عێراقی، به‌ڵكو ساڵێك پێشتر قه‌رزێكی نه‌ختینه‌ی بۆ دوو خاوه‌نه‌كه‌ی ڕێكخستبوو له به‌رامبه‌ر هاوبه‌شییه‌كی بێده‌نگی له‌سه‌دا ٥٠ له كۆمپانیای H&H. بۆیه بۆ ئه‌وان ئه‌سته‌م بوو كه داوای چاكه‌یه‌ك له هاوبه‌شێكه‌وه بكه‌ن ڕه‌ت بكرێته‌وه. من و دكتۆر سه‌فا باسی ئه‌و ڕێگایانه‌مان كرد كه كۆمپانیاكه ده‌توانێت له‌ڕێگه‌یه‌وه هاوكاریمان بكات.

ئه‌ڵمانییه‌كان، واته دیتریش هینز و پیته‌ر هوتن، شاره‌زا بوون له پرۆسه‌یه‌كدا كه پێی ده‌وترێت فلۆ فۆرمینگ، كه كانزاكان له ژێر فشارێكی توندا نه‌رم ده‌كاته‌وه به مه‌به‌ستی دروستكردنی بۆری سیمتریكی بۆ مه‌به‌ستی خولانه‌وه، له‌نێویاندا به‌رگه موشه‌ك و مووشه‌كه‌كان به‌گشتی. ئه‌مه له وردترین ئاستی ئامێرسازیدا ئه‌نجام ده‌درێت و هه‌روه‌ها ئه‌و پرۆسه‌یه‌یه كه به‌كاردێت بۆ دروستكردنی ڕۆتۆری سه‌نته‌رفیوج له پۆڵایه‌كی كوالیتی به‌رزدا

خۆی دەبینێتەوە. بە دكتۆر سەفام گوت حەز دەكەم لەگەڵ هینزە باسی ئامێرەكانی دروستكردنی تەوژم بكەم. لەبەر ئەوەی هێشتا زۆرترین پێویستیم بۆ بەدەستهێنانی دیزاینی ورد بوو بۆ سەنتەرفیوجی موگناتیسی، هەروەها پرسیارم كرد كە ئاخۆ هینزە دەتوانێت پەیوەندیم پێوە بكات لەگەڵ هەر ئەندازیارێك كە پەیوەندییان لە M.A.N. ەوە هەیە. ئەوەبوو هەر زوو دوای ئەوە بە فڕۆكە ڕۆیشتین بۆ میونشن، لەوێ هینزە چاوی پێمان كەوت. ئەو پیاوێكی بازرگانی بوو لە كۆتایی چلەكانی تەمەنیدا بوو، قاتێكی ڕێكی لەبەردا بوو و ئۆتۆمبێلێكی جۆری مێرسیدس-بێنزی ڕەنگ شینی لێدەخوڕی و هاوسەرگیری لەگەڵ ژنێكی جوانی قژزەرددا كردبوو. دیارە خانەوادەی هینزەكان لە گرێبەستە بازرگانییە عێراقییەكانیانەوە سەرفراز بوون. ئەوەبوو هینزە منی بە دوو كەس ناساند. هەریەك لە كارمەندان واڵتەر بوسێ و برۆنۆ ستێملێر، كە هەردووكیان ڕۆڵی سەرەكیان هەبووە لە پرۆگرامی سەنتەرفیوجی كۆمپانیای ئەڵمانی. بوسێ شارەزا بوو لە كاركردن لەگەڵ كانزایەكی سووك كە پێی دەوترێت پۆلا ماراجینگ كە ڕێگە بە ڕۆتۆرەكان دەدات خێراتر بخولێتەوە. ستێملێر یەكەم ئامێری كۆمپانیایM.A.N. ی تاقیگەی جیاكردنەوەی یۆرانیۆم، كە نزیكەی بیست سەنتەرفیوجی موگناتیسی تێدابوو، دروستكردبوو. بەڕاستی هینزە كارێكی باشی كردبوو؛ ئەمانە كارێكی تەواو بێ وێنە بوون.

سەرەتا بە گشتی باسمان لە بازرگانی كرد، منیش باسم لە خواستی كۆمەڵگەی زانستی عێراق كرد كە چۆن دەكرێت لە دەستكەوتەكانی زانستی ئەڵمانی فێربن. ستێملێر و بوسێ زۆر بە وردی گوێیان گرتبوو، سەریان دەجووڵاند و دەمزانی لە پشت

قسەكانمەوە بۆنی پارەیان دەكرد. ئەوەبوو دوای ئەوە ڕاستەوخۆ چوومە سەر خاڵەكە.

گوتم: زۆر سوپاسگوزار دەبین كە یارمەتیمان بدەن بۆ ئەو دیزاینانەی كە هاوكار دەبن لە پەرەپێدانی نموونەی سەنتەرفیوج. هەروەها كۆمەڵێك كێشەی تەكنیكی هەیە كە نەمانتوانیوە تا ئێستا چارەسەری بكەین.

هەردووكیان چاویان لەسەرم بوو، ئەمەش وەك نیشانەیەكی باش وەرمگرت. من بەردەوام بووم بە وەسفێكی باشی ئەو بەربەستانەی كە عێراق ڕووبەڕووی بووەتەوە لە ڕووی تیۆری سەنتەرفیوجەوە، بۆ ئەوەی سەرنجیان لەو ڕاستییە لابدەم كە تازە داوام لێكردن زانیاریی نهێنی پێشكەش بە ولاتێكی بیانی بكەن. ئاماژەم بە چەند پرسێكی سەرنجڕاكێش كرد كە زانستی ژمێریاری ئاڵۆزیان تێدایە. زانایان، چارەسەركەری سروشتی كێشەن و منیش وەك پسپۆڕێك شانازیم پێیانەوە دەكردن. بە خوێندنەوەی زمانی جەستەیان، تێبینیم كرد كە هینزە دانیشتووە و هەوڵیدا كەمێك لە گفتوگۆكە دوور بكەوێتەوە. بوسێ زیاتر وەرگر بوو. بەڵام ئەوە ستێملەر بوو كە لەسەر كورسیەكەی خۆی كز بوو بۆ پێشەوە و زۆرترین گرنگی بە بابەتەكە دا. منیش زانیم كە ئەو پیاوی ئێمەیە. ستیملێر تەمەنی نزیكەی پەنجا ساڵ بوو و كەمێك قەڵەو بوو، بە درێژایی كۆبوونەوەكە هەر جگەرەی دەكێشا. چاویلكەی ئەستوور لەچاو كردبوو و شێوەی پرۆفیسۆرێكی دەكرد. دكتۆر سەفا پێی گوتبووم كە ستێملەر بەرامبەر خاوەنكارەكەی پێشووی زۆر داخ لەدڵە، چوون هەستی دەكرد بە باشی قەرەبووی نەكردۆتەوە بۆ بەشدارییەكانی لە تەكنەلۆژیای سەنتەرفیوجدا. دواتر بیستم كە كێشەی دارایی جددی هەیە و بە هۆكاری كەسی بێهیوا بووە لە

پارە. جا پاڵنەرەکەی بەرژەوەندی زانستی بێت یان پێویستی بە پارەی کاش، بە دڵ و گیان هاوکاری هەموو داواکارییەکمان دەکرد.

من و دکتۆر سەفا ئەو سێ کەسەمان بانگهێشت کرد بۆ بەغدا، دوای چەند هەفتەیەك، لە مانگی ئابی ساڵی ۱۹۹۸ گەیشتن، هەر کە من و دکتۆر عادل و دکتۆر فەرید لەگەڵیان دانیشتین، تێگەیشتم کە ستێملێر ئاڵتوونی بۆ هێناوین. ئەوەتانێ لە جانتاکەیەوە کۆمەڵێك نەخشەی وێنەکێشانی کۆکردنەوە بۆ سەنتەرفیوجی موگناتیسی دەرهێنا کە لە M.A.N.ەوە هێناونی لە ساڵانی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا کەوتوونەتە دەستی. من نەمپرسی چۆن ئەمانە کەوتوونەتە دەستی. لە کاتێکدا بە تامەزرۆییەوە لاپەڕە لە دوای لاپەڕە بەنێویدا دەگەڕام، کاتێك گرنگی ئەم بەڵگەنامانە بۆم دەرکەوت هەستم دەکرد لێدانی دڵم خێراتر بوو. ئەم بەڵگەنامانە وەك کتێبی ڕێنمایی بوون بۆ سەنتەرفیوجەکەی M.A.N.. بەڵام ئەوە تەنها شتێك نەبوو کە ستێملەر هێنابووی. بەڵکو بە شانازییەوە دەستی بردەوە ناو جانتاکەیەوە و نموونەی پێکهاتەکانی سەنتەرفیوجی دەرهێنا، لەوانەش ماتۆڕ و بنکەکانی هەردوو بەشی سەرەوە و خوارەوەی ڕۆتۆرەکە. ئێمە هەوڵماندا ئەو پەرۆشییەی هەمانە کۆنترۆڵی بکەین و ئاشرا نەبێت کە چەندێك دڵخۆشین. بۆ کەسانێکی زانا کە دەیانزانی سەیری چی دەکەن و ئەم بەڵگەنامانە چەندێك گرنگن، وەك ئەوە وابوو کە ستێملێر مانگی لە ئاسمانەوە هێنابێتە خوارەوە بۆ نێو دەستەکانمان.

من و ستێملێر بە نرخی دوو ملیۆن مارکی ئەڵمانی یەکلاییمان کردەوە، یان کەمێك زیاتر لە ملیۆنێك دۆلار، بۆ هەموو ئەو شتانەی کە پێشکەشی دەکردن، لەنێویاندا هاوکاری تەکنیکی

بەردەوام. هەستم دەكرد نرخەكە زیاترە لە دادپەروەرانە و بیرم لەوەكردەوە كە ئاخۆ بۆچی ستێملێر هەموو شتێك دەخاتە مەترسییەوە بۆ ئەو برە پارەیە!

هەندێك لە باشترین ئەندازیارانی تەكنیكیم هێنایە ژوورەوە بۆ ئەوەی چاوپێكەوتن لەگەڵ ستێملێر بكەن سەبارەت بە خاڵە وردەكانی دیزاینی سەنتەرفیوج. چەند ڕۆژێك لە ئۆفیسێكی چۆڵ لە بارەگای MIC پرسیارو تێبینیەكانمان ئاراستە كرد. هەندێك جار مێشكی تەمومژاوی دەهاتە بەرچاو و زۆرجاریش لە دەرەوەی بابەتەكە وەك بلێی وێڵ و سەرگەردان دەبوو، بەڵام خاوەنی زانیارییەكی قووڵ بوو. من ویستم ستێملێر سەیری كێشەكانی سەنتەرفیوجی بیمزمان بكات و مەترسی ئەوەم هەبوو كە دامەزراوەی ڕەشیدیەمان ئاشكرا بكات لە هێنانی بۆ ئەوێ. لەجیاتی ئەوەی لە ناوەڕاستی بەغداوە بەرەو باكور بڕۆین، بەرەو باشوور بردمان و لە ڕێگای ڕەشیدیەدا كۆمەڵێك لادانی بازنەییمان كرد بۆ ئەوەی شوێنەكە نەزانێت و لێی تێكەڵاو بیت. چونكە مەترسییەكە شایانی ئەوە بوو. دوای لێكۆڵینەوە لە سەنتەرفیوجی بیمزمان، ستێملێر چەند ڕێكخستنێكی سەرەكی پێشنیار كرد كە كارایيەكەی باشتر كرد. پێدەچوو كەمێك پێكەنیناوی بووبێت كە ئێمە هەوڵمان داوە بەرنامەیەكی ئەتۆمی لەسەر بنەمای سەنتەرفیوجی نەوت دروست بكەین، بەڵام ئەو لای باش بوو كە وەك ئامرازێكی بەسوود بۆ لێكۆڵینەوە لە كاتێكدا ئامادەكاریمان دەكرد بۆ دروستكردنی وەشانی موگناتیسی.

قسەكردن لەگەڵ ستێملێر چاوەكانی زیاتری كردەوە بۆ پێویستی هاوكاری تەكنیكی لەلایەن بیانییە بەئەزموونەكانەوە. لە كاتێكدا ئێمە بە پەرۆشەوە كارمان دەكرد بۆ گۆڕینی وێنەكێشانی

كۆكردنەوەی ستێملێر بۆ دیزاینی ورد بۆ دروستكردنی تاكە پارچەكە، هەروەها تێگەیشتم كە توانا پیشەسازییەكانی عێراق لە ئاستی ئەركەكەدا نین. دامەزراوە ڕەسەنەكانمان خاوەن ئەو ئاستە وردبینییە نەبوون كە پێویست بوو بۆ زۆرێك لە كەرەستەكان. هەندێك بەش پێویستیان بە بەرهەمهێنان هەبوو لەسەر پێوەرێكی وردبینی. دوای ئەوەی ئەڵمانییەكان بەغدایان بەجێهێشت، دەستم كرد بە دانانی ستراتیژییەك بۆ بەدەستهێنانی پارچە و كەرەستە و زانیاری لە بازاڕی ڕەشی نێودەوڵەتیدا.

لەكاتێكدا لێكۆڵینەوەم لە تەكنیكەكانی سەنتەرفیوج دەكرد، فەرمانی حوسەین كاملیشم پەیڕەو دەكرد بۆ بەردەوامبوون لە پەرەپێدانی بەرنامەی دەوڵەمەندكردنی بڵاوبوونەوە. گروپی تایبەتی زانایانم دانابوو بۆ لێكۆڵینەوە لە چۆنیەتی پێشكەوتن لەو بەربەستەی كە لە سەرەتاوە پەرەمان پێدا بۆ وەشانێك كە مامەڵە لەگەڵ ڕۆیشتنی هێكسافلۆرایدی یۆرانیۆم بكات. تاقیگەی بەربەستەكە لە بینایەكی جیاوازدا لە سەنتەری دیزاینی ئەندازیاریدا دانرابوو. هەرچەندە پێشكەوتنمان بەدەست دەهێنا، بەڵام من پرۆژەكەم زیاتر بە خولیایەك دەزانی نەك بە كارێكی ڕاستەقینە. لەكاتێكدا بەسەر مایكرۆسكۆپی ئەلكترۆنیدا دەمڕوانی بۆ چاودێریكردنی كونیلەكانی بەربەستەكە، خۆمم دەهاتە بەرچاو كە بە چێژەوە چوومەتە نێو گەردوونێكی چكۆڵە. تێبینیم كرد كە ڕۆیشتنی گەردیلەیەكان بەناو بەربەستەكەدا دەڕژێت وەك ئەوەی قەرەباڵغییەكی هاتوچۆی ئۆتۆمبێلەكان بێت كە بە تونێلێكدا تێدەپەڕن. گەورەترین نیگەرانی من ئەوە بوو كە دیوارەكانی تونێلەكان لە ژێر ڕەوتی ئەو مۆلیكولە هێكسافلۆرایدانەی یۆرانیۆمدا درزیان لێ دروست دەبێت. لە

كاتەكانی تردا پرۆسـەكە وا دەركەوت كە هەنگەكان كونەكانی شانە ناسكەكەیان پڕ دەكەنەوە، منیش بە ئەندازیارەكانمم گوت كە دەبێت وریا بین بۆ دڵنیابوون لە هێزەكەی بۆ پاراستنی هەنگوینەكە. ئێمە تاقیكردنەوەی مایكرۆمیكانیكی بێكۆتایمان بۆ مادەكە كرد و لە هەر هەنگاوێكی ڕێگاكەدا پاڵاوتمانەوە. ساڵانێك دواتر كاتێك تاقیكردنەوەكانی بڵاوبوونەوەمان بۆ پشكنەرانی چەك لە ئەمریكا و ئەوروپا و ژاپۆن وەسف كرد، دانیان بەوەدا نا كە هەوڵەكانمان داهێنەرانە بوون.

كاتێك لە كۆتاییدا تاقیكردنەوەمان لەسەر بەربەستەكە كرد بە بەكارهێنانی هێكسافلۆرایدی یۆرانیۆم لە ماوەی شەش مانگدا، ئەنجامەكان باش بوون. تا كۆتایی ساڵی ١٩٨٨ كاریگەری تیۆری بەربەستەكەمان سەلماندبوو. تەلەفۆنم بۆ حوسەین كامل كرد، كە گەیشت و نموونەی سەرەتایی بینی، ڕووخساری لە پەرۆشیدا ڕووناك بووەوە. ئەوە یەكەمجار بوو كە لە چەندین مانگدا دڵخۆش بێت و منیش هیواداربووم كە ئەمە هەندێك كاتمان بۆ بگەڕێنێتەوە لە بەرنامەی سەنتەرفیوجدا.

دوای سێ سەعات لە ڕۆشتنی، ئەوەبوو حوسەین كامل تەلەفۆنی بۆ ئۆفیسەكەم كرد و قسەیەكی كرد وەك ئەوە وابوو كە بۆمبێكی فڕێدابێتە نێو ئۆفیسەكەم.

حوسەین كامل وتی: سەرۆك سەددام داوای كردووە بە شێوەیەكی شەخسیی ئێوە ببینن. بۆیە پێویستە سبەی بەیانی ئامادەبن بۆ كۆبوونەوە. نموونەی ئەو بەربەستەی بڵاوبوونەوە كە دروستت كردووە و تەكنیكارە سەرەكییەكانی پرۆژەكە لەگەڵ خۆت بهێنە. ئۆتۆمبێلێك بەدواتدا دەنێرم.

هەستم بە خۆشییەكی لە ڕادەبەدەر دەكرد بەڵام لەهەمان كاتیشدا نیگەران بووم. چوون سەددام زۆر بە دەگمەن داوای دیداری لەگەڵ زانایان دەكرد. ئەو، دواجار كوڕی جوتیارێك بوو كە كەمترین ئاستی خوێندەواری هەبوو، پێی باشتر بوو ڕاپۆرت لە ناوەندە متمانەپێكراوەكان وەربگرێت كە زانیارییان بۆ دەهێنا نەوەك لە خودی زانایانەوە. لە تكریت خۆی بە پیاوە سەربازییەكان و ئەندامانی عەشیرەتەكەی دەورە داوە، ئەوانیش ئەوەی دەیەوێت بیبیستێت پێیان دەگوت.

كاتژمێر ٩ی بەیانی، مینی پاسێكی ڕەش هاتە دامەزراوەی ڕەشیدیە بۆ ئەوەی من و چوار یاریدەدەری بچووكم لەگەڵ خۆیدا ببات. لەگەڵ سەركەوتنمان بۆ ناو مینی ڤانەكە هیچمان نەدەبینی، چونكە جامەكان لەناوەوەش ڕەش بوون بۆ ئەوەی نەتوانین بزانین بۆ كوێ دەڕۆین. لە باوەشمدا بەربەستی نموونەییم لەناو سندوقێكی چەرمیدا هەڵگرتبوو كە بەشەكەمان شەوی پێشتر بە شێوەیەكی تایبەت دروستی كردبوو بۆ پێشكەشكردن و نمایشكردنی بە دیكتاتۆرەكە.

هەمووومان بە پەرۆش و نیگەرانیش بووین لەهەمان كاتدا. چونكە دیدارەكان لەگەڵ سەددامی بەدناو ئەزموونێكی پێشبینینەكراو بوون كە دەكرا بە پلەبەرزكردنەوە، دیارییەك، یان زیندانیكردن كۆتایی پێبێت. هاتەوە بیرم كە چۆن سەددام نۆ ساڵ پێشتر دەسەڵاتی خۆی چەسپاندبوو لەو كۆبوونەوەیەدا كە تێیدا فەرمانی لەسێدارەدانی زۆرێك لە بەرپرسانی حكومەتی دەركردبوو.

دوای نزیكەی نیو كاتژمێر لە لێخوڕین، مینی ڤانەكە وەستا و

ڕێگه‌مان پێدرا بچینه ده‌ره‌وه بۆ شوێنێکی وه‌ستانی ئۆتۆمبێل که به دره‌ختی زه‌یتون ده‌وردرابوو. یه‌که‌م سه‌رنجم ئه‌وه بوو که هه‌رگیز ئه‌وه‌نده زه‌یتونه‌م به دره‌ختێکه‌وه نه‌بینیبوو. حوسه‌ین کامل سڵاوی لێکردین و به‌ره‌و گۆشه‌یه‌کی بچووکی بردین که پاسه‌وانه یه‌کپۆشه‌کانی لێبوون. پاشان له حه‌وشه‌یه‌کی پڕ له گوڵه‌وه بردنیانه ناو بینایه‌کی دیکه. ناوه‌وه‌ی ڕازێنرابووه‌وه، بنمیچ و زه‌وییه‌که‌ی جوان بوو، و په‌نجه‌ره‌کانی له مه‌ڕمه‌ڕی وردی ئیتاڵی بوو. له کۆتاییدا چووینه ناو ساڵۆنێکه‌وه که پڕ بوو له مێزی چایه که له‌به‌رده‌م کورسییه ڕازاوه و ڕه‌نگاوڕه‌نگه‌کاندا دانرابوو.

سه‌ددام حسێن هاته پێشه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی سڵاومان لێ بکات. سه‌رم سوڕما له ده‌رکه‌وتنی. عه‌با یان بشتێکی عه‌ره‌بی له‌به‌ردا بوو له ئاوریشمی زه‌رد و عه‌گالێك له سه‌ریدا بوو. من خووم به‌وه‌گرتبوو که له تیڤیدا ببینم که جلوبه‌رگی سه‌ربازی سه‌وزی زه‌یتوونی له‌به‌ردایه و یه‌که‌م بیرکردنه‌وه‌م ئه‌وه بوو که ئه‌مه نه‌خێتك گه‌مژانه‌یه. بۆچی سه‌رۆك بۆ کۆبوونه‌وه‌یه‌کی فه‌رمی له‌گه‌ڵ زانایان دا جل و به‌رگی ئاغایانه‌ی عه‌ره‌بی له‌به‌ر ده‌کات؟

به‌ڵام له‌گه‌ڵ نزیکبوونه‌وه‌ی ئه‌م بیرکردنه‌وانه بوونه هه‌ڵم. هه‌ستم کرد قوڕگم به‌هۆی نیگه‌رانییه‌وه توند بووه‌وه. نه‌مده‌وێرا ئاوڕ له چوار یاریده‌ده‌ره‌که‌م بده‌مه‌وه، به‌ڵام هه‌ستم ده‌کرد له پشتمه‌وه وه‌ك ته‌خته ڕاست وه‌ستاون. تاوه‌کو له‌توانام دابوو ده‌ستم به‌هێمنی درێژکرد.

حوسه‌ین کامل سه‌ری خسته ژێر سه‌ری سه‌ددام و وتی: ئه‌مه ئه‌و پیاوه‌یه که یۆرانیۆم ده‌پیتێنێت. ئه‌و پێشتر هه‌نگاوی گه‌وره‌ی به‌ده‌ستهێناوه.

سەددام دەستی خستە نێو دەستم بەبێ ئەوەی یەك وشە بڵێت. من لەوەو پێش ئەركەكانم ئەنجام دابوو، بۆیە دەمزانی كە ئەگەر بە هێزێكی زۆرەوە دەستەكانی بگوشم، ئەوا نائەدەبییە، بۆیە فشاری دەستگرتنەكەم شلكرد بۆ ئەوەی كەمێك لە دەستگرتنەكەی نەرمتر بێت وەكو ڕێزێك. من لەبارەی خووی بێزاركەری سەددام لەوەو پێش بیستبووم كە بۆ ماوەیەكی زۆر لە كەسایەتی خەڵك دەكۆڵێتەوە ئەمەش بە سەیركردنی چاویان. بۆیە هەستم بە چاوەكانی كرد لەكاتێكدا تەوقەمان دەكرد. چاوەكانی قاوەیی و پتەو بوون، بەڵام سپێتی چاوی درزیان تێكەوتبوو و خوێنبەرەكانی دیاربوون و كەمێك زەرد ببوون. پێم سەیر بوو ئایا شەوی پێشتر ئارەقی خواردووەتەوە؟ دەستی بەرنەدام و بە نەرمی تەوقەكەی دەكرد وەك ئەوەی هەوڵی ئەوە بدات وەكو جادووگەرێكی بمهەژێنێت و بمخاتە ژێر خەواندنی موگناتیسی، لە هەمان كاتدا بە چاوەكانی ڕایدەكێشام. هەستم بە تا ڕادەیەك گاڵتەجاڕانە و لەڕادەبەدەر ناڕەحەتی دەكرد. بەڵام دەمزانی نابێت چاوم لێ دوور بخەمەوە.

دەوروبەرمان لەنێو ژوورەكە بێدەنگ بوون. منیش پێم سەیر بوو كە ئاخۆ ئەم تەوقەكردنە دەتوانێت تا چەند بەردەوام بێت. بە بێدەنگی چركەكانم دەژمارد تاوەكو گەیشتمە نزیكەی دوو خولەك و هێشتا دیكتاتۆرەكە چاوی خستبووە نێو چاوم. نیگاكانم نەرم كرد و سەیری سیماكانی دەموچاوی سەرۆكم كرد. تۆڕێك لە موولوولەی شێوە شكاو بەسەر لوتی پان و شێوە گوێزی هیندیدا بڵاوبوونەوە و سمێڵ و برۆكانی وەك دارستانێكی چڕ لە دەموچاویەوە خۆیان دەنواند. كەمێك چاوەكانی تروكاند و منیش ڕەق ببووم و بیرم دەكردەوە كە ڕەنگە بە جۆرێك بتوانێت مێشكم

بخوێنێته‌وه‌. بیرم له‌و هه‌زاران عێراقییه‌ ده‌كرده‌وه‌ كه‌ ئه‌م پیاوه‌ له‌ سێداره‌ی دابوون یان زیندانی كردبوون. ده‌وترێت ئه‌وانه‌ی له‌ سه‌ددام ناڕازی بوون له‌ خانه‌ی بێ هیوایدا ده‌ژیان و ڕۆژانه‌ جارێك له‌ ڕێگه‌ی كونی ده‌رگاكانیانه‌وه‌ خۆراكیان پێده‌درا. مه‌سه‌له‌یك هه‌یه‌ ده‌ڵێت ماران گه‌سته‌ له‌ گوریسی ڕه‌ش ده‌ترسێت، ئه‌مه‌ ڕێك بۆ ئه‌م بارودۆخه‌ ده‌ستی ده‌دا. من ئازاری ئه‌و هه‌موو باوك و ژن و منداڵانه‌م هێنا خه‌یاڵی خۆم كه‌ هه‌رگیز نه‌یانده‌زانی ئازیزه‌كانیان مردوون یان له‌ زیندانه‌كانی سه‌ددامدا زیندانی كراون. من ئه‌ندامانی بنه‌ماڵه‌ی خۆمم له‌م دۆخه‌دا خه‌یاڵ ده‌كرد، ئه‌گه‌ر سه‌ددام یه‌كێكیان زیندانی بكات بۆ ئه‌وه‌ی "هانم" بدات بۆ خێراتر پیتاندنی یۆرانیۆم.

له‌وانه‌یه‌ سه‌رۆك هه‌ستی به‌ ناڕه‌حه‌تی من كردبێت.

بۆیه‌ وتی: دكتۆر مه‌هدی، ئێستا وه‌ره‌و كوپێك چام له‌گه‌ڵ بخۆره‌وه‌، له‌ كۆتاییدا ده‌ستی به‌ردام و ئیشاره‌تێكی بۆ كردم كه‌ كورسییه‌ك له‌ ته‌نیشت ده‌ستیه‌وه‌بوو تاوه‌كو دانیشم. ئه‌وه‌بوو دانیشتین و كوپێك چا و قاپێك شه‌كریان له‌به‌رده‌مم دانا. سه‌رۆك وتی: "دڵخۆشم به‌ بیستنی پێشكه‌وتنه‌كانتان. زیاتر له‌و باره‌یه‌وه‌ بۆم بدوێ".

هه‌وڵمدا لایه‌نه‌ سه‌ره‌كییه‌كانی به‌ربه‌سته‌كه‌ و ته‌كنیكه‌كانی بڵاوبوونه‌وه‌ به‌ زاراوه‌ی نا-ته‌كنیكی ڕوون بكه‌مه‌وه‌. گوتم: وه‌ك چۆن له‌ دوكه‌ڵدا كه‌ له‌ ڕێگه‌ی هه‌وادا بڵاوده‌بێته‌وه‌ و سووكترین ته‌نۆلكه‌كان پێشه‌نگن و قورسترینیان له‌ دوای خۆیان ده‌مێننه‌وه‌، ده‌توانرێت هێكسافلۆرایدی یۆرانیۆم ده‌وڵه‌مه‌ند بكرێت به‌ ناچاركردنی بۆ بڵاوبوونه‌وه‌ی له‌ ڕێگه‌ی زنجیره‌یه‌ك به‌ربه‌سته‌وه‌،

من پرۆتۆتایپه‌كه‌م به‌رز كردەوه و ڕوونم كردەوه كه پرۆسه‌كه هه‌زاران به‌ربه‌ستی له‌و جۆره و دروستكردنی كارگه‌ی پرۆسێسكردنی گه‌وره له‌خۆده‌گرێت. هه‌ستمكرد كه سه‌ددام ئاره‌زووی گوێكردنی نه‌ماوه، بۆیه به خێرایی ته‌واوم كرد.

گوتم: بۆ دروستكردنی خانوو، سه‌ره‌تا ده‌بێت دیزاینی خشتێك بكه‌یت. «ئه‌مه خشته‌كه‌یه.»

سه‌ددام وه‌ستا و پاشان ده‌ستی كرد به وتارێكی گشتی سه‌باره‌ت به پێشكه‌وتنی ته‌كنه‌لۆژیای عێراق و نه‌ته‌وه‌ی عه‌ره‌ب.

وتیشی: به‌م زووانه له‌ڕووی ته‌كنه‌لۆژیاوه هاوتای ولاتانی وه‌ك سویسرا ده‌بین. "حوسه‌ین كامل، چه‌ند كاتمان ده‌وێت تا عێراق بگاته ئاستی سویسرا؟"

حوسه‌ین كامل به هۆشیاریه‌وه وتی: به دڵنیاییه‌وه زۆری نه‌ماوه.

به‌ڵام ئه‌مه شتێكی ته‌واو بێ مانا بوو، چوون كه‌م كه‌س هه‌بوو كه له من باشتر له دۆخی ژێرخانی ته‌كنه‌لۆژی عێراق تێگه‌یشتبێت و ده‌مزانی هه‌رچه‌نده عێراق له زۆربه‌ی دراوسێكانی له ڕۆژهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست زیاتر پێشكه‌وتووتره، به‌ڵام به‌راوردكردن له‌گه‌ڵ سویسرا وه‌ك ئه‌وه‌یه عه‌قڵمان له‌ده‌ست دابێت. قسه زله‌كانی پیاوێك كه هه‌رگیز سه‌ردانی سویسرای نه‌كردبوو، ئه‌وه‌ی ده‌رده‌خست كه چه‌نده له واقیعه‌وه دابڕاوه. پاشان سه‌رۆك ڕووی له من كرد.

- گوتت ئه‌و گازه پێی ده‌وترێت یۆرانیۆم هێكسافلۆراید؟ قه‌ڵه‌م و ده‌فته‌رێكی له سه‌ر مێزی چاییه‌كه هه‌ڵگرت و له‌سه‌ری نووسی "UF6". " ئایا ئه‌وه ئاوێته كیمیاییه‌كه‌یه‌تی؟"

هه‌ستم ده‌كرد نمایشێك ده‌كات كه ئاره‌زووی لایه‌نه

تەكنیكییەكانی بەرنامەكە ڕوون بكاتەوە. وەك ئەوەی هەوڵبدا كە وای دەربخات كەمێك گرنگی بە پرۆسەكە دەدا و زانیاری هەیە. تەنها ویستویەتی بەرهەمی كۆتایی ببینێت.

گوتم: بەڵێ، ئەوە.

سەددام پارچە كاغەزەكەی لە دەفتەری یاداشتەكە دەرهێنا و هەمووومان سەیرمان دەكرد كە هێواش هێواش دەیدڕاند و دەیكردە پارچە بچووكەكان، كە دەیخستنە ناو تەپڵەكێكەوە. ئەمە دوو پەیامی ورد و ڕوونی پێبوو: بەرنامەكە بەشێوەیەكی سەرەكی بە نهێنی بوو، هەروەها سەرۆكیش گوێی لە لایەنی تەكنیكی شتەكان گرتبوو.

دواتر وتی: دكتۆر مەهدی، كەی ئەنجامەكانی ئەم بەرنامەی بڵاوكردنەوە دەبینین؟" بە ڕاشكاوی پرسی. — ئێستا تۆ دەڵێیت خشتەكەت هەیە، واتە خشت بۆ دروستكردنی خانوو؛ كەوابوو كەی دەتوانین لە نێو خانووەكەدا بژین؟

بەكارهێنانی مێتافۆری "لە نێو خانووەكەدا بژین" پێویستی بە ڕوونكردنەوەی زیاتر نەبوو، بەڵام من نەمدەزانی چۆن وەڵام بدەمەوە. بەدوای وشەگەلێكی تەواو دەگەڕام بۆ وەڵام دانەوە. چوون من زانابووم نەوەك ماستاوچی. سەبارەت بە بەرنامەی بڵاوبوونەوە ڕێگاكەمان زۆر درێژ بوو و ڕەنگە مەحاڵ بووبێت. بەرنامەكە پێویستی بە گواستنەوە بوو لە قۆناغی نموونەییەوە بۆ قۆناغی تاقیكاری كە دەیان پەرشوبڵاوی جۆری جیاوازیان تێدابێت، لە كۆتاییدا بۆ قۆناغێكی پیشەسازی كە هەزاران ئامێری زۆر ئاڵۆزی تێدابێت كە تەنانەت لە چەند ساڵی داهاتوودا بەدووری نازانرێت بەرهەمی بهێنین. بەڵام زەحمەت نەبوو پێشبینی

ئەوە بكەین كە سەددام بە وەڵامی ئەوەی ساڵانێكی زۆری دەوێت ڕازی نابێت. چاوێكم لە حوسەین كامل و ڕاوێژكاری سەددام، لیوا ئەمیر ئەلسەعدی كرد. سەریان بۆ من لەقاند تا وەڵامی پرسیارەكە بدەمەوە.

بە وریاییەوە گوتم: "زۆر قورسە بیخەینە چوارچێوەیەكی كاتیی وردەوە، زۆر ئاستەنگ لەبەردەم بەرنامەی بڵاوبوونەوەدایە. ئەوەی لێرەدا هەمانە تەنها بەردی بناغەیە و چەندین كەرەستەی تریش پێویستە بۆ دروستكردنی خانووەكە. لە لایەكی دیكەوە بە متمانەی زیاترەوە دەستمان كردووە بە گەڕان بەدوای توانای سەنتەرفیوجەكەدا".

حوسەین كامل نیگایەكی توندی تێگرتم تاوەكو قسەكانم ببڕێت. لە یەك كاتدا ڕوون بووەوە كە سەددامی لەبارەی بەرنامەی سەنتەرفیوجەوە ئاگادار نەكردۆتەوە كە هێشتا لە ئاستی تیۆریدا بووە، چونكە پێویستی بە پێشكەوتن هەبووە نەك سەرەتایەكی نوێ. هەرچەندە حوسەین كامل هاوسەرگیری لەگەڵ كچەكەی دیكتاتۆردا كردبوو، بەڵام زۆر لە سەددام دەترسا.

حوسەین كامل وتی: "دكتۆر مەهدی پیاوێكی زۆر خاكییە و ڕقی لە شانازیكردنە، ئەو پێی وایە لە چەند مانگی داهاتوودا ئەنجامەكان دەردەكەون".

وەك بڵێی دڵم كەوتە خوارەوە. چوون ئەمە چوارچێوەیەكی كاتیی تەواو مەحاڵ بوو كە تێیدا پێشكەوتنی بەرجەستە لەگەڵ یان بڵاوبوونەوە یان بەرنامەی سەنتەرفیوج نیشان بدرێت. سەددام لەسەر كورسیەكەی هەستا و ئاماژەی بەوەدا كە كۆبوونەوەكەمان كۆتایی هاتووە. حوسەین كامل و ژەنەڕاڵ ئەلسەعدی بردیانمە

دەرەوە بۆ ناو حەوشەی كۆشكەكە و پاشان لەبەردەم یاریدەدەرەكانمدا جلیان لەبەر كردمەوە.

"بۆچی ئەوەی سەرۆك ئارەزووی بوو بیبیستێت نەتگوت؟" ژەنەڕاڵ ئەلسەعدی هاوارێكی لێكردم. - ئایا لەوە دەترسایت لە ملت بدا؟ دەبوو ئێستا زیاتر بترسیت لەوەی لە داهاتوودا نائومێدی بكەیت!"

هەڵوێستی ژەنەڕاڵ ئەلسەعدی ئاشكرا و ڕوون بوو. تەواوی سەردەمی سەددام بە درۆی ژێردەستەكان و فەرمانی درۆینەی مەسولەكان تایبەتمەند بوو. هەمووان بۆ ئەوەی بژین، یەكتریان فریو دەدا. هەروەها وەك ئەو زانایەی كە سەركردایەتی هیوا گەورەكەی عێراق دەكات بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم —من -، لە نێوان خاڵی فێڵ و واقیعدا بووم.

# بەشی پێنجەم
# بازارکردن لە ئەوروپا

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٨دا چوومە ناو هۆڵی پێشوازی هۆتێلێکی گەورە لە پاریس، تەنها لەڕێگەی وەسفێکی ناڕوونی هەریەك لە دکتۆر فەرید و دکتۆر عادل.

بەرێز عەلی و من بڕیار بوو یەکتر ببینین. ئەمەش بۆ گەڕان بەدوای پۆڵای ماراجینگ بۆ دەستپێکردنی بەرهەمهێنانی کەرەستە لەسەر بنەمای نەخشەی سەنتەرفیوجەکانمان، پەیوەندیمان بە بازرگانێکی فەرەنسییەوە کردبوو کە بە ناوی خواستراوی جاك ڕۆف ناوەزەند دەکرا و لەوەو پێش جۆرەکانی تری پۆڵای بۆ پیشەسازی عێراق دابین کردبوو. بەڵێنیدا دابینکەرێك بدۆزێتەوە، دەیزانی ئەمە گرێبەستێکی نهێنی دەبێت. پۆڵای ماراجینگ لە بازاڕی کراوەدا بە ئەستەم دەست دەکەوت. بەکارهێنانی پۆتانسێلی لە چەك و سەنتەرفیوجی ئاڵۆزدا وای لێکرد کە ببێتە یەکێك لەو مادانەی کە لەلایەن دەزگا هەواڵگرییە نێودەوڵەتییەکانەوە لە نزیکەوە چاودێری بکرێت. ئەوەبوو تا لەتوانامان دابوو بە بێباکییەوە سەیری لۆبیەکەمان کرد تا دوو پیاوەکە نزیك بوونەوە.

فەڕەنسییەکە گوتی: "وابزانم ئێوە هاوکارە عێراقییەکانمن، من جاکم".

ئەوەبوو دەستم بۆ جاك ڕاڤ درێژكرد بەمەبەستی تەوقەكردن، واتە ئەو پیاوەی یاوەری كردین، ئەویش هاوكارێكی لەگەڵدابوو كە ئینگلیزێكی بە ڕەچەڵەك پاكستانی بوو بە مالیك ناوی هێنا و بە ئێمەی ناساند. مالیك ڕێك پۆش بوو، سمێڵێكی تەنكی هەبوو، لەسەر پێشنیاری ئەو هۆتێلەكە شوێنێكی باش نەبوو بۆ كۆبوونەوە، و بانگهێشتی كردین كە لەگەڵیدا سواری ئۆتۆمبێل ببین بۆ شوێنێكی تر. ئەم هەڵسوكەوتەی ئەو لەوەوە هاتبوو كە ئەزموونی مامەڵەی لە بازاڕی ڕەشدا هەبووە. شەش كەسەكەمان لە دوو ئۆتۆمبێلی چاوەڕوانیدا سواربووین و بۆ ماوەی نزیكەی نیو كاتژمێر بە پاریسدا بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشتین و چووینە ناو گەڕەكەكانی دەرەوەی شار. كاتێك لە كۆتاییدا چووینە نێو ماڵێكی بێدەنگ، سەرم سوڕما كاتێك بینیم كە شوێنەكە ماڵێكی پشوودان بوو بۆ گەورە ساڵان. پەیوەندی مالیك بە شوێنەكەوە ڕوون نەبوو، بەڵام شوێنێكی زۆرباش بوو بۆ گفتوگۆیەكی نهێنی دوور لە چاوی چاودێرەكانی شارەكە.

لەناو شوێنی پێشوازیدا، جاك بە زمانی فەرەنسی پێشوازی لە خزمەتكارێك كرد. دیار بوو ئەو دوو پیاوە یەكتریان دەناسی و بە دڵخۆشیەوە تەوقەمان كرد و بەخێرهاتنیان كردین بۆ ئەو گۆڕەپانە گەورەیەی لە پشتەوەی ماڵەكە هەبوو. بەناو باخچەی پڕلە گوڵی باش چاودێریكراو و فراوان و ڕێكخراودا ڕۆیشتین، كاتێك دەستمان كرد بە باسكردنی كڕینی پۆلاكانی ماراجینگ، تاكە شایەتحاڵی گفتوگۆكەمان ماسییە ڕەنگاوڕەنگ و پەڵەدارەكان بوون كە بە تەمبەڵی لە گۆمێكدا مەلەیان دەكرد. لە دوورەوە، چەند كەسێكی بەساڵاچوو بە جۆرێك لە ئارامییەوە كە لەگەڵ تەمەنیان دەگونجا، بە درێژایی ڕێگاكاندا دەڕۆیشتن.

كاتێك وتم كه من حه‌زم له پۆڵا مارایجكردنه به به‌رزترین كوالێتی به‌رده‌ست، كه پێی ده‌وترێت ماراجینگ ۳۵۰. مالیك برۆیه‌كی به‌رزكرده‌وه و وتی:

- به‌نیازیت بۆ چی به‌كاری بهێنیت؟

گوتم: موشه‌ك، بۆ به‌رنامه‌ی تۆپخانه‌كه‌مان.

ڕاسته هه‌ندێك جار پۆڵای ماراجینگ بۆ دروستكردنی موشه‌كی تۆپخانه به‌كارده‌هێنرێت، به‌ڵام به‌رزترین كوالیتی كه پێویستیانه پله‌یه‌كی كه‌متره، ماراجینگ ۲۵۰. كاتێك به‌ناو باخچه‌كاندا ده‌ڕۆیشتین. جه‌ختم له‌سه‌ر ئه‌وه كرده‌وه كه پێویستیمان به نمونه‌یه‌كه بۆ پشكنین، مالیك دڵنیای كردمه‌وه كه ده‌توانێت ڕۆژی دواتر دانه‌یه‌كمان بگه‌یه‌نێته ده‌ست. كاتێك وتم نزیكه‌ی سه‌د تۆنمان ده‌وێت، ئه‌و بێ ئه‌وه‌ی هیچ قسه‌یه‌ك بكات سه‌ری نزم كرد. چوون ئه‌مه بره پاره‌یه‌كی زۆر و تێچووی زۆری ده‌ویست.

ستافه‌كه‌م پێش كۆكردنه‌وه‌ی كه‌ره‌سته‌كان بۆ به‌رهه‌مهێنانی گه‌وره مشتومڕێكی گه‌رمیان له‌سه‌ر ئه‌وه كردبوو كه ئایا پرۆتۆتایپه‌كه په‌ره‌پێبده‌ن یان نا. پرۆسه‌ی سروشتی بۆ پرۆژه‌یه‌كی ئاسایی ئه‌وه ده‌بوو كه دوور بكه‌ویته‌وه له كڕینی گه‌وره‌ی ماده‌ی خاو تا ئه‌و كاته‌ی نموونه‌یه‌كی سه‌ره‌تایی توانای به‌رده‌وامبوونی خۆی سه‌لماند. لایه‌نه باش و خراپه‌كانیم له‌به‌رچاو گرتبوو. ڕه‌نگه سه‌ددام و حوسه‌ین كامل سزامان بده‌ن ئه‌گه‌ر پاره به‌فیڕۆ بده‌ین له كڕینی پێشوه‌خته‌دا. به‌ڵام به دڵنیاییه‌وه بۆ ئێمه خراپتر ده‌بێت ئه‌گه‌ر حكومه‌ته بیانییه‌كان پێش ئه‌وه‌ی هه‌موو كه‌ره‌سته‌كانمان هه‌بێت، به‌رنامه‌كه‌مان بدۆزنه‌وه و سازشیان له‌سه‌ر بكه‌ن. دواجار

بڕیارمدابوو که به زووترین کات هه‌موو ئامێرێك که ده‌مانتوانی و ده‌ستمان پێی ده‌گه‌یشت بیکڕین.

ئه‌و شه‌وه مالیك بانگهێشتی کردین بۆ ئێواره خوانێك له شارۆچکه‌که و منیش سه‌رم سوڕما له شوێنه‌که، چونکه شوێنه‌که گازینۆیه‌کی شه‌وانه بوو له شه‌قامی شانزه ئه‌لیزه. چووینه ناو هۆڵێکی که‌م ڕووناکی که گڵۆپی به‌چرپه[1] و ژنانی نیمچه ڕووت له‌سه‌ر شانۆیه‌کی زه‌به‌لاح سه‌مایان ده‌کرد و ئه‌زموونی نزیکه‌ی ده ساڵ پێشتر له‌گه‌ڵ پیاوه‌کانی کۆمیسیۆنی وزه‌ی ئه‌تۆمی فه‌ره‌نسا بیرم هاته‌وه. له ڕیزێکی دوور و درێژی کورسییه‌کان که ڕووی له شانۆ بوو، دانیشتین. له‌گه‌ڵ سه‌رقاڵبوونی دکتۆر فه‌رید و دکتۆر عادل و کاك عه‌لی به نمایشه‌که، مالیك کۆمه‌ڵێك پرسیاری تایبه‌تی لێکردم. باسی له کۆتایی شه‌ڕ له‌گه‌ڵ ئێران کرد و هاوسۆز بوو له‌گه‌ڵ پێویستی عێراق بۆ پڕکردنه‌وه‌ی کۆگاکانی موشه‌که‌کانی تۆپخانه.

وتیشی: "ئه‌و ماده‌یه‌ی داوای ده‌که‌یت ستانداردێکی زۆر به‌رزتره له‌وه‌ی که به شێوه‌یه‌کی ئاسایی بۆ تۆپخانه به‌کارده‌هێنرێت". "دڵنیای که ئه‌و ئاسته‌ت پێویسته و ئاستێکی که‌مترت پێ باشتر نییه؟"

به شێوه‌یه‌ك له شێوه‌کان به‌سه‌ر مۆسیقاکه‌دا ده‌نگم به‌رزکرد و گوتم: "نا، ماراجینگ ٣٥٠ ئه‌وه‌یه که پێویستمانه."

وتی: "به‌ڵام ئه‌و تایبه‌تمه‌ندیانه‌ی باست کرد زیاتر گونجاون بۆ ئاستی به‌رزی فشار له‌سه‌ر ماده‌که، بۆ نموونه وه‌ك له خێراییه به‌رزه‌کانی خولانه‌وه‌یدا."

---

[1] ئه‌و گڵۆپانه‌ی تایبه‌تن به یانه شه‌وانه‌کان

بەمجۆرە ڕاستەوخۆ چووە ناو دڵی بابەتەكەوە. دیارە ئەم مالیكە تا ڕادەیەك ئاشنای لەگەڵ بابەتی سەنتەرفیوجەكاندا هەبووە، هەرچەندە خۆی لە هێنانە ناوەوەیان بەدوور گرتووە. منیش پرسیارم كرد كە ئایا ئەو بەشدارە لە بەرنامەكانی سەنتەرفیوجی پاكستان یان بەڕازیل. بەڕاستی لەم جیهانە تاریكەدا هیچ ڕێگەیەك نەبوو بۆ بۆ گوتنی ڕاستییەكان. چوون ڕێی تێدەچوو ئەو هەواڵگری بێت. لە كاتێكدا چاوێكم لە ڕیزێك كچانی سەماكار لەسەر شانۆ بوو، لەناكاو بەم تێڕوانینە سەیرە سەرسام بووم كە یانە سترییەكانی پاریس دوو هێندە دەبنە ژووری لێكۆڵینەوە بۆ زانایانی ئەتۆمی بیانی.

تاكە بژاردەی من ئەوە بوو كە وا نیشان بدەم كە لە مانای پشت لێدوانەكەی تێنەگەیشتم.

گوتم: كاتێك باس لە موشەكەكان دەكرێت، ئێمە بڕیارمانداوە گۆشە وەیان مەودای دیاریكراو نەبڕین.

مالیك شانی هەڵكێشا و هەستم بە ئاسوودەیی كرد كاتێك وا دیار بوو كە لێكۆڵینەوەكەی لەوێ كۆتایی هات.

ڕۆژی دواتر داوام لە باڵیۆزی عێراق لە فەرەنسا كرد كە بە كیسی دیپلۆماسی نمونەیەك لە پۆڵا ماراجینگەكە بنێرێت بۆ كۆمپانیای ئینتەراتۆمی ئەڵمانی بۆ تاقیكردنەوە. وا دیار بوو باڵیۆزەكە بە بینینی من تووشی سەرسوڕمان بوو. چونكە ئەو كەسە بریتیی بوو لە دكتۆر ئەلهاشمی، سەرۆكی ئاژانسی عێراقی وزەی ئەتۆمی لە ساڵانی حەفتاكانی سەدەی ڕابردوودا، كە ساڵانێك پێشتر پرسیاری لەبارەی تاقیكردنەوەكانی ڕیاكتۆری تەمموزەوە كردبوو. بەڵام یەك نیگا لەلایەن ئەوەوە نیشانیدام كە لە قوڕسایی

داواكارییەكەم تێگەیشتووە. بەبێ ئەوەی هیچ لێدوانێك لەسەر پەیوەندی ڕابردوومان بدات، دڵنیای كردمەوە كە شۆفێرێك لە دەرەوە چاوەڕێم دەكات. دوای دوو ڕۆژ ئەنجامەكەم وەرگرت. پۆلا ماراجینگەكە بەرزترین كوالێتی بوو و بە تەواوی لەگەڵ تایبەتمەندییەكانی ئێمەدا دەگونجێت.

بە فڕۆكە ڕۆیشتم بۆ ئەوەی لە لەندەن چاوم بە مالیك بكەوێت. پێدەچوو ئەو پێی باشتر بوو مامەڵەكانی لە ڕووی جوگرافییەوە پەرش و بڵاو بێت. دوای پاریس كە بەزەحمەت لە زمانەكە تێدەگەیشتم، گەیشتن بە فڕۆكەخانەی هیسرۆ وەك ئەوە وابوو بگەڕێمەوە نیشتمان. ڕۆژێكی دەگمەنی خۆرەتاوی زستان بوو لە لەندەن و لە پەنجەرەی تاكسییە ڕەشەكەوە سێبەری بینا خشتییە كۆنەكان لە بەرامبەر خۆر ئاوابووندا وەك پۆستكارتێك دەهاتە بەرچاو كە وێنەی شارەكەی لەسەر بێت.

بەیانیەكەی دیكە من و مالیك لە چایخانەیەكی چۆڵ لە ویمبڵدۆن یەكترمان بینی. لە كاتێكدا گارسۆنەكە بسكیتی هێنا و چای دانا، ئێمە لەسەر نرخی ٧ ملیۆن دۆلار بۆ سەد تۆن پۆلا ٣٥٠ مارایجینگ مامەڵەكەمان یەكلاكردەوە. بە شێوەیەكی ئاسایی پرسیارم لە ناوی بەرهەمهێنەرەكە كرد، بەڵام دیار بوو مالیك نایەوێت سەرچاوەكە ئاشكرا بكات. بەڵام دڵنیای كردمەوە كە باری تەواو لەگەڵ تایبەتمەندییەكانی ئێمەدا دەگونجێت و پێشنیاری كرد كە لە ڕێگەی لۆید لە لەندەن یان بیرۆ ڤێریتاسەوە بنێردرێت بۆ كوالیتی كۆنترۆڵ. ئێمە لەسەر بیرۆ ڤێریتاس ڕێككەوتین. مالیك خۆی لە پرسیاری زیاتر سەبارەت بە بەكارهێنانی مەبەستمان لە مادەكە بەدوور گرت و لەگەڵ كەوتنە ناو قسە خۆشەكانیدا، متمانەم پێی زیاد بوو.

به گه‌ڕانه‌وه بۆ ئه‌و كاته، به‌ڕاستی سه‌یربوو كه توانیم چێژ له‌و به‌یانییه بێده‌نگه وه‌ربگرم له ویمبلدۆن له‌كاتێكدا بناغه‌ی جبه‌خانه‌یه‌كم داده‌نا كه بتوانێت وێرانكاری له جیهاندا بكات. سه‌د تۆن پۆلای ماراجینگ به‌س بوو بۆ به‌رهه‌مهێنانی ده هه‌زار سه‌نته‌رفیوج، كه له به‌رامبه‌ردا ده‌توانێت سالآنه ١٥٠ كیلۆگرام یۆرانیۆمی زۆر پیتێنراو به‌رهه‌م بهێنێت. ئه‌وه به‌س ده‌بێت بۆ ئه‌وه‌ی عێراق سالآنه ده بۆمب به‌رهه‌م بهێنێت به هێزی وێرانكه‌ری ئه‌و بۆمبه‌ی كه له سالّی ١٩٤٥ بۆ سه‌ر هێرۆشیما فڕێدرایه خواره‌وه، یان نزیكه‌ی مانگێك بۆهه‌ر بۆمبێك. بیرۆكه‌ی ده‌یان بۆمبی ئه‌تۆمی له ده‌ستی سه‌ددامدا، ترسناكه. كاتێك بیر له سه‌ركرده‌كانی وه‌ك سه‌ددام ده‌كه‌مه‌وه ئه‌مڕۆ له جیهاندا و ئه‌وانه‌ی بێ گومان له داهاتوودا سه‌رهه‌لّده‌ده‌ن، به دلّنیاییه‌وه بلآوبوونه‌وه‌ی وێرانكه‌رترین چه‌كی جیهان ده‌بینین. ئه‌و جۆره كه‌سانه له ده‌یان ولآت سه‌رهه‌لّده‌ده‌ن كه جبه‌خانه‌ی ئه‌تۆمیان له‌به‌رده‌ستدایه، له‌گه‌لّ هه‌موو شه‌ڕ و ململانێیه ئه‌گه‌رییه‌كانیان، ئه‌مه‌ش ئه‌گه‌ری ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ی ئه‌تۆمی وێرانكه‌ر به‌رز ده‌كاته‌وه.

له‌به‌ر پێویستی و كاتێك سه‌رنجم له‌سه‌ر كۆكردنه‌وه‌ی پێكهاته‌كان و سه‌رچاوه‌كان بوو بۆ به‌رنامه‌ی سه‌نته‌رفۆج ئه‌م نیگه‌رانیانه‌م له مێشكم ده‌رهێنا. له سه‌ركه‌وتنێك نزیكتر بووینه‌وه و له ئامانجی به‌په‌له‌ی دلّخۆشكردنی سه‌ددام و هه‌روه‌ها دوورخستنه‌وه‌ی من و ستافه‌كه‌م له زیندانه‌كانی ئه‌و. به‌لآم پێویستی به ستراتیژییه‌كی ورد بوو. ئێمه پێویستمان به هه‌ردوو كه‌ره‌سته و لێهاتوویی ته‌كنیكی بوو بۆ دروستكردنی نموونه‌یه‌كی سه‌ره‌تایی و دواتر پێویستمان به دامه‌زراوه به‌رهه‌مهێنانه گه‌وره‌كان بوو. من ڕێبازێكی دوولایه‌نه‌م په‌ره‌پێدا: كڕینی ئامێر و كه‌ره‌سته‌ی خاو بۆ

دروستكردنی زۆرترین پێكهاتەكان لە ناوخۆی عێراق و بەخشینی بەرهەمهێنانی پارچەكانی دیكە لە دەرەوە. بۆ زۆرێك لە هەستیارترین بەشەكان بەدوای هەردوو ڕێڕەوەكەدا ڕۆیشتین. نهێنی زۆر پێویست بوو. هەوڵەكانمان لە زۆرێك لە وڵاتاندا بڵاوكردەوە بۆ ئەوەی دەستنیشان نەكرێن. دیزاینەكانی سەنتەرفیوجم بەشێوەی تاك تاك و بەجیا دانا لە ترسی ئەوەی ئاشكرابن. من سەرنجم لەسەر ئامانجە ئاسانەكان بوو لە كەرتی تایبەتدا: ئەو كۆمپانیایانە كە دەتوانن پارچە و ئامێری ورد بەرهەم بهێنن بەبێ ئەوەی گومانیان لە ئامانجی بەكارهێنانیان هەبێت.

ئێمە لە سەرەتای بەرنامەكەمانەوە چەندین وانە فێربووبووین، یەكێك لەوانە ئەوە بوو كە هێشتا شارەزاییمان زۆر كەم بوو. سەنتەرفیوج وەكو قاپێك ژەمی ناسك وایە كە ئەگەر شتێك بە هەڵە ئەنجام بدرێت، ئەوا ژەمەكە تێكدەچێت و ناخورێت، لەلایەكی تریش چێشتلێنەرەكانمان ئامادە نەبوون بۆ ئەم كارە. بۆیە من ڕاهێنانی تەكنیكارەكانم لە دەرەوەی وڵات لە پێشینەی كارەكان دادەنێم. چەندین ئەندازیارمان لە كۆلێژی ئیمپریال لەندەن تواناكانیان لە بواری هایدرۆدینامیكدا بەرزكردەوە. هەندێكی تریش چوونە میونیخ بۆ لێكۆڵینەوە لەو ماتۆرە ئاڵۆزانەی كە پێویستن بۆ دروستكردنی كێڵگە موگناتیسیەكان بۆ سوڕاندنی ڕۆتۆری سەنتەرفیوج. بیست و دوو كەس لە ستافەكەم لە كۆمپانیای ئینتەراتۆمی ئەڵمانی ڕاهێنانی چڕیان ئەنجامدا. لەوێ فێری چۆنیەتی دروستكردن و كاركردن بوون لەناو ژینگەیەكی "ژووری پاك"دا. تیمێكی دیكەش چوونە نێو كۆمپانیای ئینتەراتۆم كە خۆیان وەك ئەندازیاری وەزارەتی نەوت پیشان دەدا بۆ ئەوەی نهێنییەكانی بەستنەوە بزانن، كە لێكۆڵینەوەیە لە پلەی گەرمی زۆر

نزم، ئەمەش پێویست بوو بۆ بەرهەمهێنانی گازی یۆرانیۆمی هێکسافلۆراید. هەریەك لەوانە چەند هەفتەیەكیشیان لە لێكۆڵینەوە لە كورەكاندا بەسەر برد، ئەمەش تەنها بۆ پاراستنی ئەو وەهمەی كە ئەوانە ئەندازیاری نەوت بوون، بەو پێیەی هەردوو دیسیپلینەكە لە پاڵاوگەكانی نەوتدا پێویستن.

لەگەڵ زیاتر ئاشنابوونمان بە پرۆگرامی بڕگەكان لە كۆمپانیای ئەمریكی MTI، ئەوەمان بۆ ڕوون بووەوە كە زانیارییە نوێیەكانمان لەبارەی داینامیكی ڕۆتۆرەوە تەنها زانیاری سادەن، ئەمەش شتێكی ناخۆش بوو. ئەزموونی ئێمە لەگەڵ سەنتەرفیوجی ڕۆنی بیمز دەریخست كە داواكردنی كەمێك زانیاری بەڕاستی مەترسیدارە و ڕەنگە پرۆژەكەمان و ژیانمان بخاتە مەترسییەوە. پەیوەندیم بە دەیڤدەوە كرد لە MTI، ئەویش ڕێككەوت لەسەر گرێبەستێك بۆ یەكێك لە ئەندازیارەكانمان بۆ ئەوەی لەگەڵ پرۆفیسۆرێكی بەساڵاچوو لەوێ بخوێنێت لە بەكارهێنانی پرۆگرامی بڕگەكان. ئەندازیارێكی گەنجی زیرەكم نارد بە ناوی دكتۆر مەكی ڕەشید، لەگەڵ ڕێنمایی تایبەت. ئەوەبوو تاقیكردنەوەكانمان بەردەوام بوون تا ئەوكات دەیتوانی بۆ ڕۆتۆرە خاوەكانی خولانەوەی بەكارهێنراو لە پیشەسازی نەوتدا بەكاربهێنرێت، بەڵام مۆدێلێكی تایبەتمان بە ڕۆتۆری سەنتەرفیوج لە زیاتر لە ٥٠,٠٠٠ خول لە خولەكێكدا دروستكرد. تا دوای چەند مانگێك دكتۆر مەكی گەڕایەوە عێراق دركم بەوەكرد كە خەریك بوو ئاشكرابین.

لەگەڵ پرسیاركردنمدا لە دكتۆر مەكی ترسم زیاتر بوو. دكتۆر مەكی وتی بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك خوێندنەكەی بە جوانی كردووە و پێشوەچوونی باش هەبووە، تاوەكو توانیویەتی پلەی دكتۆرا دەست بخات. سەرپەرشتیكردنی ڕاهێنانەكانی لەگەڵ پرۆفیسۆرەكە پرسیاری زۆری تێكەوتبوو.

دكتۆر مەكی وتی: "پرۆفیسۆرەكە سەرنجی دا كە ئەو مۆدێلە ڕۆتۆرەی كە من كارم لەسەر دەكرد لە دەرەوەی پێداویستییەكانی پیشەسازی نەوت بووە، ئەو بەردەوام پرسیاری ئەوەی دەكرد كە من خەریكم چی دیزاین دەكەم."

منیش پرسیم: چیت پێ وت؟

"وەك باسمان كرد، پێم گوت ئەوە تەنها مۆدێلێكی گریمانەییە."

بەڕاستی ئەوە پێشهاتێكی كارەساتبار بوو. بەهۆی ترسمانەوە كە نەتوانین ئەمە بە خێرایی بەرهەم بهێنین بۆ سەددام، مەترسیمان دەكرد جێبەجێكردنی بەرنامەكەمان كەوتبێتە ژێر لوتی بەڵێندەرێكی گەورەی ئەمریكی. ڕەنگە ئێمە زۆر دوور ڕۆیشتبین. بەهۆی پەیوەندییە نزیكەكانی نێوان MTI و حكومەتی ئەمریكا و دەزگا هەواڵگرییەكان، گومانی یەك ئەندازیاری گەنج دەتوانێت تەواوی بەرنامەكەمان بخاتە مەترسییەوە. نیگەران بووم لەوەی كە بەم زووانە گوێمان لە تۆمەتێك بێت لە حكومەتی ئەمریكاوە دێت، بەڵام ئەم تۆمەتە هەرگیز ئاڕاستەمان نەكرا.

لەگەڵ گەشەسەندنی تۆڕی پەیوەندییەكانمان كە لەلایەن هینزە و كەسانی دیكەوە دابین دەكرا، دەستمان كرد بە پێكەوە دانانی پارچەكانی تر. مالیك لەگەڵ بەڵێنەكەی ڕاست بوو، دوای چەند هەفتەیەك لە كۆبوونەوەكەمان لە ویمبلدۆن، پۆڵا ماراجینەكە گەیشتە دوبەی و بە بارهەڵگر بەنێو بیابانی سعودیەدا بە سێ بارەوە بەرەو بەغدا هێنرا. ئێمە وەلفەلی بۆشایی و بۆریمان لە كۆمپانیای ئەڵمانی لیبۆڵد كڕی، لە شاری كۆڵن. لە كۆمپانیای لقەكەی Leybold's U.S، ئێمە ئامێری لێهەڵمژینی تیشكی ئەلكترۆنیمان كڕی بۆ ئەوەی تۆپەكە بە شەفتی بنكەی خوارەوە ببەستینەوە.

هەرچەندە بە شێوەیەكی تایبەت بە پێوانە وردەكان بۆ سەنتەرفیوجەكەمان دروستكراوبوو، بەڵام كۆمپانیاكە پرسیاری لە ئامانجی بەكارهێنانی نەكرد. كۆمپانیای ڕۆیتلینگەری ئەڵمانی ئامێری پێ فرۆشتین بۆ هاوسەنگكردنی ڕۆتۆرەكان. لە یوگۆسلاڤیا و ئینگلتەرا و سویسرا بەدوای بەشەكانی دیكەدا گەڕاین.

هەوڵەكانمان بۆ دەستخستنی كەرەستە، ئێمەی گەیاندە زۆرێك لە شەقامە بنبەستەكان، هەندێك سەركەوتنی سەرنجڕاكێش و چەند پەیوەندییەكی نزیك وەدیهاتن. یەكێك لە قورسترین پارچەكان بۆ بەدەستهێنانی موگناتیسی بچووكی بەهێزی بەرز بوو كە لەسەرووی سەنتەرفیوجەكە دادەنیشێت. پارچەیەكی سەرسوڕهێنەری ئەندازیارییە، بنكەی موگناتیسی سەرەوە ڕۆتۆرەكە لە شوێنی خۆیدا دەهێڵێتەوە، بەبێ ئەوەی هەرگیز دەستی لێبدات، كاتێك لە بۆشاییدا دەسوڕێتەوە. موگناتیسی ئاسایی نییە، تایبەتمەندییەكانی وەك پارچەیەكی سەرەكی سەنتەرفیوج دەیناسێنن.

كاتێك پرسیارمان لە كۆمپانیایەكی عێراقی كرد لە بەریتانیا، بە ناوی گروپی گەشەپێدانی تەكنەلۆجی (TDG)، سەبارەت بە بەدەستهێنانی موگناتیسی لەو شێوەیە، پێشنیاری دووكەسیان بۆ كردین كە ئینگلیزێك و ئەمریكییەكی لەدایكبووی چین بوو، ئەوانیش پەیوەندییان بە TDG كردبوو لە هەوڵێكدا بۆ فرۆشتنی تەكنەلۆژیای چینی لەنێو بازاڕی ڕەش. سەرەتا وا دیار بوو كە پێشەنگێكی ئومێدبەخش بوو و لەگەڵ دكتۆر فەرید و دكتۆر عادل و كاك عەلی بە فڕۆكە بەرەو بۆنی ئەڵمانیا ڕۆیشتم بۆ كۆبوونەوەیەكی پێشوەختە لە هۆتێلێك لەوێ.

لە باڵكۆنی ژووری نهۆمی سێیەم لە هۆتێلە بچووكە چوار ئەستێرەیە ڕاقییەكەدا وەستام، كە ڕووی لە باخچەیەكی گەورە بوو، چاوەڕێی هاتنی پیاوە ئینگلیزەكە بووم بۆ ئەو كۆبوونەوەی كە بڕیاربوو كاتژمێر دوو بكرێت. چەند خولەكێك پێش وادەكە، سەیری گوڵەبەڕۆژەكانی خوارەوەم دەكرد و سەرسام بووم پێی، پیاوێكی كەچەڵم بینی كە لە دەرگای چوونە ژوورەوە نزیك بووەوە. قاتێكی لەبەردا بوو و جانتایەكی هەڵگرتبوو. هەستێكی سەیرم هەبوو كاتێك سەیرم دەكرد لە ژێر چادرەكەی هۆتێلەكەدا ونبوو. وەك بڵێی هەستی شەشەم بوو كە دایكم هەمیشە متمانەی پێی بوو، ئەم هەستە پێی وتم ئەمە پیاوەكەیە بەڵام نابێت مامەڵەی لەگەڵدا بكەیت. بڕیارمدا چاوم پێی نەكەوێت. بەڵكو دكتۆر عادل و دكتۆر فەریدم ناردە خوارەوە بۆ ئەوەی قسە لەگەڵ ئەو پیاوە بكەن. دوای دوو كاتژمێر گەڕانەوە و دووپاتیان كردەوە كە ئەو پیاوە كەچەڵە بە پەیوەندیدا بووە و ئاماژەیان بەوەشكرد كە ڕێككەوتوون بەوەی موگناتیسی نمونەیی لە وڵاتی چینەوە بنێردرێت.

دوای دوو هەفتە گەڕاینەوە بۆ بەغدا، نمونەیەكمان لە موگناتیسی چینی وەرگرت و ئۆفەرێكمان بۆ دروستكردنی دامەزراوەیەكی بەرهەمهێنان بەبەهای ٤.٧ ملیۆن پاوەندی بەریتانی دەستخست. بەڵام نمونەكە باش دەرنەدەكەوت. ڕووكارەكانی ناشیرین و چاڵ بوون و بەگشتی نموونەكە بە هیچ شێوەیەك گونجاو نەبوو. من لە ڕێگەی TDG پەیامێكم نارد و بە توندی ڕەتمكردەوە كە پابەندبم بە ئۆفەرەكە. هەستەكەم سەبارەت بەو ئینگلیزە كەچەڵە ڕاست بوو. چەند ڕۆژێك دوای ئەوە، بابەتێك لە هەواڵنامەیەكدا بە ناوی ماركێتەكانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست كە

لەلایەن ڕۆژنامەی فاینانشیاڵ تایمزی لەندەنەوە بڵاوکرایەوە و عێراقی تۆمەتبار کردبوو بەوەی هەوڵدەدات موگناتیسی دروستکراوی چینی زۆر ئاڵۆز بەدەستبهێنێت بۆ هەوڵدان بۆ دروستکردنی سەنتەرفیوج. ئاماژەی بەوەشکردووە، هەوڵی کڕینی موگناتیسی بەشێکی سەرەکییە لە هەوڵەکانی عێراق بۆ بۆمبی ئەتۆمی.

من دوای پەیوەندییەکی تەلەفۆنی حوسەین کامل کە بانگهێشتی ئۆفیسەکەی کردم، زانیاریم لەسەر بابەتەکە زانی. کە گەیشتم بینیم کۆپییەکی هەواڵنامەکە لەسەر مێزەکەی دانراوە. لەکاتی خوێندنەوەیدا وەستاو وتی:

"ئەمە چۆن ڕوویدا؟" دەنگی بە شێوەیەکی ئارام ناتایبەتمەند بوو.

گوتم: گەورەم، ئەو پیاوەی کە قسەی لەگەڵدا کرابوو دەبێ بریکاری هەواڵگری بەریتانیا بووبێت. من هیچ زانیارییەکم لەسەر ئەو نییە. چاوم پێی نەکەوت."

وتی: "ئایا درك بەوە دەکەیت کە ئەمە مانای چییە ئەگەر ببێتە چیرۆکێکی گەورەتر لە میدیاکان؟، ها درك بەوە دەکەیت؟".

گوتم: بەڵێ. دەتوانێت بەرنامەکەمان بخاتە مەترسییەوە.

ئەویش بە شێوازی ئاسایی خۆی وتی: دەبێت وریاتر بیت. دڵنیابەرەوە لەوەی کە جارێکی تر شتی لەمجۆرە دووبارە نابێتەوە.

بە دڵەڕاوکێیەوە چاوەڕێی ئەوە بووم بزانم ئایا میدیای هەواڵی بیانی زیاتر گرنگی بەم هەواڵە دەدەن یان نا، و هەوڵمدا ئاکامەکانی لەپێش چاو بگرم. هۆشیاری گشتی لەبارەی بەرنامەی

سەنتەرفیوجی عێراق لە ئەوروپا یان ئەمریكا دەبێتە هۆی لێكۆڵینەوەی توندتر لە هەناردەكردن بۆ عێراق و ئەمەش نەك تەنها زیان بە چانسی سەركەوتنمان دەگەیەنێت بەڵكو زیان بە چانسی سەركەوتنی عێراق دەگەیەنێت بە گشتی. سەددام و حوسەین كامل تاوانەكەیان بە كەسێكەوە هەڵدەواسی و بەمەش بە ئەگەرێكی زۆرەوە پەتەكە دەخرایە ملی ئێمە. بەڵام هەفتەكان تێپەڕین و هیچ شتێكی نوێ لەبارەی ئەو بابەتە لە میدیای بیانیدا دەرنەكەوت. دەبێ سەرنووسەرانی ڕۆژنامەكان وردەكارییەكانی دۆسیەكەیان زۆر بە وردی نەزانیبێت و بەڵگەكانیان زۆر لاواز بووبێت. تەنها شتێك كە لایان بوو ئەوەبوو كە یەك هەوڵی لەبارچوو بوو بۆ كڕینی موگناتیسی، هەروەها هیچ شوێنەوارێكی كاغەزی واتە مۆركردنی پەیمانێك یان شتێك نەبوو بۆ سەلماندنی. لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز بۆم دەرنەكەوت كە ئاخۆ هیچ كەسێك لە TDG لە لەندەن بەهۆی ئەمەوە تووشی هیچ دەرئەنجامێك بووە یان نا.

ئێمە كاتێكمان لە كۆمپانیای بەرهەمهێنەری بەناوبانگی موگناتیسی ئەڵمانی ماگنێتۆبۆن دیاری كرد، بۆ ئەوەی بەرژەوەندی ڕاستەقینەی خۆمان لەبەرچاو بگرین، لیستێكمان نارد كە دەیان جۆری موگناتیسی تێدایە و پێشنیارمان كرد كە ڕەنگە كۆمەڵێك بەرهەمی گەورەی ماگنێتۆبۆن بكڕین، بەو هیوایەی ئەمە سەرنجی خەڵك لە موگناتیسی سەنتەرفیوج دوور بخاتەوە. بەڵام كاتێك گەیشتمە كۆمپانیاكە، بەڕێوەبەری تەكنەلۆژیا لە شوێنی پێشوازییەكە چاوی پێكەوتم و وتی كە بەداخەوە كۆمپانیاكە نەیتوانی ڕێگەم پێبدات بچمە ناو شوێنەكەیەوە. دیارە كەسێك بە وردی لە لیستی پێداویستییەكانی ئێمەدا كۆڵیوەتەوە و زەنگی

ئاگادارکردنه‌وه‌ی لێداوه به‌تایبه‌ت کاتێك تایبه‌تمه‌ندییه‌کانی موگناتیسی سه‌نته‌رفیوجی بینوه.

"به‌ڵام کاکه تۆ بانگهێشـــتت کردووم ئه‌و هه‌موو ڕێگایه‌م له به‌غداوه بڕیوه تاوه‌کو بێم بۆ ئه‌م ســـه‌ردانه"، له ترســـی ئه‌وه‌ی جارێکی تر بگه‌ڕێمه‌وه بۆ عێراق به ده‌ستبه‌تاڵی. "ئه‌وه ڕێگایه‌کی دوور و درێژه بۆ گه‌شتکردن."

به‌ڕێوه‌به‌ری ته‌کنه‌لۆژیا وتی: تکایه داوای لێبوردنه‌کانم قبوڵ بکه‌ن بۆ ئه‌و هه‌ڵه‌یه‌ی که ڕوویدا.

هه‌ستم ده‌کرد هه‌روا به ساده‌یی ناتوانم جارێکی تر به ده‌ستی به‌تاڵ بگه‌ڕێمه‌وه. به‌ڵام پێده‌چوو هیچ ڕێگه‌یه‌کی تر نه‌بێت بۆ فشارخستنه سه‌ر که‌یسه‌که‌م. خێرا مێشکم گۆڕی بۆ شتێك که بتوانم داوای له‌م پیاوه بکه‌م به‌وه‌ی به شێوه‌یه‌کی ناڕه‌وا گومانه‌کانی زیاتر نه‌بێت و له‌هه‌ن کاتیشدا سوودی هه‌بێت.

- باشه بۆ ئه‌وه‌ی کاتم به ته‌واوی به‌فیڕۆ نه‌چێت، ئایا ده‌توانم لانیکه‌م چه‌ند پرسیارێکی ته‌کنیکیتان لێ بکه‌م؟

سه‌یری کاتژمێره‌که‌ی کرد و وتی: به‌ڵێ زۆر ئاساییه. به‌ڵام هێشتاش ناتوانم بانگهێشتت بکه‌م بۆ ژووره‌وه.

پرسیارم کرد ده‌رباره‌ی په‌ستان و چاره‌سه‌رکردنی کانزاکان بۆ موگناتیسه‌کان، و ئه‌و ڕێگایانه‌ی که بۆ ته‌نۆلکه‌کانی ناوه‌وه‌یان به‌کارده‌هێنرێن. هه‌رچه‌نده بابه‌ته‌کان تیۆری بوون، به‌ڵام ئه‌مانه پرسیاری زۆر تایبه‌تمه‌ند بوون، وه‌ڵامه‌کانیان ده‌ستیان خسته سه‌ر به‌کارهێنانی پۆلێنبه‌ندی. .

به‌ڕێوه‌به‌ری ته‌کنه‌لۆژیا ئێستیکی کرد و به‌مجۆره‌ش

پرسیاره‌كانم بۆ ساتێك بێ وه‌ڵام مانه‌وه. له شوێنی پێشوازییه‌كه‌دا سه‌یری هاوڕێ كارمه‌نده‌كانی ده‌كرد كه له ده‌رگای پێشه‌وه ده‌هاتن و ده‌چوون. ڕه‌نگه خۆی دڵنیا كردبێته‌وه كه له‌م ژینگه‌یه‌دا قسه‌كردن له‌گه‌ڵم سه‌لامه‌ته. پاشان ساتێك له ترس و دڵه‌ڕاوكێ ده‌ستی به‌سه‌رمدا گرت. ڕه‌نگه به‌هۆی پرسیاره‌كانمه‌وه ترسی لێ نیشتبێت و خه‌ریك بووبێت كه په‌یوه‌ندی به ئاسایشه‌وه بكات. یان ڕه‌نگه ڕاپۆرتێك له‌سه‌ر عێراقییه‌ك تۆمار بكات كه پرسیاری مه‌ترسیداری كردبوو. به ده‌وری هۆڵی پێشوازییه‌كه‌دا سه‌یری ڕێبواره‌كانم كرد كه وا دیار بوو هیچ سه‌رنجێكیان له‌سه‌ر ئێمه‌وه نه‌بوو، نیگه‌ران بووم له‌وه‌ی كه له سنوور ده‌رچووبم.

پاشان، یان له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هه‌ستی به تاوان ده‌كرد كه له كۆتا خوله‌كدا واده‌كه‌ی منی هه‌ڵوه‌شاندۆته‌وه یان به‌هۆی خۆشه‌ویستی سروشتی زانایه‌ك بۆ ڕوونكردنه‌وه‌ی شته‌كان، به شێوه‌یه‌كی گشتی ده‌ستی كرد به وه‌ڵامدانه‌وه. به تامه‌زرۆییه‌وه ده‌فته‌ر و قه‌ڵه‌مێكم له گیرفانی خۆم ده‌رهێنا و پێشكه‌شی ئه‌وم كرد بۆ ئه‌وه‌ی یارمه‌تیده‌ر بن له وێناكردنی خاڵه‌كانی. بۆ ساتێك دوودڵ بوو، به گومانه‌وه سه‌یری ده‌فته‌ره‌كه‌ی ده‌كرد، به‌ڵام دواتر وه‌ریگرت. ئه‌مجاره قه‌ڵه‌مه‌كه‌ی ڕه‌تكرده‌وه، پێی باش بوو قه‌ڵه‌مێك له گیرفانی كراسه‌كه‌ی خۆیه‌وه به‌كاربهێنێت. چه‌ند تێبینی و هێڵكارییه‌كی دارشت و منیش پرسیاری به‌دواداچوون و مه‌به‌ستدارم كرد سه‌باره‌ت به درێژیی كاتی فشاردان كه پێویسته بۆ دروستكردنی موگناتیسی، پله‌ی گه‌رمی، ته‌واوكردنی ڕووی موگناتیسی و پرسه ته‌كنیكییه‌كانی تر. بۆ ماوه‌یه‌كی كورت وا دیار بوو گیرۆده‌ی حه‌ماسه‌تی وه‌سفكردنی جه‌وهه‌ری كاره‌كه‌ی بوو، وه‌ك مامۆستایه‌كی قوتابخانه كه دڵخۆش بوو به دۆزینه‌وه‌ی

خوێندکارێکی گوێڕایەڵ بۆ وانەکانی. هەموو وشەیەکی ئەوم لەبەکرد. دوای نزیکەی بیست خولەك، ڕەنگە تێگەیشتبێت کە زۆر زیاتر لەوەی کە مەبەستی بووە پێی بەخشیووم، چونکە لەناکاو وتارەکەی ڕاگرت.

وتی: پێموایە ئەوەندە بەسە. ئەوەندە بەسە وایە؟

وتم: ئێوە زیاتر لە پێویست ڕوونتان کردووە، زۆر سوپاسی میهرەبانیتان دەکەم.

من ئەمەم گوت و بەپەلە ڕۆیشتم.

لەو بیست خولەکەدا بەتەواوی لە ئەلیفەوە هەتا یێ فێربووم کە چۆن لە بنەڕەتەوە ئەم موگناتیسییە ئاست بەرزانە چەمکسازی بکەم. تێگەیشتن لە تەکنەلۆژیای پشتیان ئەو متمانەیەی پێبەخشیم کە پێویست بوو بۆ دانوستان لەگەڵ بەرهەمهێنەران.

ئەمجارە چاوم خستە سەر کۆمپانیای ترێباچەری نەمسایی بۆ تەکنەلۆژیای ئاست بەرز کە یەکێکە لە کۆمپانیا دیارەکانی جیهان لە دروستکردنی موگناتیس.

بەیانییەکی ساردی پاییزی ساڵی ۱۹۸۸، بە ئۆتۆمبێلێك و لەگەشتێکی دوور لە ئەڵمانیاوە بەرەو ڤیەننا ڕۆیشتین. کاك عەلی کە ڕێگا نیشاندەرمان بوو بە ڕێگا سەهۆڵاوییەکاندا ڕۆیشت بۆ ناو بەرزاییەکانی ئەلب کە بەفر داپۆشیبوون و دیمەنگەلی هەناسەبڕکێی ئاسا بوون. لەگەڵ چوونە ناو نەمسا، بارانێکی بەخوڕ دەستی پێکرد و بەمجۆرەش بینیاییمان بۆ ڕێگاکە تا ئاستی سفر کەمیکردەوە. ئەوەبوو کاك عەلی ڕۆیشتنەکەی خاو کردەوە، بەڵام لەگەڵ دابەزینمان لە گردێکەوە، تایەکان لەسەر ڕێگا سەهۆڵاوی

و شه‌خته‌كه‌دا خلیسكان. ئۆتۆمبێله‌كه به لایه‌كدا ڕۆیشت و دواتر له ژێر كۆنترۆڵ ده‌رچوو. كاك عه‌لی بێهوده هه‌وڵیدا بارودۆخه‌كه ڕاست بكاته‌وه. سه‌یری داشبۆرده‌كه‌م كرد. دواتر له‌ناكاو هه‌ستم به لێدانێك كرد و به‌قوڵی چه‌ند پێیه‌ك خلیسكاین و كه‌وتینه ناو چاڵێكی بچووكی به‌فره‌وه. ده‌رگاكه‌م كرده‌وه و به ترسناكییه‌وه بینیم له‌به‌رزاییه‌كداین كه ته‌نیا چه‌ند پێیه‌ك مابوو بكه‌وینه نێو كه‌نده‌لانه‌وه. ته‌نیا ئه‌م چاڵه بچووكه‌ی به‌فر ڕێگری لێكردبووین له كه‌وتنمان. به‌مجۆره به‌رنامه‌ی سه‌نته‌رفیوجی عێراق نزیك بوو له كۆتایی هاتن.

كاتێك به سه‌لامه‌تی دابه‌زین بۆ ناو چۆڵه‌وانییه ته‌خته‌كانی ده‌وروبه‌ری ڤیه‌نا، ئاسمان بوویه‌وه به ساماڵ و هه‌وری تێدا نه‌ما، له‌وێ وه‌ستاین بۆ نانخواردنی نیوه‌ڕۆ، كه ژه‌مێكی نه‌مسایی بوو. له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ده‌بوو تا سبه‌ی به‌یانی بوه‌ستین بۆ كۆبوونه‌وه‌كه‌مان له‌گه‌ڵ كۆمپانیای ترێیباچه‌ر، بۆیه له‌گه‌ڵ ئه‌ندازیارێكی كۆمپانیای H&H Metalform واده‌یه‌كمان دانابوو. پاشنیوه‌ڕۆكه‌مان به ئۆتۆمبێل له ده‌وروبه‌ری ڤیه‌نا به‌سه‌ر برد، سه‌رسام بووین به سه‌وزایی و شاخه به‌رزه‌كانی ئه‌وێ. ئه‌ندازیاره ئه‌ڵمانییه‌كه، ماڵی پێشووی لودویگ ڤان بیتهۆڤن و چه‌ندین قه‌ڵای پیشان داین كه چه‌م و باخچه‌ی نایابیان تێدابوو. كاتێك یه‌كێك له‌م شوێنه‌وارانه‌مان جێده‌هێشت، ئه‌و ڕووی له من كرد و به‌جۆرێك له دڵته‌نگییه‌وه ئه‌وه‌ی ڕوونكرده‌وه كه بیانییه‌كان تێنه‌گه‌یشتنیان هه‌یه بۆ ئه‌و واقیعه‌ی كه ئێمه له عێراقدا له ژێریدا ده‌ژین.

هه‌روه‌ها وتی: هه‌موو ئه‌م كۆشكه ڕاقیانه‌ی كه سه‌ددام له وڵاته‌كه‌تدا دروستی ده‌كاتن وه‌ك ئه‌و قه‌ڵایانه وان. "وایه؟"

بە ئەدەبەوە سەرم دانەواند. بەڵام كۆمێنتەكەی هەورێكی تاریكی بەسەر ئەو نیوەڕۆیە خۆشەدا هێنا. چوون من هەرگیز نەمدەوێرا باسی قەڵاكانی سەددام بكەم لەبەردەم خەڵكدا، تەنانەت لە وڵاتێكی بیانیشدا. لەعێراقدا دەشێت لە چنگی هێزە ئەمنییەكاندا بۆ هەتا هەتا ببیت بە هەڵم و ون بیت تەنها لەسەر ئەوەی بەدەنگی بەرز قسەیەكی لەو شێوەیەت وتووە. سەددام و كۆشكەكانی و ژیانی تایبەتی ئەو، بابەتی قەدەغەكراو بوون. ئەم كۆشكانە شوێنێكی ترسناك بوون، تەنها باسكردنیان هاوڵاتیانی ئاسایی دەخستە لێواری مردنەوە. ڕەنگە قەڵاكانی نەمسا لە ڕابردوویەكی دووردا شاهیدی دڕندەیی بووبن، بەڵام بە پێچەوانەی كۆشكەكانی سەددام، ئەم قەڵایانەی نەمسا ئێستا وەك شوێنی گەشتیاری كراوە وا بوون لەبەردەم خەڵك دا.

بەیانی بە ئۆتۆمبێل ڕۆیشتینە بارەگای كۆمپانیای ترێیباچەر كە لە دۆڵی ئەلب لە شارۆچكەی ڤیلاچ لە باشووری نەمسا هەڵكەوتووە. چووینە ژوورێكی چاوەڕوانی كە ڕێك و پێك بوو و هەروەها پەنجەرەیەكی تێدابوو وەك دەیڕوانی بەسەر خودی كارگەكە. ئاسانكارییەكان بێگەرد بوون، وەك ئەوەی مرۆڤ بتوانێت ژەمێك لە بەردەم بریسكە و بریقەی ئامێرەكانەوە بخوات. بەڕێوەبەری ترێیباچەر بە ئینگلیزییەكی بێ خەوش خۆی پێمان ناساند و بانگهێشتی ئۆفیسەكەی كردین. دوای ئەوەی قسەی خۆشمان ئاڵوگۆڕ كرد، پرسیاری لە سروشتی كارەكەمان كرد. منیش خۆم پڕكردبوو بەو زانیاریانەی لە ئەڵمانیا بەدەستم هێنابوو، پێم گوت هیوادارین موگناتیسی ئاڵۆز بكڕین. هەروەها باسی تایبەتمەندییەكانی ئەو موگناتیسیەم كرد كە دەمانویست بۆ

سەنتەرفیوجەكەمان بەكاری بهێنین، بەڵام بە جیاوازییەكی گرنگ لە ڕووی كاراییەكەیەوە.

ئەو پرسی: "بەنیازیت ئەم موگناتیسیە بۆ چ كارپێكردنێك بەكاربهێنیت؟".

گوتم: "ئێمە تاقیكردنەوە لەسەر پەمپە هەرە پێشكەوتووەكان دەكەین بۆ پیشەسازی نەوت، و دەمانەوێت ڕێگەیەكی باشتر بۆ دروستكردنی مۆرێكی موگناتیسی بدۆزینەوە."

ئەو، بۆ چەند خولەكێك ئێمەی بە تەنیا جێهێشت و وەك ئەوە وابوو كە بۆ هەتا هەتا ڕۆیشتووە، پاشان كە هاتەوە، بە ڕووخساری پڕ گومانەوە سەیری كردم، دواتر داوای لێبوردنی لێكردین. ئەوەبوو من ترس دایگرتم لەوەی كە ڕەنگە پێشتر ئامانجی ڕاستەقینەی سەردانەكەمانی پێشبینی كردووە و دەسەڵاتداران لەوە ئاگادار بكاتەوە. لەدڵی خۆمدا وتم ڕەنگە پەیوەندی بە دەزگای هەواڵگری نەمسا یان ئینتەرپۆل بكات. هەوڵمدا بە بیركردنەوەی عەقڵانی خۆم ئارام بكەمەوە. هۆكارێكی جێی متمانەمان بۆ سەردانەكەمان خستەڕوو و ئەم كەسانەش لە بازرگانی فرۆشتنی موگناتیسیدا بوون. بەڵام نەمتوانی ئەو ترسە هەڵبشێوێنم كە لەگەڵ دانوستانێكی وەها گرەوداردا دێت.

ئەوەبوو دواجار دوای چەند خولەكێك بە هێلكارییەكەوە كە تایبەتمەندییەكانی موگناتیسی ئاڵۆز نیشان دەدات گەڕایەوە.

پرسی: ئایا ئەوە، ئەمەیە كە تۆ بەدوایدا دەگەڕێیت؟.

دڵم بازێكی دا. چوون ئەو هێلكارییە تایبەتمەندییە وردەكانی موگناتیسی سەنتەرفیوجی نیشان دەدا. من ویستم هێلكارییەكە

وەربگرم و زیاتر لێی بکۆڵمەوە. بەڵام ئەوە نەبوو کە من داوایم کردبوو. من ئاماژەم بە تایبەتمەندییە گونجاوەکان کردبوو بۆ پەمپەکانی پیشەسازی نەوت. هەرچەندە خودی موگناتیسیەکە وەك یەك بوو، بەڵام هێلکارییەکە ئاستێکی کارایی زۆر لە دەرەوەی پێداویستییە ئاماژەپێکراوەکانمان نیشان دا. وەك ئەوە وابوو داوای کڕینی ئۆتۆمبێلێکی وەرزشیم کردبێت کە بتوانێت خێراییەکەی بگاتە دوو سەد میل لە کاتژمێرێکدا، بەڵام من ڕامگەیاندووە کە ئەم ئۆتۆمبێلە تەنها لە شەقامەکانی شاردا بەکاری دەهێنم و پابەندی سنووری یاسایی خێراییەکان دەبم. ئەو هێلکارییەکی پیشان دەدام کە ئۆتۆمبێلەکە چۆن لە یاریگای پێشبڕکێدا بە تەواو کاردەکات. هەستم کرد کە ئەمە تەڵەیەکە، بۆیە وام نیشان دا کە نازانم.

گوتم: "دەترسم ئەوە نەبێت، من بەم دیزاینە ئاشنا نیم."

پێدەچوو بەڕێوەبەری ترێبباچەر بەم وەڵامە دڵخۆش بووبێت کاتێك هێلکارییەکەی کۆکردەوە. دوو یاریدەدەرەکەی بانگ کرد بۆ ناو ئۆفیسەکە و ڕێنمایی کردن کە دەوروبەری شوێنەکەمان پیشانمان بدەن و پێداویستییەکانمان جێبەجێ بکەن. ئێمە بەمجۆرە پاروومان کەوتبووە نێو ڕوونەوە. دوای گەشتێکی سەرنجڕاکێش لە دامەزراوەی ترێباچەر و دانوستانێکی درێژخایەن، یەکلایی بووینەوە لەسەر گرێبەستێك بۆ دابینکردنی هەزاران موگناتیسی بۆ پیشەسازی نەوتی عێراق.

ئەوەی کە نەمساییەکان ئامادە بوون ئەم موگناتیسیانەمان پێ بفرۆشن، سەختی هێشتنەوەی ئەو تەکنەلۆژیایەی کە کۆمەڵێك بەکارهێنانی هەیە لە دەستی ئەو کەسانە دەردەخات کە ڕەنگە لە بەرنامەیەکی چەکی نهێنیدا بەکاریبهێنن. هەروەها باس لە سروشتی

ئاڵۆزی په‌یوه‌ندییه‌كانی عێراق له‌گه‌ڵ ڕۆژئاوا ده‌كات له‌ كۆتایی هه‌شتاكانی سه‌ده‌ی ڕابردوودا. زۆرێك له‌ وڵاتان به‌ نهێنی هاوكاری سه‌ددامیان كردبوو له‌ شه‌ڕی هه‌شت ساڵه‌ی دژ به‌ ئێران و هێشتا وه‌ك هه‌ڕه‌شه‌یه‌ك بۆ سه‌ر ئاسایشی ڕۆژئاوا هه‌ستی پێنه‌ده‌كرا. له‌ لایه‌كی دیكه‌وه‌ هیچ وڵاتێك نه‌یده‌توانی به‌ ئاشكرا پشتیوانی له‌ به‌رنامه‌یه‌كی چه‌كی ئه‌تۆمی عێراق بكات.

په‌یوه‌ندییه‌كانمان له‌گه‌ڵ كۆمپانیا بیانییه‌كان هه‌میشه‌ جۆرێك له‌ مه‌ترسییان هه‌بوو. هه‌رگیز نه‌مانده‌توانی بزانین ده‌زگا هه‌واڵگرییه‌ بیانییه‌كان چه‌نده‌ له‌ نزیكه‌وه‌ چاودێری هه‌نارده‌كردن ده‌كه‌ن، به‌ڵام لانیكه‌م هه‌ندێك له‌ ئه‌ندامانی حكومه‌ته‌كانی ڕۆژئاوا پێده‌چوو خۆیان بووردبێت له‌ كۆمه‌ڵێك له‌ كاره‌كانمان. ئه‌گه‌ر ئه‌ورووپییه‌كان و ئه‌مریكییه‌كان وریاتر بوونایه‌، زه‌حمه‌ت بوو بیخه‌ینه‌ به‌رچاومان كه‌ به‌رنامه‌كه‌مان به‌و خێراییه‌ به‌ره‌و پێش ده‌چوو.

یه‌كێك له‌ فیزیازانه‌ لێهاتووه‌كانمان كه‌ ناوی دكتۆر ویداد حاته‌م بوو، ناردم بۆ كۆمپانیایه‌ك له‌ به‌ریتانیا، له‌وێ فێری توانای كاركردنمان به‌ موگناتیسه‌كانی كۆمپانیای ترێیباچه‌ر بوو. له‌وانه‌یه‌ ئه‌و زانایه‌ به‌ریتانیانه‌ی كه‌ له‌گه‌ڵیدا كاریان كردووه‌، به‌ ئاسانی سروشتی ڕاسته‌قینه‌ی لێكۆڵینه‌وه‌كانی پێشبینی كردبێت. چونكه‌ جارێكیان یه‌كێكیان -دواتر پێی وتم- ته‌نانه‌ت ئاگاداری كردووه‌ته‌وه‌ كه‌ موگناتیسه‌كه‌ نه‌خاته‌ نێو جانتای ده‌ستی له‌ گه‌شتی گه‌ڕانه‌وه‌ی بۆ به‌غدا، چونكه‌ له‌وانه‌یه‌ گومان له‌ نێو ئاسایشی فڕۆكه‌خانه‌كه‌دا دروست بكات. به‌ڵام بێتوانایی ئاسایشی فڕۆكه‌خانه‌كان له‌ پشكنینی سه‌رجه‌م كه‌لوپه‌له‌كانی هه‌ر سه‌رنشینێك ڕێگه‌ی دا كه‌ره‌سته‌ی بچووك به‌ڵام مه‌ترسیدار له‌

نێوان ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئەوروپادا بە قاچاخ بگوازرێتەوە. یەكێك لە ئەندامانی ستافەكەم توانی نمونەیەكی هێكسافلۆرایدی یۆرانیۆم لە بەغداوە لە ڕێگەی فڕۆكەخانەی هیسرۆوە بهێنێتە زانكۆی دوندی لە سكۆتلەندا، لەوێ چەندین زانای نیشتەجێی عێراقی یارمەتیان دا بۆ تاقیكردنەوەی ماددەكە. بە دزییەوە لە ڕێگەی گومرگەوە بە بەستنەوەی لە ژێر قایشی پانتۆڵەكەیدا. بەڕاسی سەبارەت بەوەی كە هاوكارەكەم توانیویەتی ماددەیەكی تیشكدەر لە گەشتێكی نێودەوڵەتیدا بهێنێت، زۆر ترسناك بوو.

ئەوەندەی سەركەوتنەكانی وادەكانمان بەندبوو بە ئاسایشی لاواز و چیرۆكە داڕێژراوەكانمان، هێندەش ئەگەر تۆڕی كۆمپانیاكانی بەرەی عێراقی و پەیوەندییە بازرگانییە نێودەوڵەتییەكان نەبوایە، ئەوا پێشكەوتنێكی كەممان بەدەست دەهێنا. كۆمپانیایەكی ئامێر لە شاری كۆڤێنتری بە ناوی ماتریكس چەرچڵ چەندین پێكهاتەی بۆ پرۆگرامی سەنتەرفیوجەكەمان دروستكرد. كۆمپانیایەكە پێشتر خاوەنی ئەزموون بوو و خاوەندارێتیەكەی بەریتانی بوو، دكتۆرە سەفا ئەلحەبۆبی سەرپەرشتی ئەم كڕینانەی كۆمپانیای ماتریكس چەرچڵی دەكرد و ئەمەش تەواو لە كاتی خۆیدا بوو. هەربۆیە لە ساڵی ١٩٨٧ دوای كڕینی زۆرینەی پشكەكانی، وەك سەرۆكی دەستەی كارگێڕییەكەی دەستنیشانكرا. هەمان بارودۆخیش بۆ كۆمپانیای H&H Metalform ڕاست بوو، هەربۆیە بۆ كۆمپانیای ماتریكس چەرچڵ مەحاڵ بوو كە بازرگانی لەگەڵ عێراق دا ڕەت بكاتەوە. عێراق بانگەشەی ئەوەی كرد كە ئەو كەلوپەلانەی ماتریكس چەرچڵ بەرهەمی هێناوە بۆ بەكارهێنانی مەدەنیانە بەكاردەهێنێت و حكومەتی بەریتانیاش ڕەزامەندی لەسەر هەناردەكردنیان داوە.

ئاڵۆزی پەیوەندییەكانی عێراق لەگەڵ ڕۆژئاوا دەكات لە كۆتایی هەشتاكانی سەدەی ڕابردوودا. زۆرێك لە وڵاتان بە نهێنی هاوكاری سەددامیان كردبوو لە شەڕی هەشت ساڵەی دژ بە ئێران و هێشتا وەك هەڕەشەیەك بۆ سەر ئاسایشی ڕۆژئاوا هەستی پێنەدەكرا. لە لایەكی دیكەوە هیچ وڵاتێك نەیدەتوانی بە ئاشكرا پشتیوانی لە بەرنامەیەكی چەكی ئەتۆمی عێراق بكات.

پەیوەندییەكانمان لەگەڵ كۆمپانیا بیانییەكان هەمیشە جۆرێك لە مەترسیان هەبوو. هەرگیز نەماندەتوانی بزانین دەزگا هەواڵگرییە بیانییەكان چەندە لە نزیكەوە چاودێری هەناردەكردن دەكەن، بەڵام لانیكەم هەندێك لە ئەندامانی حكومەتەكانی ڕۆژئاوا پێدەچوو خۆیان بووردبێت لە كۆمەڵێك لە كارەكانمان. ئەگەر ئەوروپییەكان و ئەمریكییەكان وریاتر بوونایە، زەحمەت بوو بیخەینە بەرچاومان كە بەرنامەكەمان بەو خێراییە بەرەو پێش دەچوو.

یەكێك لە فیزیازانە لێهاتووەكانمان كە ناوی دكتۆر ویداد حاتەم بوو، ناردم بۆ كۆمپانیایەك لە بەریتانیا، لەوێ فێری توانای كاركردنمان بە موگناتیسەكانی كۆمپانیای ترێبباچەر بوو. لەوانەیە ئەو زانایە بەریتانیانەی كە لەگەڵیدا كاریان كردووە، بە ئاسانی سروشتی ڕاستەقینەی لێكۆڵینەوەكانی پێشبینی كردبێت. چونكە جارێكیان یەكێكیان -دواتر پێی وتم- تەنانەت ئاگاداری كردووەتەوە كە موگناتیسەكە نەخاتە نێو جانتای دەستی لە گەشتی گەڕانەوەی بۆ بەغدا، چونكە لەوانەیە گومان لە نێو ئاسایشی فڕۆكەخانەكەدا دروست بكات. بەڵام بێتوانایی ئاسایشی فڕۆكەخانەكان لە پشكنینی سەرجەم كەلوپەلەكانی هەر سەرنشینێك ڕێگەی دا كەرەستەی بچووك بەڵام مەترسیدار لە

نێوان ڕۆژهه‌ڵاتی ناوه‌ڕاست و ئه‌وروپادا به‌ قاچاخ بگوازرێته‌وه‌. یه‌كێك له‌ ئه‌ندامانی ستافه‌كه‌م توانی نمونه‌یه‌كی هێكسافلۆرایدی یۆرانیۆم له‌ به‌غداوه‌ له‌ ڕێگه‌ی فرۆكه‌خانه‌ی هیسرۆوه‌ بهێنێته‌ زانكۆی دوندی له‌ سكۆتله‌ندا، له‌وێ چه‌ندین زانای نیشته‌جێی عێراقی یارمه‌تیان دا بۆ تاقیكردنه‌وه‌ی مادده‌كه‌. به‌ دزییه‌وه‌ له‌ ڕێگه‌ی گومرگه‌وه‌ به‌ به‌ستنه‌وه‌ی له‌ ژێر قایشی پانتۆڵه‌كه‌یدا. به‌ڕاسی سه‌باره‌ت به‌وه‌ی كه‌ هاوكاره‌كه‌م توانیویه‌تی مادده‌یه‌كی تیشكده‌ر له‌ گه‌شتێكی نێوده‌وڵه‌تیدا بهێنێت، زۆر ترسناك بوو.

ئه‌وه‌نده‌ی سه‌ركه‌وتنه‌كانی واده‌كانمان به‌ندبوو به‌ ئاسایشی لاواز و چیرۆكه‌ داریژراوه‌كانمان، هێنده‌ش ئه‌گه‌ر تۆڕی كۆمپانیاكانی به‌ره‌ی عێراقی و په‌یوه‌ندییه‌ بازرگانییه‌ نێوده‌وڵه‌تییه‌كان نه‌بوایه‌، ئه‌وا پێشكه‌وتنێكی كه‌ممان به‌ده‌ست ده‌هێنا. كۆمپانیایه‌كی ئامێر له‌ شاری كۆڤێنتری به‌ ناوی ماتریكس چه‌رچڵ چه‌ندین پێكهاته‌ی بۆ پرۆگرامی سه‌نته‌رفیوجه‌كه‌مان دروستكرد. كۆمپانیایه‌كه‌ پێشتر خاوه‌نی ئه‌زموون بوو و خاوه‌ندارێتیه‌كه‌ی به‌ریتانی بوو، دكتۆره‌ سه‌فا ئه‌لحه‌بۆبی سه‌رپه‌رشتی ئه‌م كڕینانه‌ی كۆمپانیای ماتریكس چه‌رچڵی ده‌كرد و ئه‌مه‌ش ته‌واو له‌ كاتی خۆیدا بوو. هه‌ربۆیه‌ له‌ ساڵی ١٩٨٧ دوای كڕینی زۆرینه‌ی پشكه‌كانی، وه‌ك سه‌رۆكی ده‌سته‌ی كارگێڕییه‌كه‌ی ده‌ستنیشانكرا. هه‌مان بارودۆخیش بۆ كۆمپانیای H&H Metalform ڕاست بوو، هه‌ربۆیه‌ بۆ كۆمپانیای ماتریكس چه‌رچڵ مه‌حاڵ بوو كه‌ بازرگانی له‌گه‌ڵ عێراق دا ڕه‌ت بكاته‌وه‌. عێراق بانگه‌شه‌ی ئه‌وه‌ی كرد كه‌ ئه‌و كه‌لوپه‌لانه‌ی ماتریكس چه‌رچڵ به‌رهه‌می هێناوه‌ بۆ به‌كارهێنانی مه‌ده‌نیانه‌ به‌كارده‌هێنێت و حكومه‌تی به‌ریتانیاش ڕه‌زامه‌ندی له‌سه‌ر هه‌نارده‌كردنیان داوه‌.

بەڵام لە ماوەی ساڵانی نەوەدەكاندا، فەزیحەیەك سەریهەڵدا كاتێك بەڵگەكان دەریانخست كە هەواڵگری بەریتانیا لەبارەی بەكارهێنانی كۆتایی ڕاستەقینەی زۆرێك لە پێكهاتەكانی زانیوە، و حكومەت بە بێدەنگی ڕەزامەندی دەربڕیوە لەسەر هەناردەكردن بۆ پڕچەككردنی سەددام پێش جەنگی كەنداو لە ساڵی ۱۹۹۱.

بەڵام هەرچۆنێك بێت، كلیلی ڕاستەقینە ئەڵمانییەكان بوون كە پەیوەندییان بە كۆمپانیای H&H Metalform ەوە هەبوو، كە تا ئەوكات پشكی شێریان لە كۆمیسیۆنەكانی عێراق وەرگرتبوو. دیتریش هینزە دەیان هۆكاری بۆ كۆمپانیاكانی تەكنەلۆژیای بەرز دابین كرد كە هاوكاریان كردین ئەمەش بەهۆی پەیوەندی درێژخایەنیان لەگەڵیدا و ئەو پارە زۆرەی كە دەمانتوانی دابینی بكەین بۆیان. والتەر بوسێ، پسپۆڕی ئامێری پارچەی سەنتەرفیوج، زۆرێك لە خاڵە وردەكانی كاركردن لەگەڵ پۆڵای فێركردین، هەردووكیان گەشتی چەندجارەیان بۆ عێراق كرد بۆ ئەوەی یارمەتیدەر بن لە ڕێتماییكردنی بەرنامەكەمان. بە بەكارهێنانی نەخشەی كۆكردنەوە كە لەلایەن ستێملێرەوە دابینكرابوو، ئێمە دیزاینی بنكەی خولاوەمان كرد كە سەنتەرفیوجەكە لەسەری دادەنیشت. چەندین كۆمپانیای سویسریمان دۆزیەوە كە تایبەتمەند بوون لەو دیزاینانەی كە لە دریلەكانی ددان و لەخولانەوەی زۆر بەرزدا بەكاردەهێنرێن، كە دەتوانرێت بۆ خولانەوەی سەنتەرفیوج بگونجێن.

لە بنی ڕۆتۆری سەنتەرفیوجەكەدا، بنكە لەناو حەوزێكی ڕۆنی تایبەتدا و لەناو كوپێكی تایبەتمەندا دەسوڕێتەوە. بۆ كەمكردنەوەی خۆلێدان –پیاكێشان- بۆ ئاستی نزیكەی سفر، تۆپەكە دەبێت بە بنكەیەك بچەسپێنرێت كە چینێكی تەنكی ڕۆن

له نێوان بنكه‌كه و ڕووی كوپه‌كه‌دا بپارێزێت. دیزاین و ته‌كنیكه ئاڵۆزه‌كانی چه‌سپاندنی ئه‌م بنكانه نهێنییه‌كی زۆر پۆلێنكراون. به‌ڵام دوای ئه‌وه‌ی ئێمه هاندانێكی دارایی باشمان پێشكه‌ش كرد، ستێملێر وێنه‌یه‌كی وردبینی نه‌خشه‌كه‌ی پێشكه‌ش كردین و ئێمه‌ش به‌م هۆیه‌وه ئه‌م به‌ربه‌سته‌مان تێپه‌ڕاند.

كاتێك پێویستمان به كڕینی ئامێر و پارچه‌ی وردبینی به‌رز بوو، ئه‌ڵمانییه‌كان بۆ كۆمپانیایه‌كی سویسری به‌ناوی شاوبلین Schaublin S.A. ئاڕاسته‌یان كردم كه هه‌ندێك له وردترین ئامێره‌كانی جیهانی دروست ده‌كرد. له ساڵی ١٩٨٨ من و دكتۆر فه‌رید له ئۆفیسی سه‌ره‌كی كۆمپانیاكه له شارۆچكه بچووكه‌كه‌ی بێڤیلارد سه‌ردانی ئۆلریچ سپایس، به‌ڕێوه‌به‌ری فرۆشتنی شاوبلینمان كرد. سپایس پیاوێكی لاوازه‌ی میزاجی بوو، چه‌ندین كاتژمێرمان به‌سه‌ر ده‌برد له گفتوگۆكردن له‌سه‌ر كڕینی ئامێری خولان و سوڕانه‌وه. هه‌رچه‌نده ئه‌م ئامێرانه چه‌ندین به‌كارهێنانیان هه‌یه، له‌وانه دروستكردنی كاپی ڕۆتۆر و به‌شه‌كانی تری سه‌نته‌رفیوج، به‌ڵام دواجار ڕه‌زامه‌ندی ده‌ربڕی له‌سه‌ر دابینكردنی پانزه ئامێر به‌بێ ئه‌وه‌ی پرسیار له به‌كارهێنانی مه‌به‌ستمان بۆیان بكات. به‌ڵام كاتێك باسی نرخێكی كرد، پێم وت ئه‌م نرخه پێده‌چێت به شێوه‌یه‌كی خه‌یاڵی به‌رز بێت و پێشنیاری كه‌مكردنه‌وه‌ی لانیكه‌م ١٠٪م له‌سه‌دا كرد. من و دكتۆر فه‌رید له‌به‌رده‌م مێزه‌كه‌ی دانیشتبووین، له‌گه‌ڵیدا دانوستانمان ده‌كرد و ده‌گه‌ڕاینه‌وه تا جه‌نابی سپایس ئارامی لێ هه‌ڵسا و له‌ناكاو تووڕه بوو.

وتی: ئه‌مه مه‌حاڵه. وا دیاره ئێوه جگه له بازرگانێكی ئاسایی چیتر نین!

هەستم کرد دکتۆر فەرید لەوجۆرە ڕەگەزپەرستییە زۆر توڕەیە. وا دیار بوو جەنابی سپایس ئێمەی وەك كۆڵبەرێکی وڵاتێکی ناپێشکەوتوو کە بە جۆرێك لە جۆرەکان لە ژێر ئاستی ئەودا بووین، سەیر دەکرد. ڕەنگە بە هەمان شێوە ئێمەی بە مەڕدار و وشتر ناوەزەند کردبێت. لەلایەکی تر ڕوومەتەکانی خۆمیش لە تووڕەییەوە سوور ببوون.

وتم: "بەرێز. سپایس، دیارە ئەمە کات و شوێنێك نییە بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتن. بۆچی لە بەغدا سەردانمان ناکەن و زیاتر باسی شتەکان دەکەین؟"

وتی: "ببورە، بەڵام ناتوانم، من کاتم نییە."

ئەوەبوو تەوقەمان کرد، من و دکتۆر فەرید گەڕاینەوە بەغدا. من بۆ ماوەیەکی کاتی ئەم غروورەم قووت دا، چونکە هەستەکان لە سەر مێزی دانوستان جێگەیان نابێتەوە. دەمزانی کە شاوبلین دەتوانێت هاوبەشێکی بەنرخ بێت، بڕیارمدا لە ئاستێکی تردا دانوستان لەگەڵ سپایس بکەم و هەوڵبدەم پەیوەندییەکی بەرهەمدارتر پەرەپێبدەم، لەجیاتی ئەوەی ئەو نرخە بدەم کە پێشتر ئەو پێشنیاری کردبوو. بڕیارمدا بە نیشاندانی جوانی و نهێنی ئەو خاکەی کە ئەو سووکایەتی پێکردبوو، باشتر سەرنجی سپایس بەدەست بهێنم. بڕیارمدا جۆرێك لە گەشت و پشووی پێشکەش بکەم کە تاهەتا هەتای ژیانی بیری نەچێتەوە، بەمەش لە پرۆسەکەدا بە تەواوی ئەو شتانە بەدەست دەهێنم کە پێویستمان بوو بۆ بەرنامەی سەنتەرفیوج.

ئەمە حەقیقەت بوو کە تەکنەلۆژیای سویسری سالانێك لە پێش عێراق دا بوو کە دەکرا بە سالانی ڕووناکی ناوزەند بکرێت، ئەمە

تەنانەت سەددامیش دەیتوانی دان بەوەدا بنێت. ئەم نایەكسانییە ئێمەی گەیاندبووە ئەورووپا بۆ ئەوەی لە پلەی یەكەمدا بازاڕ بكەین بۆ كڕینی پارچە و هەروەها شارەزایی. بەڵام كەس حەز ناكات بە كەمتەرخەم ناوزەد بكرێت و كۆمێنتەكەی جەنابی سپایس شانازی منی وروژاند. وڵاتەكەم پڕ بوو لە كەسانێك كە خاوەنی عەقڵی خوێندەوار و شارەزاو لێهاتوو بوون، كە سەرەڕای ستەمكاری سەددام توانیان هەستی یەكپارچەیی وڵات بپارێزن. ئەوە بەڵگەیە لەسەر ڕۆحی گەلی عێراق كە چینێكی خوێندەوارەو بەرگەی دیكتاتۆریەتی دڕندەیان گرتووە.

دوای چەند ڕۆژێك، دوای ئەوەی تورەییەكان ساردبوونەوە، تەلەفۆنم بۆ جەنابی سپایس كرد پێم ڕاگەیاند كە هەموو خەرجییەكانی بۆ سەرف دەكەین بۆ گەشتێكی پلە یەك بۆ عێراق. لەگەڵ ئاسۆی پەیوەندییەكی بازرگانی بەردەوام، بەمجۆرە ئەم دەم چەوركردنە سەلماندی كە زۆر لەوە گرنگترە لەوەی بتوانێت ڕەتی بكاتەوە.

دواجار جەنابی سپایسم لە فڕۆكەخانەی نێودەوڵەتی سەددام هەڵگرت و سەرنجم دەدا كە چۆن چاوە سویسرییەكانیی ئەو هۆڵە فراوان و بێ پەڵە و پاك و خاوێنی گەیشتنیان بینی كە دیوارەكانی بە دیزاین و بەردی ڕەونەق داپۆشرابوو. زۆر جیاواز لە فڕۆكەخانەی زیوریخ، فڕۆكەخانەی سەددام ئینتەرناشناڵ ئەو جۆرە شوێنە نەبوو كە لەلایەن "بازرگانێكی ئاساییەوە"ەوە دروست بكرێت. بە لیمۆزینێكی مێرسیدس لە فڕۆكەخانەوە بردمانە دەرەوە، بە درێژایی ڕێگایەكی نەرم كە بە دارخورما و درەختی كالیپتۆس دەوردرابوو. من ئاماژەم بە دیمەنەكان دەكرد و شوێنەكانم دەناساند كاتێك ڕێگای خێرای قادیسیەمان بەرەو ناوەڕاستی بەغدا

به‌جێده‌هێشت، به‌ وردی سه‌یری سپایسم ده‌كرد تا بزانم چی سه‌رسامی كردووه‌ و چی برۆكانی به‌رز كردووه‌ته‌وه‌. پێده‌چوو سه‌ری سوڕمابێت له‌وه‌ی كه‌ به‌غدا چه‌نده‌ مۆدێرن بووه‌. منیش ڕێگایه‌كم هه‌ڵبژاردبوو كه‌ ئه‌م لایه‌نه‌ی وڵاته‌كه‌مان به‌ باشترین شێوه‌ نیشان بدات. .

ڕێگای خێرای قادیسیه‌ به‌ چه‌ند پاركێكی سه‌وز له‌ لای چه‌پ و ڕووباری دیجله‌ له‌ لای ڕاستمانه‌وه‌ ده‌وردرابوو، هه‌روه‌ها به‌ناو گۆڕه‌پانی فێستیڤاڵ و نمایش و قوبه‌ی نوێ و مۆدێرنیستییه‌كه‌ی مۆنۆمێنتی "سه‌ربازی ون"دا تێپه‌ڕین، تا هۆتێلی ئه‌لڕه‌شید، كه‌ له‌وێشدا به‌خێرهاتنی تایبه‌تمان بۆ ڕێكخستبوو.

بۆ سبه‌ی به‌یانییه‌كه‌ی من و دكتۆر عادل و دكتۆر فه‌رید له‌گه‌ڵ جه‌نابی سپایس كۆبووینه‌وه‌ بۆ گفتوگۆیه‌كی گشتی له‌سه‌ر ته‌كنه‌لۆژیا. ئه‌وه‌بوو من ئه‌و ئاماژه‌یه‌م لابرد كه‌ مه‌به‌ستی ئه‌و ئامێرانه‌ی پێشتر باسمان كردبوو ته‌نیا نوكی شاخی سه‌هۆڵینی گرێبه‌سته‌ ئه‌گه‌رییه‌كانن. پێده‌چوو قسه‌كان وه‌ربگرێت و گوێڕایه‌ڵ بوو، ته‌نانه‌ت تامه‌زرۆی گوێگرتن له‌ زیاتریش بوو، به‌ڵام من ئه‌م دیالۆگه‌م كورتكرده‌وه‌.

گوتم: "جه‌نابی سپایس، با به‌ كاروباری زۆره‌وه‌ پشووه‌كه‌ت تێك نه‌ده‌ین، بۆیه‌ وه‌ك شتێك گه‌شتێكی تایبه‌تم بۆ شوێنه‌واره‌كانی بابل بۆ رێكخستووی."

دوای نانخواردنی نیوه‌ڕۆ جه‌نابی سپایسم برده‌ بابل، نزیكه‌ی په‌نجا میل له‌ باشووری به‌غداوه‌ له‌ نزیك كه‌ناری ڕووباری فورات. ئه‌و شوێنه‌م نیشان دا كه‌ له‌ سه‌ده‌ی شه‌شه‌می پێش زایین. پاشای بابل نه‌بوخودنه‌سری دووه‌م، باخچه‌ی هه‌ڵواسراوی بۆ

هاوسەرەكەی دروستكرد، كە یەكێكە لە حەوت سەرسوڕهێنەرەكانی جیهان و زەقوورەی ئوور كە تاوەری ئەفسانەیی بابل بوو. وا دیار بوو بەتەواوی سەرنجی جەنابی سپایسم ڕاكێشا كاتێك باسی تەلارسازێكی بابلی بەناوی گودیای لاگاشم بۆ كرد، كە پلانی پەرستگاكانی نزیكەی پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەر لە بەرددا هەڵكەندراوە، ئەمە سەرەتاییترین گرافیكی ئەندازیارییە لە جیهاندا.

كاتێك لەناو وێرانەكاندا دەڕۆیشتین، وتی: "دەمزانی زانستی جەبر لێرە داهێنراوە".

گوتم: "ئەمە ئەو هاوكێشە چوارگۆشەیەیە كە پەرەیان پێداوە و تا ئێستاش لە كتێبی خوێندنی هەموو منداڵێكدا لە سەرانسەری جیهاندا بەكاردەهێنرێت". "ئایا دەزانی كە بابلییەكان چەمكی 'سفر'یشیان داهێناوە؟"

جەنابی سپایس وای نیشاندا كە كاتی خۆی گوێبیستی ئەوە بووە. من باسی پەرستگایەكی بابلیم كرد لە شاری كۆنی نیپور كە زیاتر لە چوار هەزار ساڵ لەمەوبەر پڕ بوو لە خشتەی گڵین، بەمەش ئەمە یەكەم كتێبخانەی ناسراوی ئەوكات بوو. پێم گوت، بابلییەكان یەكەم نەخشەی مرۆڤیان لەسەر خشتەی گڵین داڕشتووە، لەنێویاندا سەرەتاییترین نەخشەی جیهان كە ئاوەكانی دەوروبەری بازنەی زەوی نیشان دەدات و بابل لە ناوەندەكەیدایە. پێدەچوو جەنابی سپایس بەڕاستی بەتەواوی بە گەشتە مەیدانییەكەمانەوە سەرسام بووبێت و لە كاتی گەڕانەوەمان بۆ بەغدا گفتوگۆیەكی باشمان كرد سەبارەت بە مێژووی جیهان و ئەو زانا و بیرمەندە گەورانەی كە لەخزمەتیان بە پێشكەوتنی مرۆڤ كردووە. هەستم

كرد بەربەستەكانی نێوانمان دەتوێنەوە. لە كۆتا ڕۆژی گەشتەكەیدا هەندێك لە ئەندازیارانی بەتواناترمان هێنایە MIC بۆ ئەوەی لەگەڵ جەنابی سپایس باسی تایبەتمەندیەكانی ئامێرەكانی شاوبلین بكەن. بەبێ ئەوەی باسی نرخەكان بكەم، لێم پرسی ئایا دەكرێت هەندێك لە ئەندازیارەكانمان بنێرین بۆ بیڤیلارد بۆ ڕاهێنانی دەستی. پێدەچوو بە داواكارییەكەم سەری سوڕمابێت.

وتی: بۆ چی پێویستت بە ڕاهێنانە؟ پێم وایە پێشتر هەندێك لە باشترین ئەندازیارەكانی جیهان لای تۆیە.

بەم قسەیە زەردەخەنەم كرد. جەنابی سپایس نەیدەزانی كە ئەو باشترینی بینیوە و لە بابەتەكە نەدەگەیشت. ئەمە وەك ئەوە وابوو كە لە سەر عەرەبانەكان لەنێو بازاڕەكانی عێراقدا كاتێك تەماتە جوانەكان دەخەنە سەرەوە و خراپەكان لە ژێرەوە دەشارنەوە. بەڵام هەستەكەیم بەرز نرخاند. بەبێ ئەوەی ئەو وا بڵێت، هەستم كرد ئەوە پاشەكشەی تەواوەتییە لە لێدوانەكەی سەبارەت بە "بازرگانی ئاسایی". لەوەش گرنگتر هەستم دەكرد گەیشتوینەتە ئاستێك لە ڕێزگرتن لە یەكتر كە پەیوەندییەكی كاركردنی لەسەر دروست بكەین.

ئەوەبوو منیش دەستخۆشییەكەیم گەڕاندەوە و گوتم: "ڕەنگە چەند ئەندازیارێكی بەتوانامان هەبێت، بەڵام كەس نازانێت وەك سویسرییەكان بەجوانی كار بە ئامێرەكان بكات."

ئامانجم بۆ ڕاهێنانی ئەندازیارەكانمان لە شاوبلین دوو لایەنە بوو. من ویستم لە ژێر ڕێنمایی پسپۆڕان ئاشنا بن بە ئامێرەكان و لەوەش گرنگتر، كەپەكانی ڕۆتۆری سەنتەرفیوج و بەشەكانی تر بە تایبەتمەندیيە دروستەكان بەرهەم بهێنن. هەروەها دروستكردنی

پۆلا زۆر قورسە بۆ ئامێرسازی و لەگەڵ ئەوەشدا وردبینی کاپەکان بە هەمان شێوەی خودی ڕۆتۆرەکە گرنگ بوو. لەبەر ئەوەی شاوبلین ئامێری دروست دەکرد و مامەڵەی لەگەڵ پارچەکاندا نەدەکرد، هەستم دەکرد کە لەوێدا پێکهاتەکانی سەنتەرفیوج دروستکردن ئاسانتر دەبێت و مەترسی دۆزینەوەیان کەمترە. من و جەنابی سپایس یەکلایی بووینەوە لەسەر زیادکردنی نرخێك بۆ ئامێرەکانی خولان و سوڕانەوە کە ڕاهێنانی لە شوێنی خۆیدا لەسەر ئەو پارچانە لەخۆگرتبوو کە دەمانەوێت دروستی بکەین. ئەوەی وەك پەیوەندییەکی ئاڵۆز دەستی پێکردبوو، بوو بە هاوکارییەك کە سوودی بۆ هەردووکمان هەبوو.

بێگومان جەنابی سپایس تووشی فزولیەت بوو لەو پێکهاتە سەیر و سەمەرەی کە ئەندازیارەکانم مەبەستیان بوو لەسەر ئامێرەکانی بەرهەمی بهێنن. من بەشداریم لە چەندین کۆبوونەوەی سەرەتایی مەشقەکانی شاوبلین کرد بۆ ئەوەی دڵنیا بم کە هەموو شتێك بە ئاسانی بەڕێوەدەچێت، بە بیانوویەکی ئامادەکراوەوە کە کاپەکانی سەنتەرفیوج بۆ ئامێرێکی تایبەتمەند بووە کە پێی دەوترێت لەیزەر چۆپەر، کە لە تاقیکردنەوەکانی لەیزەردا بەکاردەهێنرێت. ئەمە وەك گرەو وابوو، چونکە ئاشنابوونم بە چۆپەری لەیزەر لە باشترین حاڵەتدا ڕووکەش بوو. من تەنها دەمزانی ئامێری خولانەوەیە کە تیشکی لەیزەر ڕادەگرن و دووبارە فۆکەسیان دەکەنەوە. لەڕاستیدا تەکنەلۆژیایەك بوو کە زۆر لە دەرەوەی دەستی ئێمە بوو. بەڵام من پێشبینیم کرد کە وەك بەڕێوەبەرێك نەك تەکنیکارێك، جەنابی سپایس بەقەد من کەمێك لەبارەیانەوە دەزانێت. پاشنیوەڕۆیەك، کاتێك من و یەکێك لە ئەندازیارە گەنجەکانمان بە ناوی جەمال سەیری یەکێك لە دیزاینە

هەستیارەكانمان دەكرد، بەشێوەیەك بە چرپەوە و بۆ سوودی سپایس بە ئینگلیزی گوتم: "سەیركە جەمال، كاتێك ئەم بەشە دەسوڕێتەوە، تیشكەكە دەگیرێت."

جەمال بە سەرلێشێواوی سەیری كردم، بەڵام باشتری دەزانی لەوەی هەر شتێك بڵێت. دیارە جەنابی سپایس ئەو ئاماژەیەی هەڵگرتەوە، چونكە ڕۆژی دواتر بە جۆرێك لە نهێنییەوە لە یەكێك لە ئەندازیارەكانم نزیك بووەوە. وتی: "دەزانم تۆ چی دەكەیت. ئێوە كار لەسەر چۆپەری لەیزەر دەكەن. من نەمدەزانی عێراق كار بەو جۆرە تەكنەلۆژیایە دەكات". پەیوەندییە باشەكانمان لەگەڵ جەنابی سپایس تادەهات باشتر دەبوو، هەروەها سوودی دیكەی هەبوو. چوون پەیوەندی زۆری بۆ ئەندازیارەكانمان لە كۆمپانیاكانی تری سویسرا كردەوە. تەنانەت چەند جارێك ئەندازیارانی خۆیشی نارد بۆ ئەوەی لەگەڵ مندا بێن بۆ كۆمپانیاكانی تەكنەلۆژیای بەرزی دراوسێ بۆگەرەنتی ئەوان. زۆری نەخایاند سویسرا بوو بە وۆرك شۆپێك بۆ عێراق.

# بەشی شەشەم
# بەرنامەی تێکچڕژان و بەریەککەوتن

کاتێك ئاوڕم بۆ دواوە دایەوە تاوەکو سەیری هەموو ئەو شتانە بکەم کە لە ماوەی هەژدە مانگی ڕابردوودا بەدەستمان هێناوە، پێشکەوتنێکی گەورەم بینی. چوون ئێمە ببووینە خاوەنی دیزاین و کەرەستەی خاو و زۆرێك لە ئامرازەکانی سەنتەرفیوجێکی ڕەسەن. دەیان لە ئەندازیار و توێژەرەکانم بە نهێنی لە باشترین پەیمانگاکانی جیهان و کۆمپانیاکانی تەکنەلۆژیای بەرزدا ڕاهێنانیان دەکرد. تەکنیکاران لە سەرانسەری ئەورووپا کاریان لەسەر پێکهاتە لاوەکییە هەستیارەکان دەکرد، بێ ئاگا لەوەی کە یارمەتیدەرن بۆ پەیداکردنی پارچەکانی بەرنامەی سەنتەرفیوجی عێراقی. ڕەنگە ئەمە بە ئەگەرێکی زۆرەوە کارامەترین بەرنامەی دەوڵەمەندکردنی نهێنی بووبێت لە مێژوودا. لە هەر بارودۆخێکی تردا، لەوانەیە هەر سەرۆکێکی تری تیمی ئەندازیاری بوایە ئەوا ستایشی بێ شوماری ئێمەی دەکرد، بەڵام حوسەین کامل هەمیشە سەرنجی لەسەر کەموکوڕییەکانمان بوو. ناچار بووم دان بەوەدا بنێم کە هەروەك چۆن زۆرێك لە توخمەکانی بەرنامەی سەنتەرفیوجەکەمان پێدەچوو وا کۆدەبنەوە، لەهەمان کاتدا ئێمەش تووشی یەك دوو کێشەی جددی بووین. لێکدانەوەکانمان دەریانخست کە موگناتیسی هەمیشەیی بە خێراییە بەرزەکانی سەنتەرفیوج دەتەقێتەوە، ئەمەش بەهۆی هێزی خولانەوەی زۆرەوە. لەوەش

كێشەدارتر، ئێمە بەزەحمەت دەتوانین ئامێرەكانی دروستكردنی لێشاو كە لەلایەن كۆمپانیای H&H Metalform دابینكرابوون بۆ دروستكردنی ڕۆتۆرەكان بە وردی -كە بەرگەی خێراییەكانی خولانەوەی سەنتەرفیوج بگرن- بەكاربخەین. چونكە ئەو ئامێرانە بۆ بەرهەمهێنانی كەیسی موشەكی تۆپخانە باش بوون، بەڵام وردبینییان نەبوو كە بتوانن بە بەردەوامی بۆرییەكی تەواو یەكسان لە پۆڵایەكی بەهێز دروست بكەن و تەنانەت بچووكترینی ناتەواویش لەم كارەدا تەواوی بۆرییەكانی بێكەڵك دەكرد.

دوای شەڕی ئێران، حكومەتی سەددام لە ڕووی سەربازییەوە لاواز بوو و خەریكی سەرفكردنی خەرجییەكان بوو بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی بەرگرییەكانی، لەنێویاندا گفتوگۆكردن لەسەر گرێبەستێكی چەكی ئاسایی كە ملیارەها دۆلار بوو لەگەڵ بەڕازیل. هەروەها ئەگەر بە فشارە هێمنەكانی حوسەین كامل لەسەر ئێمە حوكم بدەین، سەددام لە هەموو كاتێك زیاتر تامەزرۆی یۆرانیۆمی پیتێنراو بوو. لە ئاستی نێودەوڵەتیدا، حكومەت دەستیكرد بە هەوڵەكانی بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی پێگەی خۆی، بەتایبەتی لە چاوی ڕۆژئاوادا، ئەمەش بە مەبەستی هاندانی كەمكردنەوەی قەرزەكان كە لە كاتی جەنگدا بەرزببوونەوە. سەددام لە ١ی نیسانی ساڵی ١٩٨٩ هەڵبژاردنی ئەنجامدا و تیایدا ژمارەیەكی زۆر لە ژنان و غەیرە بەعسی كورسییان لە ئەنجوومەنی نیشتمانی وەرگرت و نیازی خۆی ڕاگەیاند بۆ دروستكردنی دەستوورێك كە گەرەنتی حوكمڕانی دیموكراسی بكات. بەڵام ئەمە هەر تەنها بانگەشە بوو و هیچی تر.

پیاوە ئەمنییەكانی سەددام كە لە ڕەشیدیە جێگیر بوون، دەستیان كرد بە پرسیاری تەكنیكی زۆر لە دەرەوەی تێگەیشتنیان. هەندێك

له ئه‌ندازیاره‌كانم پێیان وتم كه پێده‌چێت لێكۆڵینه‌وه له كه‌موكورِیه‌كانی به‌رنامه‌كه‌مان بكه‌ن به‌مجۆره‌ش ده‌توانن راپۆرت بده‌ن به‌سه‌رووی خۆیانه‌وه.

كاتێك ئاڵنگارییه ته‌كنیكیه‌كانی خۆمانم خسته به‌رده‌م ستێملێر، ئه‌و شێوازێكی ئاڵۆزتری پێشنیار كرد بۆ به‌رهه‌مهێنانی رۆتۆر به به‌كارهێنانی ماده‌یه‌ك كه پێی ده‌وترێت ریشاڵی كاربۆنی، كه ته‌نانه‌ت له پۆلایه‌كی پته‌و به‌هێزتره. من تامه‌زرۆ بووم بۆ گه‌ران به‌دوای ئه‌م ته‌كنه‌لۆژیایه‌ی تردا. هه‌ر پرۆژه‌یه‌كی سه‌ركه‌وتوو ده‌بێت بتوانێت خۆی له‌گه‌ڵ گۆرانی واقیعه‌كاندا بگونجێنێت. ستێملێر وتی هاوڕێیه‌كی و هاوكارێكی پێشووی هه‌یه له پرۆگرامی سه‌نته‌رفیوج له M.A.N. كه تایبه‌تمه‌ند بوون له ریشاڵی كاربۆنی. ناوی كارل هاینز شاب بوو، هه‌رچه‌نده له‌و كاته‌دا نه‌مده‌زانی، به‌ڵام ئه‌و كه‌سه دوا كلیلی پێویست بۆ په‌ره‌پێدانی سه‌نته‌رفیوجی عێراقی دابین ده‌كرد.

شاب وازی له M.A.N. هێنابوو له سه‌ره‌تای هه‌شتاكانی سه‌ده‌ی رابردوودا و كارێكی تایبه‌تی دامه‌زراندبوو، ئه‌مه‌ش وای لێكرد زیاتر نزیك بێته‌وه له كۆمپانیایه‌كی گه‌وره و له ژێر كۆنترۆڵی توندا. كۆمپانیاكه‌ی به ناوی رۆش RoSch كه پێكهاتووه له یه‌كه‌م پیته‌كانی ناوی بنه‌ماڵه‌كه‌ی و بریجیت رۆنیگه‌ری هاوسه‌ری. وادیاربوو ئه‌و پۆشینی ریشاڵی كاربۆنی بۆ كۆمپانیاكانی ئۆتۆمبێل و كۆمپیوته‌ر، هه‌روه‌ها دژه فیشه‌كی بۆ هێزی ئاسمانی میسر به‌رهه‌م ده‌هێنا. به‌هۆی پێشینه‌ی خۆی له ته‌كنه‌لۆژیای سه‌نته‌رفیوج، به ته‌واوی له‌گه‌ڵ پێداویستییه‌كانماندا ده‌گونجا.

لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٨٩ من و ستێملێر سەردانی جەنابی کارل هاینز شابمان کرد لە کۆمپانیاکەیان لە شارۆچکەی کاوفبیورن لە باڤاریا. دکتۆر فەرید و دکتۆر عادلم لەگەڵ خۆم هێنا، هەروەها جەنابی عەلیشم هێنا. ئێمە لەوە وریا بووین کە لەکاتی کۆبوونەوەکە و سەرەتا باسی پرۆژەی سەنتەر فیوجەکەمان نەکەین.

هەر لەو ساتەوەی یەکترمان بینی ئەو کەسەم کەوتە بەردڵ. لە تەمەنی پەنجا و پێنج ساڵیدابوو، دە ساڵ لە من گەورەتر بوو، قژە خۆڵەمێشییەکەی بەسەر پێشەوەی سەریدا شانەی گەڕابووەوە. چاوە شینەکانی وەك حەوزێکی بچووکی ئاو دەهاتنە بەرچاو کە هێزی کێشکردن لە دەموچاوە فراوانەکەیدا نوقم بووبوو و کاتێکیش پشووی بە دەمی دەدا گۆشەکانی بە ڕوخسارێکی خەمناك و بیرکردنەوە بەرەو خوارەوە دەگەڕانەوە. بە جۆرێك دەجوولایەوە، وەك ئەوەی قورساییەکی نەبینراوی لەسەر پشتی هەڵگرتبێت. بەڵام دەستەکانی سیحراوی بوون. کەسێکی تا بڵێی بەڕێز بوو، لە کاتێکدا بە دەوری وەرشەکەیدا دەسوڕایەوە و بە زمانی ئەڵمانی کارەکانی خۆی ڕوون دەکردەوە، دەستەکانی بەسەر ئامێرەکاندا دەهێنا وەك ئەوەی لە گفتوگۆیەکی تایبەتدا بێت لەگەڵیان کە تەنانەت شاب خۆیشی نەیدەتوانی بیبیستێت. ئامێرێکی پێچانی ڕۆتۆری نیشان داین کە بەکاردێت بۆ دروستکردنی بۆری لە ڕیشاڵی کاربۆنی، لەگەڵ قەڵغانی زرێپۆشی بالیستی و ئەو شتانەی تر کە بەرهەمی هێناون. پاشان ڕۆتۆرێکی سەنتەرفیوجی پیشان داین، ئەمەش سەرسامی کردم چونکە ئامێرێکی پۆڵێنکراوی بەرز بوو. بە نزیکەیی هەمان ڕەهەندەکانی ڕۆتۆرە پۆڵا پتەوەکانمان بوو. شاب بە نەرمی لە نێو پەنجەکانیدا گرتبووی، وەك ئەوەی لە

زه‌وی ده‌رهێنابێت و به‌ ده‌ستی خۆی دروستی كردبێت و به‌شێوه‌یه‌كی سه‌ربه‌خۆ به‌كاربێت نه‌ك له‌سه‌ر ئامێرێك بپێچێته‌وه‌.

كاتێك به‌ شێوه‌یه‌كی ئاسایی باسم له‌ ئاره‌زووی خۆمان بۆ ڕۆتۆری سه‌نته‌رفیوج كرد، خۆشحاڵ بووم كه‌ بینیم شاب له‌ بیرۆكه‌كه‌ پاشه‌كشه‌ی نه‌كرد. باسمان له‌ زۆر كێشه‌ كرد كه‌ هێشتا له‌به‌رده‌م به‌رنامه‌كه‌مانه‌، له‌وانه‌ ئامێره‌كان بۆ دانانی هاوسه‌نگی ڕۆتۆره‌كان كاتێك به‌رهه‌م ده‌هێنرێن و پرۆسه‌ی وردی تاقیكردنه‌وه‌یان. كاتێك له‌ كۆتاییدا پرسیارم له‌ شاب كرد كه‌ ئایا ده‌توانێت ڕۆتۆری ڕیشاڵی كاربۆنی وه‌ك ئه‌و ڕۆتۆره‌ی كه‌ له‌ وه‌رشه‌كه‌یدا بینیبوومان بۆمان دابین بكات، پێده‌چوو ئه‌ویش ئاماده‌ بێت. هه‌روه‌ها ڕازی بوو هاوكارمان بێت بۆ كڕینی ئامێری خولخۆر، بۆ ئه‌وه‌ی بتوانین خۆمان ڕۆتۆره‌كان له‌ عێراق دروست بكه‌ین. منیش ئاستی هاوكارییه‌كه‌یم به‌ جێگه‌ی سه‌رنج زانی.

زۆری نه‌خایاند ئه‌وه‌ ڕوون بووه‌وه‌ كه‌ بریجیتی هاوسه‌ری شاب كاریگه‌رییه‌كی زۆری له‌سه‌ر بڕیاردانه‌كانی هه‌بووه‌. له‌ ماوه‌ی هاوكارییه‌كه‌ماندا چه‌ند جارێك شابم بانگهێشت كرد بۆ عێراق و له‌ بۆنه‌یه‌كدا ئه‌ویش یاوه‌ری بوو. ئێمه‌ ته‌واوی پاره‌كه‌مان دابین كرد، له‌وانه‌ش ڕاقیترین شوێنی نیشته‌جێبوون كه‌ عێراق پێشكه‌شی بكات، و لاشم ڕوون بوو كه‌ ئه‌مه‌ بریجیتی هاوسه‌ری زۆر دڵخۆش ده‌كات. ژنێكی توند و تیژ بوو، ڕوخسارێكی پته‌و و جۆرێك له‌ ئیراده‌یی هه‌بوو. به‌ پێچه‌وانه‌ی شاب كه‌ به‌ زه‌حمه‌ت له‌ شوێنێكه‌وه‌ بۆ شوێنێكی تر ده‌جولا، ژنه‌كه‌ی به‌ خێرایی ده‌جوولایه‌وه‌ و له‌بیرمه‌ هه‌میشه‌ له‌ كاتی ڕۆیشتنیاندا شاب هه‌وڵیده‌دا بۆ ئه‌وه‌ی بتوانێت بگاته‌وه‌ ئه‌و. ئێواره‌یه‌ك له‌گه‌ڵ عه‌لی و دكتۆر فه‌رید و دكتۆر عادل بردمن بۆ نانخواردنی ئێواره‌ له‌

یەکێك لە باشترین چێشتخانەکانی بەغدا لەسەر شێوازی ڕۆژئاوایی، چێشتخانەی هینایدی لە قەزای جادریە. خاوەنی چێشتخانەکە مێزێکی گۆشەیی بۆمان دابینکرد کە دوور بوو لە مێزەکانی تر. لەکاتێکدا ستیك و فینگەرمان دەخوارد، دەستم کرد بە پێشنیارکردنی کۆمەڵێك ڕێگەی دیکە کە تیایدا کۆمپانیای ڕۆش بتوانێت یارمەتیمان بدات.

باسمان لە وردەکارییەکانی گرێبەستێك کرد بۆ دروستکردنی ڕۆتۆرەکانی سەنتەرفیوج، هەروەها پرۆسەی لێدانی سەرپۆشەکانی کۆتایی لەسەریان. هەروەها شاب ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر کارکردن لەسەر خولێنەری تۆپەکە. ئامادەیی ئەو بۆ یارمەتیدانمان بێ سنوور بوو و ڕێگەم دا داواکارییەکان بڵێت تاوەکو شاب سەری لەقاند و لەناکاو دوودڵ دەرکەوت.

عەلی وتەی ئەوی وەرگێڕا بۆ زمانی عەرەبی: دەڵێ داوای زۆر دەکەیت.

بەڵام هاوسەرەکەی شاب دەستوەردانی کرد و بە خێرایی بە زمانی ئەڵمانی قسەی لەگەڵ کرد. عەلی لەبەر ڕەوشتی باش لە کاتی گفتوگۆی تایبەتی خۆیاندا وەرگێڕانەکەی ڕاگرت، بەڵام تۆنەکەی بێ هەڵە توند و جۆرێك بوو. کاتێك وازی لە قسەکردن هێنا، شاب خۆی پێچەوانە کردەوە.

عەلی وتی: دەڵێت باشە بزانم دەتوانم چی بکەم.

شاب ڕاستگۆ بوو لەگەڵ هەموو پەیمانەکانی و کارەکانیشی لەسەر خولێنەر و هەڵگری تۆپەکەو ئەڵقەی موگناتیسی و بەشەکانی تر بەرنامەکەمانیانی بە چەندین مانگ بەرەو پێشەوە برد، ئەگەر ساڵان نەبێت. لە هاوینی ساڵی ١٩٨٩دا، نمونەیەکی بۆری

ڕۆتۆرم وەرگرت كە شاب بەپێی تایبەتمەندییەكانمان بەرهەمی هێنابوو. ئێمە لەسەر بەرنامەكانی كادەنس لە MTI لە نیویۆرك تاقیمان كردەوە و داواكارییەكمان بۆ گۆڕانكاری تایبەت لە پێكهاتەكەیدا ناردەوە.

شاب یەكسەر پابەند بوو و دوای چەند هەفتەیەك دوو ئەندازیاری عێراقیم نارد بۆ میونشن بۆ كۆكردنەوەی بارێكی بیست بۆری ڕۆتۆر، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی كیسی دیپلۆماسییەوە بیگەیەنن. كاتێك گەیشتنە دامەزراوەی ڕەشیدیە، ڕۆتۆرەكان بە تەواوی لەسەر پرۆگرامی MTI تاقیكرابوونەوە. دەستە پسپۆڕەكانی شاب، وەك بلێی موعجیزەیان دروست كردبوو.

شاب وتی دەتوانێت نەخشە و دیزاینی پێشكەوتووترمان بۆ دابین بكات كە بە سەنتەرفیوجی زۆر گرنگ ناسراون. پێنج هێندەی بەرزترە لەو سەنتەرفیوجەی كە ئێمە كارمان لەسەر دەكرد، سەنتەرفیوجی زۆر گرنگ پێكهاتبوو لە ڕۆتۆرەكان كە لە كۆتاییەوە بۆ كۆتایی بەسترابوونەوە و بە باندێكی پۆلایەكی پتەو كە پێی دەگوترا دەرچەی هەوا (یان هەوا تێخەر). چەندین هێندەی بڕی یۆرانیۆمی پیتێنراوی بەرهەم دەهێنا كە بەهۆی سەنتەرفیوجەوە لە دیزاینەكانی ستێملێردا دروست دەبوو، ئەمەش مێژووەكەی دەگەڕایەوە بۆ ساڵانی حەفتاكان. ئەم نەخشانە پێشكەوتوو بوون، نوێنەرایەتی دە ساڵ لێكۆڵینەوە و پەرەپێدانیان دەكرد لە ئەوروپا. ئێمە لەسەر نرخی ۱۰۰ هەزار ماركی ئەڵمانی ڕێككەوتبووین: سەودایەكی باوەڕپێنەكراو، و نیشانەیەك كە ئەم زانایە ئەڵمانیانە بێ ئاگان لە بەهای ڕاستەقینەی ئەو هاوكارییانەی كە پێشكەشیان كردووە. ڕەنگە كەسێك بێهیوا بووبێت لەم نەخشە نهێنیانە ملیۆنان دۆلاری بۆ داوە. بەڵام شتە هەرە گرنگەكە بریتیی

بوو لە دەرچەی هەواكە بە كریمپە وردبینەكەیەوە. بیستبووم تەنانەت ژاپۆنییەكانیش بە تەكنەلۆژیای باڵایانەوە تا ئێستا نەیانتوانیوە نهێنییەكانی دەرچەی هەوای سەنتەرفیوج بزانن.

لە زستانی ساڵی ١٩٨٩دا شاب زیاتر لە هەفتەیەكی لە بەغدا بەسەر برد و هاوكاریمان كرد بۆ چارەسەركردنی كێشەكانی كە پەیوەست بوون بە ڕۆتۆرەكان. ئەویش ئامێری دابین كرد بۆ ئەوەی هەم هاوسەنگی بۆرییەكان و هەمیش شیكارییان بكات بە خێرایی سوڕانەوەیەكی خاو، هەروەها ئەوەشی نیشانی داین كە چۆن بەكاریان بهێنین. زیاد لەوەش ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر دروستكردنی ئەو جامەی كە هەڵگرو خولێنەری تۆپەكەی تێدا دادەنیشێت، كە دەبێت بە وردی دوو لەسەر هەزاری ملیمەتر بە ئامێر دروست بكرێت.

لە بەهاری ساڵی ١٩٩٠، لەگەڵ گەیشتن بە پێكهاتەكان بە بارێكی نهێنی لە بەرهەمهێنەرانی ئینگلتەرا، ئەڵمانیا، سویسرا و شوێنەكانی دیكەی ئەوروپا، ئێمە ئامادە بووین دەست بكەین بە كۆكردنەوەی جۆرە نموونەییەكەمان لە ڕەشیدیە. شاب دوایین گەشتی خۆی بۆ عێراق لە مانگی نیساندا ئەنجامدا. بۆ ماوەی سێ ڕۆژان هێنامان بۆ ڕەشیدیە، بە ڕێگای بازنەیی هێنامان بۆ ئەوەی هەستی ئاراستەكردنی تێكەڵ بكەین، وەك ئەوەی لەگەڵ ستێملێردا كردبوومان. بە چاودێری شاب، ئێمە ستاندێكی تاقیكردنەوەمان بۆ نموونە سەرەتاییەكە كۆكردەوە و موگناتیسی فشارخستە ناو ئەڵقەكانی ڕیشاڵی كاربۆنیمان دانا. وەك تەكنیكاران، زۆر بە پەرۆش بووین بۆ كۆبوونەوەی داهاتوو، هەروەها بە جۆش و خرۆشێكی سەرسوڕهێنەرەوە تا درەنگانی شەو كارمان دەكرد. ئێمە كاپەكانی سەرەوە و خوارەوەی كۆتاییمان بە یەكێك لە

ڕۆتۆرەکانی ڕیشاڵی کاربۆنی شاب لەگەڵ بەشەکانی تردا لێکدا و دامانننا بۆ ئەوەی بۆ ماوەی شەوێك ڕەق ببنەوە. ئێوارەی ڕۆژی دواتر موگناتیسیمان بەستەوە بە کۆتایی سەرەوەی ڕۆتۆرەکە و دەرزی و خولێنەر و هەڵگری تۆپەکەمان بە کۆتایی خوارەوە بەستەوە. پێش ئەوەی شاب بڕوات، ئامێری هاوسەنگکردنمان دانا بۆ تاقیکردنەوەی هاوسەنگی ڕۆتۆرەکە. سەرنجم دا، بە بێهێزی لەسەر خولێنەرەکە دەلەرزی. کاتێك ئاماژەم بەم شتە کرد بۆ شاب، شانی هەڵکێشا و بەسەر بیرینگەکەدا چەمایەوە بۆ ئەوەی لە نزیکەوە سەیری بکات. پەنجەی ئاماژەی خۆی خستە ژێر تۆپە بچووکەکەوە، نزیك بوو دەستی لێ بدات. من نەمدەتوانی لەوە تێبگەم کە مەبەستی چی بوو. بە سەرسامییەوە سەیری دەستی شابم دەکرد کە لە ژێر سەنتەرفیوجەکەدا دەسوڕایەوە، پەنجەکانی وەك باڵندەیەك کە لە گیرفانی هەوادا هەڵواسرابوو، بە فراوانی بڵاوبوونەوە. بە دەست لێدانێك بەڵام بە هێواشی وەك ئەوەی هەستی پێنەکەیت، بە نوکی پەنجەی لە خولێنەر و هەڵگرەکەی دا، لەو شوێنەی کە دەبێ ناوەندی تۆپەکە بووبێت، چونکە لەناکاو سەنتەرفیوجەکە هاوسەنگ بوو. بە سەرسوڕمانەوە سەرم لەقاند. ئەو دەست لێدانە نەرمەی شاب لە سەد مەکینە باشتر بوو، منیش تێگەیشتم کە هەموو تیۆرییەکانی جیهان هەرگیز ناتوانن جێگەی دەستێکی بە ئەزموون بگرنەوە.

ئامێرەکەمان گواستەوە ناو بۆرییە گەورەکەی بۆشایی و پێش ئەوەی شاب بەرەو ئەڵمانیا بڕواتەوە، بەچاوی خۆی بینی کە نموونە سەرەتاییەکە بە خێراییەکی کەم و بە تەواوی دەخولێتەوە. ساتەوەختی ڕاستەقینە گەیشتبوو و هەموو ستافەکەم هەستیان بە چاوەڕوانییەك کرد. حوسەین کامل زۆر سەردانی ڕەشدیەی

ده‌كرد، چونكه‌ ورده‌ ورده‌ خێرایی كاره‌كانمان زیاد ده‌كرد و په‌ره‌سه‌ندنمان پێوه‌ دیاربوو. له‌لایه‌كی تریش یاده‌وه‌ری سه‌نته‌رفیوجی ڕۆنی شكستخواردووی بیمز هێرشی ده‌كرده‌ سه‌رمان.

دكتۆر ماكی كۆمه‌ڵێك زانیاریی زۆری له‌سه‌ر داینامیكی ڕۆتۆر له‌ MTI ده‌ست خستبوو، هه‌ربۆیه‌ ماتۆڕه‌كه‌ی خێراتر كرد. له‌ كاتێكدا ستافه‌كه‌ی ترم به‌ ده‌مارگیرییه‌وه‌ سه‌یریان ده‌كرد، به‌ڕێز سینان، دیزاینه‌ری ماتۆڕه‌كه‌، ئاگاداری پاوه‌ر سه‌پلایه‌كه‌ی بوو. سه‌نته‌رفیوجه‌كه‌ گه‌یشته‌ ٢٠ هه‌زار خول له‌ خوله‌كێكدا، ئێمه‌ش پیرۆزباییمان له‌ خۆمان كرد كه‌ گه‌یشتینه‌ نمره‌ی به‌رزی نوێ. به‌ڵام كاتێك خێراییه‌كه‌ گه‌یشته‌ ٣٢ هه‌زار خول له‌ خوله‌كێكدا، گوێمان له‌ ته‌قینه‌وه‌یه‌ك بوو. كاتێك بیرم له‌ نرخی شكستێكی دیكه‌ ده‌كرده‌وه‌، دڵم له‌ ترسان وه‌ك بڵێی كه‌وته‌ سه‌ر زه‌وی. ماتۆڕه‌كه‌ هێور بوویه‌وه‌ و سه‌نته‌رفیوجه‌كه‌ش هێواش بوویه‌وه‌. نزیكه‌ی كاتژمێر سێی به‌یانی بوو، كاتێك به‌ ده‌وری تاقیگه‌كه‌دا ده‌گه‌ڕام بینیم ده‌موچاوی ستافه‌كه‌م له‌ ترسدا حه‌په‌ساون. ئه‌وان ده‌یانزانی ئێمه‌ توانای ئه‌وه‌مان نییه‌ جارێكی دیكه‌ حوسه‌ین كامل بێ هیوا بكه‌ین. به‌ڵام نائومێدی نامانگه‌یه‌نێته‌ هیچ شوێنێك و منیش ئه‌وه‌بوو خۆم كۆكرده‌وه‌ و به‌و زانیارییه‌ی كه‌ له‌ ماوه‌ی دوو ساڵ و نیوه‌كه‌ی ڕابردوودا فێری ببووم. ئه‌مجاره‌یان به‌ ستافه‌كه‌مم وت، هه‌ست ده‌كه‌م شاره‌زایی ته‌واومان هه‌یه‌ بۆ ئه‌وه‌ی له‌ كێشه‌كه‌ تێبگه‌ین و چاره‌سه‌ری بكه‌ین.

دواتر گوتم: "دكتۆر ماكی" به‌جۆرێك له‌ ڕه‌وانبێژیه‌وه‌ پرسیم: "ئه‌م هه‌موو هێزه‌ به‌ره‌و كوێ ده‌ڕوات؟"

بە زەردەخەنەیەكی سەیرەوە سەیری كردم، وەك ئەوەی نابێت پرسیارێكی وەها ئاشكرا بكەم، گوتی: "بێگومان بۆ خێراكردنی ماتۆڕەكە".

پرسیم : "بەڵام ئایا هەموو هێزەكە دەچێتە سەر خێراكردن؟".

گوتی: "بێگومان هەموو شتێك دەچێتە سەر خێراكردن؛ ئەی قابیلە بۆ كوێی تر دەچوو؟". ئەو نەیتوانی لە پێشنیارەكەم بگات، بەڵام دركم بەوە كرد كە دكتۆر فەرید ڕەزامەند بوو.

گوتم: باشە با تا بەیانی هەموو شتێك بەجێبهێڵین چونكە هەمووومان ماندووین. "بەڵام من باوەڕم وایە ڕەنگە پرسیارەكەم وەڵامی كێشەكەمان لەخۆ بگرێت."

بەیانیەكەی كە گەیشتم بینیم دكتۆر فەرید و دكتۆر ماكی سەنتەرفیوجیان كردۆتەوە. سەرنجمان دا ڕەنگێكی تۆخ لە لای خوارەوەی ڕۆتۆرەكە هەیە، من و دكتۆر فەرید كۆك بووین كە بوونی ئەو ڕەنگە بەهۆی گەرمییەكی زۆرەوە بووە كە لە ماتۆڕی موگناتیسیەوە دزە دەكاتە دەرەوە. لە كاتێكدا بەڕێز سینان كاری دەكرد بۆ چاككردنەوەی گۆڕینی فرێكوێنسی ماتۆڕەكە، من دكتۆر فەرید و باشترین ئەندازیارەكانم ڕاسپارد كە پێكهاتەكان بە ڕۆتۆرێكی نوێدا ببەستنەوە تاوەكو بۆ دووەم جار تاقیكردنەوە بكەین. دوای ماوەیەكی كەم حوسەین كامل هاتە پێشەوە و منیش بردمە لایەك و گوتم هەرچەندە تووشی پاشەكشەیەكی بچووك بووین، بەڵام متمانەمان بە سەركەوتن هەیە.

سەرەڕای دڵنیاییەكانم بۆ ستافەكەم و حوسەین كامل، بەڵام ئەو ترسەی هەستم پێدەكرد كاریگەری لەسەر تەندروستی من هەبوو. لەكاتی دووبارە دروستكردنەوەی سەنتەرفیوجەكەدا،

هه‌ندێك جار هه‌ستم به سه‌رگێژخواردن ده‌كرد و نیگه‌ران بووم له پەڵه‌یه‌كی ڕه‌ش كه له‌سه‌ر پێستی سه‌ره‌وه‌ی سنگی چه‌پم ده‌ركه‌وتبوو. په‌ڵه وه‌نه‌وشه‌ییه‌كه به قه‌باره‌ی مشتم بوو به‌مجۆره‌ش سه‌رم لێ شێوابوو. وه‌ك ئه‌وه وابوو ڕه‌نگ گۆڕانی ڕۆتۆری سه‌نته‌رفیوجه‌كه به جۆرێك خۆی گواستبێته‌وه بۆ جه‌سته‌م. به‌هۆی ئه‌وه‌ی نه‌مده‌ویست ستافه‌كه‌م ئاگاداربكه‌مه‌وه، بۆیه به باشترین شێوه ئه‌مه‌م شارده‌وه. به‌ڵام له ماڵه‌وه شتێكی جیاواز بوو. له‌یلا یه‌ك چاوی لێكردم و داوای لێكردم سه‌ردانی پزیشك بكه‌م. ئه‌گه‌رچی من پیاوێك نیم كه به ئاسانی خۆم به‌ده‌سته‌وه بده‌م، به‌ڵام ڕازی بووم. پزیشكه‌كه وتی گۆڕینی ڕه‌نگی سنگم به‌هۆی ئاستی به‌رزی فشاره‌وه بووه، ئاگاداری كردمه‌وه كه ئه‌گه‌ر چه‌ند ڕۆژێك پشوو نه‌ده‌م، له‌وانه‌یه له ژیاندا نه‌مێنم. به دوودڵی هه‌وڵمدا له ماڵه‌وه ئارام بگرم و به بڕینی داره میوه‌كانه‌وه خۆم خه‌ریك كرد. به‌ڵام دوای چه‌ند كاتژمێرێك جگه له ئه‌ندازیاره‌كانم كه له‌سه‌ر پرۆتۆتایپی نوێی سه‌نته‌رفیوج كاریان ده‌كرد، هیچی تر دانه‌نیشتم و بیر بكه‌مه‌وه به‌ڵكو به‌په‌له گه‌ڕامه‌وه بۆ ڕه‌شیدیه.

دواجار توانیمان هاوسه‌نگی له ڕۆتۆری نوێدا دروست بكه‌ین به‌بێ ده‌ست لێدانی سیحراوی شاب. به ده‌مارگیرییه‌وه سه‌یری خێرایی سه‌نته‌رفیوجی نوێمان ده‌كرد كه له ده‌ره‌وه‌ی نیشانه‌ی ٣٠ هه‌زار خول له خوله‌كێكدا دیاربوو. تا دره‌نگانی ئێواره، ئێمه خێراییه‌كه‌مان زیاد كرد بۆ ٦٣ هه‌زار خول له خوله‌كێكدا و هه‌مووان به هه‌ستی سه‌ركه‌وتنه‌وه یه‌كتریان له باوه‌ش گرتبوو.

به‌یانیه‌كه‌ی دیكه حوسه‌ین كامل هات بۆ بینینی سه‌نته‌رفیوجه‌كه وبینی كه كارده‌كات. كاتێك چووه ناو تاقیگه‌كه‌وه، پێده‌چوو سه‌ری سوڕمابێت، دیار بوو پێشبینی بوونی

دەنگێکی بەرزی دەکرد کە لەوەو پێش لە وەشانی ڕۆنی بیمزەوە گوێبیستی بوو بوو. بەڵام سەنتەرفیوجی موگناتیسی لە بۆشاییەکەیدا و بە بێدەنگی دەخولایەوە.

حوسەین کامل: "کار دەکات؟".

گوتم: بەڵێ گەورەم، ژمێرەری دیجیتاڵیم نیشان دا کە ٦٣ هەزاری لە خولەکێکدا دەخوێندەوە.

پێکەنی و بە زاراوەی عێراقی گوتی: "تۆ بەرپرسیاریتی تاوانەکەم لە ئەستۆ دەگریت ئەگەر ڕاست نەبێت".

بە شێوەیەکی سروشتی هەنگاوی داهاتوو هەوڵدان بوو بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم. سەرکەوتنی پرۆتۆتایپەکە لە گەیشتن بە خێراییە گرنگەکان متمانەی پێبەخشین کە سەنتەرفیوجەکەمان لە تاقیکردنەوەی کۆتایی خۆی دەردەچێت. وەك ئەوە وابوو ئۆتۆمبێلێکت دروست کردبێت و لە کارگەدا ماتۆڕەکەی بپشکنیت. ئێستا ئامادە بووین کلیلەکە بخەینە نێوی و بۆ یەکەمجار تاقی بکەینەوە.

بەڵام تاقیکردنەوەکە بە مادەی تیشکدەرەوە مەترسیدار دەبێت. ئێمە سەنتەرفیوجێکی نوێمان دروستکرد و ئامێرە یارمەتیدەرەکانی خۆراکدان و دەرهێنانی گازی هێکسافلۆرایدی یۆرانیۆممان دانا. دوای چەند هەفتەیەك، لە کۆتایی مانگی حوزەیران، تۆڕێکی ئاڵۆزی بۆری و وەلڤەل و کۆنترۆڵەکان لە ژوورێکی پاکدا کە بە پارتیشنێکی پلێکسی کە بە دیوارێکی شووشەوە دەور درابوو، سەنتەرفیوجی نوێیان چەسپ کرد. لەگەڵ بەرپرسانی بەشەکەم، دکتۆر عادل، دکتۆر فەرید، دکتۆر عەبدولفەتاح و دکتۆر فارس لە ژووری کۆنترۆڵ وەستابووم و چاوم لە سیستەمی ڕووناکی

هورروژمەكە بوو. دكتۆر عەبدوڵڵا كە سەركردایەتی بەشی پرۆسەی فیزیایی دەكرد، بە پاڵتۆ سپییەكەی تاقیگەییەوە بە پەلە بەدەوریدا دەگەڕا و لە كۆتا خولەكدا پشكنینی سیستەمەكەی دەكرد. وا دیار بوو كە لەرزۆك بوو، بە دەنگێكی بەرز فەرمانی بە یاریدەدەرەكانی دەدا و هاواری دەكرد كە ئەمەش تایبەتمەندی سروشتی ئاسایی خۆی نەبوو.

لەكاتێكدا فەرمانی دەستپێكردنی سەنتەرفیوجەكەم دەدا، قسە و قسەڵۆكی نێوان تەكنیكارەكان بوو بە چرپە و كاتێك بێدەنگی باڵی كێشا بەسەر ژووری كۆنترۆڵەكەدا، گوێت لە كەوتنە خوارەوەی دەرزییەك دەبوو. سەنتەرفیوجەكە بە هەمان شێوەی نموونە سەرەتاییەكەی پێشوو بە ئاسانی كاری دەكرد و زۆری نەخایاند خوێنەرەوەكە نیشانەی ٦٠,٠٠٠ خولی لە خولەكێكدا تۆماركرد. لەناو بۆشاییەكی نزیك لە یەك لەسەر ملیاری بەرگەهەوادا جێگیر بوو، بە بێدەنگی دەسوڕایەوە، وەك منداڵێكی ئاقڵ و ژیر كە چاوەڕێی خۆراكی هێكسافلۆرایدی یۆرانیۆم دەكات.

بەرپرسانی بەشەكانم بەردەوام سەیریان دەكردم وەك ئەوەی بتوانم هەندێك لە ترسەكانیان كەم بكەمەوە و منیش هەموو هەوڵێكم دەدا بۆ ئەوەی ئارامیی خۆم ڕابگرم، زەردەخەنەم بۆیان دەكرد بۆ ئەوەی ئاماژە بەوە بكەم كە سەركەوتن تەواو دڵنیایە. بەڵام دڵم بە پەرۆشەوە وەك ئەوەی لە برپرەكانی پشتمدابێت لێیدەدا. مێشكم بازێكی دا بۆ ئاگركەوتنەوەكانی پاڵاوگەی نەوت كە شاهیدی بووم و ئەو ڕووداوە پیشەسازیانەی كە لێكۆڵینەوەم لەسەر كردبوو. ئەوان هیچ نەبوون بە بەراورد بە ترسناكیی ئەگەری ڕووداوێكی ئەتۆمی. سیستەمی خۆراكدانەكە نزیكەی

دوو کیلۆگرام هێکسافلۆرایدی یۆرانیۆمی تێدابوو و ئەگەر سیستەمەکە بتەقیتەوە یان دزەیەکی گەورەی لێبکەویتەوە، ئەوا گازی خراپکەر دەتوانێت هەمووومان لە ژوورەکەدا بکوژێت. ئەگەرەکە دوور بوو، بەڵام ئێمە یاریمان بە وێرانکەرترین چەکی ئاگرین دەکرد کە مرۆڤ تا ئێستا دروستی کردووە. کاتێك سەیری سیستەمی ڕووناکی گەشاوەمان دەکرد، ڕووخسارمان ڕەنگی مردنی لێ نیشت بوو. بە دەوروبەرمدا سەیری تەکنیکارە کۆبووەکانمم کرد، هەموویان پیاوی باش بوون و خێزانیان هەبوو، لەناکاو هەستم بە قورسایی بەرپرسیارێتی سەلامەتییان دەکرد.

سەرم بۆ دکتۆر عەبدوڵلا لەقاند وەك ئاماژە. ئەویش کۆتاییە بەستراوەکەی بردە ناو سەنتەرفیوجەکەوە و پەستانەکە دەستبەجێ بە لەرزینێك بەرزبووەوە و لەرزینی لەسەر خوێنەرەوەکە تۆمار کرد. دڵمان لەگەڵیدا دەلەرزی و هەستم بەو ئارەقە دەکرد کە لە پێستمەوە دەردەدرا. بەڵام فشارەکە تەنها دەگەیشتە بەشێکی کەم لە بەرگەهەوایەك و دواتر بە سەلامەتی جێگیر بوو. لەگەڵ هاتنی گازی یۆرانیۆم بۆ ناو سیستەمەکە، هەستم دەکرد هەموو گەردیلەکان بە خوێنبەرەکانی بۆرییە ئاڵۆزەکەدا دەجووڵێن وەك ئەوەی سیستەمی سووڕی خوێنی جەستەی خۆم بێت.

ڕژێمی گازەکان لە ژێر کۆنترۆڵی توندا بوون، بەڵام هەر لادانێك هەموو هەوڵەکانمان هەڵدەوەشێنێتەوە و لەوانەیە کارەساتیشی لێبکەویتەوە. بیرم لەو حیساباتە ئاڵۆزە کردەوە کە هاوکارەکانم لە کۆلێژی ئیمپریال لە لەندەن فێری بوون و ئەو زانیاریانەی کە لە ڕاپۆرتەکانی هایدرۆدینامیکی بەدەستمان هێنابوو لە دەرەوەی وڵات و هەستم بە ئاسوودەیی کرد کە ئێمە بەشی خۆمان شارەزا بووین لە تەکنیکە پێویستەکان. هەندێك جار

زانا دەبێت ڕێگە بدات كە هەستەكانی ڕێنمایی بكەن بۆ شتە نەناسراوەكان و بۆیە لەگەڵ سووڕانەوەی هێكسافلۆرایدی یۆرانیۆم لە ڕێگەی سەنتەرفیوجەوە، هەستم پێی وتم كە هەوڵەكانمان لەم تاقیكردنەوەدا دەردەچن.

دوای چەند كاتژمێرێك لە نیگەرانی، دكتۆر عەبدوڵلا ڕایگەیاند كە هەموو گازە تیشكدەرەكە بە سەركەوتوویی لە ڕێگەی سەنتەرفیوجەوە تێپەڕیوە بۆ ژووری دەرهێنان. فەرمانم دا سەنتەرفیوجەكە دابخرێت و ئەوەبوو هاوارێك لە نێو ستافەكەمدا بەرز بووەوە. هاواری دڵخۆشی بوو، هێندە دڵخۆش بووین بەجۆرێك من و بەرپرسانی بەشەكەم لە ژووری كۆنترۆڵدا هەر لەخۆوە یەكترمان لە باوەش گرت. وەك ئەوەی تازە گەیشتبووینە لوتكەی شاخێكی بەرز، نەماندەتوانی لە پێكەنین بوەستین.

ئێمە هێكسافلۆرایدی یۆرانیۆمی پیتێنراومان نارد بۆ ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی بۆ شیكاری و كاتێك ئەنجامەكان دوای دوو ڕۆژ هاتنە پێشەوە، سەركەوتنەكانمان پشتڕاستكرایەوە. ئێمە یۆرانیۆمی پیتێنراومان بەرهەمهێنابوو، كە ئەمەش وەك گڵۆپی سەوز وابوو بۆ بەردەوامبوون لە كارگەیەكی پیشەسازی.

كاتێك حوسەین كامل هاتە ڕەشیدیە بۆ ئەوەی پیرۆزباییمان لێبكات، ڕووخسارێكی ئاسایی توند و تیژی بە زەردەخەنەیەكی خۆشحاڵییەوە حەشاردابوو، كە پێشتر سێ جاران ئەو حاڵەتەم بینیبووم: كاتێك بۆ یەكەمجار باسم لە ئەگەرەكانی سەنتەرفیوج كرد لە كۆشكی كۆماریی، هەروەها لە سەركەوتنی پێشوەختەی تاقیكردنەوەی بیمز چەند مانگێك دواتر، و هەروەها كاتێك بەربەستێكی بڵاوبوونەوەمان بەرهەمهێنابوو.

حوسەین کامل فەرمانی دەرکرد: "دە سەر مەڕ سەربڕنا"، وەك چۆن ساڵانێك پێشتر کردبووی. چەند خولەکێکی بەسەر برد بۆ دەستخۆشیکردن لە من و بەرپرسانی بەشەکەم و پاشان وەك خووی خۆی بە خێرایی شوێنەکەی بەجێهێشت. چێشتلێنەرە حکومییەکان گەیشتن و چەندین جۆری گۆشت برژاندن و کەبابیان خستە سەر خەڵووز بۆ ئاهەنگێکی گەورە، خواردنەکان لە تەشریب و خواردنەکانی تری عێراقی بۆ هەموو ستافەکەم ئامادە کرابوو. دە مەڕ هێنرانە ناو حەوشەی سەنتەری دیزاینی ئەندازیاری. بە پەیڕەوکردنی شێوازی تەقلیدی، چێشتلێنەرەکان بە چەقۆی درێژ، چەقۆیان لە قوڕگیان نا و خوێنەکە دەڕژایە سەر زەوی. هەندێك لە ئەندازیارە بچووکەکانم دەستیان لەناو شوێنی کۆبوونەوەی خوێنەکە، بە خوێن تەڕ کرد و وەك نیعمەتێك جێگە دەستی سووریان لەسەر دیوارەکانی تاقیگەی سەنتەرفیوج دروست کرد.

ئێمە هۆکارێکی باشمان لەبەردەست بوو بۆ ئەوەی هەست بە شانازی بکەین. لە ماوەی کەمتر لە سێ ساڵدا، ستافەکەمان کە تەنها دوو سەد ژن و پیاوی بەتواناى تێدابوو، لە هەنگاوی نەزانی بەرەو تەکنەلۆژیای سەنتەرفیوجەوە و بەرەو پیتاندنی سەرکەوتووانەی یۆرانیۆم و تا لێواری بەرهەمهێنانی بەرفراوان پێشکەوتبوون. یەکێك لە کلیلەکانی سەرکەوتنمان گونجاندن بوو. بەڵام تیمێکی زانا و ئەندازیاری لەڕادەبەدەر بەتوانامان هەبوو کە لە ژێر گەورەترین هێزی پاڵنەردا کاریان دەکرد کە مرۆڤ تاوەکو ئێستا بینیبێتی، ئەویش: ترس بۆ مانەوە لە ژیانیان و خێزانەکانیان.

لەسەر داوای حوسەین کامل، فەرمانم دا کە بیناسازی لە دامەزراوەی ئەلفورات لە یوسفیە کە نزیکەی سی کیلۆمەتر لە باشووری ڕۆژئاوای بەغداوە دوورە، خێراتر بکرێت بۆ تەواوکردنی ئەو چوارچێوەی پیشەسازییە کە پێویستە بۆ دروستکردنی سەد سەنتەرفیوج لە تۆڕێکدا کە پێی دەوترێت زنجیرە (کاسکەید). شلەمەنییەك سەنتەرفیوجەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە بەجۆرێك کە هێکسافلۆرایدی یۆرانیۆم بە زنجیرەیەکدا بەناویاندا تێپەڕێت، لە هەر قۆناغێکدا زیاتر دەوڵەمەندتر دەبێت تاوەکو دەگاتە ئەو پلەیەی کە پێویستە بۆ چەکی ئەتۆمی.

دامەزراوەی ئەلفورات بە شێوەیەك دیزاین کراوبوو سێ پێکهاتەی زەبەلاحی لەخۆ دەگرت، کە ڕووبەری ۳۳ هەزار مەتر چوارگۆشە بوو، لەگەڵ بینای پشتیوانی بچووکتر. بینایەك پێشتر تەواو بووبوو، لەلایەن کۆمپانیایەکی ئەڵمانیەوە وەك ناوەندێکی ڕاهێنان و وەرشە دروستکرابوو، کە ئێمە ئامێرەکانی شاوبلینمان تێدا دانابوو بۆ دروستکردنی پارچەکان. بینایەکی دیکە کە لە قۆناغی دروستکردنی دابوو، ئامێرەکانی دروستکردنی هوروژمی H&H لەخۆدەگرت بۆ دروستکردنی ڕۆتۆر. سێیەمیان لەلایەن کۆمپانیای ئەڵمانی ئینتەراتۆمەوە دیزاین کرابوو و ئامێری ژووری پاکی تێدابوو بۆ ئەوەی وەرشەی بۆری و ژووری کۆبوونەوە و هۆڵی کاسکەیدی سەنتەرفیوجی تێدابێت. دوای ئەوەی دیزاینەکانی سەنتەرفیوجی سوپەر گرینگم لە شاب وەرگرت، فەرمانم کرد گۆڕانکاری لە دیزاینی هۆڵی کاسکەددا بکرێت بۆ ئەوەی جێگەی وەشانی سەنتەرفیوجی سێ مەتری بەهێزتر بگرێتەوە.

بیرۆكەی پڕچەككردنی سەددام حسێن بە چەكی ئەتۆمی هێشتا دوور بوو لە كاتێكدا من و ستافەكەم لە نیازپاكی دەگمەنی حوسەین كاملدا خۆمان دەخولاینەوە. هەرچەندە حكومەتی سەددام سیاسەتی دار حەیزەرانی بەكارهێنا لەبەرامبەر زاناكانی، بەڵام لەهەمان كاتیشدا تامی تامی پێدەكردین. نزیكەی هەفتە و نیوێك دوای سەركەوتنی تاقیكردنەوەكەمان لەگەڵ نموونەی سەرەتایی، حوسەین كامل پەیوەندی پێوەكردین و هەواڵی ئەوەی پێداین كە سەددام دەستخۆشی فەرمی لێكردووین. من و هەشت ئەندازیاری باڵام ئۆتۆمبێلی نوێمان پێبەخشرا، باقی ستافەكەم بڕە پارەی جۆراوجۆریان وەرگرت. ئەوەبوو من ئۆتۆمبێلێكی جۆری سیدان ژاپۆنی چوار دەرگام هەڵبژارد كە ئەوەندە گەورە بوو بەڕادەییەك هەموو خێزانەكەمی تێدا جێگا دەبوویەوە. كاتێك بە ئۆتۆمبێلە نوێیەكە چوومەوە ماڵەوە و لەبەر دەرگا وەستاندم، لەیلا و منداڵەكان لە ماڵەكە ڕایانكردە دەرەوە و لەدەوری ئۆتۆمبێلەكە دەخولانەوە. بۆیە منیش هەر لەوێدا بەڵێنم دا كە بۆ پشوویەك بیانبەم بۆ شاخەكانی باكووری عێراق بۆ ئەوەی لە گەرمای بەتینی هاوینی بەغدا ڕزگارم بێت. تامەزرۆی دەرفەتێك بووم كە دوای سێ ساڵ لە نهێنی و نیگەرانی بەردەوام و بە تایبەتی هەندێك ڕۆژی بەنرخ بە تەنیا لەگەڵ خێزانەكەمدا دوور بكەومەتەوە و ئارام بگرم. چوونە داواكارییەكانی حوسەین كامل بۆ ماوەیەكی زۆر ئەم ئارامییەیان لێ دوورخستبوومەوە.و بڕیارمدا لە داهاتوودا كاتێكی زیاتر لە ماڵەوە بەسەر بەرم.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمە نەدەبوو وا بێت.

دوای چەند هەفتەیەك، بەیانی ٣ی ئابی ١٩٩٠ لەگەڵ لەیلا لە ناندینەكە نانی بەیانیمان دەخوارد، كە تەلەفزیۆنەكەم داگیرساند و هەواڵە شۆككەرەكەی بێژەرێكی دەوڵەتی عێراقم بیست. دەیان هەزار سەربازی سەددام لە شەودا چووبوونە ناو كوێت و شاری كوێتیان داگیركردبوو كە پایتەختی میرنشینە بچووكەكە بوو. فڕۆكە بۆمب هاوێژە شەڕكەرەكانی عێراق هێرشیان كردە سەر فڕۆكەخانە و ئامانجەكانی دیكە و دەگوترا زۆرێك لە خەڵكی كوەیت بەرەو سعودیەی دراوسێ هەڵدێن. ئەو لەشكركێشییە هەموو جیهانی تووشی سەرسوڕمان كرد.

من و لەیلا بەجۆرێك لە سەرسوڕمانەوە سەیری یەكترمان كرد. سەددام چەند هەفتەیەك بوو كوێتی تۆمەتبار دەكرد بە زیادەڕۆیی لە بەرهەمهێنانی نەوت و دابەزاندنی نرخ لە بازاڕە نێودەوڵەتییەكان، هەروەها بە نایاسایی بە دزەكردنی لە سنوورەوە بۆ ناو كێڵگەی نەوتی ڕومەیلە لە باشووری عێراق. بەڵام ئەگەری لەشكركێشییەكی تەواو، تەنیا دوو ساڵ دوای كۆتایی هاتنی شەڕ لەگەڵ ئێران، هەرگیز بە مێشكماندا نەدەهات. ڕەنگە لەبەر ئەوەی كاتێكی زۆرم لە دەرەوەی وڵات بەسەر بردبێت، یەكسەر هەستم كرد كە هێرشە سەربازییە بەپەلەكەی سەددام كاردانەوەی جددی دەبێت، هەرچەندە هێشتا زوو بوو بۆ ئەوەی بە تەواوی بڵێم كە چی ڕوودەدات.

نەتەوە یەكگرتووەكان زنجیرەیەك بڕیارنامەی ئیدانەكردنی ئەو لەشكركێشییەی پەسەند كرد و ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایش هەڕەشەی بەكارهێنانی هێزی سەربازییان كرد ئەگەر سەددام تا ١٥ی كانوونی دووەمی ١٩٩١ بەبێ مەرج لە كوێت نەكشێتەوە، لەناكاو ئەمریكا و یەكێتی سۆڤیەت و زۆربەی ئەورووپی و

ئاسايیەكان گەلی عێراقيان وەك دوژمنێكی مەترسيدار دەهاتە بەرچاوە، رێك وەك زۆربەی وڵاتانی دراوسێی عێراق. بۆیە پێشبینی شەڕی هاوپەیمانان شتێكی زۆر قورس نەبوو.

چەند رۆژێك دوای لەشكركێشییەكە، سەردانكەرێكی چاوەڕواننەكراوم بۆ ئۆفیسەكەم لە ڕەشیدیە وەرگرت. لەو كاتەوەی كە حوسەین كامل لە ساڵی ١٩٨٧دا لە ئاژانسی وزەی عێراقی دەریهێنام، بۆ من جێگای سەرسوڕمان بوو كە ببینم دكتۆر جەعفەر وا لە دەرگاوە دێتە ژوورەوە. من زۆر بەخێرهاتنم كرد، نەك هەر تەنها لەبەر ئەوەی ئەدەب بنوێنم بەرامبەری، بەڵكو من وەكو زانایەكیش زۆر رێزم دەگرت. ئەو هەرگیز چاوی لەسەر دامەزراوەكانمان نەبوو و تەنیا ئەوەم دەزانی كە دكتۆر جەعفەر لە هەمان ساڵاندا سەرپەرشتی بەرنامەیەكی دەوڵەمەندكردنی كارۆموگناتیسی كردووە. تەنیا تێڕوانینێكی ناڕوونم هەبوو كە هەوڵەكانی چۆن بووە، چونكە حوسەین كامل ئێمەی بە تەواوی لە یەكتر دابڕاندبوو، ئەمەش ڕەنگە بۆ هاندانی هەستكردن بە كێبڕكێی نێوان ئەو دوو بەرنامەیە بووبێت. پرسیاری لە پێشكەوتنی بەرنامەی سەنتەرفیوجەكەمان كرد. گومانم دەكرد ئەو پێشتر بە سەركەوتنی ئێمەی زانیبێت، و حوسەین كامليش بۆ كردنەوەی رێگای هاوكاری ناردوویەتی. سەرەتا بە قسەی ئاسایی دەستمان بە گفتوگۆكرد كە نەریتی سەرەتای هەر گفتوگۆیەكی عێراقییانەیە، پرسیارمان لە خێزانەكانی یەكتر كرد و پێكەوە كوپێك چامان خواردەوە. پاشان هاتە سەر مەسەلەكە.

بە شێوازە نەرم و نیانەكەی وتی: ئێمە پێمان خۆشە سەنتەرفیوجەكانتان بەكاربهێنین بۆ پیتاندنی بڕێكی سنووردار لە یۆرانیۆم و بەبڕی لە سەدا حەفتا بۆ نەوەد و سێ.

سه‌رم بۆی له‌قاند وه‌ك ئه‌وه‌ی ئه‌مه داواكارییه‌كی سروشتی بێت له نێوان دوو زانادا. دیاربوو ئاژانسی عێراقی بۆ وزه‌ی ئه‌تۆمی توانای پیتاندنی یۆرانیۆمی به هیچ شێوازێكی تر په‌ره پێنه‌دابوو.

پرسیم: "جا یۆرانیۆمی پیتێنراوی له‌سه‌دا حه‌فتا له كوێوه ده‌ستده‌كه‌وێت؟"، هه‌رچه‌نده پێشتر وه‌لامه‌كه‌م پێشبینی كردبوو.

دكتۆر جه‌عفه‌ر گوتی: "له ڕیاكتۆره‌كانه‌وه كۆگا هه‌یه."

سووته‌مه‌نی ڕیاكتۆره‌كه سالانێك بوو له (التویثه) به خاوی مابوویه‌وه. به‌لام كه‌وتبووه ژێر چاودێری نێوده‌وڵه‌تی وه‌ك له په‌یماننامه‌ی قه‌ده‌غه‌كردنی بلاوبوونه‌وه‌ی چه‌كدا هاتووه، كه عێراق له ساڵی ١٩٦٨ واژۆی كردبوو، لابردنی بۆ ده‌وڵه‌مه‌ندكردنی زیاتر پێشێلكردنی په‌یماننامه‌كه ده‌بێت و به دڵنیاییه‌وه له‌لایه‌ن پشكنه‌رانه‌وه سه‌رنجی ده‌درێت كه به‌پێی یاسا نێوده‌وڵه‌تییه‌كان ده‌بوو پشكنینی بۆ بكه‌ن هه‌ر چوار مانگ جارێك. هه‌نگاوێكی له‌و شێوه‌یه ده‌یتوانی ته‌نیا یه‌ك مانا بدات به‌ده‌سته‌وه، ئه‌ویش كه سه‌ددام له زووترین كاتدا بێهیوا بووه له چه‌كی ئه‌تۆمی.

ئه‌گه‌رچی دكتۆر جه‌عفه‌ر باسی وشه‌ی "بۆمب"ی نه‌كردوو، به‌لام مانا و مه‌به‌سته‌كه ڕوون بوو. بۆ ئه‌وه‌ی شایسته‌ی مه‌ترسییه‌كی له‌و شێوه‌یه بێت، ده‌بێ بڕی یۆرانیۆمی زۆر پیتێنراو به‌س بووبێت بۆ دروستكردنی یه‌ك ئامێری ئه‌تۆمی خاو. نزیكه‌ی چاره‌ك سه‌ده‌یه‌ك بوو دكتۆر جه‌عفه‌رم ناسیبوو. من وه‌ك كوڕی وه‌زیرێك له شانشینی پێشووی عێراق و وه‌ك فیزیاییه‌ك كه خاوه‌نی بڕوانامه‌ی دكتۆرا بووم له شاری بیرمینگهامی ئینگلته‌را په‌روه‌رده‌ی جوانی ئه‌وم ناسی. هه‌روه‌ها ئه‌وه‌ی له ڕوخساریدا بینیم، نیگایه‌كی سه‌رلێشێواوی نائارامكه‌ر بوو. چاوه زیره‌كه‌كانی گومانه‌كانی

دەردەخست. لەو ساتەدا درکم بە هەستێکی قووڵی هاوسۆزی لەگەڵیدا دەکرد. ئەو ڕواڵەتی پیاوێکی گەمارۆدراوی هەبوو کە نەیدەتوانی پەنجەکانی سەددام لە ملیەوە دەربهێنێت. بیرم لەوە کردەوە کە چۆن لە کۆتاییەکانی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا خراوەتە زیندانەوە. هەرچەندە هەڕەشەی ئاماژەپێکراو بەسەر هەموو زانایانی ئەتۆمی سەددامدا هەبوو، بەڵام دکتۆر جەعفەر بەو واقیعە ترسناکەدا تێپەڕیبوو.

ئێمە جۆرە نیگایەکمان ئاڵوگۆڕ کرد کە تەواوی داواکارییەکەی دەگەیاند، هەروەها ئەمە وەك هەستێکی هاوبەشی بێدەسەڵاتی وابوو. لێرەدا دوو زانا، ئەوەندە بەهێز بوون کە چەکێکی ئەتۆمی بدەن بە سەددام حوسێن، لەنێو گومان دا نقووم بوو بوون. لەگەڵ ئەوەشدا نەماندەتوانی بوێرین کار لەسەر گومانەکانمان بکەین، یان تەنانەت قسە بکەین و ناویان بنێین.

گوتم: پێویستم بە دروستکردنی لانیکەم پەنجا سەنتەرفیوج دەبێت.

دکتۆر جەعفەر وتی: هەرچی پێویست بێت بیکە. "دڵنیام کە حوسەین کامل هەر بڕە پارەیەك پێویست بێت بۆتان دابین دەکات، و هەروەها منیش بە هەر شێوەیەك بتوانم هاوکاریتان دەکەم."

ئەو قوربانیکردنەی حوسەین کامل دوای تاقیکردنەوە سەرکەوتووەکەمان نیشانی دابوو، دەستبەجێ لە ژێر فشاری بەریەکەوتنی ئامانجەکان و ئەو جەنگە بەهەڵم بوو. جارێکی دیکە دەستی بە سەردانە زۆرو زەبەندەکانی کردەوە بۆ ڕەشیدیە و داوای ئەنجامی نوێی دەکرد. فەرمانی بە من و ستافەکەم کرد کە

تاقیکردنەوەی زیاتری نموونە سەرەتاییەکان بوەستێنین و هەموو هەوڵەکانمان بەرەو دامەزراوەیەکی بەرهەمهێنانی یۆرانیۆم -کە بچووککراوەتەوە- ئاراستە بکەین. ئێمە سەرنجمان دەخستە سەر چەمك و دیزاینەکانی پەنجا سەنتەرفیوج لە ناو بیناکە لە ڕەشیدیە.

لیستی پارچە و ئامێرەکانمان زۆربەیان لە دەرەوەی وڵات دروستکرابوون. لەبەر ئەوەی پێش ئەوەی بچمە قۆناغی پیشەسازی لە ئەلفورات، پلانم دانابوو کە سەنتەرفیوجەکە لە نموونەی سەرەتاییدا پاڵاوتە بکەم، پێشتر پەنجا لەسەدی پارچە گرنگەکانمان لەبەردەستدا بوو. ڕەنگە موگناتیسی تەواومان لە ترێبباچەرەوە هەبووبێت، من درکم بەوەکرد، بە مەرجێك هیچ تێکچوونێك زیانیان پێ نەگەیەنێت. بەڵام داگیرکردنی کوێت کۆتایی بە هاوکارییەکانی کۆمپانیاکانی ئەڵمانیا، سویسرا، بەریتانیا و شوێنەکانی دیکە هێنا، ئەمەش بەو مانایە بوو کە دەبوو خۆمان پارچەی ونبوو دروست بکەین. ئێمە تەنیا نزیکەی بیست بۆری ڕۆتۆری ڕیشاڵی کاربۆنیمان لە کۆمپانیای شابەوە دەستخستبوو و ئەو ئامێرەی کە دەتوانین هەوڵی دروستکردنی زیاتری پێبدەین، نەگەیشتبوو. بەڕێز عەلی و دکتۆر ڕوەیدە فەتلاویم ڕەوانەی سەنگافورە کرد بۆ ئەوەی نامەیەکی نوێی قەرز بۆ ئامێرەکە لە بانکێك وەربگرن کە تا ئەوکاتیش بازرگانی لەگەڵ عێراقدا دەکرد.

ئەوان کەل و پەلەکانیان دانا و لەڕێگەی وڵاتی ئەردەنەوە بەخێرایی ناردیان، بەڵام لەم نێوەندەدا، تاکە بژاردەی دیکەمان ئەوە بوو کە تاقیکردنەوەی دروستکردنی بۆری لە پۆڵای پتەو بکەین و دواتر تێکەڵەیەك لە ڕۆتۆری پۆڵا و ڕیشاڵی کاربۆنی بەکاربهێنین. دکتۆر عادلم ناردبوو بۆ خولێکی ڕاهێنانی دوو

هه‌فته‌یی له‌گه‌ڵ ئامێره‌كانی دروستكردنی لێشاو له كۆمپانیای H&H Metalform و ئێستا ڕووبه‌ڕووی ئه‌ركی هه‌وڵدان بوو بۆ دروستكردنی بۆری ڕۆتۆر. كارێكی ترسناك بوو كه پێویستی به وردبینی هه‌بوو تا ئاستی یه‌ك مایكرۆن، یان بیست و پێنج هێنده بچووكتر له بچووكترین ته‌نۆلكه كه به چاوی ڕووت ده‌بینرێت. سه‌باره‌ت به ئامێری پێچانی كاربۆن، تا دوای كۆتایی هاتنی جه‌نگ و به‌رنامه‌كه‌مان له ڕه‌فه‌دا مایه‌وه نه‌ده‌گه‌یشته ئه‌رده‌ن. ئامێره‌كه له كۆگایه‌كی ئه‌رده‌نی دانرابوو تا پشكنه‌رانی چه‌ك دۆزییانه‌وه.

بۆ ئه‌وكات ژماره‌یه‌كی ناته‌واو له پێكهاته گرنگه‌كانی ترمان هه‌بوو، وه‌كو په‌مپه گه‌ردیله‌ییه‌كه بۆ دروستكردنی بۆشایی له سیسته‌مه‌كه‌دا، به‌رگی ده‌ره‌وه‌ی سه‌نته‌رفیوج و كه‌یسی ماتۆڕ. ئه‌گه‌ر ده پارچه‌ی به‌ستنه‌وه‌ی مسمان هه‌بووایه، پێویستمان به چل پارچه‌ی دیكه بوو. حوسه‌ین كامل دروستكردنی پارچه ونبووه‌كانی به هه‌ندێك له ئه‌ندازیارانی دكتۆر جه‌عفه‌ر به‌خشی، ئه‌مه‌ش ڕێگه‌ی به من و ستافه‌كه‌م دا خۆمان ته‌رخان بكه‌ین بۆ دیزاینی زنجیره (كاسكه‌د) و هه‌ماهه‌نگی ته‌واوی پڕۆژه‌ی سه‌نته‌رفیوج. تیمێك له ئه‌ندازیاره‌كانمان نارد بۆ ئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ گروپی دكتۆر جه‌عفه‌ر باس له به‌كارهێنانی ئامێری شلكردنه‌وه و سوڕاندنی شاوبلن بكه‌ن. به‌ڵام سه‌خت بوو. پشتمان به شاره‌زایی بیانی به‌ستبوو و زۆرێك له پارچه هه‌ستیاره‌كانمان له وۆرك شۆپه‌كانی ئه‌وروپادا دروست ده‌كرد. ئێستا ئێمه پشتمان به خۆمان به‌ستبوو، هه‌وڵمان ده‌دا ئه‌و كارامه‌ییانه‌ی كه به‌م دواییه به‌ده‌ستمان هێنابوو له بواری ئامێرسازیدا بگوازینه‌وه بۆ ئه‌و ئه‌ندازیارانه‌ی كه به به‌رنامه‌كه‌مان ئاشنا نه‌بوون. زۆرێك له به‌شه‌كان پێویستیان به

وردبینی هەبوو تا دوو مایکرۆن و وەك هەوڵەكانی دكتۆر عادل بۆ دروستكردنی بۆرییەكانی هوروژم، چونكە ئەندازیاری لەم ئاستەدا دەچێتە ناو جیهانێكی جیاوازەوە. دەبێت بارودۆخەكان بە توندی كۆنترۆڵ بكرێن لە ژینگەیەكدا كە گەرمی جەستەی تاكە كەسێك -كە دەچێتە ژوورەكەوە- بتوانێت پلەی گەرمی بە رادەیەك بەرز بكاتەوە كە بتوانێت ئامێرەكە بگۆڕێت. لە مانگی ئۆكتۆبەردا دكتۆر فەریدم نارد بۆ ئەوەی سەردانی هاوتاكانمان بكات لە گروپی دكتۆر جەعفەر، ئەویش بەو بۆچوونە گەڕایەوە كە چەند مانگێكی دەوێت تا شارەزابن لە تەكنەلۆژیا و دروستكردنی قورسترین پێكهاتەكان بە شێوەیەكی دروست.

لە ڕەشیدیە، كاتێك پێكهاتەیەكی نوێمان دانا و هۆڵێكی شلەمەنیمان دروستكرد، پاسەوانەكانی حوسەین كامل هەستیان بە مەترسی دەكرد. ئێمە دیوارێكی چیمەنتۆی ئەستووری مەترێكمان دیزاین كرد، بەنزیكەی بەرزی سنگ، لە ناوەڕاستی ژوورەكەدا، كە بیست و پێنج كۆشكی یەكسان لە هەر لایەكدا هەبوو بۆ ئەوەی ڕێگە لە سەنتەرفیوجی دانراو بگرێت. پێكهاتەكە كە بۆ نەهێشتنی لەرزین بە تەواوی دیزاین كراوبوو، هەندێك جار بە شوێنی پیس (پیسۆیر)[1] ناودەبرا، چونكە دیوارێكی دوولایەنەی میزڵدانەكانی تێدابوو. وەك چۆن لەگەڵ سەنتەرفیوجی نموونەییەكەدا هەمانبوو، بلۆكی كاسكەیدەكەمان لە ژوورێكی پاك دانا. كۆنترۆڵێكی تەنیشت یەكتر لە پەنجەرە ئەستوورەكانەوە دانرابوو.

ئەركی سەرەكیمان دیزاینكردنی ڕەوتی شلەمەنی بوو، كە

[1] Pissoir

زانستێکی تەواو جیاوازە لە دروستکردنی تاکە سەنتەرفیوج. بۆ چەند هەفتەیەك حیسابمان دەکرد کە چەند کیلۆگرام هێکسافلۆرایدی یۆرانیۆم دەبێ بچێتە ناو شلەمەنیەکەوە، و بە چ ڕێژەیەك، بە لەبەرچاوگرتنی بڕی ناو هەر سەنتەرفیوجێك لە هەر کاتێکدا. فۆرمولەی بیرکاری ئاڵۆز بووە هۆی ئەوەی بگەنە ئەو ئەنجامەی کە شلەمەنی پەنجا سەنتەرفیوج، -ئەگەر تەواو بێت- دەتوانێت لە چەند مانگێکدا یۆرانیۆمی پیتێنراوی لەسەدا ٧٠ بکاتە ڕێژەی ٩٣، واتە ئەو ڕێژەیەی کە پێویستە بۆ چەکێك.

لە ٨ی تشرینی دووەمی ١٩٩٠ ئەمریکا ئامادەکارییەکانی بۆ هێرشێك بۆ سەر عێراق بە ناوی ئۆپەراسیۆنی گەردەلوولی بیابانی ڕاگەیاند، کە ئەگەر سەددام نەتوانێت وادەی ١٥ی کانوونی دووەم جێبەجێ بکات، دەستپێدەکات. سەدان هەزار سەرباز لە زیاتر لە سی و پێنج وڵاتەوە دەستیان کرد بە نیشتنەوە لە سعودیە و لەوێش بەدرێژایی سنوورەکانی کوەیت و عێراق پێگەی هێرشبەریان گرتە دەست. هەرچەندە ناچار بووم زۆرترین کات لە ڕەشیدیە بەسەر بەرم، بەڵام شەوانە تا دەمتوانی دەگەڕامەوە ماڵەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ خێزانە نیگەرانەکەمدا بم. لەگەڵ ڕیزکردنی دراوسێ عەرەبەکانی وڵاتی عێراق دژی خودی عێراق و زیادبوونی هەڕەشەکانی داگیرکاری بە سەرکردایەتی ئەمریکا، من و لەیلا لە درەنگانی شەودا چەندین گفتوگۆی ئازاربەخشمان هەبوو سەبارەت بە لێکەوتەکانی ئەگەری شەڕ.

لە خۆمم پرسی، ئایا ئەمە کۆتایی سەددامە؟ چوون ئەم بەریەکەوتنی ئامانج و تێکچڕژانە، نائومێدییەکەی لە یەك چەکی ئەتۆمی نیشان دا کە بۆمبێکی خام بوو. بەڵام لە بەرامبەر ئەو هێزە

سەرسەختەی هەموو جیهاندا، دەکرێت سەددام بیر لە چی بکاتەوە؟ لە غیابی هیچ وەڵامێکی ئاشکرادا، بەشێوەیەکی زانستی هەوڵمدا ئەمە ڕوون بکەمەوە. بۆ هەر چەکێك تەنها دوو بەکارهێنانی هەیە: شێوازی بەکارهێنانی هێرشبەری یان بەرگری. ئەگەر بەکارهێنانی مەبەست لێی هێرشبەرانە بووایە، ڕەنگە سەددام بیەوێت چەکی ئەتۆمی ڕاستەوخۆ دژی یەکێك لەو گەلانە بەکاربهێنێت کە هەڕەشەی داگیرکاری دەکات. بەڵام ئەمە پێویستی بە ئامرازی مەودای دوور دەبێت بۆ گەیاندنی باری سوودبەخش، بەڵام ئەمە پێویستی بە هاوێژەری دوور مەودا هەبوو. بۆیە تاکە بژاردەی هێرشبەری دیکەی ئەو، هێرشی ئەتۆمی بوو بۆ سەر وڵاتێکی نزیك. لەم حاڵەتەشدا ئامانجی ئاشکرا ئیسرائیل دەبێت، ڕەنگە لە هەوڵێکدا بێت بۆ کۆکردنەوەی گەلانی عەرەب لە پشت خۆیەوە و بەدەست هێنانی سەرنجیان. بەڵام بە دڵنیاییەوە ئیسرائیل بە دژە-هێرشێکی لەناوبەر تۆڵەی دەسەندەوە، چونکە خاوەنی جبەخانەیەکی ئەتۆمی فراوانی تایبەت بە خۆی بوو.

ستراتیژی بەرگری زیاتر مانای هەبوو، سەددام چەکی ئەتۆمی وەك ڕێگرییەك لە لەشکرکێشی دەویست. بەڵام ئەگەر بەڕاستی هەستی بەوە کردبێت کە چەکی ئەتۆمی وەکو ڕێگرییەك گرنگە، ئەوا تاکە ڕێڕەوی لۆژیکی ئەوەیە کە ڕووبەڕووبوونەوەیەك دوابخات تاوەکو ڕووبەڕووبوونەوەیەکی تری دەبێت. ڕەتکردنەوەی ئەو لە جووڵە دەریخست کە عێراق لە چنگی سەرکردەیەکی وەهمییدایە کە هیچ بیرکردنەوەیەکی ستراتیژی درێژخایەنی نییە.

لە هەر حاڵەتێکدا بوونی یەك بۆمب لە دژی باقی هێزی جیهان

چی مانایه‌كی هه‌بوو؟ به‌شێكی كه‌م له چه‌كی ئه‌تۆمی له‌لایه‌ن ئه‌مریكاوه ده‌توانێت به چركه به‌غدا، یان هه‌موو عێراق بكاته وێرانه. هه‌ر بیرۆكه‌ی به‌كارهێنانی بۆمبێكی خام له به‌رامبه‌ر ئه‌و توانایه وێرانكه‌ره‌دا شێتانه بوو. به‌مجۆره وێنه‌ی ترسناك هاته مێشكم كه هاونیشتمانییه‌كانم له هێرشێكی به‌رپه‌رچدانه‌وه‌ی ئه‌تۆمیدا له ماڵه‌كانیاندا ده‌بنه خه‌ڵووز.

سوپاس بۆ خوا، ڕه‌نگه جیهان هه‌رگیز درك به‌وه نه‌كات كه ئه‌گه‌ر هاتباو سه‌ددام بۆمبی ئه‌تۆمی هه‌بووایه ئه‌وا چی لێده‌كرد. تا مانگی كانوونی دووه‌می ساڵی ۱۹۹۰ -كه خه‌ریك بوو قه‌یرانه‌كانی سه‌ر كوێت به‌ره‌و لوتكه ده‌ڕۆیشتن- زانیم كه هێشتا چه‌ند مانگێكمان ماوه بۆ به‌رهه‌مهێنانی ماده‌ی پێویست بۆ چه‌كێك. زانیاریم بۆ هات كه دكتۆر خالید ئیبراهیم سه‌عید پێشكه‌وتنی له دروستكردنی ئامێرێكی ته‌قه‌مه‌نی ڕاسته‌قینه‌دا به‌ده‌ستهێناوه به‌ڵام زۆر دووره له ئاماده‌یی بۆ ئه‌وه‌ی یۆرانیۆمی پیتێنراو بكاته بۆمب. به‌ربه‌ستێكی دیكه به‌رهه‌مهێنانی هێكسافلۆرایدی یۆرانیۆم بوو. هه‌رچه‌نده ئه‌مه كارێكی زۆر ئاسانتر بوو له دروستكردنی سه‌نته‌رفیوج، به‌ڵام ئێمه كاره‌كه‌مان ڕاده‌ستی تیمێكی ئاژانسی وزه‌ی عێراقی ئه‌تۆمی كردبوو و ئه‌وانیش كێشه‌یان هه‌بوو له گۆڕینی سووته‌مه‌نی ڕیاكتۆره‌كه بۆ گازی مه‌ترسیدار و زۆر تیشكده‌ر. ئه‌م ڕاستییه دواتر بووه هۆی سه‌رسوڕمانی پشكنه‌رانی نێوده‌وڵه‌تی چه‌كی نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان. له ماوه‌ی ساڵانی نه‌وه‌ده‌كاندا چه‌ندین جار پرسیاریان ده‌كرد كه ئایا ئێمه بڕێكی زۆر له یۆرانیۆم هێكسافلۆرایدمان به‌رهه‌م هێناوه؟ هه‌ستیان ده‌كرد سه‌ركه‌وتنمان له دروستكردنی سه‌نته‌رفیوجدا ئاماژه‌یه بۆ ئه‌وه‌ی كه توانای به‌رهه‌مهێنانی هه‌ر بڕه سووته‌مه‌نییه‌كی خاومان هه‌یه كه

ئارەزووی بكەین، بەو پێیەی كارێكی ئاسانترە. ئەوان نەیاندەتوانی لەوە تێبگەن كە سەرچاوەكانمان سنووردار بوو، و ساڵانێك بوو زۆرینەی ڕەهایانم خستۆتە سەر زاڵبوون بەسەر كێشە چالاكترەكەی خودی سەنتەرفیوجەكەدا.

تا كۆتایی مانگی كانوونی دووەم، نزیك بووین لە تەواوكردنی دروستكردنی هۆڵی كاسكەیدەكەمان. ئەو شتەی كە هێشتا لێمان كەم بوو، پێكهاتەی سەرەكی بوو بۆ كۆكردنەوەی پەنجا سەنتەرفیوج. دوای شكستێكی زۆر، دكتۆر عادل سەركەوتوو بوو لە دروستكردنی یەك بۆری ڕۆتۆری تەواو لە پۆڵایەكی پتەو و بەمەش ڕەنگە توانیبوای زیاتر بەرهەم بهێنێت ئەگەر هاتبا و كات ڕێگەی پێدابا. هەرچەندە تیمی دكتۆر جەعفەر هێشتا بەشە ونبووەكانیان بەرهەم نەهێنابوو، بەڵام شلەمەنیەكەیان لە دەست دا بوو. بەڵام بەهۆی ئەو سنوورە كاتییە مەحاڵەوە مەحكوم بوو.

لە ڕۆژانی پێش وادەی ١٥ی كانوونی دووەم بۆ كشانەوە لە كوێت، پێدەچوو شتێكی گاڵتەجاڕانە بێت كە سەددام لە بەرامبەر لەشكركێشیدا داواكارییە نێودەوڵەتییەكان پێشێل بكات. بەڵام ئەوەبوو ئەم زەنگی ئاگادار كردنەوەی پشتگوێ خست و چارەنووسی هەموو تاكێكی لە عێراق بۆ چەندین ساڵی داهاتوو دیار كرد. لە ١٥ی كانوونی دووەمدا بەغداد وەك شارۆچكەیەكی جنۆكانی لێ هاتبوو لە كاتێكدا هەمووان چاوەڕێی زریانەكە بوون. ئەوەبوو هێرشەكە لە نزیكەی كاتژمێر ٢ی بەیانی ڕۆژی دواتر دەستی پێكرد. لەگەڵ بۆردومانێكی گەورە كە بەغدای بەئاگا هێنا.

فەرمانە سەرەتاییەكانم لە حوسەین كاملەوە ئەوە بوو كە لە سەنتەری دیزاینی ئەندازیاری لەگەڵ ستافی باڵام بیست و چوار

كاتژمێر لە كاتی بۆردومانەكەدا بمێنمەوە. فەرمانەكە دڕندانە دەركەوت و هیچی كەمتر نەبوو لە نیشاندانی هاودەنگییەكی زۆرەملێ لەگەڵ ڕژێمی سەددام دا. لە ماوەی چەند هەفتەی داهاتوودا، بۆمب هاوێژە بیانییەكان هێرشیان كردە سەر دامەزراوەكانی حكومەت، لەوانەش شوێنە ئەتۆمییەكانی التویثە؛ دامەزراوەكانی EMIS ی دكتۆر جەعفەر لە الطارمیە و بێجی، و دامەزراوەی دكتۆر سەعید لە الاثیر. ئێمە زۆر هەوڵمان دابوو بۆ ئەوەی كۆمپاوندەكەمان بە نهێنی بهێڵینەوە، بەڵام هیچ ڕێگەیەك نەبوو بزانین كە ڕەنگە دەزگا هەواڵگرییە بیانییەكان چەندە لەبارەی بەرنامەكەمان لە ڕەشیدیە ئاگادار بووبن. ڕیزێك لە كۆشكەكانمان لە كۆتایی ڕۆژئاوای دامەزراوەكە پاككردەوە كە لەلایەن تیمەكانی چاككردنەوە و ئاسایشەوە بەكارهێنرابوون. ئێمە لەسەر تەختە خەوەكانی منداڵان دەخەوتین، بە شێوازی بەشەناوخۆیی، ترسمان لەوە هەبوو كە ڕەشیدیە لێی بدرێت و بۆردومان بكرێت و دوا شت كە لەم ژیانەدا دەیبیستین، فیشەی بۆمبێك بێت كە بەرەو ڕوومان دێت.

لە سێیەم ڕۆژی هێرشەكەدا، حوسەین كامل هات و فەرمانی دا بە هەڵوەشاندنەوەی تەواوی دامەزراوەی سەنتەرفیوج بە شێوەیەكی كاتی. لە ڕۆژانی دواتردا من و ستافەكەم بە وریاییەوە ڕۆتۆرەكانمان لە پێكهاتەكانیان هەڵوەشاندەوە و پارچە سەرەكییەكانی سیستەمی هێكسافلۆرایدی یۆرانیۆممان جیاكردەوە و ڕادەستی تیمێكی ئاسایشی تایبەتمان كرد، كە ئەوانیش بەپەلە لە بیناكانی دەرەوەی شار و خانووی كێڵگە گوندنشینەكاندا دەیانشاردەوە. جگە لەو ئامێرانەی لە هۆڵی كاسكەید و تاقیگە نموونەییەكان دانرابوون، كۆگایەكی شەش هەزار مەتر

چوارگۆشه‌مان به سه‌دان تۆن ئامێری كۆكراوه به‌تاڵكردەوه. من سه‌یری ئاسمانم ده‌كرد و دڵنیا بووم له‌وه‌ی كه جوڵه‌كانمان له‌لایه‌ن مانگه ده‌ستكرده‌كانی ڕۆژئاوا یان فڕۆكه‌ی سیخوڕییه‌وه ده‌بینرێت. نزیكه‌ی ١٥٠ بارهه‌ڵگر له ڕه‌شیدیه‌وه ده‌هاتن و ده‌چوون، سندوقی پێكهاته و كه‌ره‌سته‌ی خاویان به عه‌ره‌بانه ده‌برد بۆ شوێنی حه‌شاردان. ده‌زگا ئه‌منییه‌كان سندوقه قورسه‌كانی پۆڵای پته‌ویان برد و له ناوچه‌ی كشتوكاڵی تاجی باكوری به‌غدا نێژران. گشت ئامێر و كه‌ره‌سته‌ی ئه‌وروپییان له ئه‌لفورات و وه‌رشه‌ی تر چۆڵ كرد. نزیكه‌ی سه‌د سندوق به‌ڵگه‌نامه‌یان كۆكرده‌وه تاوه‌كو حه‌شاری بده‌ن و دوور بخرێنه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی دواتر به‌كاریبهێنن.

له یه‌كێك له كۆتا ڕۆیشتنه‌كانمدا به‌ناو بینای ئیداره‌دا، له ئۆفیسه‌كه‌مدا وه‌ستام بۆ كۆكردنه‌وه‌ی كۆپی دیزاینه‌كانی سه‌نته‌رفیوجه‌كانم، كه بڕیارمدابوو بیبه‌مه‌وه ماڵه‌وه بۆ پاراستنیان. هه‌روه‌ها نموونه‌ی چوار پێكهاته‌م كۆكرده‌وه كه له‌سه‌ر ڕه‌فه‌یه‌ك له ئۆفیسه‌كه‌مدا دانرابوون: بنكه‌ی خولاوه‌ی تۆپه‌كه، ماتۆڕ، بنكه‌ی سه‌ره‌وه‌ی موگناتیسی و زه‌نگ بۆ سه‌نته‌رفیوجی زۆر گرینگ. ئه‌م شته به‌نرخانانه‌م له‌ناو سندوقی كارتۆندا كۆكرده‌وه له‌گه‌ڵ زیاتر له دوو سه‌د ڕاپۆرت كه به وردی چۆنیه‌تی دروستكردنی هه‌ر پارچه‌یه‌كی سه‌نته‌رفیوجیان ڕوونكرده‌وه. ڕاپۆرته‌كان تێبینی دیزاینی وه‌رگێڕدراو بۆ زمانی عه‌ره‌بی و هه‌روه‌ها تایبه‌تمه‌ندی ته‌كنیكی بۆ دروستكردنیان له‌خۆگرتبوو. له‌و كاته‌دا به‌شێوه‌یه‌كی كه‌م بیرم له بڕیاره‌كه‌م ده‌كرده‌وه كه ئه‌م شتانه ببه‌مه‌وه ماڵه‌وه. وا دیار بوو كاره‌كه سروشتی بوو كه بمه‌وێت له له‌ده‌ستدان یان له‌ناوچوونیان بیان پارێزین. چونكه ئه‌و

ڕاپۆرت و كاغه‌زانه نوێنه‌رایه‌تی ساڵانێك له ماندووبوون و فێربوونیان ده‌كرد و منیش به هه‌مان ئه‌و هه‌سته پڕ له شانازییه‌وه سه‌یرم ده‌كردن كه ڕۆماننووسێك به‌رامبه‌ر به ده‌ستنووسێكی ڕه‌سه‌ن هه‌یه‌تی. ئه‌گه‌ر ئه‌و كاته بیرم له‌و كێشه‌یه كردبایه‌وه كه بۆم دروست ده‌كه‌ن، ڕه‌نگه به‌شێوه‌یه‌كی جیاواز بیرم له بابه‌ته‌كه كردبایه‌وه. ئه‌وه‌بوو كارتۆنه‌كانم خستنه ناو سندوقی ئۆتۆمبێله‌كه‌مه‌وه و بردمنه‌وه ماڵه‌وه و به‌شێوه‌یه‌كی كاتی له گه‌راجه‌كه‌مدا هه‌ڵمگرتن.

سوپای هاوپه‌یمانان له شه‌وی ٢٣ی شوبات هێرشی وشكانی ده‌ستپێكرد، به له‌شكركێشی سێ قۆڵی بۆ سه‌ر لای كوه‌یت و باشووری ڕۆژئاوای عێراق كه به خێرایی سه‌ربازانی عێراقی له‌ناو شانشینی داگیركراو و ده‌وروبه‌ری گه‌مارۆدا. ئه‌و هێرشه تۆقێنه‌ره بووه هۆی كوژرانی ده‌یان هه‌زار سه‌ربازی عێراقی. هه‌زارانی تریش خۆیان ڕاده‌ست كرد و زۆرێكیشیان جێهێڵران. له ماوه‌ی دوو ڕۆژدا سه‌ددام كشانه‌وه‌ی له كوێت ڕاگه‌یاند. له هه‌ڵمه‌تێكی بێمانای تێكده‌رانه‌دا، زۆرێك له سه‌ربازه‌كانی سه‌ددام فه‌رمانێكیان په‌یڕه‌وكرد بۆ تێكدانی ژێرخانی كوێت و پیشه‌سازی كوێت له‌كاتێكدا پاشه‌كشه‌یان ده‌كرد. ده‌یان بیره نه‌وتیان ئاگر تێبه‌ردا و نه‌وتێكی زۆریان ڕژاند و ئاگریان تێبه‌ردا و هه‌وایان به دوكه‌ڵی ڕه‌ش ژه‌هراوی كرد. هه‌وره‌كه به درێژایی ناوچه‌كه درێژبووبویه‌وه تاوه‌كو گه‌یشتبووه به‌غدا و دوكه‌ڵی تاڵ كونه‌كانی لووتمی پڕ كردبوو. ئه‌مریكا و هاوپه‌یمانه‌كانی -كه ئاماده نه‌بوون ئه‌ندامانی وڵاتانی عه‌ره‌بی هاوپه‌یمانییه‌كه جێبهێڵن- پاشه‌كشه‌یان كرد له هه‌ڕه‌شه‌كان بۆ داگیركردنی عێراق به ته‌واوی و لادانی سه‌ددام.

ئەوەبوو سەد كاتژمێر دوای دەستپێكردنی لەشكركێشییەكە، ئاگربەست ڕاگەیەندرا.

ڕەنگە سەددام بەهۆی مەرجە ناڕوونەكانی ئاگربەستەوە بوێرتر بووبێت، بۆیە فەرمانی دەستپێكردنەوەی دەستبەجێی بەرنامەی سەنتەرفیوجی دەركرد. حوسەین كامل وەك ئەوەی من بینیومە تووڕە بوو، داوای لێكردین هەوڵەكانمان دوو هێندە بكەین بۆ بەرهەمهێنانی یۆرانیۆمی پیتێنراوی پێویست بۆ چەكی ئەتۆمی بە زووترین كات. من و ستافەكەم شەو و ڕۆژ كارمان دەكرد، چونكە تیمی ئاسایشی تایبەت (SSO) ئامێرەكانی لە شوێنی حەشاردانەكانیان دەهێنایەوە. ئەوەبوو یەكەم هەنگاومان ناوە بۆ دووبارە بنیاتنانەوەی ژوورە پاكەكان و كۆكردنەوەی هەموو شتێك وەك چەند هەفتەیەك پێشتر. بەڵام لە ماوەی چەند هەفتەیەكدا تێبینی زۆر شتمان كرد. نەتەوە یەكگرتووەكان مەرجەكانی بۆ ئاگربەستی هەمیشەیی دانابوو كە بریتی بوو لە چەكداماڵینی عێراق لە چەكی كۆمەڵكوژی. لە ٢ی نیسانی ١٩٩١ ئەنجومەنی ئاسایش داواكاری توندی خستەڕوو: عێراق دەبێت بەرپرسیارێتی زیانەكان وەربگرێت و قەرەبووی كوێت بكاتەوە، چەكی كیمیایی و بایۆلۆژی و موشەكی بالیستیكی لەناوببات و هەموو بەرنامەكانی چەكی ئەتۆمی ڕابگرێت. لەژێر هەڕەشەی نوێكردنەوەی كردەوەی سەربازیدا، دوای چوار ڕۆژ، سەددام ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر ئەوەی ڕێگە بە پشكنەرانی نێودەوڵەتی چەك بدات بچنە ناو عێراقەوە.

حوسەین كامل فەرمانی پێداین جارێكی تر هەموو شتێك لە ڕەشیدیە هەڵبوەشێنینەوە، پاشان هەموو دامەزراوەكە حەشاربدەین. ئێمەیش ژوورە پاكەكە و بۆریەكانمان لابرد و دیوارەكانی

تاقیگەی سەنتەرفیوجەکەمان بۆیە کرد و دەستکاری ژمارەیەك لە پێکهاتەکانمان کرد. هەروەها زەوییەکی کۆنکریتی نوێمان ڕشت بۆ ئەوەی ئەو چاڵانە پڕبکەینەوە کە بۆ ستاندی سەنتەرفیوج دیزاین کرابوون. ئێمە ئۆفیسەکانمان لە هەموو بەڵگەنامەکان پاککردەوە و لەجیاتی ئەوانە، خشتەی داڕشتن و کەرەستەمان دانا کە پێشنیاری کاری ئەندازیارییان دەکرد لەسەر پرۆژەکانی پاککردنەوەی ئاو.

دواتر بیستم SSO کە بەرپرسی شاردنەوەی کەرەستەکان بوو، فەرمانێکی سەیریان پێدراوە: ماددەیەکی پێویست بۆ سەد سەنتەرفیوج کۆبکەنەوە و بە جیا بیانشارنەوە. ئەوەی سەیر بوو لەم فەرمانەدا ئەوە بوو کە من و ستافەکەم بەشدار نەبووین لە هەڵبژاردنی مادەکاندا. ئەمەش بۆ پیاوە ئەمنییەکان کە تاڕادەیەکی زۆر ناخوێندەوار بوون، ئەرکێکی بێهیوا بوو. وەك چۆن بوو ئێمە کەرەستەی پێویستمان نەبوو تەنانەت بۆ پەنجا سەنتەرفیوجی تەواو. پێدەچوو بیرۆکەیەکی خەیاڵی بێت، لە ناوەڕاستی ئەم ئاژاوەدا بە خراپ بیری لێکرابووەوە.

حوسەین کامل فەرمانی پێداین کە هەموو ئەو دیزاین و بەڵگەنامە و پارچەی یەدەگ و نموونە سەرەتاییانەی کە لەبەردەستماندا بوون، ڕادەستی خزمەتگوزارییە ئەمنییەکان بکەین. زۆرێك لە ئەندازیارەکانم نەخشەی ئەو بەشانەیان هەبوو کە بەرپرسیار بوون لێیان و بەرهەمی چەندین کاتژمێر کارەکانیان ڕادەستی ئەوان دەکرد، ڕێك وەك ئەوەی سزادراوان لە دەروازەکانی زیندان کەلوپەلی تایبەتی خۆیان ڕادەست دەکەن. بە حوسەین کاملم گوت پێویستە بە ئۆتۆمبێل بچمەماڵەوە بۆ ئەوەی تەواوی کەرەستەکان و پێکهاتەکانی کۆبکەمەوە.

حوسەین كامل: "تەواوی كەرەستەكان؟ لە ماڵەكەت دا تەواوی كەرەستەكان هەیە؟".

گوتم: بەڵێ. "لە كاتی بۆردومانەكەدا بردمنە ماڵەوە، لەگەڵ چەند پارچەیەكی نموونەیی."

بۆ ساتێك وەستا و كەمێك بیری كردەوەو گوتی: نەخێر، بۆ ئێستا بیانهێڵەرەوە، تا ئەوكاتەی پێت دەڵێمەوە.

نەمدەتوانی بزانم چی لە مێشكیدایە، بەڵام ئەوە هەستێكی نائارامی بۆ بەجێهێشتم. لە كاتێكدا ئەندازیار و ستافە بچووكەكانم ئەو ڕۆژە ڕەشیدیەیان بەجێهێشت و هیچی تریان بەدەستەوە نەبوو جگە لەو زانیارییەی لە مێشكیاندا بوو، كەچی من پێچەوانەی ئەوان، خاوەنی بەڵگەی فیزیكی بووم كە ڕەنگە ڕۆژێك بێت ببێتە پرسێك لەگەڵ پشكنەرانی چەك و بتوانێت لە نزیكەوە من بە حوسەین كامل و سەددامەوە ببەستێتەوە. لەو ساتەدا بە تەواوی گومانەكانم بۆ دروست نەبوون، بەڵام خۆزگەی ئەوەم خواست كە هەرگیز دیزاین و پێكهاتەكانم نەهێنابایە ماڵەوە.

# بەشی حەوتەم
# شاردنەوەی چەکی ئەتۆمی

دکتۆر هومام عبدالخالق غەفور وتی: "سبەی، ئێوە لەبەردەم پشکنەرانی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی دەبن. کەواتە پێم بڵێ، چۆن چێژت لە ساڵانی کارکردنت بینی لە وەزارەتی پیشەسازی ؟"

دکتۆر هومام لە دیوەکەی ئەولای مێزی بەڕێوەبەری گشتی خۆی لە IAEC بە شێوەیەکی گاڵتەجارانە زەردەخەنەی کرد، ئەمە لەکاتێك ڕاهێنانی پێدەکردم لەسەر دروستکردنی چیرۆکێك بۆ شاردنەوەی کارەکان. پاییزی ساڵی ۱۹۹۱ بوو، نزیکەی شەش مانگ دوای ناردنی یەکەم تیمی پشکنەری چەك لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بۆ عێراق. ستراتیژی سەددام بۆ پووچەڵکردنەوەیان، منی لە ڕۆڵێکی سەرەکیدا لە هەوڵەکانی شاردنەوەدا قفڵ کردبوو. سەنتەرفیوج بە گەوهەرێك لە تاجی بەرنامەکانی WMD دادەنرا، بۆ ئەوەی لە سەرووی هەموو شتێکەوە بشاردرێتەوە. ئەو بەرپرسانەی کە ئاراستەکردنی شاردنەوەی چەکی کۆکوژی عێراق دەکەن، ڕەنگە پێیانوابووبێت ئەگەر سازش لەسەرم نەکرێت، ئەوا دەستپێکردنەوەی بەرنامەی سەنتەرفیوج ئاسانتر دەبێت. چوون من دروستکەری ئەو بەرنامە بووم و تاکە کەس بووم کە لە نزیکەوە هەموو وردەکارییەکانی دەزانی. بۆیە وەك سەرمایەیەك مامەڵەیان لەگەڵ کردم، وەك شتێك

كە دەبێت لەگەڵ كەرەستە و ئاسانكاری و دیزاینەكاندا لە چاوی خەڵكدا بشاردرێتەوە.

دكتۆر هومام چیرۆكێكی دارشتبوو كە من لە ساڵی ١٩٨٧ دوای شەڕ لەگەڵ دكتۆر جەعفەر دەستم لە IAEC كێشاوەتەوە و دواتر گواسترامەوتەوە بۆ وەزارەتی پیشەسازی. بۆ چەند كاتژمێرێك لەسەر ئەم چیرۆكە لێكۆڵینەوەی لەگەڵدا كردم، بە شێوازی پارێزەری هۆڵی دادگا لە پشت مێزەكەیەوە دەهات و دەچوو. پاشان داوای لێكردم لیستێك لەو پرسیارانە دروست بكەم كە بە خەیاڵمدا دەهاتە بەرچاو گوایە پشكنەرەكان لەوانەیە لێم بكەن.

بەیانی ڕۆژی دواتر شۆفێرێكی حكومەت بە ئۆتۆمبێلەكەی بردمی بۆ بارەگای ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی. لە چاوپێكەوتن لەگەڵ پشكنەرەكان دەترسام. دەبێ لە سەرچاوە هەواڵگرییەكانیانەوە بیرۆكەیەكیان هەبووبێت كە من كێم، چونكە چەندین جار داوای ئەوەیان كردبوو كە لەگەڵ مندا قسە بكەن. ترسم هەبوو بە ئاسانی لە ڕێگەی چیرۆكەكەمەوە هەموو شتێكی من ئاشكرا بكەن.

كاتێك چوومە ژوورێكی بچووكی كۆبوونەوە، دوو پشكنەر لەسەر كورسییەكانیان هەڵسان: ئەمریكییەك كە ناویم لەبیر نییە و پشكنەرێكی یۆنانی بە ناوی دیمیتری پێریكۆس كە یەكێك بوو لە سەركردەكانی تیمی چالاكیی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی. تەوقەم لەگەڵ پشكنەرەكاندا كرد و بە دەمارگیرییەوە لەسەر مێزی كۆبوونەوەكە دانیشتم. سێ هاوپیشە عێراقیەكەم لە

IAEC بەرامبەریان دانیشتبوون. ئەوان بەر لە من كۆبوونەوەو چاوپێكەوتنیان لەگەڵدا كرابوو.

ئەمریكییەكە زۆربەی پرسیارەكانی كرد. پێدەچوو ئارام و تێگەیشتوو بێت، لە كاتێكدا پێریكۆس بە درێژایی چاوپێكەوتنەكە بە شێوەیەكی گاڵتەجارانە سەیری كردم. ئەمریكییەكە پرسیاری گشتی سەبارەت بەو ماوەیەی كە دەچێتە ساڵی ١٩٨٧ و منیش توانیم لە قۆناغە سەرەتاییەكانی بەرنامەی بڵاوبوونەوەدا كارەكانم بە شێوەیەك وەسف بكەم كە بە تەواوی لەگەڵ ڕاستییەكان بگونجێت. پاشان پێریكۆس دەستوەردانی كرد بۆ ئەوەی پرسیار لەبارەی بەرنامەی سەنتەرفیوجەوە بكات. منیش ڕەتمكردەوە هیچ پەیوەندییەكم بەوەوە هەبێت.

پێریكۆس وتی: ئۆو دكتۆر مەهدی، واز لەم جۆرە قسانە بێنە. ئێمە لە تۆ باشتر دەزانین كە دوای ساڵی ١٩٨٧ چیت كردووە؟"

گوتم: لەو بەرەوارە بەدواوە گواسترامەوە وەزارەتی پیشەسازی.

ئەو: "بەڕاستی، كەسێكی گرنگی وەك تۆ، چۆن ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی ڕێگەت پێدەدات بچیت بۆ وەزارەتی پیشەسازی؟"

دیاربوو پێریكۆس شتێكی دەزانی بۆیە منیش بۆ وەڵامێك بەخۆكەوتم.. بۆ چەند ساتێكی شەرمەزاركەر ئەو وشانەم وتنەوە كە دكتۆر هومام ڕۆژێك پێشتر ڕاهێنانی پێ كردبووم. ئەوەبوو دكتۆر عەبدولحەلیم ئەلحەجاج كە دكتۆر هومام وەك پەیوەندی ئەتۆمی بۆ پشكنەرەكە دانابوو، بەهانام هات.

ئەو گوتی: "دكتۆر مەهدی لەگەڵ دكتۆر جەعفەر كێشەیان

هەبوو و هاتنە بنبەست، دکتۆر مەهدی پێی وا نەبوو عێراق خاوەنی ژێرخانی بەرنامەیەکی بەرفراوانی بڵاوبوونەوە بێت و تاکە ڕێگەش بۆ چارەسەرکردنی جیاوازی بیروڕای نێوانیان گواستنەوەی دکتۆر مەهدی بوو. بۆیە ئەو چووە وەزارەتی پیشەسازی".

لانیکەم توخمێکی بچووکی ڕاستی لەم بابەتەدا هەبوو، بەڵام ئەم چیرۆکە دارێژراوە بە باشی لەگەڵ پێریکۆسدا کاری نەکرد.

پێرکۆس بەگاڵتەوە گوتی: "ها! ئەم چیرۆکە هەروا بە سادەیی جێی متمانە نییە!"

ئەوەبوو لە ڕووی لە عەبدولحەلیم وەرگەڕاند و سەیری چاوەکانی کردم.

- چاوەڕێی ئەوە دەکەیت باوەڕ بەم چیرۆکە بکەم؟

حەزێك هەبوو کە ڕووبەڕووی پێریکۆس ببمەوە چونکە بە گاڵتەوە سەیری دەکردم و توانجی لێدام. من زانابووم، ویستم پێی بڵێم، بەقەد ئەو ڕێز لە ڕاستییەکان دەگرم. ئایا نەیدەتوانی درك بەوە بکات کە من کاتێك ئەو وشانە دەڵێم وەك ئەوە وایە کە دەستم لە گەردنم ئاڵاوە؟ ئایا ئەگەر لە پێگە و جێگەی مندا بوایە ئەو بوێری ئەوەی هەبووە ڕاستییەکان بڵێت، و ژیانی خێزانەکەی بخاتە مەترسییەوە؟ ئایا نەیدەتوانی لەو دووڕیانە تێبگات کە من تێیدا بووم؟ بێگومان زمانم گرت و چاوپێکەوتنەکەم تەواو کرد، ئەرکی خۆمم بەرامبەر بە لیژنەی سەددام جێبەجێ کرد. کاتێك لە کۆتاییدا پشکنەرەکان بەڕێیان کرد، منیش هەستم بە ماندووبوون زۆر دەکرد.

دوای ئەو چاوپێکەوتنە گەیشتمەماڵەوە و لە ماندوێتیدا کەوتم

بەسەر قەنەفەكە. دواى ئەوەى ئەو هەموو وزەم لێ ڕۆیشتبوو، لە تاریكیدا بیرم لە ماناى خۆشاردنەوە دەكردەوە. سەیركە ئەم كارە منى بەرەو كوێ برد، پیاوێك بەناوى ئەوە دەستى بە كارەكەى كردبوو بەو هیوایەى بەشدارى لە بنیاتنانى نەتەوەیەكى گەورەدا بكات؟ ئایا من تا كۆتایى ژیانم وەك ئامرازێكى سادە لە دەستى ئەو كەسانەدا بەسەر دەبەم كە هیچ بەهایەكیان بۆ تاكى مرۆڤ دانەناوە؟ بیرم لە چارەنووسى دكتۆر ئەلشەهرستانى دەكردەوە كە لە كاتى بەرنامەى ڕیاكتۆردا زیندانى كرابوو و دكتۆر جەعفەر كە لە هەمان قۆناغدا زیندانى كرابوو. چۆن میللەتێك دەتوانێت بە سەركوتكردنى گەلەكەى هیواى بەدەستهێنانى گەورەیى هەبێت؟

لەیلا پیاڵەیەك چاى بۆ هێنام، منیش باسى لێپرسینەوەكەمم بۆ كرد.

دایكى گوتى: تۆ ترسناك دەردەكەویت.

من بە درێژایى ڕۆژ درۆم كردووە كە كێم، هەوڵمدا گاڵتە بەو بابەتە بكەم. "بۆیە من تەواو هەست بە خۆم ناكەم."

دواى شەڕى ساڵى ١٩٩١، سەددام زۆربەى زانایانى باڵاى بەرنامەى ئەتۆمى عێراق بەسەر پۆستە پیشەسازییەكانى دەوڵەتیى دابەشكردن. من كرامە بەڕێوەبەرى گشتى كۆمپانیایەك بە ناوى دامەزراوەى گشتى تەكنەلۆژیاى ئەندازیارى (GEET)، كە بنكەكەى لە ئۆفیسە گۆڕاوەكانمان لە ڕەشیدیە بوو، كە پڕۆژەى پیشەسازى بۆ MIC ئەنجام دەدا. حكومەت تا دەكرا زاناكانى لە پشكنەرەكان دوور دەخستەوە. بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ تیمەكانى نەتەوە یەكگرتووەكان، سەددام دواى قبوڵكردنى مەرجەكانى

ئاگربەستەكە هەر زوو لیژنەیەكی چاودێری دامەزراندبوو. تاریق عەزیز جێگری سەرۆكوەزیران سەرۆكایەتی ئەم لیژنەیەی كرد كە قوسەی كوڕی سەددام و هەروەها سەرۆكی دیوانی سەرۆكایەتی و ئەوانی دیكەی لەخۆگرتبوو لەسەر بنەمای پێویست. لیژنەكە بە هاوكاری دكتۆر جەعفەر، بەڕێوەبەری ئاژانسی عێراقی وزەی ئەتۆمی، دكتۆر هومامی كردە كەسی یەكەم بۆ پرسیارەكان سەبارەت بە بەرنامەی ئەتۆمی. لە خولەكانی سەرەتایی پشكنینەكان لە بەهاری ساڵی ١٩٩١، دكتۆر هومام تەنها ئەوەی ئاشكرا كرد كە عێراق هەوڵی داوە یۆرانیۆم بە بەكارهێنانی تەكنیكەكانی جیاكردنەوەی ئایزۆتۆپی كارۆموگناتیسی (EMIS)ی دكتۆر جەعفەر پیتاندن بكات. ئەو بانگەشەی بۆ ئەوە كرد كە عێراق لێكۆڵینەوە لە چۆنیەتی پیتاندنی سووتەمەنی دەكات بۆ بەرنامەیەكی ئەگەرێ وزەی ئەتۆمی لە داهاتوودا. ساڵانێك عێراق ڕەتیدەكردەوە كە ئامانجی بەرنامە ئەتۆمییەكە بەرهەمهێنانی چەك بێت. بەڵام پشكنەرەكان لەڕادەبەدەر گومانیان هەبوو و داوای وەڵامی زیاتریان دەكرد.

تا هاوینی ساڵی ١٩٩١، چەند مانگێك پێش چاوپێكەوتنەكەم لەگەڵ پێریكۆس، تیمی چالاكیی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی، بۆنی بەرنامەكانی سەنتەرفیوجی عێراقی كردبوو، لەوانەیە لەڕێگەی زانیاری هەواڵگرییەوە بووبێت كە لەلایەن وڵاتانی ئەندامی نەتەوە یەكگرتووەكانەوە پێشكەشكرابوون. دكتۆر هومام دانی بە بوونی ئەو بەرنامانەدا نا. بەڵام وتی كە تەكنیكەكانی سەنتەرفیوج و بڵاوبوونەوە تەنها گەیشتوونەتە قۆناغەكانی لێكۆڵینەوە. كاتێك پشكنەرەكان پرسیاریان كرد كە كێ

سەركردایەتی بەرنامەی سەنتەرفیوجی كردووە، لیژنەی چاودێری دكتۆر فارس، سەرۆكی پێشووی بەشی پشتگیری ئەندازیاریمان دیاریكرد.

لەبیرمە یەكەم جار لیژنەكە فەرمانی بە دكتۆر فارس كرد كە سیمینارێك پێشكەش بكات لە بارەی بەرنامەی سەنتەرفیوجەوە بۆ شەش كەس لە پشكنەران. سیمینارەكە لە كاتژمێری ٤ی دوای نیوەڕۆ لە هۆتێلێك لە ناوەندی شاری بەغدا ئەنجام درا. هەر دوای ئەوەی دەستی پێكرد بەبێ ئەوەی كەس ئاگادارم بێت خۆم خزاندە ناو هۆڵەكەوە و لە ڕیزی دواوە دانیشتم بۆ ئەوەی گوێی لێبگرم. پشكنەرەكان بە پەرۆشەوە گوێیان شلكردبوو لە كاتێكدا دكتۆر فارس نمایشی سلایدێكی سەرنجڕاكێشی پێشكەش كرد تیایدا تێڕوانینێكی گشتی لە بەرنامەكەدا پێشكەش دەكرد، كە تێیدا زەڕڕەیەك درۆی تێدانەبوو. بەڵام بابەتی زۆری تێدا لادرابوو، دكتۆر فارس كەمتەرخەمی نواندبوو لە باسكردنی بەرنامەی بەریەككەوتن بۆ دروستكردنی پەنجا سەنتەرفیوج لە مانگەكانی پێش جەنگدا، هەروەها ئەو ڕاستییەی كە ئێمە نەخشەی دیزاینكراومان لەبەردەست دابوو بۆ سەنتەرفیوجێكی زۆر گەورەتر و سێ مەتری كە بەرهەمی یۆرانیۆمی پیتێنراومان بە شێوەیەكی سەرنجڕاكێش زیاد دەكرد. ئەو بە تەواوی لە بابەتی یارمەتی و ئەو هاوكارییانەی كە لە دەرەوە وەرمانگرتبوو، خۆی بەدوور گرتبوو. لە كاتێكدا دكتۆر فارس چاوی لە پشتی هۆڵەكە كرد و پێم وابوو ڕەنگە لە نیوە تاریكیدا منی ناسیبێتەوە، چونكە بە خێرایی جارێكی دیكە خەریك بوو سەیری لای منی كردەوە. پێش ئەوەی گڵۆپەكان دابگیرسێنرێنەوە، هەرزوو بە ئەسپایی لە هۆڵەكە دەرچووم.

خولی چوارەمی پشكنینەكان ئەو كاتە دەستی پێكرد كە لە هاوینی ساڵی ١٩٩١دا دكتۆر دەیڤید كای هات و ئەمەش قۆناغێكی سەخت بوو بۆ شاردنەوەكانی سەددام. دكتۆر كای خەڵكی تەكساس بوو، شێوازێكی زەقی هەبوو لە ڕووبەڕووبوونەوە. بە هەموو عێراقدا دەسوڕایەوە و وەك كاوبۆیەك لەسەر ئەسپێكی زل مامەڵەی دەكرد و بە تێپەڕبوونی كات هەموو زاناكان دەترسان كارەكانی پێشوویان ئاشكرا بكات و تووشی كێشە ببنەوە.

شەوێك پێش ئەوەی فڕۆكەكەی لە یەكەم ئەركی لە بەغدا بنیشێتەوە، بەشداریم لە كۆبوونەوەی ستراتیژی بۆ زانایانی باڵای ئەتۆمی عێراق كرد لە بینای كارگێڕی ئاژانسی عێراقی وزەی ئەتۆمی لە تەنیشت گۆڕەپانی فیردەوس. دكتۆر خالید ئیبراهیم سەعید كە سەركردایەتی (هەوڵی دروستكردنی بۆمبەكەی) كردبوو، بانگهێشتی كۆبوونەوەكەی كردین. ناوبراو لەنێو شتەكانی تردا جەختی لەسەر پێویستی شاردنەوەی بەڵگەنامەكانمان و پسوڵەی هاوكاریەكانمانی كردبوویەوە. دڵنیام كردەوە كە هەموو بەڵگەنامەكانی بەرنامەی سەنتەرفیوج لەلایەن دەزگا ئەمنییەكانەوە كۆكراونەتەوە. سەیر لەوەدابوو كە بەشێك لە كاغەز و بەڵگەنامەكانی خودی دكتۆر سەعید هێشتا هەر لەو بینایەدا بوو و بە باشی نەشاردرابووەوە. بەیانیەكەی دیكە كاتێك دكتۆر كای گەیشت، یەكێك لە یەكەم كارەكانی كە كردی، ئەوەبوو سەردانی ئەو شوێنەی كرد. ئەو بە پەلە هاتە ناو ئەندامانی ستافی دكتۆر سەعید كە دوا بەڵگەنامەكانیان كۆدەكردەوە و یەك دوو سندوقی ڕفاند و هەوڵیدا بیانبات. كارمەندانی دكتۆر سەعید بە ترسەوە پەیوەندییان بە ئاسایشەوە كرد، ئەوانیش ڕێگریان كرد

دەرچوونی دکتۆر کای لە شوێنەکە و لە شوێنی وەستانی ئۆتۆمبێلەکاندا هێشتیانەوە. ئەمەش تێبینیبەکی پڕ لە ئاماژەی بەدوای خۆیدا هێنا.

بۆ ماوەی سێ ڕۆژان، دکتۆر کای ڕەتیکردەوە بەڵگەنامەکان ڕادەست بکات، لەهەمان کاتیشدا بۆ ماوەی سێ ڕۆژان هێزە ئەمنییەکانی عێراقیش ڕەتیان کردەوە ڕێگەی پێبدەن لەگەڵ بەڵگەنامەکان بینای ئاژانسەکە جێبهێڵێت. دکتۆر کای زۆرترین سوودی لە دۆخە دراماتیکەکە وەرگرت، لە شوێنی وەستانی ئۆتۆمبێلەکانەوە چاوپێکەوتنی لەگەڵ ڕۆژنامەنووسان ئەنجامدا. لەگەڵ ئەوەی ئەو چەقبەستوو بوو، لە سەرانسەری جیهاندا مانشێتی ڕۆژنامەکانی داگیرکرد، فشارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و حکومەتەکانی دەرەوە لەسەر ڕژێمی سەددام زیادیان کرد تا دواجار بەرپرسانی عێراق دانوستانیان لەسەر سازشێك کرد بۆ ئەوەی دکتۆر کای بە زۆرێك لە بەڵگەنامەکانەوە بڕوات. ئەو بەڵگەنامانە کۆمەڵێك لە وەسڵی کۆی مووچەیان لەخۆگرتبوو کە تێڕوانینێکی فراوانی بە پشکنەرانی چەك لە پێکهاتەی IAEC و ناوی کارمەندان دەدا. سەددام بە سووکیی سزای دکتۆر سەعیدی دا ئەویش تەنها دابەزاندنی پلەکەی، بەڵام چەند کەسێکی ژێردەستەی فڕێدایە زیندانەوە بەهۆی ئەو کارەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەرنامەی سەنتەرفیوج خۆی لە بەرکەوتن بەم بابەتەوە بەدوور گرتبوو چونکە ئێمە لە ساڵی ١٩٨٧ەوە لە ڕووی دارایی و بە شێوەیەکی تر لە IAEC جیا بووینەوە.

پشکنەرەکان لەو مانگە سەرەتاییانەدا دەستهاتێکی بەرزی دیکەیان دەستخست. ئەوان دامەزراوەی جیاکردنەوەی ئایزۆتۆپی کارۆموگناتیسی دکتۆر جەعفەریان دۆزیەوە، کە ئەمەش وای

کرد بەناچاری نزیکەی تەواوی بەرنامەی EMIS ئاشکرا بکرێت. هەروەها داوای بینینی ئامێرگەلی تەکنیکەکانی بڵاوبوونەوە و سەنتەرفۆجیان کرد. لیژنەی چاودێری بەشێکی زۆری ڕادەست کرد، لەنێویاندا ڕۆتۆرەکانی ڕیشاڵی کاربۆنی. ئەوەبوو پشکنەرەکان لەسەر زەوی دایاننا و بە پێیەکانیان پارچە پارچەیان کرد.

لە هەنگاوێکی پێشوەختەدا، سەددام یاداشتێکی نارد کە زۆر بانگەشەی بۆ کرابوو بۆ لەناوبردنی تاکلایەنە هەموو ئەو کەرەستانەی پەیوەستن بە بەرنامەکانی چەکی کۆمەڵکوژەوە. ڕێکخراوی ئاسایشی تایبەت (SSO) تۆنێك کەرەستەی لە هەموو بەرنامەکان هێنا و دۆکیۆمێنتی لەناوبردنیان کرد یان ڕادەستی پشکنەرانی کرد. نزیکەی سەد تۆن پۆلایان لە تاجی لە زەوی دەرکرد و لەگەڵ کانزاکانی دیکە تێکەڵیان کردن و تواندنیانەوە بۆ ئەوەی بۆ مەبەستی چەك بەکارنەهێنرێت. سەدان تۆن ئامێری تری سەنتەرفیوجیان بەخشی بە پشکنەرەکان، وەکو پەمپی بۆشاییەکان، وەلڤەلی ئەلەمنیۆم و موگناتیسی.

لە بەرامبەر ئەو بەڵگانەی کە لەلایەن پشکنەرانەوە پێشکەشکرابوون، لیژنەی چاودێری کارگەی سەنتەرفیوجی پلان بۆ داڕێژراوی لە ئەلفورات بەدیارخست، کە ئاواتەکانی بەرنامەکەی ئاشکرا کرد. کارکردن لەسەر بیناکانی ئەوێ تا سەرهەڵدانی شەڕەکە بە جوانی پێشکەوتبوو، لەنێویاندا هۆڵێکی شێوە ئەشکەوت کە چاڵەکانی سەنتەرفیوجی تێدابوو بۆ بەرهەمهێنانی گەورە. هەرچەندە هێشتا ئامێری کەم دانرابوون، بەڵام دامەزراوەکە دیمەنێکی سەرسوڕهێنەر بوو. دواتر بیستم کە دەیڤید کای بە کۆنگرێسی ئەمریکای وتووە کە لە ڕووی

دامەزراوە ئەتۆمییەکانەوە، هیچ شتێکی وردتری نەبینیوە

لە دەرەوەی نیوەگۆی ڕۆژئاوا کە هێندەی ئەمە ورد بێت. دان بەوەدا دەنێم کە بیستنی ئەمە هەستی شانازیی منی وروژاند، تەنانەت لە کاتێکدا پشکنەرەکان بە پووچەڵکردنەوەی ساڵانی کارکردنمان دەڕۆیشتن.

لیژنەی چاودێری پابەند بوو بەو چیرۆکەوە کە دیزاین و تاقیکردنەوەی بەرنامەی سەنتەرفیوج لە التویثە ئەنجامدراوە. ستراتیژەکە ئەوە بوو کە سەنتەری دیزاینی ئەندازیاری لە ڕەشیدیە بە نهێنی بهێڵینەوە، بۆ ئەوەی ڕادەی پێشکەوتنەکانمان بشارینەوە. ئەو هێڵەی کە بە پشکنەرەکان دەدرا ئەوە بوو کە پلانە گەورەکان بۆ ئەلفورات خەونێکی دەست نەهاتوو بووە. بەڵام دیارە گومانیان بە پێچەوانەکەی هەبوو.

پاشنیوەڕۆیەکی زوو لە مانگی کانوونی دووەمی ١٩٩١ بەبێ ئاگادارکردنەوە چوار ئۆتۆمبێلی سپی نیسان سپۆرت هاتنە ناو ڕێڕەوی هاتووچۆی دامەزراوەی ڕەشیدیە، من لە ئۆفیسەکەمدا خەریکی پڕۆژەیەك بووم بۆ نۆژەنکردنەوەی کارگەیەکی مس، کە پێش جەنگ ڕاگیرابوو. لە پەنجەرەی ئۆفیسەکەمەوە نزیکەی دەیان ژن و پیاوم بینی کە غەیرە عێراقی دەردەکەوتن، پانتۆڵی خاکی و کراسی قۆڵ کورتیان لەبەردا بوو و زەرف و جانتایان بە پشتیانەوە بوو، لە ئۆتۆمبێلەکانیان هاتنە دەرەوە.

بە شێوەیەکی غەریزەیی مێشکم یەکسەر تەواوی دامەزراوەکەی بەخێرایی پشکنی. ئێمە بە تەواوی گۆڕانکاریمان بەسەر دامەزراوەکە هێنابوو. تۆڕی بۆرییەکان لەگەڵ ژووری پاك و سەکۆی چاودێری و هەموو ئەو ئامێرانەی کە پەیوەندییان بە

بەرنامەی سەنتەرفیوجەوە هەبوو، لابرابوون. فەرمانی پڕكردنەوەی كونەكان و دووبارە بۆیاخكردن و دانانی قاتێكی نوێم كردبوو. مێزی دانیشتن و چەند ئامێرێك بۆ پرۆژەی كارگەی مس سروشتی پێشووی شوێنەكەیان گۆڕی بوو. ئێمە ئۆفیسەكانمان لە هەموو بەڵگەنامەیەكی تاوانباركردن پاككردبووەوە. خۆشم دڵنیا بووم كە تیمێكی پشكنەر لە هاوینی ڕابردوودا سەردانێكی كورتیان بۆ دامەزراوەكە كردووە و هیچیان نەدۆزیوەتەوە. بەڵام بڕیاری گەڕانەوەیان بۆ سەردانێكی لەناكاو دوای نزیكەی شەش مانگ جێگەی نیگەرانی بوو.

لە دەرگای پێشەوەی نهۆمی خوارەوە هاتنە لە دەرگایان دا، ئەوە منی هەژاند و دركم پێكرد. تەنها نیشانەی بەكارهێنانی پێشووی ئەو دامەزراوەیە، بوونی من و دكتۆر فەرید بوو. بەپەلە لە ئۆفیسەكەم هاتمە دەرەوە و بە ئاراستەی دەرگاكەیەوە بەڕووی هۆڵەكەدا هاوارم كرد.

- پشكنەرەكان لێرەن! خێرا وەرن ئەگینا كەشف دەبین!" بە پلیكانەكاندا بەخێرایی چووم و دوو ئەندازیارەكەممان لە نزیك دەرگای چوونە ژوورەوە بوون، دڵنیا نەبووین كە چی بكەین. ئەوان بە چاوەڕوانییەوە سەیریان كردم لەكاتێك كە لێدان لە دەرگاكە بەردەوام بوو.

بە چرپەوە گوتم: "مەهێڵە بێنە ژوورەوە، بۆ چەند خولەكێك ڕایانبگرە". ئێمە بۆ ژوورێكی پشتەوە ڕامان كرد كە دەرگایەكی كرابووەوە بە لای ڕۆژئاوای دامەزراوەكە، بینای ئیدارەمان خستە نێوان خۆمان و پشكنەرەكانەوە. كاتێك لەوێوە چووینە دەرەوە، من و دكتۆر فەرید سەركەوتینە سەر كەنارێك بۆ سەر ڕێگایەكی

تاك هێڵ کە لە لایەکەوە ڕووی لە کۆمپاوندەکەمان دەکرد و لە لایەکی دیکەشەوە ڕووی بەسەر ڕووباری دیجلەوە بوو. لەوێوە من دەمتوانی چوار ئۆتۆمبێلی نەتەوە یەکگرتووەکان لە شوێنی وەستانی ئۆتۆمبێلەکاندا ببینم بەڵام هیچ پشکنەرێك دیار نەبوو، بۆیە واهەستم کرد کە ڕێگەیان پێدراوە بچنە ژوورەوە. بە پەلە بە درێژایی ڕێگاکەدا لەسەر ڕیزبەندی بەنداوەکە ڕۆیشتین، نەماندەوێرا ئاورێك بدەینەوە لە ئەگەری ئەوەی پشکنەرەکان لە پەنجەرەیەکەوە بمانبینن. دوو زانای جل و بەرگ پۆشتە کە بە خێرایی بە درێژایی ڕێگاکەدا دەڕۆیشتن و دوور لە دامەزراوەکە، لەو شوێنە گوندنشینەدا! دوای نزیکەی سەد مەتر، پێچێك لە ڕێگاکە هەبوو و هەروەها بەهۆی بوونی هەندێك گەڵای دارخورماوە، ڕێگری کرد لە بینینمان. لەوێوە زانیم کە بە پاکی و بێ گرێ و گۆڵ ڕامانکردووە، بۆیە خێراییەکەمان خاو کردەوە، سەرەڕای ئەوەی کەش وهەوا فێنك بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئارەقەیەکی زۆرمان دەردا بوو.

نزیکەی کاتژمێرێك بە درێژایی ڕیزێك لە دارخورماکاندا ڕۆیشتین، باسمان لە هۆکار و ئەگەرەکانی پشکنەرەکان کرد کە بۆ پشکنینی دووەم هاتبوون. دەبێ جۆرێك لە هەواڵگرییان پێگەیشتبێت، بەڵام مەحاڵ بوو بزانرێت کە ئایا لەلایەن کەسێکەوە زانیارییان پێدراوە، یان وێنەی مانگی دەستکردی سیخوڕ، یان سەرچاوەیەکی دیکە. یەکێك لە ئەندازیارەکانی کۆمپاوندەکە بە باشی ئاگادارکرابووەوە لەسەر چیرۆکە داڕێژراوەکە بۆ ئەوەی کاتێك پشکنەرەکان هاتن بەم چیرۆکە داڕێژراوە فریویان بدات، بەڵام نەمتوانی پێشبینی ئەوە بکەم کە ئاخۆ پشکنەرەکان بە چ زانیارییەکی نوێ ڕووبەڕووی دەبنەوە.

دوای كاتژمێرێك، كە نەمتوانی بەرگەی ئەو حاڵ و بیركردنەوە بگرم، بە درێژایی ڕێگاكە بەرەو كۆمپاوندەكەمان ڕۆیشـــتمەوە. لەگەڵ نزیكبوونەوەمدا، بۆ كێڵگەیەكی كشـتوكاڵی شـۆڕبوومەوە بۆ ئەوەی لە باكوورەوە لە دامەزراوەكە نزیك ببمەوە. بە نووكی پێمدا بەناو قوڕە نەرمەكەدا ڕۆیشتم و لە پشت دیوارێكی نزمەوە كە ڕووی لە ڕێگای هاتووچۆ دەكرد، سەركەوتم. ئۆتۆمبێلەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان هێشتا لە پێشەوە وەستابوون. دوو كاتژمێر چاوەڕێم كرد، تاو نا تاوێك بەســـەر دیوارەكەدا دەمڕوانی، تا دەرگاكە كرایەوە و گوێم لە دەنگە دەنگیان بوو كە بە ئینگلیزی قســەیان دەكرد. ئەوەبوو دواجار گوێم لە دەنگی پشــكنەرەكان بوو كە بە ئۆتۆمبێلەكەیان ڕۆیشــتن و ئەوێیان جێهێشــت. كاتێك ڕۆیشتن، منیش بەسەر دیوارەكەدا سەركەوتم و چوومە ژوورەوە.

ستافەكەم ئاگاداریان كردمەوە كە سەرەتا هەموو شتێك بە باشی بەڕێوەچووە. پشكنەرەكان سەیری دەوروبەریان كردبوو و بە ڕێزەوە گوێیان لە قسەكانی ئەوان گرتبوو بەڕێوەبەری ئەندازیارەكان ئەو چیرۆكەی گێڕابوویەوە كە دامەزراوەكە تایبەتە بە پاككردنەوەی ئاو و پرۆژە پیشەسازییەكان و ڕەتیدەكردبوویەوە كە هیچ كارێكی پەیوەست بە ئەتۆمی لەوێ ڕوویدابێت. بەڵام دواتر پشكنەرەكان نموونەیان لە دیواری چەند بینایەك و زەوی دەرەوە وەرگرتووە. ئەوە هەواڵێكی ناخۆش بوو. دەمزانی نموونەكانی بینای سەنتەرفیوجی پێشوو پشكنینیان بۆ دەكرێت بۆ ئەوەی شوێنەواری بەرزی نائاسایی یۆرانیۆمی تیشكدەر دەربكەون. فەرمانەكانی لیژنەی چاودێری بێ دوو دڵی بوون. دەبوو كارە ئەتۆمییەكانی ڕابردوو لە شوێنی ڕەشیدیە تەواو ون بكەین و بیسڕینەوە.

من زانیم كە لانیكەم هەفتەیەك دەخایەنێت تا پشكنەرەكان شیكاری نموونەكە دەكەن، دوای ئەوە بە دڵنیاییەوە دەگەڕێنەوە بۆ وەرگرتنی نموونەی زیاتر بۆ سەلماندنی كەیسەكەیان. دەبوو بە خێرایی هەنگاو بنێین. ئەگەر پشكنەرەكان بگەڕێنەوە و بە زەوییەكە بە قووڵی هەڵبكەنن، ئەوا گەردیلەی یۆرانیۆم لە هەر پارچەی ماددەیەكدا دەدۆزرێتەوە كە لە كاتی كاری سەنتەرفیوجەكەماندا هەبووە.

هەمان پاشنیوەڕۆ، ستافەكەم بانگهێشتی كۆبوونەوەیەك كرد و فەرمانمدا تاقیگەی پێشووی سەنتەرفیوج دیوار و سەقفەكەی لێبكرێتەوە، ڕاست تا چوارچێوەكەی، هەروەها هەڵكەندنی پێ و نیوێك خاكی سەرەوە لە ژێرەوە و دەوروبەری بیناكەوە، لەلای خوارەوەش بە درێژایی سەد پێ كە ڕەنگە شوێنەواری یۆرانیۆمی لێ مابێت.

ئەم كارە وەك ئەوەی ئەركێكی گەورە نەبێت، گوتم: "لە ماوەی هەفتەیەكدا، كونەكان بە خاكی تازە پڕ دەكەینەوە و لە كەرەستەی نوێ كۆپییەكی وردی دامەزراوەكە دروست دەكەین."

ستافەكەم بە سەرسوڕمانەوە سەیریان كردم، چونكە پێدەچوو فەرمانەكە مەحاڵ بێت. بەڵام هەر زوو تێگەیشتن كە تاكە بژاردەی دیكە ئەوەیە كە بەرپرسیارێتی پێشێلكردنی پلانی شاردنەوە لە ئەستۆ بگرن. دەرئەنجامەكانی بۆ ژیانی ئێمە و خێزانەكانمان بەرگەی بیركردنەوەیان نەگرت. ستافەكەم بە بێزارییەوە دەستیان بە كار كرد و شەو و ڕۆژ تیم و ئامێرەكانیان دەهێنا. ڕەنگە یەكێك بووبێت لە خێراترین پرۆژەكانی ڕووخاندن و بیناسازی لە مێژوودا. حەوت ڕۆژ لە شوێنی ڕووداوەكە بووم، نیگەران بووم لەوەی

پشكنەرەكان بگەڕێنەوە ئێمە لەسەر ئەو كارەدا ببینن، ئەمەش بەڕاستی ڕژێمی دەخستە دۆخێكی نائارامەوە.

كاتێك پشكنەرەكان دوای نزیكەی دوو هەفتە بەبێ ئاگاداركردنەوە گەڕانەوە، هەموو شتێك وەك ئەوەی دوایین جار بینیبوویان دەركەوت، تا دەگاتە دانانی مێز و ئامێرەكانی دارشتن و تەنانەت ئامێری قاوە سازەكە. من لەوێ دوور كەوتمەوە، بەڵام دواتر ستافەكەم پێیان وتم پشكنەرەكان بە هەڵوێستێكی سەركەوتوانە و كەمێك تۆمەتەوە هاتوون. پاشان دەیان نمونەیان لە دیوار و عەزل و خاكی زەوییەكە وەرگرتووە و دواتر ڕۆیشتوون بۆ ئەوەی ڕەوانەی ڤیەنناى بكەن بۆ پشتڕاستكردنەوە. بەڕاستی ڕەنگە سەریان سوڕمابێت كاتێك دواتر بینیویانە پشكنینی مادەكە نێگەتیڤ بووە بۆ ئاستی نائاسایی یۆرانیۆم. من زۆر جاران بیرلەوە دەكەمەوە كە چۆن تاوەكو ئەمڕۆش سەریان لێشێوا!

سەرنجم بۆ پرۆژەی كارگەی پاشماوەی مس گەڕاندەوە تا بەیانییەك لە شوباتی ١٩٩٢ —كە ئەو ڕۆژە گەرمی ناوەرزی ڕووی لە ناوچەكە كردبوو-، كاتێك فەرمانێكم پێگەیشت كە دەبوو ڕاپۆرتێك پێشكەش بكەم بۆ قوسەی سەددام حوسێن سەبارەت بەو توانایەی كە لە بەرنامەی سەنتەرفیوجدا ماوەتەوە. ئەمەش سەرسامی كردم كە قوسەی خوازیاری پوختەیەكی سەربەخۆ بوو جیاواز لەوەی حوسەین كامل. بێ گومان لەناو بازنەی ناوەوەی حكومەتە خراپەكارەكەی سەددامدا مانۆڕی سیاسی هەبوو، كە مەعریفە و توانای ئامۆژگاریكردنی دیكتاتۆر؛ كلیلی دەسەڵات بوون.

قوسەی ئەوكات لە سەرەتای بیستەكانی تەمەنیدا بوو و هێشتا

ناوبانگی خراپەکاریی عودەی برا گەورەکەی بەدەست نەهێنابوو، کە ئەویان سەلیقەی بۆ ئاهەنگەکانی خواردنەوە و چەکی ئاگرین و دەستدرێژی کردن لە عێراق ناوبانگی دەرکردبوو. قوسەی لە برا گەورەکەی بە ترسناکتر سەیر دەکرا و سەددامیش لە ئێستاوە خەریکی ئامادەکاری بوو بۆ ئەوەی ڕۆڵێکی گەورەتری پێبدا لە ڕژێمەکە. جا بیرۆکەی ئەوەی کە بە تەنیا لەگەڵی دابنیشم بە شێوەیەکی تایبەت نیگەرانی کردبووم، چونکە ئەو خێزانە بەوە ناسرابوون کە خێزانێکی میزاجین و کۆلکە خوێندەوارن هەرکاتێکیش ئەو وەڵامانەیان دەست نەکەوت کە دەیانەوێت، ئەوا یەکسەر بێ یەك و دوو دەتخەنە زیندانەوە. پێشتر لە کۆبوونەوەی لیژنەی چاودێریدا بۆ ماوەیەکی کورت چاوم بە قوسەی کەوتبوو. من وەك تیرە مارێك بیرم لێدەکردەوە، هێشتا دڵنیا نەبووم لە هێزەکەی بەڵام ژەهرێکی بەهێزی هەبوو کە دەتوانێت بەیەك پێوەدان بتکوژێت.

بە ئۆتۆمبێلەکەم ڕۆیشتمە شوێنی کۆبوونەوەکە لە نزیك کۆشکی کۆمارییەکان، لەوێ ئەفسەرێکی تایبەتی ئاسایش لەناو ئۆتۆمبێلێکی جۆری پیکاپ چوار دەرگادا هەڵیگرتم کە پەنجەرەکانی ڕەنگاوڕەنگ بوون و شۆفێری کردم بۆ گۆڕەپانی کۆشکەکە. ئەفسەرەکە بردمی بۆ بینایەکی یەك نهۆمی، ئەوەبوو منیان پشکنی و پاشان لە دەرەوەی دەرگاکە چاوەڕێی کرد لە کاتێکدا من چوومە ژوورەوە. قوسەی بە تەنیا لەسەر قەنەفەیەکی شێوەی L دانیشتبوو و قاتێکی پۆشتەی باشی لەبەردا بوو. ئیشارەتی پێدام کە بەرامبەری دابنیشم، بەبێ ئەوەی هەستم و دەستی پێشکەش بکات بۆ تەوقە کردن. دەموچاوە نەرم و چاوە ماتەکانی و ڕەفتاری بێ تاقەتی ڕووخساری منداڵێکی تێر و پڕی دەکرد

کە لە ژیانیدا هەرگیز لە هیچ شتێك بێبەش نەبووە. چەند ساتێك بە بێدەنگی دانیشتین لە کاتێکدا ئەو سەیری دەکردم و لێی دەڕوانیم، ئەم ڕەفتارەش لە باوکییەوە وەریگرتبوو وەك فێڵێکی شانۆیی. ئەو وەك هەموو عێراقییەکان بە سوحبەت و قسەی خۆش دەستی بە قسە نەکرد، بەڵکو ڕاستەوخۆ چووە سەر ئەو بابەتی کە دەیویست.

قوسەی: پێم بڵێ چی لە بەرنامەی سەنتەرفیوج ماوەتەوە؟

من بە پوختی باسی ئەوەم کرد کە پێشتر —هەروەك خۆی دەیزانی- لە لیژنەی چاودێریدا: نموونە سەرەتاییەکانی سەنتەرفیوجەکان ڕادەستی پشکنەرەکان کرابوون، ئەوانیش بۆرییەکانی ڕیشاڵی کاربۆنیان لە شوێنی ڕووداوەکەدا شکاندبوو و ئەوەی دیکەیان بردبووە بارەگای ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی لە ڤییەنا بۆ لێکۆڵینەوە. ئەوەندەی من زانیاریم هەبوو زۆربەی پێکهاتەکان و کەرەستەی خاو و ئامێرەکانی بەرهەمهێنان یان لەناوچووبوون یانیش لە دەستی پشکنەرەکاندا بوون. تا ئێستا نەتەوە یەکگرتووەکان ئاگاداری زۆرێك لەو کۆمپانیا ئەوروپییانە نەبوو کە پێکهاتەکانیان دروستکردووە و لە ناسنامەی هەموو ئەو زانایە ئەڵمانییانەی کە هاوکارییان کردووە.

قوسەی: ئایا ئەوە هەموو شتێکە؟

بە قوسەیم وت کە کۆپییەکی شەخسیی کۆمەڵە دیزاینە تەواوەکانی هەر بەشێکی سەنتەرفیوجم لایە، لەگەڵ چەند پێکهاتەیەکی گرنگ. قوسەی قەڵەم و دەفتەری یاداشتێکی دەرهێنا و چەند تێبینییەکی نووسی.

قوسەی: ئەی ئەم بەڵگەنامانە تا چەند گرنگن؟

گوتم: "ئەوان كتێبی ڕێنماییەكانن و تەنانەت لە پێكهاتەكانیش گرنگترن."

قوسەی: "كێی تر ئەم بەڵگەنامانەی لایە؟ هەندێك لە هاوكارەكانت؟"

پرسیارەكەی دەریخست كە ئەو چەندێك بە كەمی -لانیكەم تا ئێستا- بەشداری كردووە لە وردەكارییەكانی هەوڵی شاردنەوەی كەل و پەل و بەڵگەنامەكان. منیش ڕوونم كردەوە كە ساڵێك پێشتر هەموو نەخشەی سەنتەرفیوج و بەڵگەنامەكانی تر ڕادەستی دەزگا ئەمنییەكانی عێراق كراون.

قوسەی: كێی تر لەبارەی ئەو كۆپییە شەخسیەوە دەزانێت كە لەبەردەستتدایە؟

گوتم: ئەوەندەی من بزانم، تەنیا حوسەین كامل.

قوسەی: لە چاوی خەڵك دووریان بخەرەوە.

ڕووخساری قوسەی خیانەتی لە هیچ نەكرد لەوەی كە لەو ساتەدا بیری لێدەكردەوە. نیگەران بووم لەوەی كە ڕەنگە خۆم لە ناوەڕاستی ململانێی دەسەڵات لە نێوان كوڕەكەی سەددام و زاواكەیدا ببینمەوە. قوسەی پێویست نەبوو پێم بڵێت باسی گفتوگۆكەمان لەگەڵ حوسەین كامل مەكە. لە كەشوهەوای فێڵكردندا، كە بازنەی ناوەوەی سەددامی تەنی بوو، هەموو شتێك نهێنی بوو مەگەر بە پێچەوانەوە باس نەكرێت. بۆیە مرۆڤ هەركات دەمی كردبایە یەكسەر تووشی كێشەو تەنگ و چەڵەمە دەبوویەوە.

"ئایا دەتوانین جارێکی تر دەست بە بەرنامەکە بکەینەوە؟" قوسەی پرسی و بیرکردنەوەکانی منی پچڕاند.

دیسانەوە بە پرسیارێکی وەها نەگونجاو سەرم سوڕما. ولاتەکە لەگەڵ پشکنەرانی چەکدا –کە بە وردی خەریکی لێکۆڵینەوە بوون و تاکە ئامانجیان ڕێگریکردن بوو لە دەستپێکردنەوەی بەرنامەکانی چەکی کۆمەڵکوژ- خەریك بوو. ئەو پرسیارە سادەیەی بیرخستمەوە کە باوکی چەند ساڵێك پێشتر سەبارەت بە بەربەستی بڵاوبوونەوە لێی کردبووم.

گوتم: "ئەوە بەندە بەو پێشهاتانەی کە لە داهاتوودا دێن" و بە وردی قسەکانم هەڵبژارد و ئەوەشم بۆ قسەکانم زیادکرد: "بێگومان بە فەرمانەکانی تۆشەوە".

قوسەی چەند تێبینییەکی تری نووسی و پاشان بەڕێی کردم. من گرنگی ڕووبەڕووبوونەوەکەمم لەبەرچاو گرت، چونکە ئەفسەری ئاسایش بە ئۆتۆمبێلەکەی بردمییەوە. بە دڵنیاییەوە قوسەی زیاتر بەشداری لە ئۆپەراسیۆنە هەواڵگری و ئەمنییەکانی باوکیدا دەکرد و هەروەها تەماحی تایبەتی هەبوو. تاکە دەرەنجام ئەوە بوو کە هەرچەندە ناڕوون و ناعەمەلی بێت، بەلام مەبەستی درێژخایەن ئەوە بوو کە چاوەڕوانی پرۆسەی پشکنینەکان بکرێت و پاشان کاتێك جیهان چیتر چاودێری نەدەکرد، ئەوکات هەوڵبدرێت بۆمبێك دروست بکرێت.

بە ئۆتۆمبێلەکەم ڕۆیشتمە ماڵەوە و پێم وابوو دەبێت شوێنێکی سەلامەتتر بدۆزمەوە بۆ هەڵگرتنی بەڵگەنامەکان، شوێنێك کە کەس هەرگیز تێبینی نەکات. پاشان واهاتە پێش چاوم کە باشتر وایە بیانێژم. مرۆڤەکان هەر لە سەرەتای مێژووەوە گەنجینەکانیان

له ژێر زه‌ویدا شاردووه‌ته‌وه. دوای ئه‌وه‌ی ئۆتۆمبێله‌كه‌م له گه‌راجه‌كه‌مان وه‌ستاند، ڕاسته‌وخۆ چوومه شوێنی ئامێره‌كانم و به‌رمیلێكی پلاستیكی سه‌وزی په‌نجا گالۆنم دۆزیه‌وه. قه‌باره و پێكهاته‌كه‌ی زۆر باش و ته‌واو بوو، ئه‌مه‌ش كاغه‌زه‌كان و پێكهاته ناسكه‌كانی له شێی ناو خاكه‌كه ده‌پاراست. پاشان چوومه ژووره‌وه بۆ ئه‌وه‌ی شوێنی ژن و منداڵه‌كانم بزانم. بڕیارم دابوو پێیان نه‌ڵێم كه خه‌ریكم چی ده‌كه‌م، چونكه زانینی ئه‌وه‌ی له باخچه‌كه‌ماندا نێژراوه ده‌بێته هۆی نیگه‌رانییان، ته‌نانه‌ت له‌وانه‌یه بیانخاته مه‌ترسییه‌وه. تێبینیم كرد زه‌یدی كوڕم له ده‌ره‌وه بوو. له‌یلا و كچه‌كان له ژووره‌وه سه‌رقاڵ بوون.

كاتێك ڕێگه‌م به‌ره‌و ده‌رگای پێشه‌وه ده‌گرت، بانگم بۆ لایلا كرد و وتم: "كه‌مێك خه‌ریكی باخچه‌كه ده‌بم".

دایكی گوتی: "جا بۆ به‌و قرچه‌ی نیوه‌ڕۆیه". "بۆچی چاوه‌ڕێ ناكه‌یت تا فێنك دادێت؟"

گوتم: ته‌نیا ده‌مه‌وێت كه‌مێك بڕین بكه‌م. زۆر كات ناخایه‌نێت. ئه‌گه‌ر كه‌سێك په‌یوه‌ندیم پێوه بكات، ئه‌وه ته‌نها وه‌ك تێبینی بینوسه.

ئاوڕم دایه‌وه و بینیم له‌یلا له ده‌رگای چێشتخانه‌كه وه‌ستابوو و ده‌ربڕینێكی پرسیار ئاسا له‌سه‌ر ڕووخساری به‌دی ده‌كرا. بینی كه من ڕه‌فتارێكی سه‌یرم هه‌یه، به‌ڵام له‌وه زیاتر هیچی نه‌وت. ئه‌و ده‌یزانی كه هه‌ر كاتێك هه‌ستم به فشار ده‌كرد، حه‌زم ده‌كرد به كاركردن له باخچه‌كه‌ماندا ئارام ببمه‌وه. كاتێك چوومه باخچه‌كه، به‌رمیله پلاستیكییه‌كه و خاكه‌نازێكم برده ناو حه‌وشه‌ی ده‌ره‌وه‌مان كه به دیوارێكی خشتییه‌وه له ماڵه‌كه‌مان هه‌ڵواسرابوو.

کاتێك بۆ شوێنێکی باش دەگەڕام، خۆر بە توندی تیشکی پەخش دەکرد. لە سێبەری درەختێکی نیلوفەردا، خاڵێکم لە زەویدا دۆزیەوە و چاڵێکم هەڵکەند بە قووڵی نزیکەی چوار پێ. پێکهاتەکان و ئەو کۆمەڵە بەڵگەنامانەی سەنتەرفیوج کە بەرزییەکەی دوو پێ بوو، لەناو کیسی زبڵی پلاستیکی جیاوازدا پێچامەوە بۆ ئەوەی زیاتر بیانپارێزم. پاشان هەموو شتێکم لەناو بەرمیلی پلاستیکیدا کۆکردەوە و خستمنە نێو چاڵەکە. لەکاتێکدا خۆڵم بەسەر بەرمیلەکەدا دەکرد، درکم بە هەستێکی سەیر دەکرد، ئەم هەستە وەك ئەوە وابوو کە ئاژەڵێکی ماڵی دڵخوازم بنێژم کە مردووە. بەرنامەی سەنتەرفیوج کە سەرەتا من بیرم لێکردبوویەوە و دەرهێنەرەکەی بووم، ئێستا کورتکرایەوە بۆ پارچە زەوییەکی ژێرزەوی لە حەوشەی ماڵەکەمدا. کاتێك تەواو بووم، بە ماندووییەوە پشتم بە دیوارەکەدا، تێگەیشتم کە بە ناشتنی ئەو دیزاینانە بەشێك لەخۆمم نێشتووە. چوون من تاکە کەس بووم کە بە تەواوی دەمزانی لە کوێن. ئەوە تاکە نهێنی بوو کە تا ئەوکاتە لە لەیلا و هاوسەرەکەم و باشترینی هاوڕێم شاردبێتەوە. بەڵام ئەوە بارگرانییەك بوو کە دەمزانی دەبێت بە تەنیا هەڵیبگرم، بۆ سەلامەتی ئەو و بۆ پاراستنی منداڵەکانمان. ئەگەر دەزگا هەواڵگرییەکانی سەددام بیانویستایە کلیلی بەرنامە ئەتۆمییەکە بدۆزنەوە، ئەوا ڕێگاکە بریتی بوو لەوەی کە چەند هەنگاوێك لە ژووری نووستنەکانمانەوە بنێین بەرەوە ژێر نیلوفەری باخچەکە.

تەنانەت ئەو کاتەش پێشبینییەکم هەبوو کە ئەم نهێنییانە بە ئارامییەوە پشوو نادەن و ڕۆژێك لە ژێر بارودۆخێکدا زیندوو دەبنەوە کە لە ژێر کۆنترۆڵی مندا نییە. ئەوەبوو لە ساڵانی داهاتوودا مۆتەکەکان خەوزڕاویان کردم. زۆرجار خەونم بەوەوە دەبینی کە

پیاوە ئەمنییەكانی سەددام دەهاتنەماڵەكەم بۆ ئەوەی داوای بەڵگەنامەكانی سەنتەرفیوج بكەن. لەم مۆتەكە دووبارەبووەوەدا هەمیشە دەیانبردمە نێو باخچەكەم لەوێوە یەكسەر بۆ لای نیلوفەرەكە. بەڵام هەموو جارێك كە هەوڵم دەدا ئاماژە بەو شوێنە بكەم كە بەرمیلێكی پلاستیكیم تێدا نێشتووە، ئەوا جگە لە چاڵێكی بەتاڵ هیچی تری لێ نەبوو.

بەدرێژایی ساڵانی پشكنینی چەك لە عێراقدا، زۆرجار لە شەقامەكانی بەغدا شتێك بە گاڵتە دەگوترا. ئەوەش بریتی بوو لەوەی كە خواردنێكی بەناوبانگی عێراقی ناسراو بە (الدليمية)، كە تیایدا پارچە گۆشتی بەرخ بە گومەزێك برنج دادەپۆشرێن و دواتر دەكوڵێنرێن بۆ ئەوەی برنجەكە ئاوی گۆشتەكە هەڵبمژێت. جا گاڵتەجارییەكە بەم شێوەیە دەگوترا: رۆژێك پشكنەرانی چەك لە یەكێك لە چێشتخانەكان فەرمان دەكەن كە خواردنی (الدليمية)یان بۆ ئامادە بكەن بۆ نیوەڕۆ. خاوەنەكەش بە ئامانجی دڵخۆشكردنیان، تاوەیەكی كەڵەكەبوو لەبەردەمیان دادەنێت. دواتر كاتێك پرسیاری ئەوەیان لێدەكات كە ئایا چێژیان لە ژەمەكە وەرگرتووە، ئەوانیش داوای لێبوردن دەكەن كە چێشتەكەیان بۆ تەواو نەكراوە و دەڵێن تێر بوون.

پشكنەرێكیان دەڵێت: بەراستی برنجێكی بەتام بوو.

خاوەنی چێشتخانەكەش لێی دەپرسێت: ئەی چێژت لە گۆشتەكە وەرگرت؟

"گۆشتەكە؟" پشكنەرەكان بە سەرسوڕمانەوە پرسیار دەكەن. "ئێمە هیچ گۆشتێكمان نەبینیوە لە خواردنەكە"

خاوەنی چێشتخانەكەش بە جۆریك لە سەرزەنشت دەڵێت:

"بەڵام ئێوە سەیری ژێر برنجەکەتان نەکردووە! ئەگەر بتەوێت گۆشتەکە بدۆزیتەوە، دەبێت قووڵ هەڵکەنیت!"

کەس نەیدەتوانی قەدری ئەم گاڵتەجاڕییە لە هەمان ئاستی مندا بزانێت کە بە خاکەنازەکەی خۆی نهێنییەکانی سەنتەرفیوجی نێشتبوو. ئەمە هەرچەندە پێکەنینێکی زۆری لەسەر حیسابی پشکنەرەکان لە کافێکان و لە گۆشەی شەقامەکانی بەغدا وروژاندبوو، بەڵام ئەو گاڵتەجاڕییە بە شێوەیەکی خراپ ڕەنگدانەوەی واقیع بوو. زۆربەی پشکنەرەکان پیشەیی لێهاتوو بوون کە بە شێوەیەکی میتۆدی کاریان دەکرد و بە هێواشی، بەڵام بە دڵنیاییەوە لە کۆتاییدا توانا ئەتۆمییەکانی عێراقیان دۆزیەوە و هەڵوەشاندەوە.

لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٩١دا بەڵگەکان کە لەلایەن پشکنەرانەوە پێشکەشکرابوون، لیژنەی چاودێرییان ناچارکرد دامەزراوەی (الاثیر) لە شارۆچکە موسەیب —کە پێشتر لێی بێ ئاگا بوون-، چل میل لە باشووری بەغداوە، کە دکتۆر سەعید هەوڵەکانی چەکسازیی تێدا ئاراستە کردبوو، ئاشکرا بکات. ئامێری زانیاری و دیزاینی بیناکان دواجار ئەوەی بە پشکنەرەکان بەخشی کە هەستیان دەکرد بەڵگەیە لەسەر ئەوەی عێراق هەوڵی پیتاندنی یۆرانیۆمی داوە بۆ دروستکردنی بۆمب نەك بۆ ڕیاکتۆرەکانی داهاتوو. کاتێك تیمی دکتۆر کای بەم ئەنجامە ڕووبەڕووی لیژنەی چاودێری بووەوە، بەبێ ئەوەی هیچ ڕوونکردنەوەیەکی دیکەی باوەڕپێکراو پێشکەش بکات، بە ڕوونی بەرنامەی چەکیان ڕەتکردەوە. لە نیسانی ساڵی ١٩٩٢ پشکنەرەکان داوایان کرد کە

مەگەر عێراق وەڵامی باشتری لابێت وەگەرنا پێویستە هەر هەشت بیناكەی (الاثیر) لە ناوببرێن. بەڵام سەددام هێشتا نەدەچووە ژێر باری ئەوە. لەبری ئەوەی دان بە نیازی بەرهەمهێنانی چەكی ئەتۆمیدا بنێت، مۆڵەتی لەناوبردنی (الاثیر)ی پێدان. لەكاتێكدا چاودێرانی نێودەوڵەتی چاویان لێدەكرد، تیمە عێراقییەكان دینامیتیان خستە ژێر بیناكان و لە چاوتروكانێكدا بوونە زەوی تەخت.

پشكنەرەكان بەردەوام بوون. ئەوەبوو دوو دانەی تری EMIS ی دكتۆر جەعفەریان لەناوبردن و شوێنەكانی دیكەیان خستە ژێر چاودێری و كامێرایان دانا، بەتایبەت ئەو شوێنانەی كە پێشتر بۆ ئەو مەبەستە بەكارهێنرابوون و دواتر گۆڕابوون بۆ شوێنی خزمەتگوزاری گشتی. لەلایەكی تر ئەو یۆرانیۆمە پیتێندراوەی كە لە (التویثە) دەستی بەسەردا گیرابوو، ڕەوانەی دەرەوەی عێراقیان كرد بۆ پاراستنی و هەروەها یۆرانیۆمی پیتێنراویان كۆكردەوەو مۆریان كرد، بۆ ئەوەی لە پشكنینەكانی داهاتوودا چاودێری بكرێن. بەشی باقی و پێكهاتەكانی بەرنامەی سەنتەرفیوجیان دەستبەسەردا گرت، و كرداری دروستكردنی هورروژم، لێهەڵمژینی تیشكی ئەلكترۆنی، و ئامێرە گرانبەهاكانی دیكەیان دەست بەسەردا گرت كە بۆ بەرهەمهێنانی پارچەی سەنتەرفیوج بەكاریان هێنابوو. ئێمە بەدرێژایی ئەم كاتە شاردنەوەی ڕێگاكانی دابینكردنمان (وەسڵی ئەو پارچە و بەرهەمانەی كڕیبومان) لە ئەولەویەتی كارەكانمان بوو و لەولاتریش لیژنەكە بەردەوام بوو لە یارییە شەترەنج ئاسا دیپلۆماسیەكانی لەگەڵ پشكنەرەكان لەسەر ئەم بابەتە. من لیستی ناتەواوم دەدا بە ئەوان و كاتێكیش ئەوان

داوای زانیاری زیاتریان ده‌كرد، ئێمه‌یش به‌ پشتگوێ خستن و یان دوای كاتێكی زۆر وه‌ڵاممان ده‌دانه‌وه‌.

وریاییه‌كی تایبه‌ت هه‌بوو بۆ ئه‌وه‌ی ئاشكرا نه‌بێت كه‌ ئه‌ڵمانییه‌كان تا چه‌ند هاوكارییان كردبووین. له‌ چاوپێكه‌وتن و نامه‌ و قسه‌كانی چاودێران هه‌میشه‌ له‌ ڕۆڵی هینزه‌، ستێمله‌ر، بوسێ و شاب پرسیاریان ده‌كرد. واپێده‌چوو ئه‌وانه‌ به‌ سه‌روه‌ت و سامانی به‌رنامه‌ی سه‌نته‌رفیوجی عێراقیان زانیبێت.

له‌هه‌مان كاتدا لێكۆڵینه‌وه‌كانی دیكه‌ له‌ ئارادا بوون. ده‌سه‌ڵاتدارانی ئه‌ڵمانیا به‌دواداچوونیان بۆ كۆمپانیای H&H Metalform ده‌كرد و له‌ كۆتاییه‌كانی ساڵی ١٩٩٢دا هینزه‌ و هاوبه‌شه‌كه‌ی و دوو له‌ به‌ڕێوه‌به‌ره‌كه‌یان ده‌ستگیركرد به‌ تۆمه‌تی پشتگیریكردن له‌ به‌رنامه‌ مووشه‌كی و ئه‌تۆمییه‌كانی عێراق به‌ پێشێلكردنی یاساكانی هه‌نارده‌كردنی ئه‌ڵمانیا. تۆمه‌تباركردنه‌كه‌ تیشكی خسته‌ سه‌ر فرۆشتنی ئه‌و ئامێرانه‌ی كه‌ ئامێری هورووژم دروست ده‌كه‌ن كه‌ پشكنه‌ره‌كان له‌ عێراق دۆزیبوویانه‌وه‌ و توانیویانه‌ بگه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ كۆمپانیای هینزه‌. هینزه‌ له‌ هاوینی ساڵی ١٩٩٣ دانی به‌ تاوانه‌كه‌یدا ناو به‌ڵام خۆی له‌ سزای زیندانیكردنی درێژخایه‌ن به‌دوور گرت. پارێزه‌ره‌كه‌ی به‌ سه‌ركه‌وتوویی باسی له‌وه‌ كرد كه‌ یاساكانی هه‌نارده‌كردنی ئه‌ڵمانیا ئه‌وه‌نده‌ لاواز بووه‌ كه‌ یارمه‌تیدانی به‌رنامه‌ ئه‌تۆمییه‌كه‌ی عێراق له‌م كه‌یسه‌دا تاوانێكی بچووكه‌. بوسێ له‌ ده‌وروبه‌ری هه‌مان كاتدا نه‌خۆش كه‌وت و گیانی له‌ده‌ستدا، بۆیه‌ هه‌رگیز دادگایی نه‌كرا. ستێملێر تووشی جه‌ڵته‌یه‌ی مێشك بوو، ئه‌گه‌رچی لاوازی كرد به‌ڵام ڕزگاری بوو.

شاب، بۆ ئێستا، ته‌نها به پێشێلكردنی یاساكانی هه‌ناردەكردنی ئه‌ڵمانیا به دابینكردنی ڕۆتۆری سه‌نته‌رفیوجی ڕیشاڵی كاربۆنیمان سزا درا.

سه‌ددام چاودێری سیاسه‌تی نێوده‌وڵه‌تی ده‌كرد به هیوای ئه‌وه‌ی تۆمه‌ته‌كان به‌رامبه‌ری لاواز بن. كاتێك جۆرج بوش سه‌رۆكی ئه‌مریكا له هه‌ڵبژاردنه‌كانی ساڵی ۱۹۹۲ به بیل كلینتۆن دۆڕا، میدیا عێراقییه‌كانی ژێر ده‌سه‌ڵاتی ده‌وڵه‌ت سه‌ركه‌وتنیان ڕاگه‌یاند. له ۱۳ی كانوونی دووه‌م، كه‌مێك پێش كۆتایی هاتنی سه‌رۆكایه‌تی بوش، فڕۆكه ئه‌مریكییه‌كان هێرشیان كرده سه‌ر هه‌ندێك ئامانج له باكووری عێراق، ئه‌مه‌ش له وه‌ڵامی پێشێلكارییه گوماناوییه‌كانی عێراق بۆ ناوچه‌ی دژه فڕین بوو كه له چوارچێوه‌ی ڕێككه‌وتنی ئاگربه‌ستدا سه‌پێنراوبوو. دوای چوار ڕۆژ، كه‌شتییه جه‌نگییه‌كانی ئه‌مریكا چل مووشه‌كی كروزیان ئاراسته‌ی كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی گومانلێكراوی سه‌ربازی عێراقی كرد له به‌غدا، وه‌ك سزایه‌ك بۆ ئه‌وه‌ی عێراق ڕێگه‌ی نه‌دا به پشكنه‌رانی چه‌ك له ڕێگه‌ی ئاسمانییه‌وه بچنه ناو عێراقه‌وه. سه‌ددام هیوای خواست كه په‌یوه‌ندییه‌كی باشتر له‌گه‌ڵ كلینتۆن سه‌رۆكی داهاتووی ئه‌مریكا بنیات بنێت، تاوه‌كو ببێته هۆی هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه‌ی سزاكان و گه‌مارۆی نه‌وت كه له دوای شه‌ڕی ۱۹۹۱ سه‌پێنرابوو. به‌ڵام په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ ئیداره‌ی نوێی ئه‌مریكا به خێرایی خراپ بوو. له مانگی نیسانی ساڵی ۱۹۹۳ كوێت ئیدیعای ئه‌وه‌ی كرد كه پیلانێكی عێراقی بۆ تیرۆركردنی سه‌رۆكی پێشوو (بوش) ئاشكرا كردووه له‌كاتێكدا بۆش له سه‌ردانێكدا بووه بۆ وڵاته‌كه. ئه‌وه‌بوو سه‌رۆك كلینتۆن هێرشێكی مووشه‌كیی كرده سه‌ر

باره‌گای هه‌واڵگری سه‌ددام له به‌غدا.

دانوستان له‌گه‌ڵ پشکنه‌ران بووه هۆی قه‌یرانێکی دیکه له مانگی ته‌مموزدا، کاتێك عێراق ڕه‌تیکرده‌وه مۆڵه‌تی دانانی کامێرای چاودێری له چه‌ند شوێنێکی پێشووی چه‌کدا بدات. هه‌رچه‌نده سه‌ددام له کۆتاییدا له‌به‌رده‌م کامێراکان کۆڵی دا، به‌ڵام که‌شوهه‌وای به‌رده‌وامی گوماناوی یه‌کتر هه‌ر هیوایه‌کی بۆ هه‌ڵگرتنی سزاکان تێکدا.

تاوه‌کو ساڵی ١٩٩٤ پشکنه‌ره‌کان تا ڕاده‌یه‌کی زۆر توانا ئه‌تۆمییه‌کانی عێراقیان هه‌ڵوه‌شانده‌وه. به‌ڵام پێکهاته سه‌ره‌کییه‌کانی به‌رنامه‌ی سه‌نته‌رفیوجیان نه‌دۆزیبووه‌وه. جگه له شاردنه‌وه‌ی ئه‌و کرپینانه‌ی کردبوومان، لیژنه‌ی چاودێری له هه‌ڵگه‌ڕانه‌وه‌ی هه‌ر نه‌خشه‌یه‌ك یان به‌ڵگه‌نامه‌یه‌ك که په‌یوه‌ندی به دیزاینی ورده‌وه هه‌بوو، خۆی به‌دوور گرتبوو. پشکنه‌ره‌کان ئاگاداری پلانه‌کانمان نه‌بوون بۆ سه‌نته‌رفیوجێکی درێژتر و پێشکه‌وتووتر. ئه‌وان هێشتا هیچیان له به‌رنامه‌ی که‌وتنه‌خواره‌وه‌ی فڕۆکه‌کانی پێش جه‌نگی ١٩٩١ نه‌ده‌زانی و تا چه‌ند له به‌رهه‌مهێنانی چه‌کی ئه‌تۆمی نزیك بووینه‌وه. حکومه‌ت به‌رده‌وام بوو له ئیدیعای ئه‌وه‌ی که به‌رنامه‌ی سه‌نته‌رفیوج له (التویثه) بیری لێکرایه‌وه و په‌ره‌ی پێدراوه و به‌ڵام مه‌به‌ستی ڕاسته‌قینه‌ی سه‌نته‌ری دیزاینی ئه‌ندازیاری ڕه‌تده‌کاته‌وه. هێشتا پێکهاته‌ی ڕێکخراوه‌یی تیمی سه‌نته‌رفیوجه‌که‌مان له ژێر پرسیاردا بوو. پشکنه‌ره‌کان نه‌یانتوانیبوو ڕۆڵی من پشتڕاست بکه‌نه‌وه یان چاوپێکه‌وتنم له‌گه‌ڵ بکه‌ن وه‌ك سه‌رپه‌رشتیاری به‌رنامه‌که.

هەرچەندە کارەکانم لە سێ ساڵی ڕابردوودا لەسەر پرۆژەی مەدەنی بوو، بەڵام فشارەکان بە توندی مانەوە. حوسەین کامل هەر سەرۆکم بوو، وەك جاران گەرم و گوڕ بوو. ڕەنگە هێشتنەوەی من لە ژێر پەنجەی گەورەیدا بەشێك بووبێت لە ستراتیژییەکی گەورەتر بۆ چاودێریکردنی وردم. دوای ئەوەی کارگەی مسمان تەواو کرد کە بەهۆی شەڕەوە وەستابوو، حوسەین کامل ڕایسپاردم کە بەدواداچوون بۆ ڕێگاکانی دروستکردنی کاربۆنی ڕەش بکەم، کە بە نزیکەیی نیوەی ئەو مادەیەی کە پێویستە بۆ بەرهەمهێنانی تایەی ئۆتۆمبێل پێکدەهێنێت.

پیشەسازی دروستکردنی تایەی عێراق پشتی بە کاربۆنی ڕەشی هاوردە بەستبوو، کە زۆربەیان لە ئێرانی دراوسێیەوە هاتبوون، ئەمەش ڕاستییەك بوو کە پێدەچوو سەددامی زۆر تووڕە کردبێت. لە کۆبوونەوەی بەرپرسانی حکومەت کە سەرپەرشتی پیشەسازی تایەی ئۆتۆمبێلیان دەکرد، داوایان لێکردم ئەوە بخەملێنم کە چەند کات دەخایەنێت بۆ دروستکردنی کارگەیەکی کاربۆنی ڕەش. منیش وتم دوو ساڵ دەخایەنێت بۆ دیزاینکردن و دروستکردنی کارگەیەکی تاقیکاری، پاشان دوو تا سێ ساڵی دیکە بۆ دروستکردنی کارگەیەکی پیشەسازی تەواو. هەستم دەکرد ئەمانە زاراوەگەلێکن کە هەر بەڕێوەبەرێکی بەرپرسیاری پرۆژە دەیبەخشێت.

ڕۆژی دواتر حوسەین کامل بانگی کردم بۆ ناو ئۆفیسەکەی. چاوەکانی خستنە سەرم و ڕووخساری پڕ لە سەرزەنشتی دەنواند.

"ئەمە چییە کە دەیبیستم بە پێنج ساڵان کارگەیەك دروست

بكەین؟ دەتەوێت وامان لێبكەیت دەستی ئێران ماچ بكەین؟"

گوتم: نەخێر گەورەم، بێگومان نەخێر.

وتی: "پاشان پێشنیار دەكەم پێداچوونەوە بە پلانەكانتدا بكەیت، ئێمە ناتوانین بە بەردەوام خواردنی دەستی دوژمنانمان بخۆین".

من: "گەورەم لەگەڵ ڕێزم، بەڵام دەتوانم بڵێم كە ئەنجامدانی ئەم پڕۆژەیە بە شێوەیەكی دروست، لە درێژخایەندا كات و پارەمان بۆ پاشەكەوت دەكات؟ هەروەها ئەمە چوارچێوەیەكی كاتیی ئاساییە بۆ هەر پڕۆژەیەك لە جیهانی پیشەسازیدا."

پێدەچوو حوسەین كامل تووڕە بووبێت لە دەرئەنجامەكەی من كە عێراق دەبێ هەمان ئەو ستانداردانە پەیڕەو بكات كە لە وڵاتانی دیكەدا بەكاردەهێنرێن.

گوتی: "شەش مانگ مۆڵەتت پێدەدەم بۆ تەواوكردنی كارەكە و ئەگەر ئەمە جێبەجێ نەكەیت، ئەوا زیندانی دەكرێیت. ئێستا تەواو ڕوونە لەلات؟" هیچ شتێكی ئەوتۆ نەبوو كە بتوانم بیڵێم. ئەو وادەیە مەحاڵ بوو، بەڵام لەگەڵ حوسەین كامل هیچ مشتومڕێك نەبوو. هەمان فشاری هەڕەشەئامێزی بەكارهێنا كەساڵانێك پێشتر لە كاتی بەرنامەی سەنتەرفیوجدا بەكاریهێنابوو. من گەڕامەوە نێو بازنە مەترسیدارەكە. دەستم كرد بە كاركردن لەسەر پڕۆژەی كاربۆنی ڕەش، لە ترسی ئەوەی دوای شەش مانگ زیندانی بكرێم. لە بەیانی زووەوە تا درەنگانی شەو كارم دەكرد، ئەو وێنەكێشانانەی كە ئەندازیارەكانم بەرهەمیان هێنابووم دەبووە هۆی بەگەڕخستنی دامەزراوەیەكی كارا. لەبری ئەوەی پڕۆژەكە

بەسەر قۆناغەکاندا دابەش بکەین، لە یەك کاتدا قۆناغی تاقیکاری و بەرهەمهێنانمان لە ئاستی کارگەدا ئەنجامدا. دوای شەش مانگ چوار بینای زەبەلاحمان لە بێجی دروست کردبوو کە نزیکەی ١٢٠ میل لە باکووری بەغداوە دوورە و دەیان کورە و شووشە و پشتێنەی گواستنەوە و بۆری و ئەلیکترۆنی تێدابوو. لە ماوەی کورتدا دەستکەوتێکی سەرنجڕاکێش بوو، بەڵام هێشتا دامەزراوەکە ئامادە نەبوو بۆ بەرهەمهێنانی کاربۆنی ڕەش. حوسەین کامل لە گەشتێکدا بوو بۆ ئەردەن کە لە وادەی دیاریکراو هات و دەچوو، بەڵام کە گەڕایەوە جارێکی دیکە بانگی کردم بۆ ناو ئۆفیسەکەی.

کاتێك لەبەردەم مێزەکەیدا دانیشتبووم، وتی: "بیستومە کە دواکەوتن لە بەرهەمهێنانی کاربۆنی ڕەش".

گوتم: پێشکەوتنی گەورەمان بەدەستهێناوە.

ئەو: "ئەوە نابێتە هۆی سڕینەوەی ئەو ڕاستییە کە تۆ شکستت هێناوە لە شوێنکەوتن و جێبەجێکردنی ڕێنماییەکانم، بۆیە دەگەڕێیتەوە شوێنی بیناسازیەکەت و لەوێ دەمێنیتەوە تا ئەو کاتەی پرۆژەکە تەواو دەبێت. لەوێ دەخۆیت، لەوێ دەخەویت. تا کارەکەت تەواو نەبێت خێزانەکەت نابینیت".

منیش بە ناچاری دەبوو شوێن فەرمانەکانی بکەم، لەولاوەش دەمزانی کە تەنها هەنگاوێك لە زیندانەوە دوورم. لەیلا سەری سوڕمابوو کاتێك پێم گوت لە شوێنی کارەکەم دەمێنمەوە و نایەمەوە. هەوڵمدا بەو بیرکردنەوە دڵنەوایی بکەم کە ئەگەر لە پرۆژەی کاربۆنی ڕەشدا سەرکەوتوو بووم، ڕەنگە پاداشتمان

بدرێتەوە. بەڵام بیرۆكەی زیندانیكردنی داهاتووم بە قووڵی نیگەرانی كردبووم. من لەخۆمم دەپرسی كە ئاخۆ بەهای من وەك نهێنی دارێژەری بەرنامەی ئەتۆمی سەددام هەر هێندەیە! لەلایەكی تر ئەمە منی كردبوو بە ئامانجی تووڕەیی بەردەوامی حوسەین كامل.

هەستێكی ترسناكم هەبوو لەوەی كە فەرمانبەرەكانم دەبوو لەگەڵ مندا زیندانی بكرێن ئەگەر پرۆژەكە تەواو نەكەم. چونكە زۆرێكیان لە دوای بەرنامەی سەنتەرفیوجەوە هەر لە ستافەكەمدا بوون و بۆ من ببوونە كەسی ئازیز. ڕۆژی دواتر نزیكەی بیست كەسمان جانتاكانمان كۆكردەوە و چووین بۆ بێجی و بۆماوەیەكی زۆر لە ماڵ و خێزانەكانمان دوور كەوتینەوە. ئێمە تا دەمانتوانی هەموو ڕۆژ و كات و ساتێك كارمان دەكرد، و لەسەر قەرەوێڵە لە كارگەكەمان و لە بینایەكی پاڵاوگەی نەوت كە لە تەنیشتی بوو دەخەوتین. جا ئەوەبوو لەگەڵ دووبارە دروستكردنەوەی پشتێنەی گواستنەوە و كۆمەڵێك چاكسازی دیكە، ستافەكەم زیاتر ترسیان لێ نیشت. هەوڵمدا بە باشترین شێوە بارەكەیان سووك بكەم و دڵنەواییان بدەمەوە، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی چەند مانگێك، منیش بێهیوا بووم. لە كاتژمێرە ماندووەكانی خەوتندا، خەونم بەوە دەبینی كە منداڵەكانم لەلایەن كەسانی نامۆوە دەبرێنە قوتابخانە. هەموو شەوێك تەلەفۆنم بۆ لەیلا دەكرد، نەمدەتوانی بڵێم كەی ڕێگەم پێدەدرێت بێمەوە ماڵەوە و دوای ئەوەی تەلەفۆنەكەمان داخست، هاتە خەیاڵم كە چۆن لەیلا ماڵەكەمان بەڕێوەدەبات وەك ئەوەی بێوەژن بێت.

دواجار دوای شەش مانگ بووین بە خاوەنی کارگەی کاربۆنی ڕەش. بانگهێشت کرام بۆ کۆبوونەوەیەك لە بەغدا کە تێیدا حوسەین کامل لەگەڵ ستافە باڵاکەیدا گفتوگۆی لەسەر کۆمەڵێك پرۆژە دەکرد. کۆبوونەوەکە چوار کاتژمێری خایاند پێش ئەوەی دواجار حوسەین کامل ڕوو لە من بکات.

ئەو: "پرۆژەی کاربۆنی ڕەش چۆنە و بەکوێ گەیشت دکتۆر مەهدی؟"

گوتم: نایابە گەورەم.

دووبارەی کردەوە و ڕووی لە ستافی باڵای کرد و وتی: "نایاب". "ئەو دەڵێت نایاب و ناوازەیە."

هەوڵمدا تووڕەیی خۆم کۆنترۆڵ بکەم چوون ئەو بە تۆنێکی گاڵتەجاڕانەوە وای گوت. بەڵام لە ناخدا دەلەرزیم.

من: "بۆ نابێت گەورەم؟ ئێمە شەش مانگمان لە زینداندا بەسەر بردووە. ئێستا تایبەتمەندییەکان لەگەڵ ئەو ستانداردەدا دەگونجێت کە پیرێلی دایނابوو، بەرهەمەکەشی لەگەڵ داواکارییەکانی پیشەسازی عێراقدا دەگونجێت. پێش ئەوەی کارەکە بە نایاب ڕابگەیەنرێت، چی ترت دەوێت؟"

پێدەچوو حوسەین کامل بە تۆنە تیژ و وەڵامە چاوەڕواننەکراوەکەم سەری سوڕمابێت. ئەوەبوو بابەتەکەی گۆڕی و گفتوگۆکانی لەگەڵ ستافەکەی تەواو کرد. دوای پێنج خولەك کۆبوونەوەکەی داخست و هەستا بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەوانی تردا

بڕوات. هه‌ر پێش ئه‌وه‌ی بگاته ده‌رگاكه‌، وه‌ستا و سه‌یرێكی كردمه‌وه‌.

گوتی: "باشه دكتۆر مه‌هدی، ئێستا تۆ و پیاوه‌كانت ئازادن بچنه‌وه ماڵه‌وه‌."

# بەشی هەشتەم
# ساڵانی تاریکی

دڵخۆش بووم کە جارێکی تر بە ماڵەوە شادبوومەوە. دوای شەش مانگ لە زیندانیکردن لە کارگەی کاربۆنی ڕەشدا، چێژێکی نوێم لە ڕیتمە بچووکەکانی ژیانی خێزاندا دۆزیەوە کە لە کاتەکانی تردا زۆر بە ئاسانی بە شتێکی ئاسایی وەردەگیرێن. هەموو بەیانیەك کاتژمێر شەش و نیو هەڵدەستام، دەستنوێژم دەشووشت و فەرشێکی بچووکم لەسەر زەوی ژووری میوان ڕادەخست بۆ نوێژی بەیانی. لەو ساتە بێدەنگانەی پێش ئەوەی منداڵەکان لە خەو هەڵسن، من و لەیلا نانی بەیانیمان لە نان و پەنیر و چا لە چێشتخانەکەدا دەخوارد و باسی نیگەرانییەکانمان دەکرد بۆ ڕۆژی داهاتوو. پێش ئەوەی بچمە سەر کارەکەم، چاوم لە هەریەکێك لە منداڵەکان بوو کە هەڵدەستان. لە کاتی نانخواردنی ئێوارەدا، ئەو چەند ئێوارەیەی یەکەم، پرسیاری بێشومارییان دەکرد و منیش باسی ئەو تەنیاییەم دەکرد کە لە دووری ئەواندا هەستم پێدەکرد. وردە وردە گفتوگۆکەمان دەگەڕایەوە سەر فۆرمە کۆنەکەی، کە تێیدا بە نۆرە هەموو شتێکمان لە کاری قوتابخانەوە تا دەگاتە هەڵسوکەوتی دراوسێکانمان شی دەکردەوە. لە کۆتایی هەموو ژەمێکدا، وەك داب و نەریتی خۆمان، دەستخۆشیمان لە لەیلا دەکرد کە

خواردنێکی وەها بە تامیان ئامادە کردووە. ئێمە دڵخۆش بووین کە جارێکی تر پێکەوە بووین، بەڵام لە کۆتاییدا درکمان بەوەکردبوو کە حەزو سەرکێشییەکانی پیاوانی سەددام چۆن دەکرێت لە هەر کاتێکدا ببێتە هۆی لەناوبردنمان.

لە گەڕانەوە بۆ ئۆفیسەکەم لە GEET لە ڕەشیدیە، دەستم بە پرۆژەیەکی نوێ کرد کە سەرپەرشتی نۆژەنکردنەوەی کارگەیەکی ئاسنین لە بەسرە و کارگەیەکی لەفی ئەلەمنیۆم لە بەغدا دەکرد. زۆر ئاسوودە بووم کە لە کارگەی کاربۆنی ڕەش کەمتر چالاك بوو و ئەوەبوو دوای چەند مانگێك، هەناسەدانم باشتر بوو تا ڕاددەی ئاسایی. پاشان درەنگانی پاشنیوەڕۆی ٧ی ئابی ١٩٩٥، کە خەریکی پێداچوونەوە بە پلانەکانی کارگەی بەسرە بووم، یاریدەدەرێك هاتە ناو ئۆفیسەکەم و وتی: حوسەین کامل دەیەوێت هەر ئێستا بتبینێت.

یەکسەر کەوتمە سەر پێیەکانم، ترسم لەوە هەبوو کە سەرۆکەکەم ئاخۆ دەبێت چ کارێکی تری نوێی پڕ ئازاری بۆ دانابم. تەلەفۆنم بۆ لەیلا کرد و پێم وت کە پێویستە بەبێ من ژەمی ئێوارە بخۆن.

لەیلا بەجۆریك لە نیگەرانییەوە پرسی: پێت وایە لەم کاتەدا چی دەوێت؟

هەوڵمدا ئارامی بکەمەوە و گوتم: "دڵنیام هیچ نییە".

بە خێرایی بەنێو شاردا ڕۆیشتم بۆ ئۆفیسی حوسەین کامل لە نزیك بارەگای MIC. سکرتێرە گەنجەکەی داوای لێکردم لە ژووری پێشەوە چاوەڕێ بکەم لە کاتێکدا ئەو هەندێك کاروباری لەگەڵ سەردانکەرێکی دیکە تەواو دەکات. لە دەرگای

ئۆفیسەکەیەوە گوێم لە دەنگی کز بوو. خولەکەکان گۆڕان بۆ کاتژمێرەکان و نەمدەتوانی بیهێنمە پێش چاوم کە حوسەین کامل -کە بەکاری کتوپڕی و لەناکاوی ناسراوە- ئاخۆ دەبێت بۆ ماوەی ئەو چەند کاتژمێرە باسی چی بکات. هەوڵمدا بیرلەوە بکەمەوە و بزانم کە بۆچی دەیەوێت بەپەلە بمبینێت. چونکە لەوەنەدەچوو پرۆژەی ئێستام گەرەنتی کۆبوونەوەیەکی ئێواران بکات، بەڵام مرۆڤ هەرگیز نەیدەزانی. ڕەنگە ئەرکێکی نوێی بۆ من هەبووبێت. دوعام کرد کە ئەمە وا نەبێت. من ئامادە نەبووم بەرگەی کارێکی تری فشاری بەرز بگرم لەم ئەرکە دڕندانە.

کاتێك دواجار سکرتێرەکە منی هێنایە ناو ئۆفیسی حوسەین کامل، بەزەحمەت ئەو پیاوەی پێش خۆمم ناسیەوە. حوسەین کامل تورە دەردەکەوت، وەك ئەوەی چەند ڕۆژێکە نەخەوتبێت. لەسەر کورسیەکەی خۆی هێنایە پێشەوە و قۆڵەکانی ئەوەندە بە قورسی لەسەر مێزەکەی دانابوو و وەك ئەوەی ئێستا نا ئێستا مێزەکە دەشکێت.

بەبێ ئەوەی پۆزش بۆ ئەو چاوەڕوانییە چوار کاتژمێرییە بهێنێتەوە، وتی: دانیشە. ڕوخساری بەرز کردەوە و ڕوخسارمان کەوتە بەرامبەر یەکتر، بینیم چاوەکانی -کە بە شێوەیەکی ئاسایی لە چاوی هەڵۆ دەچوون- بە تەواوی خوێنیان تێزابوو. بیلبیلەکانی هەرتەنها بۆ ساتێك لەسەر من بوون، دواتر وەك ئەوەی شتێك لە ئارادا بێت بە بیردا چوو.

ئەو: کاروبار چۆن دەڕوات دکتۆر مەهدی؟ خێزانەکەت چۆنن؟ باشن؟

هەرچەندە ئەمانە پرسیاری خوو و ئاسایین کە زۆربەی گفتوگۆ

عێراقییەكان بەم پرسیارانە دەست پێدەكەن، بەڵام ئەمانە و دەرچوونیان لە دەمی حوسەین كامل شتێكی سەیر و سەمەرە بوو، چوون ئەو زیاتر خووی بەوە گرتبوو كە شتەكان پوخت بكاتەوە و یەكسەر بچێتە سەر بابەت. بەڵام ئەوكاتە بە نەرمی قسەی دەكرد. هەرچەندە بە تەواوی لە كارەكتەری دەرچوو بوو، بەڵام من لەناخمدا پرسیاری ئەوەم لەخۆم كرد كە ئایا ئەو تەنها بە باسكردنی خێزانەكەم، داوای لێبوردنێكی ناڕاستەوخۆی دەكات بۆ زیندانیكردنم ساڵێك پێش ئێستا. دڵنیام كردەوە كە من و خێزانەكەم تەندروستیمان باشە، و پرسیارم لە خۆشگوزەرانی خێزانەكەی خۆی كرد. كەچی بە ئاهێكی ناڕوون وەڵامی دایەوە. دواتر وتی: دەمەوێت باسی بەرنامەی سەنتەرفیوج بكەم. "دیسانەوە سوودەكانی تەكنیكی سەنتەرفیوجم بۆ ڕوون بكەرەوە."

سەرەتا وەك بڵێی لە حیرەتدا بووم. چونكە حوسەین كامل هەروەها هەر كەسێك لە ستافەكەمدا بوون لایەنە باش و خراپەكانی بەرنامەی سەنتەرفیوجیان زانیبوو. ئەوە ئەو بوو كە هەشت ساڵ پێشتر لە كۆبوونەوەی نیوەشەومان لە كۆشكی كۆمارییەكان چووە سەر بیرۆكەی سەنتەرفیوج. ئەو سەرپەرشتی هەموو هەنگاوەكانی كردبوو. بە دڵنیاییەوە نەیدەتوانی لە ماوەی چوار ساڵ و نیودا لە دوای جەنگەوە سەرەتاییترین توخمەكانی لەبیر بكات. بۆ ساتێك گومانم لێكرد كە ڕەنگە هەندێك مەبەستی پەردەپۆش لە پشت پرسیارەكەیەوە هەبێت. ڕەنگە هەوڵی ئەوە بووبێت كە بمخاتە تەڵەوە و وەڵامێكی هەڵە بدەمەوە كە جارێكی دیكە تووشی كێشەم بكاتەوە. بەڵام ئەوە لەگەڵ ڕواڵەتی ئەو پیاوەی لەبەردەممدا نەبوو. ئەم كەسە زل و زەبەلاحەی ڕژێمی سەددام كە قسەكانی هەمووانی دەلەرزاند، وا دیار بوو خۆی

لەناخیدا بە قووڵی کەسێکی لەرزۆك بوو. بیرم بۆ ئەوە چوو کە ڕەنگە لە ژێر هەندێك فشار و لەناو بازنەی ناوەوەی سەددامدا کێشەی هەبێت! دەنگۆی ململانێی دەسەڵات لە نێوان حوسەین کامل و عودەی کوڕە گەورەکەی سەددامم بیستبوو و ئەگەری ئەوە هەبوو ڕکابەرییەکە گەیشتبێتە خاڵی یەکتر شکاندن. هەرچەندە ئەمە هێڵی پرسیارەکانی ئێستای ڕوون نەکردەوە.

نیگەرانییەکەم شاردەوە و بیرم هێنایەوە کە سەنتەرفیوجەکان پێویستیان بە کارەبای زۆر کەمترە لە تەکنیکەکانی تر بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم؛ تاڕادەیەك بچووکن و کارا و ئاسانن بۆ شاردنەوە لە شوێنێکی بچووکدا. بە بێباکییەوە چەند تێبینییەکی نووسی.

گوتی: "دیسانەوە باسی ئەو ئامێرانەم بۆ بکە کە پێویستن بۆ کارگەی سەنتەرفیوج و ئەو شتانەی کە پشکنەرەکان تا ئێستا نەیاندۆزیوەتەوە."

حوسەین کامل لە کاتی قسەکانیدا، دەستەیەك حەبی دەرکرد و دوو حەبی فڕێدایە دەستی و بە قومێك ئاوی پرتەقاڵ قوتی دان، پاشان شووشەکەی خستەوە نێو چەکمەجەکە. پێشتر حوسەین کاملم نەبینیبوو حەب بخوات و پێم سەیر بوو ئایا هۆکاری باری دەروونی و سەرلێشێواویەکەیەتی، یان چارەسەرێکە. هەروەها بیستبووم کە حوسەین کامل لە ساڵی ١٩٩٢ نەشتەرگەرییەکی مێشکی بۆ کراوە، بەڵام تا ئێستا هێز و تواناکانی لەوە نەدەچوو گۆڕابن.

من لە ماوەی ساڵانی ڕابردوودا دەیان جار بەرامبەری لەسەر ئەم مێزە دانیشتبووم، بەهۆی هەڕەشە و داواکارییە ناعەقڵانییەکانیەوە هەڕەشەی تیرۆرم لێ کرابوو. بەڵام ئەم

دیدەنییەی ئەم جارەی جۆرێك لە سوریالییەتی پێوە دیاربوو، چونكە پرسیارەكانی لە چوارچێوەی چاودێرییەكانی خۆیدا بوون. تەنیا یەك شت بۆ من دڵنیا بوو كە وەك شتێكی نوێ سەیرم دەكرد، ئەویش: وەك بڵێی كۆت و بەندەكانی بیركردنەوەی ڕوونی لە دەستیەوە خزابوون.

من بەجۆریك باسی سەنتەرفیوجم كرد بۆ حوسەین كامل وەك ئەوەی بۆ یەكەمجاربێت ڕوونی بكەمەوە، لەوانەش دانانی هەموو ئامێرەكان لە سەنتەری دیزاینی ئەندازیاری، پەیوەندییە بیانییەكان و دابینكردنەكانمان دوای داگیركردنی كوێت. چەند تێبینییەكی دیكەی نووسی و پاشان قسەكانی منی بڕی.

ئەو: "بەتەواوی چەند سەنتەرفیوج دەتوانێت لەناو بینایەكی بچووكدا جێی ببێتەوە؟".

ئەمەش پرسیارێكی سەیر و سەمەرەی دیكە بوو. لە وەڵامدا گوتم كۆگایەكی بچووك دەتوانێت سەدان سەنتەرفیوج لەخۆبگرێت.

ئیدی منیش خۆم ڕانەگرت و خۆم خستە ژێر مەترسییەوە و وتم: "بۆچی ئەمانە دەپرسی؟"

حوسەین كامل بە گومانەوە چاوی لێكردم و بۆ ساتێك خۆزگەم دەخواست پرسیارم نەكردبا. پاشان شانی هەڵكێشا.

وتی: گومانمان هەیە كە ڕووسەكان ڕەنگە تەكنەلۆژیای سەنتەرفیوج بۆ ئێران دابین بكەن و دەمەوێت قەناعەتیان پێبكەم كە لەگەڵیاندا هەنگاو نەنێن.

ئەمە جێی متمانە بوو، بەڵام باری دەروونی شڵەژاوی حوسەین

كاملی ڕوون نەكردەوە. هیچ ڕوونكردنەوەیەكی دیكەی نەخستەڕوو و بە ئاماژەیەكی دەستی ئیشارەتی بەوەدا كە من ئازادم بڕۆم. لەگەڵ هەڵسانم لە سەر كورسییەكەم، ئاماژەیەكی دیكەی ناتایبەتمەندی كرد. لەجیاتی ئەوەی بە سادەیی بە شێوازی ئیمپراتۆر ئاسای خۆی لە ژوورەكە دوورمبخاتەوە، كەچی هەستا و دەستی بردە ئەودیوی مێزەكەی و دەستی گرتم. دەست گرتنەكە توند بوو، بەڵام بە شێداری دەستی دەكرد بەهۆی ئارەقەوە. بۆ ساتێك سەرنجی دام و لە چاوەكانیدا، بۆ ماوەی چركەیەك یان كەمتر، جۆرێكی چاوەڕواننەكراوی هەستم بینی. دواتر، بە بیركردنەوە لەوەی كە بە سوودی تێڕوانین بۆم دواوە، دەتوانم بڵێم كە بە جددی دەركەوت، نزیك بوو لە خەمباری، وەك ئەوەی بیەوێت شتێك بڵێت بەڵام نەیتوانیبێت.

بە تەواوی سەرم سوڕما. كات نزیك بوو لە نیوەی شەو.

بڕیار بوو پاشنیوەڕۆی دواتر بەشداری كۆبوونەوەیەكی كۆمەڵایەتی بەرپرسانی MIC و بەڕێوەبەرانی كۆمپانیا بكەم. بە ئۆتۆمبێلەكەم ڕۆیشتمە لای و هێشتا بیرم لە ڕەفتارە سەیرەكانی حوسەین كامل دەكردەوە. من بە شێوەیەكی ئاسایی بە دوودڵی بەشداریم لەم جۆرە بۆنانە دەكرد، چونكە بەشێكی زۆری دۆخی كۆمەڵایەتی لەخۆدەگرێت، بەڵام لەم پاشنیوەڕۆیەدا نیگەرانی ئەوەبووم كە ئاخۆ سەرۆكەكەم لە چ دۆخێكی دەروونیدا دەبێت و چۆن لەنێو بەڕێوەبەرەكاندا هەڵسوكەوت دەكات. چوون ئەو وەك سەرۆكی MIC ڕۆڵی سەرپەرشتی ڕێوڕەسمەكانی دەگێڕا. لەخۆمم دەپرسی ئاخۆ دەتوانێت بەردەوام بێت؟ بۆیە نەخۆشییەكەی هەرچییەك بووبێت، بەدوور نەدەزانرا كە بە تەواوی چاك ببێتەوە. هەوڵمدا ئەو نیگایەی دەموچاوی بەرپرسانی دیكە بە

خه‌یاڵمدا بێت كاتێك زاوا ترسناكه‌كه‌ی سه‌ددامیان له بارودۆخێكی وه‌ها به‌دبه‌ختانه‌دا ده‌بینی.

كاتێك گه‌یشتمه هۆڵی كۆبوونه‌وه‌كانی MIC نزیكه‌ی دوو سه‌د به‌ڕێوه‌به‌ر تێیدا كۆببوونه‌وه. حوسه‌ین كامل له هیچ شوێنێكدا دیار نه‌بوو. له‌كاتێكدا به‌ره‌و ژووره‌وه ده‌ڕۆیشتم بۆ ئه‌وه‌ی سڵاو له هه‌ندێك له هاوكاره‌كانم بكه‌م، وا دیار بوو خه‌ڵكه‌كه به قسه و باس و قسه‌ڵۆكه‌وه خه‌ریك بوون. زۆری نه‌خایاند به‌ڕێوه‌به‌رێك كه زۆر باش ده‌مناسییه‌وه، ده‌ستی خسته سه‌ر ئه‌ژنۆم و به ده‌نگێكی نزمه‌وه ئه‌و هه‌واڵه باوه‌ڕپێنه‌كراوه‌ی پێدام.

گوتی: "ده‌ڵێن حوسه‌ین كامل سه‌رله‌به‌یانی ئه‌مڕۆ به‌ره‌و ئوردن ڕۆیشتووه. له‌وه‌ده‌چێت هه‌موو خێزانه‌كه‌ی له‌گه‌ڵ خۆی بردبێت." له سه‌ره‌تا دا ورده‌كارییه‌كان زۆر ڕوون نه‌بوون، به‌ڵام له ڕۆژانی دواتردا وێنه‌یه‌كی ڕوونتر ده‌ركه‌وت. له كاتژمێره‌كانی سه‌ره‌تای ڕۆژی ٨ی ئابدا، كه زۆربه‌ی خه‌ڵكی ناوچه‌كانی به‌غدا خه‌وتبوون، حوسه‌ین كامل و براكه‌ی سه‌ددام كامل، خێزانه‌كانیان به ئۆتۆمبێله‌كانیان چه‌ند سه‌د كیلۆمه‌ترێك به‌ره‌و ڕۆژئاوا و به‌ناو بیابانه‌كاندا بردبووه عه‌ممانی پایته‌ختی ئوردن. نزیكه‌ی سی ئه‌ندامی خێڵی مه‌جید له‌گه‌ڵیان ڕۆیشتبوون، له‌نێویاندا دوو كچه گه‌وره‌كه‌ی سه‌ددام به ناوه‌كانی ڕه‌غد و ڕه‌نا كه هاوسه‌رگیریان له‌گه‌ڵ حوسه‌ین كامل و براكه‌یدا كردبوو. ئه‌وه‌بوو سه‌ددام به تووڕه‌ییه‌وه حوسه‌ین كاملی ئیدانه كرد و داوای ڕاده‌ستكردنه‌وه‌ی كرد به عێراق، به‌ڵام شا حوسێن -شای ئوردن- مافی په‌نابه‌ری به ته‌واوی خێزانه‌كه‌ی دا. دوای چه‌ند ڕۆژێك له گه‌یشتن به ئوردن، حوسه‌ین كامل وتارێكی بێ ئه‌نجام پێشكه‌ش كرد و داوای له عێراقییه‌كان كرد كه یاخی ببن و له دژی ڕژێم ڕاپه‌ڕن.

ئه‌و هه‌ڵهاتنه سه‌رسوڕهێنه‌ره جه‌نجاڵییه‌كی گه‌وره‌ی له به‌غدا دروستكرد، له‌وێدا له یه‌ك كاتدا بووه بابه‌تی ده‌نگۆی چرپه له گۆشه‌ی شه‌قامه‌كان و له ماڵه تایبه‌ته‌كاندا. قسه و باسه‌كان له‌سه‌ر ڕكابه‌رییه گریمانه‌كراوه‌كانی حوسه‌ین كامل بوو له‌گه‌ڵ كوڕه گه‌وره‌كه‌ی سه‌ددام – عوده‌ی-كه به‌م دواییه ده‌ستدرێژی كردبووه سه‌ر هه‌ندێك له مامه‌ڵه بازرگانییه‌كانی له بازاڕی ڕه‌شدا. ده‌شگوترا كه حوسه‌ین كامل و براكه‌ی كه سه‌رۆكایه‌تی هێزه ئه‌منییه‌كانی سه‌رۆكایه‌تی ئه‌مریكایان كردووه، گه‌یشتوونه‌ته خاڵێك كه له‌گه‌ڵ كوڕه‌كانی سه‌ددامدا ناكۆكییه‌كی ئاشت نه‌كراوه له‌نێوانیان دا بووه. من تاوه‌كو له‌توانام دابوو خۆم له قسه‌كردن له‌سه‌ر بابه‌ته‌كه به‌دوور گرتبوو. گومانم ده‌كرد كه من یه‌كه‌م كه‌سبم كه به‌ر له واده‌ی خۆی به كێشه‌كه‌ی حوسه‌ین كاملم زانیبێت. به‌ڵام سه‌ره‌تا له ترسی ئه‌وه‌ی كه ڕه‌نگه بمخه‌نه نێو تۆڕی گومانی سه‌ددام، بۆیه باسی كۆبوونه‌وه‌كه‌مانم له‌گه‌ڵ حوسه‌ین كامل و له دره‌نگانی شه‌ودا به كه‌س نه‌گوت. به‌ڵام چه‌ند ڕۆژێك دواتر داواكارییه‌كم پێگه‌یشت كه یاداشتێك له‌باره‌ی كۆبوونه‌وه‌كه‌مانه‌وه بنووسم، له‌لایه‌ن وه‌زیری نه‌وت -ئه‌میر ڕه‌شید- ڕاوێژكاری سه‌ددام كه ئه‌ویش ده‌بێ له سكرتێره‌كه‌ی حوسه‌ین كامله‌وه زانیبێتی. یه‌كسه‌ر قه‌ڵه‌م و كاغه‌زێكم ده‌رهێنا و باسی ته‌واوی ئه‌و دیداره سه‌یره‌م بۆ نووسی.

لادانی حوسه‌ین كامل كاریگه‌رییه‌كی ته‌واوی له‌سه‌ر ژیانم هه‌بوو، چونكه له بنه‌ڕه‌تدا ڕه‌وتی پشكنینی چه‌كه‌كانی گۆڕیبوو. له ماوه‌ی هه‌فته‌یه‌كدا دوای گه‌یشتنیان به ئوردن، ده‌ستیكرد به كۆبوونه‌وه له‌گه‌ڵ پشكنه‌رانی نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان و كارمه‌ندانی هه‌واڵگری ڕۆژئاوا، كه وه‌ك هه‌نگ به‌سه‌ر گوڵێكی

تازە پشكتوودا هاتبوون. ئەو بە وردی بەرنامەكانی بەرهەمهێنانی چەكی بایۆلۆژی و كیمیایی خستەڕوو كە تەنها بە شەڕی ساڵی ١٩٩١ دژی عێراق كۆتایی هات، هەروەها بڕیاری سەددام بۆ لەناوبردنی ئەم ژەهرانەی دوای شەڕەكە بۆ ئەوەی لە جیهانی دەرەوە بیانشارێتەوە. ئاشكراشی كرد كە پرۆگرامی سەنتەرفیوج لە سەنتەری دیزاینی ئەندازیاری لە شاری ڕەشیدیە ئەنجام دراوە، هەروەها لە چەند مانگی پێش جەنگی كەنداو لە ساڵی ١٩٩١ هەوڵمان داوە سەنتەرفیوجی پێویست بۆ یەك بۆمبی خاو دروست بكەین. جگەلەوەش كۆمەڵێك لە مامەڵەی كڕینی ماددەكانی ئاشكرا كرد، لەوانەش ڕادەی ئەو هاوكاریانەی كە لە شاب و ئەڵمانییەكانی دیكە وەرمانگرتبوون. هەروەها دووپاتی كردبوویەوە كە من پێشەنگی هەوڵەكانی سەنتەرفیوج بووم.

ئێستا دەركەوت كە دوا كۆبوونەوەم لەگەڵیدا مانای زیاتری هەبوو. وادیارە حوسەین كامل ویستویەتی یادەوەرییەكانی سەبارەت بە بەرنامەی سەنتەرفیوج نوێ بكاتەوە، چونكە ئەو وردەكاریانە دەبنە دراو لە دانوستانەكانی لەگەڵ بەرپرسانی ئوردن و ڕۆژئاوا. هەرچەندە تەواو نەبوونی بیرەوەرییەكەی سەبارەت بە هەندێك لە ڕاستییە بنەڕەتییەكانی هێشتا سەرم لێ شێوا. یان دواجار تووشی كێشەیەكی مێشك بوو یان سترێسی ئامادەكاری بۆ لادان ژێرییەكانی پەرش و بڵاو بووبووەوە.

سەرەتا هیچ ڕێگەیەك نەبوو بۆ ئەوەی بە تەواوی بزانین حوسەین كامل چی ئاشكرا دەكات. بەڵام گریمانە دەكرا كە پشكنەرەكان بە تەواوی لێكۆڵینەوەی لەگەڵ بكەن. لیژنەی چاودێری كە دەیزانی یارییەكە كۆتایی هاتووە، هەنگاوی نا بۆ پێشگرتن لە پرسیارە پێشبینیكراوەكانی پشكنەرەكان. ئەوان

چەندین بەڵگەنامەیان لە بەرنامەكانی WMD كۆكردەوە، لەگەڵ ئەوەی ماوەتەوە لە كەرەستە پەرشوبڵاوەكانی وەك چەند تۆنێك پۆڵای پتەو و بەرگەكانی سەنتەرفیوج. سندوقی دار و كانزای پڕ لە مایكرۆفیچ و دیسكی كۆمپیوتەر و ڤیدیۆ و وێنەیان كۆكردەوە كە بە درێژایی سەرەتای نەوەدەكان لە پشكنەران شاراوە بوون. پاشان بە ئۆتۆمبێلەكەیان بردیانە كێلگەیەكی پەلەوەر، كە خاوەنەكەی حوسەین كامل بوو لە گەڕەكی حەیدەر لە بەغدا و هەموو سندوقەكانیان لەم دەواجنەدا قفل كرد.

لە ١٨ی ئابدا، كارمەندێكی SSO ئاماژەی بە پشكنەرەكان كرد كە پێویستە لێكۆڵینەوە لە كێڵگەی مریشكی حوسەین كامل بكەن. لەسەر شوێنەكە دابەزین و بە خێرایی كۆگای بەڵگەنامەكانیان دۆزیەوە و بە عەرەبانە بردیان بۆ پشكنین. بەو زانیارییە نوێیە لە دەستدا، پشكنەرانی نەتەوە یەكگرتووەكان فشاریان خستە سەر دۆسیەكەیان و سەددام ناچار بوو دان بە تەماحەكانیدا بنێت بۆ دروستكردنی چەكی ئەتۆمی. بەڵام حكومەت ئەو ئیدیعایە باوەڕپێنەكراوەی كرد كە حوسەین كامل بە تەنیا مامەڵەی كردووە بۆ دەستپێكردنی بەرنامەی كەوتنەخوارەوەی فڕۆكەكە، و ئەم بەڵگەنامە و كەرەستانەی لە كێڵگەكەی خۆیدا هەڵگرتووە بەبێ ئەوەی حكومەت ئاگاداری بێت. تاریق عەزیز وەزیری دەرەوە حوسێن كامێلی وەكو كەسێكی زەحمەتكێش وێنا كرد كە دەیەوێت بەبێ ئاگاداری سەددام بەرنامەیەكی ئەتۆمی سێبەر پەرەپێبدات و دواتر سەرۆك لە پۆستەكەی دووربخاتەوە. پشكنەرەكان بە خێرایی ئەم ئیدیعایەیان ڕەتكردەوە، بەڵام ڕێگەی بە ڕژێمی سەددام دا كە بە فەرمی بەرپرسیارێتی داوای بۆمب لە ئەستۆ بگرێت.

من و دكتۆر عادل دوای ئەوەی پشكنەرانی چەك لەوێ بوون، هەر زوو بە ئۆتۆمبێل بەرەو دەواجنەكەی حەیدەر ڕۆیشتین. تا ئەو كاتەی گەیشتین، هەموو بەڵگەنامەكان لابرابوون و تەنها كەمێك مابوونەوە جگە لە پۆڵای پتەو كە مابووەوە. لامان ڕوون بوو كە پاك و بێ خەوش بوو، دیاربوو كە ماوەیەكەی زۆر نەبوو لەوێ هەڵگیرابێت.

لە دەوروبەری ئەم كاتانەدابوو كە ناوی لیژنەی چاودێری گۆڕدرا بۆ بەڕێوەبەرایەتی چاودێری نیشتمانی (NMD) كە تا ئێستاش لە ژێر دەستی تاریق عەزیزدایە[١]. توانیم شریتێكی ڤیدیۆیی بەڕێوەبەرایەتی چاودێری نیشتمانی ببینم كە بە تەواوی ئەوەی لە دەواجنەكە دۆزرایەوە نیشانی دەدا. لەكاتێكدا كامێراكە بەسەر ئەو كۆمەڵە مادەدا دەسوڕایەوە، سەرم سوڕما كە تێكەڵەیەك لە بەشەكانی سەنتەرفیوجم بینی. دركم بەوەكرد كە دەبێ ئەو پێكهاتانە بن كە لە ساڵی ١٩٩١ جیاكراونەتەوە، كاتێك SSO هەوڵی دەدا مادەی پێویست بۆ سەد سەنتەرفیوج بشارێتەوە. ئەو ڕاستییەی كە بۆ ماوەیەكی زۆر شاراوە بوون، پێشنیاری مەبەستێك بوو بۆ دەستپێكردنەوەی بەرنامەی سەنتەرفیوج لە قۆناغێكدا. بەڵام كۆمەڵە بەشێكی گاڵتەجاڕانە بوو كە نەبوونی بیركردنەوەی واقیعی لە ئاستی بیرۆكراتیدا نیشان دەدا.

بە سەیركردنی ڤیدیۆكە تەنها حەوت سندوق بەڵگەنامەم ژمارد كە دەوترێت سەر بە بەرنامەی سەنتەرفیوجن. بیرم هاتەوە كە SSO نزیكەی سەد سندوق بەڵگەنامەی لە ڕەشیدیە وەرگرتبوو لە ساڵی ١٩٩١. كاتێك ئەم ناتەباییەم هێنایە بەرچاوی

---

[١] چاپی یەكەمی كتێبەكە لە ساڵی ٢٠٠٤ دا بوو

بەڕێوەبەرایەتی چاودێری نیشتمانی، پێیان وتم کە هەموو بەڵگەنامەكانی دیكە براون بۆ كێڵگەیەكی دیكە و سووتێنراون. دواتر پشكنەران بەڵگەیان لەسەر ئەمە دۆزیەوە، كاتێك بەڕێوەبەرایەتی چاودێری نیشتمانی بردنیان بۆ شوێنی سووتاندنەكە و خۆڵەمێش و نیوە كاغەزی سووتاویان پیشاندا. بەڵام هەرگیز نەیانتوانی دووپاتی بكەنەوە كە هەموو بەڵگەنامەكانی سەنتەرفیوج لەناوبراون.

دوای لادانی حوسەین كامل، بەڕێوەبەرایەتی چاودێری نیشتمانی ناچار بوو دان بەوەدا بنێت كە من سەرۆكی بەرنامەی سەنتەرفیوجم. لە ناوەڕاستی مانگی ئەیلولدا فەرمانی كۆبوونەوەی پشكنەرەكانم پێگەیشت لە ڕۆڵی دانپێدانراومدا. درەنگانی بەیانی بوو، لە شوێنی كارە كۆنەكەمدا چاوەڕێی پشكنەری ئینگلیزی - گاری دیلۆن- بووم. زوو گەیشتبووم، بۆ ئەوەی لەوێدا چەند ساتێك بەسەر بەرم و بە دەوری كۆمپاوندەكەدا بگەڕێم. لەوێدا دەگەڕام و بیرم لە ڕۆژانی سەنتەرفیوج دەكردەوە. هەرچەندە بەشێك لە كەسێتی من بە تامەزرۆییەوە دواجار توانیم خۆم لە ڕاستییەكانی بەرنامەكەمان لە ڕەشیدیە ڕزگار بكەم، بەڵام لە پێشبینی هاتنی پشكنەرەكاندا هەستم بە دەمارگیری دەكرد. دوای ئەوەی سێ ئۆتۆمبێلی نەتەوە یەكگرتووەكان لە دەروازەكەوە هاتنە ژوورەوە، دیلۆن هاتە خوارەوە و بە گەرمی سڵاوی لێكردم، بەبێ ئەوەی شوێنەواری تۆمەتباركردن لە ساڵانی ڕابردووی فێڵكردندا هەبێت. چونكە ئەو باش ئاگاداری ئەو ڕاستییە بوو كە زانایانی عێراق بڕیاردەری پشت ئەو فێڵە نەبوون. گەشتێكم بە دیلۆن و نزیكەی دە لە هاوكارەكانی كرد بە دەوروبەری سەنتەری دیزاینی پێشوو، ئاماژەم بەو بینایانە كرد كە ئێمە تاقیكردنەوەمان لەسەر

سەنتەرفیوجی بیمز ئەنجامدابوو و تاقیکردنەوەی جیاکردنەوەمان بە سەنتەرفیوجی موگناتیسی ئەنجامدا. دیلۆن وتی ئاژانسی وزەی ئەتۆمی بەدرێژایی ماوەی ڕابردوو هەمیشە گومانی ئەوەی هەبووە کە ڕەشیدیە شادەمار و ناوەندی بەرنامەکە بێت.

من تیمێکم دانابوو تاوەکو پاشماوەی زۆر لە هۆڵی پلان بۆ داڕێژراوی شلەمەنیدا لاببەن، بۆ ئەوەی تیمی دیلۆن بتوانن شوێنپێی دیزاینی کاسکەیدەکە لە زەوییەکەدا ببینن. زۆرێك لە پێکهاتەکان گۆڕانکارییان بەسەردا هاتبوو و وەك پێشتر دەرکەوتبوون کە وەسفم کرد. ئەوەبوو باسی ڕۆژە خامۆش و سەرسوڕهێنەرەکانی ساڵی ١٩٩٠م بۆ کردن، کاتێك هەوڵماندا بەرنامەکە لە ماوەیەکی کەمدا تەواو بکەین کە چاوەڕوانی ئەوەی لێ نەدەکرا. هەستم بە ئاسوودەییەکی گەورە کرد کە دواجار توانیم ئەم شتانە ئاشکرا بکەم.

دیلۆن: بۆچی بۆ ماوەیەکی زۆر هەوڵتدا ئەم ئاسانکارییە بشاریتەوە؟ لێرە تەنها پێکهاتە هەیە، هیچ ئامێرێکی تێدا نییە. کەواتە سوودی چی بوو کە مەبەستی ڕابردووت ڕەت بکەیتەوەو ددانی پێدا نەنێیت؟"

من نەمتوانی بیر لە هۆکارێکی ستراتیژی بکەمەوە بۆ داپۆشینی سروشتی ڕاستەقینەی شوێنی ڕەشیدیە بۆ ماوەیەکی زۆر. لە یەك دوو ساڵی دوای شەڕی ١٩٩١، هەستم کرد سەددام هیوای ئەوەی هەبووە کە بەرنامە ئەتۆمییەکە سەر لەنوێ دروست دەست پێبکاتەوە. بەڵام بەو پێیەی پشکنەرەکان بە شێوەیەکی کاریگەر ئامێرەکانی عێراقیان بۆ دروستکردنی چەکی ئەتۆمی داماڵی، فێڵەکان کەمتر بوونە ڕێوشوێنێك بۆ پاراستنی بەرنامەکە و زیاتر بوونەتە کاردانەوەیەك بەرامبەر بە فشاری دەرەکی.

گوتم: فەرمانەكان تەنیا بۆ شاردنەوەی بوون. بەرنامەی سەنتەرفیوج هەمیشە لە پێشینەی كارەكانی شاردنەوە بوو.

شیكاری ئەو شتانەی كە بە "بەڵگەنامەكانی دەواجنی مریشك" ناسرا، پێویستی بە چەند مانگێك لێكۆڵینەوە هەبوو لە بارەگای ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی لە ڤیەنا. لەم ماوەیەدا دەیان چاوپێكەوتنم ئەنجامدا. سەرەتا پشكنەرەكان سەرنجیان لەسەر بەرنامەی بەریەككەوتن و تێكچڕژان و تۆڕی كڕینەكانمان لە بازاڕی بیانی و مێژووی چۆنیەتی پەرەپێدانی سەنتەرفیوجمان لە ڕەشیدیە بوو.

لە پرسیارەكانی پشكنەرەكانەوە ئەوە ڕوون بووەوە كە بەڵگەنامەكانی كێڵگەی مریشكەكان سكێچی سەنتەرفیوجەكانیان لەخۆگرتبوو بەڵام نەخشەكێشانی دیزاینی ڕاستەقینەی بەكارهێنراو بۆ دروستكردنی پێكهاتەكان نەبووە. چاوەڕێم دەكرد لە هەر ساتێكدا ڕووبەڕووی شایەتحاڵی حوسەین كامل ببمەوە كە من بە شێوەیەكی شەخسیی كۆپی سەرەكیی نەخشەی سەنتەرفیوجەكەمانم پاراستووە. بەڵام هەرگیز بابەتەكە سەریهەڵنەدا. لەدڵی خۆمدا پرسیارم لەخۆم دەكرد كە ئاخۆ ڕێی تێدەچێت حوسەین كامل ئەو كۆپییانە لەبیر بكات كە لای من حەشاردرابوون؟ لەوەدەچوو ئەو شتە ڕێی تێبچێت، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی مانگەكاندا، بیرم لە هیچ ڕوونكردنەوەیەكی دیكە نەدەكردەوە.

پشكنەرەكان هێشتا زانیاری سەرەكیی پشت سەنتەرفیوجی عێراقییان نەبینیبوو. ئەوان ئەو پێوانانە و كەرەستەكان و ژمێریاری

ئالۆزیان نەدەزانی کە تاقیکردنەوەی سەرکەوتوومان بۆ نموونەیەکی سەرەتایی کردبووە شتێکی واقیع. ڕوونم کردەوە کە هێزە ئەمنییەکان لە ساڵی ١٩٩١دا هەموو کاغەزەکانیان لە ڕەشیدیە وەرگرتووە و بە من و ستافەکەمیان وتووە کە بە فەرمانی سەددام لەناوبراون. بەڵام دووبارە و سێبارە پرسیاریان دەکرد: «کوا نەخشەکان؟» ئەوان نەیانتوانی قبوڵی ئەوە بکەن کە عێراق هەموو ئەم بەڵگەنامانەی سووتاندووە و بەڕێوەبەرایەتی چاودێری نیشتمانی نەیتوانی هیچ بەڵگەیەکی پتەو بخاتەڕوو کە ئەوان ئەو کارەیان کردووە. هەروەها ئەم داینامیکە بە ڕواڵەت لە ڕووی چەکی بایۆلۆژی و کیمیاییەوە کێشەیەك بوو. بەڕێوەبەرایەتی چاودێری نیشتمانی ڕایگەیاندبوو کە عێراق لە ماوەی هەشتاکان هەشت هەزار و ٥٠٠ لیتر لە مادەی بەکتریای ئەنتراکس بەرهەمهێناوە بەڵام لە سەرەتای سالانی ١٩٩٠ هەمووی لەناوبرد. پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان حیسابیان کردووە کە عێراق توانای بەرهەمهێنانی نزیکەی سێ هێندەی ئەو بڕە مادەی ئەنتراکسی هەیە، و نەیانتوانیوە بڕی لەناوچووەکە پشتڕاست بکەنەوە. بۆیە گومانەکانیان درێژەی کێشا.

حوسەین کامل لە دەربەدەری و دوورە وڵات لە ئوردن، بانگەوازی بۆ سەددام کرد کە داوای لێبوردن دەکات و داوای مۆڵەتی گەڕانەوەی دەکات بۆ عێراق. کارەکە وادەردەکەوت کە لە خۆکوژی زیاتر هیچی تر نەبێت. دواتر کەسانێك هەبوون کە لێرەو لەوێ قسەیان دەکرد و دەیانگوت سەددام هەڕەشەی ئەوەی کردووە کە ئەگەر حوسەین کامل و براکەی نەگەڕێنەوە ئەوا هەموو ئەندامانی خێزانەکەیان دەسڕێتەوەو لەناویان دەباتن.

هه‌ندێكی تر گریمانه‌یان ده‌كرد كه‌ حوسه‌ین كامل -كه‌ پێگه‌ی به‌هێزی خۆی لێ دزرا و له‌لایه‌ن حكومه‌ته‌كانی ڕۆژئاواوه سووكایه‌تی پێكرابوو- له‌ ژیانی ئوردن بێ هیوا بووه‌ و هه‌ستی كردووه‌ ژیانی له‌وێ هیچ ئامانجێكی نییه‌. سه‌ددام به‌ ڕواڵه‌ت و زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌كه‌وه‌ و له‌ پشتیشیه‌وه‌ چه‌قۆیه‌ك هه‌بوو په‌یامێكی بۆ حوسه‌ین كامل نارد كه‌ ئه‌گه‌ر له‌گه‌ڵ براكه‌ی و هاوسه‌ره‌كانیان بگه‌ڕێته‌وه‌ ئه‌وا له‌ هه‌موویان خۆش ده‌بێت.

به‌ شێوه‌یه‌كی بڕوا پێ نه‌كراو براكان ئه‌م چه‌واشه‌كارییه‌یان به‌ ڕاست وه‌رگرت. له‌ ٢٠ی شوباتی ١٩٩٦ به‌ كاروانێك له‌ عه‌ممانه‌وه‌ به‌ره‌و به‌غدا له‌گه‌ڵ ڕه‌غد و ڕه‌نا به‌ڕێكه‌وتن. كاتێك گه‌یشتنه‌ سنووری عێراق، ڕووبه‌ڕووی عوده‌ی و ده‌سته‌یه‌ك له‌ چه‌كداره‌كان بوونه‌وه‌. عوده‌ی خوشكه‌كانی و منداڵه‌كانیانی خستنه‌ ناو كۆپته‌رێك و مێرده‌كانیان له‌ هێلیكۆپته‌رێكی تردا. حوسه‌ین كامل و براكه‌ی به‌ فڕۆكه‌ ڕه‌وانه‌ی به‌غدا كران بۆ لێپرسینه‌وه‌ و دواتر ڕێگه‌یان پێدرا بگه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ موڵك و ماڵی خێزانه‌كه‌یان له‌ گه‌ڕه‌كی ئه‌لسه‌یدییه‌ له‌ ڕۆژئاوای به‌غدا. به‌یانی ٢٣ی شوبات، سه‌ددام جیابوونه‌وه‌ی كچه‌كانی ڕاگه‌یاند. ئه‌و شه‌وه‌ ده‌یان ئه‌فسه‌ری ئه‌منی به‌ سه‌رپه‌رشتی عوده‌ی و قوسه‌ی ماڵی حوسه‌ین كامل و براكه‌ی له‌ ئه‌لسه‌یدیه‌ گه‌مارۆ دا. تیمێكی دیكه‌ی ئه‌منی پاسێكی پڕ له‌ خزم و هاوڕێكانی حوسه‌ین كاملیان هێنایه‌ گردێكی نزیك، له‌وێشه‌وه‌ ئه‌وان ناچاركرابوون سه‌یری ئه‌و ڕووداوه‌ ترسناكانه‌ بكه‌ن كه‌ خه‌ریك بوو ڕوویان ده‌دا. له‌ به‌یانیدا شه‌ڕه‌ ده‌مانچه‌یه‌كی توند ده‌ستی پێكرد. حوسه‌ین كامل و خێزانه‌كه‌ی هه‌وڵیاندا به‌رگری له‌ خۆیان بكه‌ن، ئه‌ویش به‌ ته‌قه‌كردن له‌

هێرشبەرەکان لە پەنجەرەی ماڵەکەیانەوە. دوای چەند کاتژمێرێك زۆربەی ئەوانەی لەناوەوە بوون پێکران و کوژران، لەنێویاندا براکەی حوسەین کامل و باوکی و خوشکەکەی و کوڕەزای و چەند پاسەوانێکی. هێرشبەرەکان هەڵیانکوتایە سەر کۆشکەکە و حوسەین کاملی برینداریان بۆ دەرەوە ڕاکێشا و لەبەردەم کەسوکاریدا لە سێدارەیان دا. دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە کە پێیان وتراوە: "با ئەمە وانەیەك بێت کە ڕێگە بە هیچ خیانەتکارێك نادرێت بژیت."

لەلایەکی تر لادانی حوسەین کامل لێکەوتەی قورسی بۆ کارل هاینز شاب هەبوو. پشکنەرەکان زانیان کە ئەو نەك هەر ڕۆتۆرەکانی ڕیشاڵی کاربۆنی دروستکردووە بەڵکو بە نهێنی نەخشە پۆلێنکراوەکانی بۆ سەنتەرفیوج و بێلۆی زۆر گرنگ دابین کردووە. بۆ ئەوەی لە تۆمەتی خیانەت لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەڵمانیا ڕزگاری بێت، شاب لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٥ بەرەو بەرازیل هەڵهات و دواتر بریجیتی هاوسەریشی. کاتێك لێکۆڵەرە ئەڵمانییەکان دواجار بەدوایدا ڕۆیشتن بۆ بەرازیل داوای ڕادەستکردنەوەیان کرد. پۆلیسی بەرازیل شابیان دەستگیرکرد و نزیکەی ساڵ و نیوێکیان خستە زیندانەوە، بەڵام دواتر بەپێی یاساکانی بەرازیل ئازادکرا. دواجار گەڕایەوە ئەڵمانیا و لە ساڵی ١٩٩٨ دانی بە تاوانەکەیدا ناوە کە خیانەتی کردووە و لە چوارچێوەی گرێبەستەکەدا سزای هەڵپەسێردراوی وەرگرتووە واتە ئەو کاتەی لە زیندان بوو لە ڕیۆ لەبەرچاو گیراوە. میدیاکانی ئەڵمانیا لەسەر ئەو سزا سووکە هەلایان دروستکرد و حکومەتیان تۆمەتبارکرد بەوەی کە خۆی خزاندۆتە ناو دادگا بۆ ئەوەی دادگاییکردنێکی درێژخایەن نەبێت.

بە درێژایی نیوەی دووەمی ساڵانی نەوەدەكان، پشكنەرەكان بەردەوام بوون لە لێپرسینەوەم سەبارەت بە وردەكارییەكانی بەرنامەی سەنتەرفیوج و ئەگەری شوێنی بەڵگەنامە ونبووەكان. لە زۆربەی كاتەكاندا ئەم بەریەككەوتنانە لە ڕادەبەدەر دۆستانە بوون و تەنانەت هەندێك سەری دەكێشا بۆ بابەتگەلی فەلسەفی. لە ساڵی ١٩٩٦ پشكنەری فەرەنسی جاك باوتێم هێنایە شوێنێك لە تاجی - كە نزیكەی هەژدە میل لە باكووری بەغداوە دوورە- لەوێ لە سەرەتای بەرنامەكەدا پێشبینیمان كردبوو كارگەیەكی گەورە بۆ چوار هەزار سەنتەرفیوجی نەوت دروست بكەین. پارچە زەوییەكی كشتوكاڵی میل چوارگۆشە بوو لە ناوچە بەپیتەكەی نێوان فورات و ڕووبارەكانی دیجلە، بەهۆی ڕیزەكانی درەختی كالیپتوسەوە لە چاوی خەڵك دووربوو و نزیكەی نیو میلیش لە ڕێگاكەوە دووربوو. ئەوێ شوێنێكی تەواو بوو بۆ شاردنەوەی دامەزراوەیەكی ئەتۆمی. من و باوتێ لە تەنیشت ڕێگاكە وەستاین و بە ڕێڕەوێكی خاكی لە نێوان بێستانە بەپیتەكە ڕۆیشتین كە بە خەیار و تەماتەی جوان داپۆشرابوو. كەش و هەوا گونجاو بوو و زۆری نەخایاند كەوتینە ناو گفتوگۆیەكی خۆشەوە.

گوتی: پێم بڵێ مەهدی، بۆچی عێراق ویستی بۆمبی ئەتۆمی دروست بكات؟

پرسیارێك بوو پێشتر هەرگیز لێم نەكرابوو. ساتێك بیرم كردەوە پێش ئەوەی وەڵام بدەمەوە.

من: دەزانی جاك، نزیكەی هەموو خانوویەكی عێراقی لەسەر پەنجەرەكانی داری پارێزەریان (پەرژینی دارین) هەیە، لەكاتێكدا

بەزەحمەت ئەمە لە ماڵە فەرەنسییەكان دا دەبینرێت. خەڵك لە عێراق دەترسن پەنجەرەكانیان بشكێنرێت و بێنە ناو ماڵەكانیانەوە".

وتی: باشە، هەرگیز بیرم لەوە نەكردۆتەوە. بەڵام تۆ مەبەستت چییە و دەتەوێت چی بڵێیت؟

وتم: لە عێراق هەستێكی قووڵی نائەمنی هەیە. كاتێك وا لە خەڵك دەكەیت هەست بە ئاسایش بكەن، ئیدی پێویست بەوەناكات كە ماڵەكانیان بە پەرژینی پەنجەرە بپارێزن. دەی هەمان شت بۆ گەلانیی تریش ڕاستە. هەر كە هەستیان بە ئاسایش كرد، بیر لەوە ناكەنەوە كە پێویستیان بە بۆمب هەبێت. پرسیارەكە ئەوەیە كە چۆن بە جۆرێكی تر هەستكردن بە ئاسایش بەدەست بهێنین.

باسمان لە بۆردومانی ئیسرائیل كرد بۆ سەر ڕیاكتۆری ئەتۆمی عێراق لە ساڵی ١٩٨١ و ئەو بێ متمانەییەی یەكتر كە ڕەنگە خواستی چەكی ئەتۆمی لەلایەن هەردوو لایەنەوە زیاتر كردبێت. دواتر گفتوگۆكەمان گۆڕا بۆ شەڕی سارد لە نێوان ئەمریكا و یەكێتی سۆڤیەت و ئەو ڕاستییەی كە دوو زلهێز نزیكەی نیو سەدەیان لە یارییەكی یەكجارەكی ئەتۆمیدا بەسەر برد. باسمان لەوە كرد كە فەرەنسا خاوەنی چەكی ئەتۆمی بوو بەڵام ئەڵمانیا - كە لە ماوەی سەدەی ڕابردوودا دووجار وڵاتەكەی داگیركردبوو- چەكی ئەتۆمی نەبوو. كەچی ئێستا وادەبینین ئەو دووانە هاوبەشی ستراتیژین لە ئەوروپایەكی تازە یەكگرتوودا. بە دڵنیاییەوە ئەمە نیشانی دا كە هاوكاری دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر گومان لە نێوان گەلاندا. من و دكتۆر باوتێ بەردەوام بووین لە گفتوگۆكەمان كاتێك گەڕاینەوە سەر ئەو ڕێگایەی كە وەستابووین.

پشكنه‌ره‌كانی دیكه زیاتر شه‌ڕانگێز بوون. له ساڵی ١٩٩٧ له‌گه‌ڵ پشكنه‌ری ئه‌مریكی سكۆت ڕیته‌ر سه‌رمان خسته سه‌ری یه‌كتر و به‌توندی ڕووبه‌ڕووی یه‌كتر بووینه‌وه. ڕیته‌ر به‌شێك له به‌رنامه مووشه‌كییه‌كانی ئاشكرا كردبوو كه هێشتا حسابیان بۆ نه‌كراوبوو له دوای لادانی حوسه‌ین كامل. هه‌رچه‌نده پێشینه‌یه‌كی ته‌كنیكی سنوورداری هه‌بوو، به‌ڵام وه‌ك ده‌ریاوانێكی خاوه‌ن ئه‌زموون، لێهاتووییه‌كی ده‌رخست كه له‌لایه‌ن زۆرێك له زانایانی عێراقی ده‌مارگیری لێكه‌وته‌وه. چونكه كاره‌كه‌ی له عێراق په‌یوه‌ندی به به‌رنامه‌ی مووشه‌كییه‌وه هه‌بوو، سه‌رم سوڕما كاتێك ویستی قسه‌م له‌گه‌ڵ بكات له‌سه‌ر به‌رنامه‌ی سه‌نته‌رفیوج. له ژوورێك له باره‌گای به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی چاودێری نیشتمانی كۆبووینه‌وه، له‌گه‌ڵ دكتۆر جه‌عفه‌ر و چه‌ند پشكنه‌رێك كه نه‌مده‌ناسینه‌وه. دوای كۆمه‌ڵێك پرسیاری پڕ ئاماژه، دكتۆر جه‌عفه‌ر به‌ڕێز ڕیته‌ری به سیخوڕی سی ئای ئه‌ی ناوبرد و به په‌له له چاوپێكه‌وتنه‌كه چوویه ده‌ره‌وه. پاشان ڕیته‌ر به چاوێكی تر سه‌رنجی خسته سه‌ر من.

گوتی: ئێمه له‌گه‌ڵ تۆین. ده‌زانم تۆ شته‌كان ده‌شاریته‌وه.

به‌دوای زه‌ڕڕه‌یه‌ك له دوودڵی و نیگه‌رانیدا ده‌گه‌ڕا. وێنه‌ی ئه‌و به‌ڵگه‌نامه و پێكهاتانه‌ی كه له باخچه‌كه‌مدا نێژراون، له مێشكمدا ده‌دره‌وشایه‌وه. باش ده‌مزانی چی به‌سه‌ر من و خێزانه‌كه‌مدا دێت ئه‌گه‌ر هیچ ئاماژه‌یه‌ك بدركێنم به‌وه‌ی كه ئه‌و نهێنییانه له‌وێ و له‌ناو باخچه‌كه‌مدا شاراوه‌ن. ئه‌وه‌بوو من به باشترین به‌رگریكردن له خۆم هێرشم كرد و خاڵی لاوازی ئه‌وم به‌كارهێنا، كه بریتیی بوو له نه‌بوونی زانیاری ته‌كنیكی له بواری ئه‌تۆمیدا.

من: سه‌یركه‌، به‌رنامه‌ی سه‌نته‌رفیوج له‌مانه پێكدێت: دیزاینی چه‌مكی، دیزاینی بنه‌ڕه‌تی، دیزاینی ورد، به‌رهه‌مهێنان، دروستكردنی بینا، دروستكردنی نموونه‌یه‌كی سه‌ره‌تایی و دروستكردنی كارگه‌یه‌ك بۆ به‌رهه‌مهێنان. جا با پرسیارێكی ساده‌تان لێ بكه‌م. ئێستا من كام له‌مانه ده‌شارمه‌وه؟

ئه‌و به هه‌مان تۆن دژایه‌تی من ڕه‌تیكرده‌وه، بۆیه من به‌رده‌وام بووم له هه‌وڵدان بۆ كۆتاییهێنان به چاوپێكه‌وتنه‌كه.

من: چه‌ند مانگێكه له‌گه‌ڵ هاوكاره‌كانت قسه ده‌كه‌م كه كه‌سانی ته‌كنیكی لێهاتوو و خاوه‌ن ئه‌زموونن. من خۆم پیاوێكی ته‌كنیكیم. گفتوگۆكان له‌گه‌ڵ هاوكاره‌كانت له چه‌ند ساڵی ڕابردوودا به باشی به‌ڕێوه‌چوون. كه‌چی ئێستا له‌ناكاو تۆ هاتوویت و تۆمه‌تبارم ده‌كه‌یت به شاردنه‌وه‌ی شتێك، به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ناتوانیت بڵێیت چی ده‌شارمه‌وه. هه‌ست ده‌كه‌م كه ئێوه خاوه‌ن ئه‌و ئاسته نین بۆ ئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵمدا باسی ئه‌م بابه‌ته بكه‌ن.

به‌جۆرێك سه‌یری كردم كه هیچی پێ نه‌بێت بۆ گوتن، پاشان ده‌موچاوی سوور بووه‌وه. ده‌سته‌كانی لێره و له‌وێ بۆ له‌نێو كاغه‌زه‌كان ده‌گه‌ڕان و هه‌ستم ده‌كرد به‌دوای ڕێگه‌یه‌كدا ده‌گه‌ڕێت بۆ ئه‌وه‌ی له ژووره‌كه ده‌ربچێت. چاوپێكه‌وتنه‌كه كۆتایی هات. من پلانم نه‌بووه له‌گه‌ڵ ڕیته‌ر ئه‌وه‌نده شه‌ڕانگێز بم. به‌ڵام تاسه‌ر ئێسقانم هاتبوو. ئه‌وه‌بوو جارێكی تر یه‌كترمان نه‌بینیه‌وه.

تا ساڵی ١٩٩٨ پشكنه‌ره‌كان هه‌موو ئامێره‌كان و كه‌ره‌سته‌ی خاو و دامه‌زراوه‌كانی به‌رنامه‌ی سه‌نته‌رفیوجیان لابردبوو یان بێ

توانایان كردبوو. بەڵام سەددام بەردەوام بوو لە هەڵوێستی سەرپێچیكارانەی خۆی، ئەمەش گومانەكانی زیاتر كردبوو لەوەی كە عێراق شتێك دەشارێتەوە. نەتەوە یەكگرتووەكان داوای كرد ڕێگە بدرێت بەوەی دەستی بگات بە ژمارەیەكی زۆر لە شوێنەكان ، لەنێویاندا كۆشكەكانی سەرۆكایەتی، كە زۆربەیان هەرگیز بەشدارییان نەبووە لە بەرنامەكانی چەكی كۆكوژی لە عێراقدا. سەددام ئەمەریكای تۆمەتبار كرد بەوەی ئەو پشكنینانە وەك ڕێگەیەك بۆ سیخوڕیكردن بەسەر عێراق بەكاردەهێنێت و ڕەتیكردەوە ئەمانە بخاتە بەردەستی پشكنەرەكانەوە. ئەمەش بووە هۆی ڕووبەڕووبوونەوەیەك كە لە ئۆكتۆبەری ١٩٩٨ دەستی پێكرد، كاتێك سەددام ڕەتیكردەوە ڕێگە بە هیچ پشكنینێكی دیكە بدات ئەگەر سزاكان هەڵنەگیرێن. سەرۆكی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا كلینتۆن نیازی خۆی بۆ گۆڕینی ڕژێمی سەددام بە حكومەتێكی دۆستانەتر ڕاگەیاند و هەڕەشەی كردەوەی سەربازیی كرد. سەددام جارێكی تر ڕازی بوو كە هاوكاری پشكنەران بكات. بەڵام تیمەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان گلەییان لە بەردەوامی سنووردار كردنەكان كرد و هەر زوو دوای ئەوە فەرمانی چۆڵكردنیان پێگەیشت. لە ١٦ی كانوونی دووەمدا، كاتێك سەرۆك كلینتۆن بەهۆی پەیوەندییەكەی لەگەڵ ڕاهێنەرێك ڕووبەڕووی لێپێچینەوە بووەوە، ئەمریكا و بەریتانیا چوار ڕۆژ هێرشی ئاسمانی توندیان دەستپێكرد، بە ناوی ئۆپەراسیۆنی ڕێوی بیابان. فڕۆكە جەنگییەكان و مووشەكی كروز زیاتر لە سەد شوێنی سەربازی و پیشەسازی عێراقیان كردە ئامانج.

مەبەستی ئۆپەراسیۆنی ڕێوی بیابان ناچاركردنی هاوكاری

تەواوی عێراق بوو لەگەڵ پشكنینەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان. بەڵام ئەنجامەكەی پێچەوانە بوو. سەددام ڕایگەیاند كە چیتر ڕێگە بە پشكنەرانی چەك نادات لە ناوخۆی وڵاتدا. تا نزیكەی چوار ساڵ دواتر، لە چەند مانگی پێش شەڕی ٢٠٠٣دا، نەگەڕانەوە. ئەمریكا و هاوپەیمانەكانی ئەو ماوەیەی كە لە كانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٨ دەستپێكردووە بە "ساڵانی تاریكی" ناودەبەن، چونكە هەواڵگری بیانی سەبارەت بەو شتانەی لە ناوخۆی عێراقدا ڕوویان دەدا -كە لەوە پێش پشتی بە ڕاپۆرتی پشكنەران بەستبوو- لەدەست چوو و هیچ زانیارییەكی ئەوتۆیان لا نەما.

لە سەرەتای ئەو ساڵەدا كرابووم بە بەڕێوەبەری گشتی كۆمپانیایەكی ئەندازیاری میری بەناوی سەعد، ئەمەش تێڕوانینێكی فراوانی لە چالاكییەكانی زانا و ئەندازیارانی پێشووی ئەتۆمی پێبەخشیم. زۆربەیان لە سەردەمی من یان لە كۆمپانیاكانی تری ئەندازیاری -كە لەلایەن حكومەتەوە بەڕێوەدەبران- كاریان دەكرد. لە كاتێكدا جیهان پرسیاری ئەوەی دەكرد كە زانایانی چەكی ئەتۆمی سەددام لە چیدان و چۆن دەگوزەرێن، ئەوەبوو ئێمە كارگەیەكی تەقەمەنیمان لە ئەلقاقاع نۆژەنكردەوە و كارگەیەكی نوێمان لە كەربەلا دروستكرد و كارمان كرد بۆ دروستكردنی شەش پاڵاوگەی نەوت كرد لە سەرانسەری عێراق.

هەرچەندە ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی سەرچاوە یان كەرەستەی كەمی هەبوو بۆ ئەنجامدانی كاری كردەیی لە بواری ئەتۆمیدا، بەڵام سەددام كۆمیسیۆنی ئەتۆمی بە زیندووی هێشتەوە لەجیاتی ئەوەی دان بە شكستدا بنێت، كە ئەمەش كارێك بوو كە

هه‌رگیز نه‌چووه ژێر باری. ئه‌مه‌ش ڕێگه‌ی پێدا ئه‌و فانتازیایه بپارێزێت به‌وه‌ی كه به‌رنامه‌یه‌كی ئه‌تۆمی هه‌یه. ئه‌وه‌بوو كۆمه‌ڵێك زانای گه‌نجی وه‌ك ستاف دانا، كه زۆربه‌یان هه‌رگیز به‌شێك نه‌بوون له به‌رنامه‌كانی ده‌وڵه‌مه‌ندكردن. له زۆربه‌ی به‌شه‌كانیدا لێكۆڵینه‌وه‌یان له‌سه‌ر سووته‌مه‌نی موشه‌ك و تیۆری په‌یوه‌ست به فیزیای ئه‌تۆمی ئه‌نجامداوه.

سه‌ددام خه‌ریكی چنینه‌وه‌ی پاداشتی باشتربوونی ئابووری بوو. له ساڵی ١٩٩٧ نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان به‌رنامه‌یه‌كی وه‌ك سزا پێشكه‌ش كرد كه به به‌رنامه‌ی نه‌وت به‌رامبه‌ر خۆراك ناسراوبوو، به ئامانجی ڕزگاربوونی هاوڵاتیانی عێراقی له دۆخی ناله‌بار و له ژێر گه‌مارۆكه‌دا. ڕێگه‌ی به عێراق دا نه‌وت به ده‌ره‌وه‌ی وڵات بفرۆشێت له به‌رامبه‌ر خواردن و ده‌رمان. هه‌رچه‌نده مه‌به‌سته‌كه مرۆڤدۆستانه بوو، به‌ڵام سه‌ددام هه‌ر زوو ڕێگاكانی بۆ ئیستغلالكردنی ئه‌و به‌رنامه‌یه دۆزیه‌وه. شلبوونه‌وه‌ی سنوورداركردنی بازرگانی، كه‌ناڵی نوێی بازاڕی ڕه‌شی كرده‌وه و حكومه‌ت چه‌ندین ڕێگه‌ی نایاسایی بۆ فرۆشتنی نه‌وت به پاره‌ی كاش دۆزیه‌وه. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌ی به‌شێكی زۆری وڵات له هه‌ژاریدا ده‌یناڵاند، له‌ولاش سه‌ددام خه‌ریكی ته‌خشانكردنی بوو. چه‌ندین كۆشكی نوێی دروستكرد، كه پڕیان كرد له مۆبیلیاتی جوان و ئاوزێڕ.

هه‌رچه‌نده من و زۆرێك له هاوكاره‌كانی پێشووم له‌سه‌ر پرۆژه‌یه‌ك كارمان ده‌كرد كه ده‌یتوانی سوودی بۆ وڵاته‌كه‌مان هه‌بێت، به‌ڵام ڕێبازێكی مانه‌وه‌خوازانه (یان به‌رگه‌گرتن) له مێژبوو جێگه‌ی ڕۆحی سه‌رگه‌رمی زانستی گرتبووه‌وه. بچووكترین هه‌ڵه

لە پرۆژەیەکی ئاساییدا دەیتوانی ڕووبەڕووی سزای توندت بکاتەوە. هاوڕێ و هاوکارە کۆنەکەم، دکتۆر فەرید، پلەی بەرزکرایەوە بۆ پۆستی بەڕێوەبەرایەتی لەناو وەزارەتی پیشەسازیدا، پۆستێك کە بە تەواوی شایەنی بوو. بەڵام پلەبەرزکردنەوەکە تەنیا هەنگاوێکی لە چاوی لێنەبووردنی حکومەتی سەددام نزیکتر کردەوە. لە ساڵی ١٩٩٨دا ئەرکی دروستکردنی ژمارەیەك خانوو بۆ وەزیرەکانی حکومەت و ئەندامانی بازنەی ناوەوەی سەددامی پێسپێردرا. کاتێك ئەندازیارەکانی نەیانتوانی بە باشی دیزاینی دەرگاکان بکەن، دکتۆر فەرید لە شوێنی بیناسازیدا قەتیس بوو، وەك چۆن من چوار ساڵ پێشتر لە کارگەی کاربۆنی ڕەشدا بووم. هەر زوو دوای ئەوە بیستم کە بە جۆرێك لە جۆرەکان وای ڕێکخستبوو کە ژن و منداڵەکانی لە عێراقدا بباتە دەرەوە لەکاتێکدا لە دەست بەسەریدا بوو، پاشان لە تاراوگە پەیوەندی پێوەکردن و ئیدی ئەویش عێراقی جێهێشت. ئێمە نەمانزانی کە ئەو بۆ کوێ چووە و ئەویش هەرگیز ماڵئاوایی لە من نەکرد.

هەر لەم ماوەیەدا بوو کە لەیلا داوای چاکەیەکی لێکردم کە بەرگەی ڕەتکردنەوەیم نەدەگرت.ساڵانێك بوو تامەزرۆی ئەوە بوو بچێتە حەج، یان زیارەت بۆ شاری پیرۆزی مەککەی سعودیە بکات، کە ئەرکی هەموو موسڵمانێکی هەبووە لانیکەم جارێك لە ژیانیدا ئەنجامی بدات. تا ئەم خاڵەی ژیانمان هەردووکمان هەستمان بە ڕاکشانی تەمەنمان دەکرد و وا دیار بوو ئەگەر بەم زوانە حەج نەکەین ڕەنگە هەرگیز شوێنی لەدایکبوونی پێغەمبەر موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) و شوێنە پیرۆزە ئازیزەکانی ئایینەکەمان نەبینین.

ڕۆژێك گوتی: "مەهدی، ناتوانیت پەیوەندییەکانت لە

حكومه‌تدا به‌كاربهێنیت بۆ ئه‌وه‌ی هه‌وڵی وه‌رگرتنی ڤیزا بده‌یت؟"

ده‌مزانی به هیچ شێوه‌یه‌ك ئه‌گه‌ری ئه‌وه نییه سه‌ددام بهێڵێت له یه‌ك كاتدا هه‌ردووكمان له وڵات ده‌ربچین، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر منداڵه‌كانیشمان - وه‌ك فیدیه‌یه‌ك بۆ گه‌ڕانه‌وه‌مان - له دوای خۆمان بمێننه‌وه. هه‌ستم ده‌كرد ته‌نانه‌ت داواكاریش مه‌ترسیداره چونكه داواكاری ڤیزا به‌تایبه‌تی ئه‌گه‌ر كه‌سانی دیار بوایت ئه‌وا له‌لایه‌ن ده‌زگای هه‌واڵگرییه‌وه پێداچوونه‌وه‌یان بۆ ده‌كرا و له‌وانه‌یه گومان دروستبكات كه ئێمه پلانمان بۆ هه‌ڵهاتن داناوه. سه‌ره‌ڕۆییه‌كه‌ی جوسه‌ین كامل و كه‌سانی دیكه سه‌ددامی زیاتر وریاتر كردبوویه‌وه. هه‌روه‌ها ئه‌گه‌ر هه‌واڵێك گه‌یشتبا گوێی قوسه‌ی، كه ده‌یزانی نهێنییه ئه‌تۆمییه‌كانی عێراقم له ده‌ستدایه و داوای ڤیزه‌ی بیانیم بۆ خۆم و هاوسه‌ره‌كه‌م كردووه، ئه‌وه ده‌ترسام كێشه‌ی گه‌وره‌ی لێبكه‌وێته‌وه.

ئیشاره‌تێكم بۆ له‌یلا كرد كه به‌دوامدا بێت بۆ نێو چه‌مه‌كه‌ی باخچه‌كه‌مان، باوه‌ڕم وابوو له‌وێ دوورین له ئامێره‌كانی گوێگرتن و سه‌لامه‌تین.

به نه‌رمی گوتم: "له‌یلا، بۆچی داواكارییه‌ك نه‌كه‌م به‌وه‌ی كه له‌گه‌ڵ براكه‌تدا زیاره‌ته‌كه بكه‌یت؟ به‌و شێوه‌یه ئه‌گه‌ری قه‌بولكردنی زۆر باشتره".

به‌م قسه‌یه‌م زۆر په‌شۆكا. چوون زۆرجار خه‌ونمان به‌وه بینیبوو كه پێكه‌وه زیاره‌ته‌كه بكه‌ین و ئێستا ناچار بووم دان به‌وه‌دا بنێم كه ئه‌م خه‌ونه مه‌حاڵه. من خه‌ریك بوو به‌و بیرۆكه‌یه ئه‌و بلاوێنمه‌وه و دڵنه‌وایی بكه‌م كه باسی نهێنییه ئه‌تۆمییه‌كانی بۆ بكه‌م

كە تەنها چەند پێیەك لە دوورییەوە نێژراون بۆ ئەوەی لە ئیستدلالەكانی من تێبگات. بەڵام دواتر باشتر بیرم لەوە كردەوە. بۆ سەلامەتی ئەو و منداڵەكان باشتر بوو كە هیچ لەوبارەیەوە نەزانن.

لەیلا بۆ چەند هەفتەیەك تووشی خەمۆكی بوو. بەڕاستی من هەستی ئەوم تەواو داڕوخان كە نەمتوانی بە تەواوی ڕوونی بكەمەوە كە بۆچی هەستم بە گیرخواردن كردووە. داوام لێكرد تێبگات كە هێشتا فشاری زۆر مەترسیدار لەسەرم هەیە. دواجار لەگەڵ بیرۆكەی ئەنجامدانی گەشتەكە لەگەڵ براكەیدا ئاشت بووەوە. من داوای ڤیزەی ئەوم كرد و بە پشتبەستن بە ساڵانی خزمەتكردنم لە ڕێژیمدا داوای ڕەچاوكردنی تایبەتم كرد. بۆ چەند ڕۆژێك هەستم بە متمانە كرد كە حكومەت پەسەندی دەكات و دڵم خۆش بوو كە لانیكەم ئەندامێكی خێزانەكەمان دەتوانێت ئەو گەشتە ئەنجام بدات. دوای هەفتەیەك وەڵامەكەمان وەرگرت كە بە ئاشكرا داواكارییەكەمان ڕەتكردەوە.

عێراق لە زیندانێك دەچوو. خۆمم خستە بەردەم خێزانەكەم و هەوڵمدا دڵنەوایی بدەمەوە. لەولاشەوە منداڵەكانم خەریك بوون كە ڕێگەی خۆیان دەگرنە بەر گەورە دەبوون. كچە گەورەكەم، ئیسڕا؛ لەگەڵ ئەندازیارێكی شارستانی گەنجی باش بە ناوی ئەحمەد هاوسەرگیری كرد. زەیدی كوڕم لە زانكۆی تەكنەلۆژیای بەغدا چووە ناو پرۆگرامی ئەندازیاری میكانیكی و دوو كچە بچووكەكەم لە قۆناغی ئامادەیی سەركەوتوو بوون. شانازیم بە هەموو منداڵەكانمەوە دەكرد. بەڵام نەمتوانی خۆم

دابماڵم لە هەستی تاوانباری کە سەرکردایەتی من لە بەرنامەی سەنتەرفیوجی سەددام، هەروەها ئەو نهێنییانەی لە ژێر نیلوفەری باخچەکەماندا نێژراون، ڕەنگە بۆ هەمیشە ڕێگری لە ژیانیان بکەن. بە هۆی منەوە، پێم وابوو، ڕەنگە هەرگیز ڕێگەیان پێنەدرێت گەشت بۆ دەرەوەی وڵات بکەن و هەمان ئەو ئازادییانە ئەزموون بکەن کە باوکیان لە گەنجی خۆیدا بەدەستی هێنابوون.

بەڕێوەبەری پێشووم حوسەین کامل مردبوو، بەڵام بۆ من مارەکە سەرێکی دیکەی لە شێوەی سەرۆکی نوێی MIC، عەبدولتەواب مەلا حویش سەری دەرکردبوو. عەبدولتەواب لە کۆتاییەکانی نەوەدەکاندا بە خێرایی بەرەو لوتکەی سیاسەتی عێراق بەرزبووەوە، لە کاتێکدا دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە کە بەڵێنی بە سەددام داوە کچەکەی بدات بە سەددام. ئەویش وەك حوسەین کامل هەمیشە تووڕەو تۆسن بوو. عەبدولتەواب لە زۆر ڕووەوە ژیانی منی سەختتر کرد و بڕیارمدا هەوڵبدەم لە جیهانی سەربازی-پیشەسازی و چاودێریکردنی ئەو ڕزگارم بێت.

سەرەتای ساڵی ٢٠٠٠ نامەیەکم بۆ ئەمیر ڕەشید وەزیری نەوتی عێراق نووسی، تیایدا ئەوەم خستبووە روو کە ئاخۆ دەتوانێت شوێنێکم بۆ بدۆزێتەوە لەو پیشەسازییەدا کە چەندین ساڵ پێشتر دەستم بە کارکردن کردبوو تیایدا؟ ئەویش وەڵامی دایەوە کە وەزارەتی نەوت وەکو ئیمتیازێك دەیزانێت کە پۆستێکی باشم پێشکەش بکات. منیش پڕ لە ئومێد بۆ عەبدولتەواب نووسیم کە باوەڕم وایە سەرکەوتوو نابم گەر بێت و وەك بەڕێوەبەری گشتی سەعد بەردەوام بم و داوای کۆبوونەوەیەکم کرد بۆ گفتوگۆکردن

لەسەر گواستنەوەم بۆ وەزارەتی نەوت. وەڵامی نامەكەمی نەدایەوە و لەناكاو لە وادەیەكی تەواو ناعەقڵانیدا ئەركی زیاترم پێدرا. مانگی دواتر جارێكی تر بینیم، واتە لە مانگی نیساندا، لە كۆبوونەوەیەكی گەورەی لیژنەی بەڕێوەبردنی MIC. بەڕێوەبەرە گشتییەكان بۆ هەموو كۆمپانیایەكی MIC ڕاپۆرتی پێشكەوتنەكانیان پێشكەش كرد. ساتێك كاتی گفتوگۆكردن لەسەر كۆمپانیای سەعد هات، عەبدولتەواب ڕووی كردە من و بۆ یەكەمجار لە دوای چەند هەفتەیەكدا قسەی لەگەڵ كردم.

وتی: تۆ لە كارەكانت دواكەوتوویت. ئەمە بەهیچ جۆرێك قبولكراو نییە. بە دڵنیاییەوە ئەم جۆرە هەڵسوكەوتانە سەرەنجامەكەیان زیندانە.

تاكتیكەكانی تۆقاندنەكەی وایكرد دۆخەكەم بێ هیوا دەركەوێت. ترسم هەبوو تا كۆتایی ژیانم بە گیرخواردن لە MIC بەسەر بەرم. هەرچەندە مەترسی زیاتر وروژاندنی عەبدولتەواب بوو، بەڵام لە ماوەی ساڵ و نیوێكی دواتردا سێ نامەی دیكەم بۆ نووسی. دواهەمینیانم لە مانگی حوزەیرانی ٢٠٠١ نارد، تەنها دوای تەواوكردنی دیزاینی پاڵاوگەیەكی نەوت. من بەو پەڕی ڕێزەوە نووسیم، تا ئەو جێگایەی كە:

> بەو پێیەی ئەو ئەركانەم تەواو كردووە كە بەم دواییە پێم دراوە، بە دەرفەت دەزانم كە داواكاری گواستنەوەكەم دووبارە پێشكەش بكەمەوە. من بە تەواوی قەناعەتم هەیە كە ناتوانم لە MIC بەردەوام بم. من زۆر ئارەزووی ئەوەم هەیە كە پسپۆڕی خۆم

لە پاڵاوتنی نەوتدا پراكتیزە بكەم تا ئەوەندەی تەمەنم ماوە. سوپاس و ڕێزی خۆم دەنێرم، بەو هیوایەی ئێوەش ڕازی بن و داواكارییەكەم قبوڵ بكەن بۆ ئەوەی بتوانین زیاتر خزمەت بە زێدی خۆمان بكەین.

كاتێك هیچ وەڵامێكم وەرنەگرتەوە، ڕاستەوخۆ نامەیەكی ترم بۆ ئۆفیسی سەددام حوسێن نارد و داوای گواستنەوەكەم كرد. هەنگاوێكی نائومێدكەر بوو كە سوودی نەبوو. لە كۆتاییدا عەبدولتەواب بانگی كردم بۆ ناو ئۆفیسەكەی بۆ گفتوگۆكردن لەسەر ئەو بابەتە. من وا گریمانە دەكەم كە گوێچكەكانی، هەستیان بەو پەیوەندییەم كردبێت كە لەگەڵ ئۆفیسی سەددام و ویستویەتی ئەم پەیوەندییە بپچڕێنێت.

ئەو: "ئێوە دوا نامەی خۆتان لەسەر بابەتی گواستنەوە بۆ وەزارەتی نەوت نووسیوە". واتە: ئەوە فەرمانە.

"چی ئەگەر تەنها چەند مانگێك چاوەڕێ بكەم پێش ئەوەی شتێكی زیاتر بنووسم؟" پرسیم. "دەتوانێت بارودۆخەكە بگۆڕێت."

ئەو: بارودۆخەكە گۆڕاوە. ئەركێكی نوێم بۆ تۆ هەیە.

ئەو وتی كە لە پۆستەكەم لە كۆمپانیایی سەعد ڕزگارم دەبێت و دەكرێمە بەڕێوەبەری پرۆژەكان بۆ هەموو MIC. من سەرپەرشتی بودجەی دەزگای كارە گشتی و سەربازییە بەرفراوانەكانم دەكەم كە گەورەترین ڕێكخراو بوو لە عێراقدا. ئەمەش بەو مانایە بوو كە دەبوو بچمە ناو بینای بارەگای MIC.

لەجیاتی ئەوەی لە عەبدولتەواب دوورتر ببمەوە، دەبوو لێی نزیکتر ببمەوە.

من: "ئەگەر گواستنەوەکە ڕەت بکەمەوە چی؟"

ئەو: ناتوانیت. ئەگەر هەوڵبدەیت، دەرئەنجامی سزای بەدوا دادێت و ڕەنگە باش بزانیت کە سزاکانیش چین.

لە عێراقدا هەمیشە هەڕەشەیەکی پەردەپۆشکراو مەترسیدارترە لە هەڕەشەیەکی ئاشکرا. هەڕەشەی گشتی ئەو بۆ زیندانیکردنم لە کاتی کۆبوونەوەی دەستەی بەڕێوەبردن ساڵێك پێشتر، ڕێگەیەك بوو بۆ دانانی من لەم شوێنە. بەڵام من تەواو لە مەبەستی پەیامەکەی تێگەیشتم. چونکە باسی فڕێدانی منی بۆ ناو زیندانێك نەکرد، زانیم کە عەبدولتەواب ئەمجارەیان بە شێوەیەکی کوشندە جدییە لەم کارە. منیش پرسیارم کرد کە ئایا بە گواستنەوەم بۆ ناو MIC، تەنیا بەنیازە نزیکم بکاتەوە. سەرنج بدەن ئەم ڕژێمە ئەوەندە بە نهێنی کاری دەکرد کە مەبەستی ڕاستەقینە نزیك بوو لە مەحاڵەوە دەستنیشان بکرێت. دواتر هاوکارێکم گومانەکانی منی دەرخست کاتێك پێی وتم بیستویەتی کە ئاسایشی MIC فەرمانی ڕوونیان پێدراوە بۆ ئەوەی چاودێری من بکەن. من چوومە ناو ئۆفیسێکی شێوە گۆشەیی لە نهۆمی دووەمی بارەگای MIC، و زۆری نەخایاند خۆم بە ڕۆتینێکەوە جێگیر کرد. هەموو بەیانیەك کاتژمێر هەشت دەگەیشتمە شوێنی کارەکەم، دوای ئەوە سکرتێرەکەم قاوەیەکی تورکی و کاغەزەکانی بۆ دەهێنام کە پێویست بوو بۆ ئەو ڕۆژە پێداچوونەوەیان بۆ بکرێت. ستافەکەم - کە لە چل ئەندازیار و تەکنیکار و ژمێریار پێکهاتبوو- نزیکەی

سێ سەد پرۆژەیان لە ئەستۆ بوو. ئێمە سەرپەرشتی پلاندانان و هەڵسەنگاندن و بەدواداچوونمان دەكرد، بۆیە فراوانترین دیدگام بۆ كارە سەربازی-پیشەسازییەكانی حكومەت دەستكەوت. بەرنامەكانی چەكی كۆمەڵكوژ تا ئەو كاتە مێژوویەكی كۆن بوو. گروپی ئەلیكترۆنی كاریان لەسەر ڕادار و پەیوەندی سەربازی دەكرد و بەشی چەك و پارچەكانی تەقەمەنی وەك تۆپخانە و تفەنگ و موشەك بەرهەم دەهێنا. گروپی مادده كیمیاییەكان مامەڵەیان لەگەڵ پاڵاوگەكان و بەرهەمهێنانی باروت و گیراوەی ترشەكانی دروستكردنی تەقەمەنی و سووتەمەنی بۆ موشەك و هاوشێوەكانی دەكرد. نزیكەی یەك لەسەر سێی پرۆژەكان لە سروشتدا مەدەنی بوون، وەك پاڵاوگە و وێستگەی پاككردنەوەی ئاو.

لەم ماوەیەدا زیاتر كەوتمە ژێر فشارەوە بۆ ئەوەی بچمە ناو حزبی بەعسەوە. من لە ڕۆژانی سەرەتای كاركردنم لە IAEC لە ساڵانی حەفتاكانی سەدەی ڕابردووەوە بەرەنگاری پەیوەندیكردنم بوومەوە. بۆ من حزبی بەعس بێ مانا بوو. هەرچەندە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا وەك بزووتنەوەیەك بۆ یەكێتی عەرەب دەستی پێكرد، بەڵام لە عێراقدا وشك بووەوە و بوو بە ئۆرگانیزمێكی دڵسۆزی بۆ سەددام حوسێن. هەرچەندە زۆرجار ئەندامێتی حزب كلیلی پلەبەرزكردنەوە بوو، بەڵام كۆبوونەوەكانی پڕ بوون لە دروشمی بێ عەقڵ و چەپڵە لێدانی سەرۆك. ئەگەر هیچی تر نەبووایە ئەوا هەستم دەكرد ئەمە تەنها كات بەفیڕۆدانێكی زۆرەو و هیچی تر.

به لەیلام گوت: "ناتوانم ئەم جۆرە دۆگمایە هەرس بکەم. ئەوە شتێکی بێمانایە. لە کاتێکدا باسی ئازادی دەکەن بەڵام ئەمە وا دەکات بڕشێمەوە".

لە دەوروبەری ئەو کاتەی کە یەکەم نامەم نارد و داوای گواستنەوەم دەکرد، عەبدولتەواب یەکێك لە جێگرەکانی نارد بۆ ئەوەی ڕووبەڕووم بێتەوە سەبارەت بە بێ باکیم بەرامبەر بەو حزبە.

جێگرەکەی: "دەزانیت تۆ تاکە بەڕێوەبەری گشتیی کە ئەندامی پارتی بەعس نیت؟! دەزانی کە ئەمە چەند شتێکی مەترسیدارە!"

ئیدی منیش لە ژێر ئەم ناچارییەدا جار جارە بەشداری کۆبوونەوەکانم دەکرد. ڕازی بووم ببمە لایەنگری حیزب. بەڵام دوور لە ئەندامێتی لە حیزبەکەدا، ئەمە سەرەڕای ئەوەش پێویستی بە بەشداریکردنم لە کۆبوونەوەکاندا دەبێت. جارێکیان چوومە یەکێك لە کۆبوونەوەکان، ئەوەبوو کە ئەوەم بە شتێکی گاڵتەجاڕانە زانی و سوێندم خوارد کە هەرگیز جارێکی تر بەشداری کۆبوونەوەی تر نەکەم. لە هەفتەکانی دواتردا، لەلایەن ئەندامەکانی پارتی بەعسەوە پەیوەندیم پێوەکرا و دەیانپرسی بۆچی لە کۆبوونەوە فەرمییەکانم غیاب بووم. هەر جارێك داوای لێبوردنم دەکرد بەو بیانوویەی کە سەرقاڵی کاری زانستی گرنگ بوویمە. هەرچەندە شتەکان ناڕاستگۆیانە بوو، بەڵام دیاربوو ئەم بەهانەیە زۆر باش بوو بۆ هەموو جاران و بۆیە هەرگیز بەشداری هیچ کۆبوونەوەیەکی ترم نەکرد.

پۆستە نوێیەکەم ڕێگەی پێدام نەك تەنها تەواوی مەودای کارەکانی MIC ببینم، بەڵکو بە چاوی خۆم ئەو بەفیڕۆدان و

گەندەڵییە ئەزموون بکەم کە بە هەموو گۆشەکانی حکومەتدا بڵاوبووەتەوە. سەددام زیاتر داوای چاودێری ڕاستەوخۆی بەرنامە سەربازی-پیشەسازییەکانی دەکرد، بەڵام وا دیار بوو ئەوەندە لە واقیع دابڕاوە کە سەرکردەکانی پرۆژەکان هەستیان بە ئازادی دەکرد لە هەڵبەستنی درۆ و دەلەسەی پێشکەوتن. ئەمەش بەتەواوەتی منی تووڕە کرد. کاتێك زانست گەندەڵی تێکەوت، ئیتر ئەمە زانست نییە. زۆر نموونەی پرۆژەی ساختەم بینی کە لە ڕاستیدا بنەمایەکی کەمیان هەبوو، بەڵام یەکێکیان بە تایبەتی لە یادەوەریمدا ماوەتەوە. پێداچوونەوەم بە ڕاپۆرتێکی بەڕێوەبەری پرۆژەیەکدا کرد کە بە بەهای دەیان ملیۆن دۆلار پارەی بۆ تەرخانکرابوو بۆ پەرەپێدانی موشەکێکی دژە فڕۆکە کە لە شان هەڵدەدرێت (دەتوانرێت بخرێتە سەر شان). لە ڕاپۆرتی پێشکەوتنەکانیدا هاتبوو کە پرۆژەکە زیاتر لە سەدا ٧٠ تەواو بووە. بەڵام کاتێك داوای بینینی دیزاینەکانی موشەکەکەم کرد، بینیم کە تەنها لیستی پارامێتەرەکانیان هەیە. هەموو شتەکە بۆنی ماسییەکی ڕزیو لێدەهات. ئەمەم گەیاندە عەبدولتەواب، سەرەتا فەرمانی پێدام لێکۆڵینەوەیەك بکەم بەڵام دواتر فەرمانی کرد لێکۆڵینەوە دابخەم دوای ئەوەی داوای چاوپێکەوتنم لەگەڵ توێژەرانی زانکۆی بەغدا کرد کە وەك ڕاوێژکاری پرۆژەکە ناویان هاتبوو.

فریودان لە ژێر کۆنترۆڵ دەرچووبوو. ژێردەستەکان ئەو شتانەیان بە سەددام دەگوت کە دەیویست بیبیستێت و ئەویش لە باشترین حاڵەتدا تێگەیشتنێکی شلی لە وردەکارییەکان هەبوو. کاتێك بەڕێوبەری گشتی MIC بەرپرسی مووشەکەکانی ئەلسەمود

بانگهێشت كرا بۆ ئه‌وه‌ی ڕاپۆرتی پێشكه‌وتنی پێ بدات، بۆ نموونه، ئه‌و به‌ ته‌واوی خۆی له‌ بابه‌تی كاره‌كانی به‌دوور گرت. ده‌رهێنه‌ره‌كه‌ له‌بری ئه‌وه‌ی ڕاپۆرتێك بدات، شیعرێكی خوێنده‌وه‌ كه‌ نووسیبووی و ستایشی سه‌ددام ده‌كات. وادیاره‌ سه‌ددام به‌هۆی خوێندنه‌وه‌كه‌ جۆش و خرۆش گرتبووی، ده‌ستخۆشی لێكرد بۆ هه‌وڵه‌ ئه‌ده‌بیه‌كانی و ورده‌كارییه‌كانی پرۆژه‌ی ئه‌لسه‌مود شكستی هێنا. به‌ڵام پرۆژه‌كانی چه‌كسازی عێراق سه‌ره‌ڕای گه‌نده‌ڵی ناوخۆیی و ئاسته‌نگی ده‌ره‌كی به‌رده‌وام بوون. سزا به‌رده‌وامه‌كانی نه‌ته‌وه‌ یه‌كگرتووه‌كان، عێراقی قه‌ده‌غه‌ كرد له‌ كڕینی ئه‌و شتانه‌ی كه‌ پێی ده‌وترێت (به‌كارهێنانی دوانه‌یی) كه‌ ده‌توانرێت بۆ به‌رنامه‌ی قه‌ده‌غه‌كراوی چه‌كی ناته‌قلیدی یان مووشه‌كی دوور مه‌ودا به‌كاربهێنرێت. كێشه‌یه‌كی دووباره‌بووه‌وه‌ بریتی بوو له‌ به‌ده‌ستهێنانی جیرۆسكۆپی كوالیتی به‌رز كه‌ بۆ جێگیركردنی موشه‌كه‌كان به‌كارده‌هێنران. هه‌رچه‌نده‌ سزاكانی نه‌ته‌وه‌ یه‌كگرتووه‌كان ڕێگه‌یان به‌ عێراق دا كه‌ موشه‌كی سه‌ربازی كورت مه‌ودا به‌رهه‌م بهێنێت، به‌ڵام ده‌توانرێت ئه‌و جیرۆسكۆپانه‌ بۆ ئه‌و موشه‌كانه‌ش به‌كاربهێنرێن كه‌ سنووری سه‌پێنراوی نه‌وه‌د و سێ میل تێده‌په‌ڕاند. به‌ڵام سنوورداركردنه‌كان هه‌موو ده‌رچه‌كانی نه‌گرتبوون و تێبینیم كرد كه‌ ئامێری MIC كۆمه‌ڵێك كه‌ناڵی هه‌یه‌ بۆ ده‌ربازبوون لێیان. هه‌ركاتێك پێویستی به‌ جیرۆسكۆپ هه‌بوو، به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی كڕین و فرۆشتن به‌ كۆمپانیاكانی به‌ره‌ی عێراقی له‌ كه‌رتی تایبه‌تدا ده‌ڕۆیشت كه‌ په‌یوه‌ندییه‌كی به‌رفراوانی بازاڕی ڕه‌شیان هه‌بوو له‌ وڵاتانی وه‌ك ڕووسیا و بێلاڕوس. له‌ ڕێگه‌ی ئه‌م كه‌ناڵانه‌ی پشته‌وه‌ عێراق توانی

زۆر شتومەكی قەدەغەكراو بە قاچاخ بخاتە ناو وڵاتەكەیەوە.

كەواتە بۆچی سەددام بەرنامەی چەكی ئەتۆمی خۆی دەست پێ نەكردەوە؟ ئەگەر هێشتا دەتوانرا شتومەكی قەدەغەكراو لە بازاڕی ڕەشدا بۆ چەكی ئاسایی بكڕدرێت، بۆچی هەمان ئەم شێوازانە بەكارنەهێنرێت بۆ ئەوەی دووبارە هەوڵی پەرەپێدانی چەكی ناتەقلیدی بدات؟ بێگومان بێجگە لە سەددام حسێن كەس ناتوانێت بە تەواوی وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە. بەڵام لە ڕوانگەیەكی لۆژیكییەوە، چەند هۆكارێكی زۆر پراكتیكی هەبوو بۆ ئەوەی جارێكی دیكە بەدوای بۆمبەكەدا نەگەڕێتەوە. سەرەتا، ئەو بە شێوەیەكی باش قازانجی لە بەرنامەی نەوت لە بەرامبەر خۆراكدا دەكرد. ئەو كۆشكە نوێیانەی كە لە سەرانسەری عێراقدا دروست دەكران، تەنیا هۆكاری ئەمە بوو. جێگای سەرسوڕمانە كە بەرنامەی نەوت بۆ خۆراكیش دەستی بەسەر دەسەڵاتدا بەهێزتر كردبوو. زۆربەی دانیشتووان و بەتایبەت هەژارانی گوندنشین، ئێستا وابەستەی بەشەخۆراكی حكومەت بوون بۆ كەلوپەلی سەرەتایی، وەك ئارد و زەیتی چێشت لێنان. ئەمەش شێوازێكی نوێی كۆنترۆڵكردنی بەسەر ئەواندا بە ڕژێم بەخشیبوو. لەوانەیە سەددام تەواو بە دۆخی ئێستا ڕازی بووبێت و هەستی كردبێت كە توانای مەترسی ئەوە نییە ئەم بەرنامەیە بخاتە مەترسییەوە. قاچاخچێتی چەند جیرۆسكۆپێك شتێك بوو، بەڵام ئەگەر ئەو بەرنامەكانی چەكی جۆری خۆی پێكبهێنێتەوە، و نەتەوە یەكگرتووەكان لەو بارەیەوە بزانێت، كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بە دڵنیاییەوە ڕێككەوتنی نەوت بەرامبەر خۆراك هەڵدەوەشێنێتەوە.

دووەم: دەستپێکردنەوەی بەرنامە ئەتۆمییەکە کارێکی گەورە دەبوو. بە درێژایی ساڵانی نەوەدەکان پشکنەرەکان ئەوەندە بە تەواوی بەرنامەکەیان لەناوبردبوو کە تەنها ئەو زانیاریانەی لە نێو مێشك و سەرماندا بوون مابوونەوە و لەگەڵ ئەو بەڵگەنامانەی لە باخچەکەمدا نێژرابوون. پشکنەرەکان بەتەواوی کۆگاکانی یۆرانیۆمی پیتێنراوی عێراقیان خاپوورکردبوو. لەلایەکی تر ئامێرەکانیان یان لابردبوو وەیان بێتوانایان کردبوون بۆ دروستکردنی پێکهاتەکان بە شێوەیەکی ڕەسەن. هەروەها تۆڕی نێودەوڵەتی دابینکەرانی پارچە و شارەزایی تەکنیکی کە ئێمە زۆر پشتمان پێ بەستبوو، ئاشکرا بووبوو. حکومەتی بەریتانیا کۆمپانیای ماتریکس چەرچڵ و کۆمپانیاکانی بەرەی عێراقی لە بەریتانیا داخستبوو. هەرچەندە دەسەڵاتدارانی سویسرا بەڕێوەبەرانی شاوبلین یان ئەو کۆمپانیا سویسریانەی دیکەی کە پارچەیان بۆ دابین دەکردین، دادگایی نەکردبوون، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ گریمانە ئەوە بکات کە هەر ئاڵوگۆڕێکی بازرگانی لەگەڵ عێراق لە نزیکەوە چاودێری دەکرێت. دوای تاقیکردنەوە بەرزەکان لە ئەڵمانیا، پەیوەندییەکانمان لەوێ تەواو بوون. دووبارە دەستپێکردنەوەی بەرنامەی ئەتۆمی پێویستی بەوە بوو کە سەرلەنوێ لە سفرەوە دەست پێبکەین بەتایبەت لەڕووی سەرلەنوێ کڕینەوەی کەل و پەلە پێویستەکان. لەلایەکی تریش هەموو جیهان سەیری دەکردین.

ڕەنگە فاکتەرێکی دیکە نەبوونی حوسەین کامل بووبێت. بەڕاستی بەرنامەی ئەتۆمی لەو ساتەوە ڕەگی داکوتا کە حوسەین کامل لە ساڵی ١٩٨٧دا وەك بەرپرسی MIC دەستنیشانکرا، فەرمانی

پێکردم کە بەرنامەی سەنتەرفیوج دەست پێبکەم، هەر ئەویش بوو کە دەستیکرد بە بەرنامەی چەکسازی بە سەرۆکایەتی دکتۆر سەعید. بەهرەی زانایانی ئاراستەی تیمە کاریگەرەکان کرد و لە ڕێگەی بەڵێنی پاداشت و بە تایبەتی سزادانەوە پاڵنەرێکی بۆ داین. لەوانەیە حوسەین کامل ئەو هێزە بووبێت کە بەرنامەکانی چەکی کۆمەڵکوژی چڕکردۆتەوە و بەبێ ئەو، تەماحە ئەتۆمییەکانی سەددام خۆیان خستە ناو کایەی خەونە ناڕوونەکانەوە.

پرسیارەکە هەروا ماوەتەوە کە ئایا سەددام بەنیازی ئەوە بووە کە بەرنامەی ئەتۆمی پێکبهێنێتەوە؟ لە ژێر دەسەڵاتی پێشبینی نەکراوی ئەودا، خەونێکی ناڕوون دەتوانێت بە چەقەنەی پەنجەکانی ببێتە شتێکی ناچاری. لە ڕابردوودا بە ڕوونی مەبەستەکانی خۆی نیشان دابوو، لە هەنگاوە نایەکسانەکانی لەگەڵ ڕیاکتۆری فەرەنسی لە ساڵانی حەفتاکان تا هەوڵەکانی پیتاندنی یۆرانیۆمی تەواو و بەرنامەی بەریەککەوتن و تێکچڕژان پێش جەنگی ١٩٩١. تاوەکو لادانی حوسەین کامل، تا دەتوانرا بەشێکی زۆری بەرنامەی سەنتەرفیوجی شاردبووەوە.

تەنانەت لە ساڵانی تاریکیشدا نیشانەکانی خواستی درێژخایەن بۆ چەکی ئەتۆمی هەبوون. دیارترینیان ئەو ڕاستییەیە کە سەددام لە ساڵی ١٩٩١ەوە، کاتێك بەرنامەکان کۆتاییان هات، بەردەوام بوو لە دابینکردنی بودجە بۆ ئاژانسی عێراقی بۆ وزەی ئەتۆمی، تا جەنگی ٢٠٠٣. ڕەنگە ئەو ویستبێتی جیهان باوەڕ بکات کە بەرنامەیەکی ئەتۆمی بەردەوامی هەیە، ڕەنگە ویستبێتی خۆی باوەڕ بەو بابەتە بکات. ئاسانە وێنەی سەددام بخەیتە بەرچاوت کە

فڕنه‌كه‌ی گه‌رم ده‌كرد، لانیكه‌م له‌ ئاستێكدا. ئه‌مانه هه‌وڵی جه‌وهه‌ری نه‌بوون كه‌ له‌سه‌ر بنه‌مای ستراتیژییه‌ك دامه‌زراون، به‌ڵكو ئاماژه‌یه‌كی بچووك بوون بۆ مه‌به‌ست. پێده‌چوو خواستی چه‌كی ئه‌تۆمی زۆر دوای مردنی به‌رنامه‌كان مابێته‌وه، وه‌ك تارماییه‌ك زنجیره‌كانی به‌ده‌وری ماڵێكی تارمایی نشیندا له‌دوای ده‌كشێت و ده‌سوڕێته‌وه.

ئایا سه‌ددام جارێكی تر هه‌وڵی دروستكردنی چه‌كی ئه‌تۆمی ده‌دا، ئه‌گه‌ر گه‌مارۆكان هه‌ڵگیرابان و مه‌رجه‌كان دروست بوونایه؟ مرۆڤ هه‌ر ئه‌وه‌نده‌ ده‌توانێت له‌ خه‌یاڵیدا بڵێت به‌ڵێ. به‌ڵام بۆ ئه‌وكات زانیاری سه‌ره‌كی بۆ دووباره‌ بنیاتنانه‌وه‌ی به‌رنامه‌ی سه‌نته‌رفیوج بریتی بوون له‌و به‌ڵگه‌نامانه‌ی كه‌ له‌ باخچه‌كه‌مدا نێژرابوون، چاوه‌ڕێی فه‌رمانی قوسه‌ی حسێن یان باوكی بوو. به‌ڵام ئه‌م فه‌رمانه‌ هه‌رگیز نه‌هات.

# به‌شی نۆیه‌م
# به‌ره‌و جه‌نگ

له سه‌ره‌تای مانگی كانوونی دووه‌می ٢٠٠٢دا و دوای ماوه‌یه‌كی كه‌م له هاتنی پشكنه‌رانی چه‌كی نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان، ڕۆژێكیان له پڕ فه‌رمانێكی جیاواز خرایه به‌رده‌مم له‌سه‌ر مێزه‌كه‌م: "به‌ڵگه‌نامه‌كانتان له ئۆفیسه‌كانتانه‌وه بگوازنه‌وه بۆ ژێر زه‌مینه‌كه."

له كاتێكدا له‌سه‌ر مێزه‌كه‌م دانیشتبووم و یاداشته‌كه‌ی عه‌بدولته‌وابم بۆ هه‌موو به‌ڕێوه‌به‌ره گشتییه‌كانی MIC خوێنده‌وه، نه‌متوانی بیر له‌وه نه‌كه‌مه‌وه كه ئه‌مه ڕێنماییه‌كی سه‌یر و به‌په‌له‌یه. سكرتێره‌كه‌مم بانگ كرد بۆ ناو ئۆفیسه‌كه‌م.

پرسیم: "ده‌توانی زیاتر له‌م باره‌یه‌وه بزانیت؟ باسی كام به‌ڵگه‌نامه ده‌كه‌ن؟ به‌ڵگه‌نامه‌كانی ئێستا؟ به‌ڵگه‌نامه ئه‌رشیفكراوه‌كان؟ مووچه؟ لیستی كه‌لوپه‌ل؟"

ئه‌وه‌بوو زۆر به‌خێرایی وه‌ڵامم بۆ هات: "هه‌موویان."

دیاره ڕژێم ئه‌وكات تووشی شۆك بووبوو كه پشكنه‌ره‌كان بۆ یه‌كه‌مجار له ماوه‌ی چوار ساڵدا له سه‌رانسه‌ری عێراقدا خه‌ریكی په‌لامار بوون. ئه‌وه‌بوو .ئه‌و ڕۆژه هه‌موو به‌ڵگه‌نامه‌كان وه‌كو شاخێكی كاغه‌ز به خێرایی له ژێرزه‌مینه‌كه‌ی باره‌گای MIC

کەڵەکە بوون، لە کاتێکدا بەڕێوەبەرەکان ئۆفیسەکانیان لە فایلەکان بەتاڵ دەکردەوە. بەڵام چەند ڕۆژێك دواتر پڕۆژەکە ڕاگیرا. تیمێکی هەواڵی بی. بی. سی. بە جۆرێك زانیان کە بەرپرسانی MIC بڕێکی زۆر بەڵگەنامە دەگوازنەوە و تۆڕی کەناڵەکەش چیرۆکێکی پەخش کرد کە سەددامی تۆمەتبار کرد بە پلاندانان بۆ لەناوبردنی بەڵگە. عەبدولتەواب فەرمانەکەی پێچەوانە کردەوە و بەرپرسانی بەشەکانی ڕاسپارد کە هەموو شتێك لە ژێرزەمینەکە وەربگرنەوە. ئەمە ئەوەندە خێرا ڕوویدا کە تەنانەت دەستمان نەکردبوو بە گواستنەوەی بەڵگەنامەکانی بەشی پڕۆژەکانمان.

ئەڵقەکە جەختی لەسەر دۆخی سەرلێشێواوی لە ئاستە باڵاکانی حکومەتی عێراقدا کردەوە. بەڵگەنامەکانمان لە بەڵگەی کڕینی نایاسایی بۆ چەکی ئاسایی لە هیچ شتێکی نەفرەتی زیاتریان تێدا نەبوو؛ هیچ شتێك نەبوو کە پەیوەندی بەو چەکی کۆمەڵکوژەوە هەبێت کە ئەمریکا و بەریتانیای سەرقاڵ کردبوو. سەددام بێ پێویست گەڕابووەوە بۆ دۆخی شاردنەوە، وەك ئەوەی هەر بەشێوەیەکی غەریزەیی ئەو کارە بکات. لە ناو پلەبەندی MIC ەوە دەمتوانی بزانم کە ئەم هەڵوێستە هەڵەیەکی ستراتیژییە. بۆ جیهانی دەرەوە، تەنیا گومانی زیاتری دروست کرد کە سەددام وازی لە بەرنامە کیمیایی و بایۆلۆژی و ئەتۆمییەکانی هێناوە.

دۆخەکە لە دوای هێرشە تیرۆریستییەکان بۆ سەر ئەمریکا ساڵێك پێشتر پەرەی سەندبوو. دوای ئەوەی هێزەکانی سەر بە ئەمریکا هێزەکانی تاڵیبانیان لە ئەفغانستان لە دەسەڵات داماڵی، ئەمریکا سەرنجی "جەنگی تیرۆر"ی خۆی گۆڕی بۆ سەر عێراق. سەرکردەکانی ئەمریکا و بەریتانیا سەددامیان تۆمەتبار کرد بەوەی کە بەرنامەکانی چەکی کۆمەڵکوژی دەستپێکردووەتەوە و بەنهێنی

مامەڵەی لەگەڵ قاعیدە کردووە. سەددام بە دوودڵیەوە تەنیا لە ژێر هەڕەشەی کردەوەی سەربازیی بەرفراواندا بە خولی نوێی پشکنینی چەك ڕازی بوو. لەم کەشوهەوای بێ متمانەییەدا، ناڕەزایەتییەکانی حکومەتی عێراق کە هیچ جۆرە چەکێکی کۆمەڵکوژی نەماوە، کەوتە گوێی کەڕ.

پشکنەرەکان سەرنجیان لەسەر ئەو تۆمەتانە بوو کە لە دۆسیەیەکدا خرابوونە ڕوو کە حکومەتی بەریتانیا لە کۆتایی ئەیلولی ٢٠٠٢ پێشکەشی کردبوو بەوەی کە لە نێوان شتەکانی تردا بانگەشەی ئەوە دەکرا کە عێراق دەتوانێت لە ماوەی ساڵێك یان دوو ساڵدا چەکی ئەتۆمی بەرهەمبهێنێت ئەگەر یۆرانیۆم و پێکهاتەکانی بەشی پێویست لە دەرەوە بەدەستبهێنێت. دۆسیەکە تۆمەتەکانی خۆی بە شێوەیەکی تەواو لەسەر ئەو شتە جێگیر کرد کە بانگەشەی دەکرد بەرنامەیەکی سەنتەرفیوجی نوێ کراوەتەوە. پێشنیاری کرد کە عێراق هەوڵی داوە دامەزراوەیەکی بەرهەمهێنانی موگناتیسی دروست بکات و هەزاران بۆری ئەلەمنیۆمی بەدەست بهێنێت بۆ ئەوەی وەك ڕۆتۆری سەنتەرفیوج بەکاری بهێنێت. هەروەها ئاماژە ی بە ڕاپۆرتە هە والگرییە کان کردبوو، کە باسی لەوە دەکرد کە عێراق لە م دواییانە دا هەوڵی کڕینی بڕێکی بە ڕچاوی یۆرانیۆمی لە ئەفریقا داوە.

دوای ئەوەی پشکنەرانی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی ئەم بانگەشەیان خستە بەردەم بەڕێوەبەرایەتیی چاودێری نیشتمانی، دکتۆر جەعفەر بانگهێشتی کۆبوونەوەی دەستەی باڵای زانایانی بەرنامەی ئەتۆمی پێشووی کرد. ئەوکات دکتۆر جەعفەر ڕاوێژکاری سەرۆکایەتی بوو لەسەر بابەتی گواستنەوەی تەکنەلۆژیا، ئۆفیسەکەی ڕووی لە ڕووباری دیجلە بوو لە تەنیشت

باڵیۆزخانەی پێشووی بەریتانیا. لەم ژینگە ڕەسەنەدا یەك بە یەك باسی سێ تۆمەتەكەمان كرد. گرنگی دابینكردنی ڕوونكردنەوەی باش بۆ پشكنەرەكان ڕوون بوو. ئێمە ئەركەكەمان زۆر بە جددی وەرگرت چونكە دەكرێت زۆر شت لە وەڵامەكانمانەوە هەڵبهێنجرێت.

دكتۆر جەعفەر ئاماژەی بەوەشكرد، كە ڕێكخراوی NMD بەدواداچوون بۆ ئەو بانگەشەیە دەكات كە عێراق هەوڵی كڕینی یۆرانیۆمی داوە لە ئەفریقا. چوون ئەوە تۆمەتێك بوو لە دەرەوەی شارەزایی زاناكان. ڕێككەوتن كرا كە دكتۆر فارس، سەرۆكی پێشووی بەشی پشتگیری ئەندازیاریمان لە كاتی بەرنامەی سەنتەرفیوجدا، سەیری پرسی بۆری ئەلەمنیۆم بكات. دكتۆر جەعفەر داوای لە یەكێك لە زاناكانی پێشووی EMIS كرد كە لێكۆڵینەوە لەو تۆمەتە بكات سەبارەت بە دامەزراوەی بەرهەمهێنانی موگناتیسی پلان بۆ داڕێژراو، بە هاوكاری من.

من لەبارەی پلانەكانی كارگەی موگناتیسی لە (التحدی) كە نزیكەی سی كیلۆمەتر لە ڕۆژهەڵاتی بەغداوە دوورە، شتێك زانیاریم هەبوو، چونكە سەرەتا ئەو پێشنیازە بەلای مندا و لە MIC تێپەڕبوو. لەگەڵ ئەوەشدا من ئاشنای وردەكارییە ئاڵۆزەكانی پرۆژەكە نەبووم، كە هێشتا بەدی نەهاتبوو. لۆژیك ئەم دەرچەیەی دەرخست كە ئەوان خاوەن ئەو تێڕوانینە بوون بەوەی كە دیزاینەرانی كارگەی موگناتیسی ئاواتێكی نهێنییان هەبوو بۆ دروستكردنی پێكهاتەی سەنتەرفیوج. هەوڵێكی وەها بەرفراوان ئەوە دەگەیەنێت كە عێراق پێشتر دامەزراوەیەكی سەنتەرفیوجی بە قەبارەی بەرهەمهێنانی لە كارەكاندا هەبووە. بەڵام بۆ ئەوەی پشكنەرەكان ڕازی بكەم، هەستم كرد پێویستە شتەكان قوڵتر

ببینین. تەلەفۆنم بۆ دكتۆر ویداد حاتەم كرد كە لە ساڵانی هەشتاكانی سەدەی ڕابردوودا لە بەریتانیا بە موگناتیسی سەنتەرفیوج كاریان كردووە و داوام لێكرد لێكۆڵینەوە لە پلانەكانی دامەزراوەكە بكات، لەوانەش خشتەی بەرهەمهێنان و فیزیای پشت پلانەكانی موگناتیسیەكان. ئەو زانایەكی بەتوانا بوو و دوای یەك دوو هەفتە لێكۆڵینەوە، توانی بە شێوەیەكی قەناعەت پێكەر نیشان بدات كە موگناتیسی پلان بۆ داڕێژراو بۆ كارەكانی وەك پەمپە ئاوییەكان، ماتۆڕی پیشەسازی گەورە و موشەكی شان تەقێنراون، بەڵام بۆ سەنتەرفیوج نەبووە.

بۆرییە ئەلەمنیۆمییەكان شتێكی دیكە بوون. كاتێك گوێم لە تۆمەتەكە بوو یەكەم كاردانەوەم ئەوە بوو كە ئەم تۆمەتانە تەنانەت سەرپێچی لە لۆژیك دەكەن. بۆچی عێراق بۆری كۆدەكاتەوە، كە گوایە بۆ ڕۆتۆری سەنتەرفیوج بووە، لەكاتێكدا ژێرخانی بۆ بەردەوامی بەرنامەی سەنتەرفیوج نەبوو؟ بەڵام پێدەچوو پشكنەرانی چەكەكان لەسەر ئەو پرسە جێگیر بوون.

ڕۆژێك پێش كۆبوونەوەكە لەگەڵ دكتۆر جەعفەر، پەیوەندییەكم لە ڕاوێژكاری سەددام، لیوا ئەمیر ئەلسەعدیەوە پێگەیشت، كە وتی پشكنەرەكان سەردانێكی بێ ئامادەكارییان بۆ دامەزراوەیەك لە (الراية) كردووە، كە دكتۆر كازم میجبیل خەریكی نۆژەنكردنەوەی بەشێك لە بۆریەكان بوو دوای ئەوەی بە شێوەیەكی نادروست هەڵگیرابوون. ژەنەڕاڵ ئەلسەعدی دكتۆر كازمی هێنا سەر هێڵی تەلەفۆنەوە. تۆنی دەنگی نزیك بوو لە ناڕەزایی. وتی هەستی بە فێڵكردن كردووە لەلایەن پشكنەرەكانەوە كاتێك پێی وتن كە بۆرییەكان بۆ موشەكی تۆپخانەن، تەحەدای ئەوەیان كردووە كە ڕوونی بكاتەوە كە بۆچی ناتوانرێت بۆ ڕۆتۆری سەنتەرفیوج بەكاربهێنرێت.

دكتۆر كازم ده‌ڵێت: پێم وتن كه هیچ له‌باره‌ی سه‌نته‌رفیوجه‌وه نازانم. به‌ڵام وه‌ك ئه‌وه‌ی ڕاستییه‌كان بشارمه‌وه مامه‌ڵه‌یان له‌گه‌ڵ كردم.

كاتێك ژه‌نه‌ڕاڵ ئه‌لسه‌عدی هاته‌وه سه‌ر خه‌ت، ئاگادارم كرده‌وه كه ئێمه له كاتی هه‌وڵه سه‌ره‌تاییه‌كانماندا له‌گه‌ڵ سه‌نته‌رفیوجی جۆری بیمزدا تاقیكردنه‌وه‌ی ڕۆتۆری ئه‌له‌منیۆممان كردووه، به‌ڵام تیره‌كه‌ی گه‌وره‌تره له‌و بۆریانه‌ی كه عێراق به‌م دواییه بۆ موشه‌كه‌كان داوای كردبوو. گوتم كه ڕۆتۆری ئه‌له‌منیۆم ناتوانرێت بۆ ئه‌و جۆره موگناتیسییه‌ی سه‌نته‌رفیوج به‌كاربهێنرێت كه له ساڵی ١٩٩٠دا سه‌ركه‌وتوو بووین له پیتاندنی یۆرانیۆم، دوای ئه‌وه‌ی ته‌له‌فۆنه‌كه‌مان داخست، جارێكی تر بیرم كرده‌وه. من له ڕۆژانی سه‌نته‌رفیوجه‌وه له‌گه‌ڵ یه‌كێك له ئه‌ندازیاره بچووكه‌كانم —جه‌مال- ڕاوێژم كرد، ئه‌ویش بیری هێنامه‌وه كه پرۆفیسۆر زیپ له كاره‌كانی سه‌ره‌تایی سه‌نته‌رفیوجی موگناتیسی له زانكۆی ڤێرجینیا له كۆتاییه‌كانی په‌نجاكانی سه‌ده‌ی ڕابردوودا ئه‌له‌منیۆمی به‌كارهێناوه. ته‌له‌فۆنم بۆ ژه‌نه‌ڕاڵ سه‌عدی كرده‌وه تا خۆم ڕاست بكه‌مه‌وه. من گوتم، زۆر گرنگ بوو كه ئارگومێنتی دروست بدرێت به پشكنه‌ره‌كان بۆ جێی متمانه و نه‌بوونی تۆمه‌تی بۆری ئه‌له‌منیۆم. ئێمه نه‌مانتوانی به شێوه‌یه‌كی پۆلێنبه‌ندی بڵێین كه بۆری ئه‌له‌منیۆم بۆ سه‌نته‌رفیوجی موگناتیسی ناگونجێت. پێویست بوو كه‌یسێكی زۆر ورد بخه‌ینه‌ڕوو. ده‌مزانی دكتۆر فارس لێكۆڵینه‌وه‌یه‌كی ورد له لێبورده‌یی و تایبه‌تمه‌ندییه‌كانی بۆرییه ئه‌له‌منیۆمییه‌كان ده‌كات، بۆ ئه‌وه‌ی نیشان بدات كه به‌ڕاستی بۆ موشه‌كی تۆپخانه دانراون. هه‌روه‌ها هه‌ستم به دڵنیایی ده‌كرد كه

ده‌توانین ئه‌و تۆمه‌تانه پووچه‌ڵ بكه‌ینه‌وه كه عێراق به نهێنی به‌رنامه ئه‌تۆمییه‌كه‌ی ده‌ستپێكردووه‌ته‌وه.

له‌م نێوه‌نده‌دا، له‌ژێر فشاری توندی نێوده‌وڵه‌تیدا، سه‌ددام له ئاستێكی بێ وێنه‌دا هاوكاری پشكنه‌رانی چه‌كی ده‌كرد. ده‌ستبه‌جێ ده‌توانن بچنه هه‌ر بینایه‌ك له‌وانه‌ش شوێنه‌كانی سه‌رۆكایه‌تی و كۆشكه‌كان. تیمه‌كانی ئاژانسی نێوده‌وڵه‌تی وزه‌ی ئه‌تۆمی كه ئامێری پێشكه‌وتوویان بۆ پشكنینی ئه‌تۆمی هه‌بووه، هه‌موو ڕۆژێك سه‌ردانی ئه‌و شوێنانه‌یان ده‌كرد كه به وردی هه‌ڵبژێردرابوون. به‌بێ ئاگاداركردنه‌وه هێرشیان كرده سه‌ر كارگه‌كانی چیمه‌نتۆ، كارگه كیمیاییه‌كان، دامه‌زراوه‌كانی پرۆسێسكردنی خۆراك، كارگه كانزاییه‌كان و سه‌نته‌ره تایبه‌ته‌كان به ئه‌لیكترۆنیات و له‌یزه‌ر، له‌وێ له‌لایه‌ن به‌ڕێوه‌به‌ره عێراقییه‌كانه‌وه هاوكاری ته‌واویان پێدرا. سه‌ردانی دامه‌زراوه‌ی پێشووی ئه‌لفوراتیان كرد كه ناوی گۆڕدرابوو بۆ ئه‌لمیلاد و كرابوو به ناوه‌ندێكی لێكۆڵینه‌وه‌ی سه‌ربازی. چه‌ندین جار دامه‌زراوه‌ی ئاژانسی عێراقی بۆ وزه‌ی ئه‌تۆمی له (التویثه) به‌سه‌ركرده‌وه. له سه‌نته‌ری دیزاینی ئه‌ندازیاری پێشوومان له ڕه‌شیدیه، پشكنینی شوێنه‌واری یۆرانیۆمیان ئه‌نجامدا. ئه‌وان نمونه‌ی ئاو، مادده‌ی نیشتوو و ڕووه‌كیان له ده‌وروبه‌ری ئه‌و شوێنانه وه‌رگرت كه پێشتر په‌یوه‌ندییان به به‌رنامه‌ی ئه‌تۆمیه‌وه هه‌بوو. له شوێنه‌كانی به‌رهه‌مهێناندا ئامێره‌كانیان پشكنی. به‌ڵگه‌نامه‌یان ده‌برد و فایله‌كانی كۆمپیوته‌ریان له كۆمپانیا بازرگانییه‌كان و كارگه‌كانی ته‌قه‌مه‌نی و بانكه‌كاندا وه‌رده‌گرت. ئه‌وان ڕووپێوی ڕادیۆمێترییان ئه‌نجامدا بۆ سه‌ره‌وه و خواره‌وه‌ی ڕێڕه‌وی ئاوی سه‌ره‌كی عێراق. ئه‌وان نمونه‌ی ئایرۆسۆلیان له ئۆتۆمبێلی تایبه‌تمه‌ند وه‌رگرت كه له

ماوەی چەند مانگێکدا هەزاران میلیان بڕیبوو. هیچ کام لە هەوڵەکانیان هیچ بەڵگەیەکی لەسەر بوژانەوەی بەرنامەیەکی ئەتۆمی نەدۆزیەوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەی بەڕێوەبەرایەتی چاودێری نیشتمانی خەریکی ڕەتکردنەوەی ئەو تۆمەتانە بوو کە لەسەر کارگەی موگناتیسی پلان بۆ داڕێژراو و بۆری ئەلەمنیۆم و گریمانەی کڕینی یۆرانیۆمی ئەفریقی دەکرا، ناکۆکی دیکە سەریان هەڵدا. نەتەوە یەکگرتووەکان فشاری خستە سەر سەددام کە فڕینی چاودێری لە ڕێگەی فڕۆکە سیخوڕیەکانەوە بۆ ئاسمانی عێراق قبوڵ بکات و یاسای نیشتمانی پەسەند بکات کە چەکی کۆمەڵکوژ قەدەغە دەکات. سەددام سەرەتا هەردووکیانی ڕەتکردەوە و وەك سووکایەتیکردن بە سەروەری نیشتمانی عێراق داینا. لەوەش جێی مشتومڕتر داواکاری پشکنەرەکان بوو بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ زانایانی پێشووی چەکی کۆکوژی بە شێوەیەکی تایبەت، بەبێ چاودێری حکومەت و دوور لە سنووردارکردن. سەرۆك بوش فشاری خستە سەر سەددام کە زانا پێشەنگەکان و خێزانەکانیان لە عێراق دەربهێنن کە بتوانن بە ئاشکرا قسە بکەن بەبێ ترس لە تۆڵەسەندنەوە. ڕەنگە سەددام ترسی ئەوەی هەبووبێت ئەگەر ئازادییان پێ بدرێت، زاناکان ئەو چاکەیە لە تاراوگە بگەڕێننەوە بە پێدانی زانیاری ناڕاست کە بتوانن یارمەتیدەر بن لە پاساوهێنانەوە بۆ شەڕ دژی عێراق. دوای چەند هەفتەیەك لە دانوستان، دواجار حکومەتی عێراق ڕەزامەندی دەربڕی کە ڕێگە بە هەندێك زانا بدات بە شێوەیەکی تایبەت قسە لەگەڵ پشکنەران بکەن. بەڵام NMD مەرجی دانا کە هەموو

چاوپێكەوتنەكان بە كاسێت تۆمار بكرێن بۆ ئەوەی دواتر لەلایەن بەڕێوەبەرەكانیان پێداچوونەوەیان بۆ بكرێت.

لەگەڵ ئەوەی پشكنەرەكان كارەكانیان جێ بەجێ دەكرد، لەولاوە بەرپرسانی كۆمپانیای MIC بە سادەیی مەترسییە پەرەسەندووەكانی شەڕیان پشتگوێ خست. هەستی ئینكاری ئەوەندە گەورە بوو كە لە درەنگانی مانگی كانوونی دووەمدا سەرپەرشتی پلانێكی گەشەپێدانی دە ساڵەم دەكرد. ئەمە شتێكی تەواو بێ مانا بوو. لە كاتێكدا بەهێزترین سوپای جیهان خۆی ئامادە دەكرد بۆ داگیركردنی میللەتەكەی، سەددام بە چاوێكی وردەوە داوای پلانی سەربازی- پیشەسازی دەكرد تا ساڵی ٢٠١٢. من بۆچوونی خۆمم نەخستەڕوو كە ڕەنگە ئەمە ئەولەویەتێكی هەڵە بێت، بە لەبەرچاوگرتنی بارودۆخەكە. لەبری ئەوە، هەموو بەرپرسانی وەزارەتەكانم كۆكردەوە و داوام لێكردن پرۆژەیەك پێشنیار بكەن كە هەم پابەندبن بە سزاكانی نەتەوە یەكگرتووەكان لەسەر كڕینە سەربازییەكانی عێراق و هەم بەرگرییەكانی وڵات لە داهاتوویەكی دوور بخەنە پێشەوە.

پلانەكەمان چارەسەری كەموكوڕییەكانی سیستەمی دژە-فڕۆكەی عێراقی كرد. ساڵانێك بوو فڕۆكە بۆمب هاوێژەكانی ئەمریكا و بەریتانیا بە شێوەیەكی پچڕپچڕ بەرگری ئاسمانییان لە ناوچەی دژە فڕینی باكوور و باشوور بۆمباران دەكرد. ڕاداری عێراق كاتێك ئاماژەی دەنارد، سوودی نەبوو چونكە هێندە دەناسرایەوە كە ئامانجێكی ئاسان بوون. لە لایەكی دیكەوە مووشەكەكانی سەرزەوی بۆ ئاسمانی عێراق لە مەودا و وردبینیدا سنووردار بوون. ئەوان لە ماوەی زیاتر لە دە ساڵدا تەنانەت یەك فڕۆكەی ئەمریكی یان بەریتانییان نەخستبووە خوارەوە و

مووشەكەكانی ئەمریكا بەبێ هیچ لەمپەرێك دەگەیشتنە ئامانجەكانیان لە عێراق. پلانەكەمان بریتی بوو لە پەرەپێدانی مووشەكی وردتر و سیستەمێكی نوێی ڕادار، كە تاوەكو سالّی ۲۰۰۸ ئامادە دەبوون.

لەم نێوەندەدا، پێشتر ڕووبەڕووبوونەوەیەكی ئاست نزم دەستی پێكردبوو. فڕۆكە جەنگییەكانی ئەمریكا و بەریتانیا ڕۆژانە هەڵیان دەكوتایە سەریان بۆ زیاتر لاوازكردنی بەرگرییە ئاسمانییە هاوتاكانی سەددام. لە كۆتایی مانگی كانوونی دووەمدا سەرۆك بوش ڕێگەی بە ناردنی هێزەكانی ئەمریكا بۆ ناوچەی كەنداو دا. كەناڵەكانی تەلەفزیۆن و هەواڵەكان ڕاپۆرتیان لەسەر ئامادەكارییەكانی بنكە سەربازییەكانی ئەمریكا بڵاوكردەوە، لەكاتێكدا سەربازەكان بۆ شەڕی تەواو خەریك بوون ئامادەكاریان دەكرد. كۆمەڵێك ڕاپۆرتم بینی كە هێزە تایبەتەكانی ئەمریكا لە ئێستاوە لەسەر زەوی ناوخۆی عێراق چالاكیيان دەكرد. شەوانە لە ماڵەوە سەیری ئەم هەواڵەم دەكرد، لە ڕۆژیشدا لە بارەگای MIC سەرقاڵی ئەوە بووم كە دوا سەرنجمان دەرببڕین لە بودجەی كارگەكانی چەك و كارگەیەكی پاككردنەوەی ئاو و پاڵاوگەكانی نەوت كە لە ماوەی دەیەی داهاتوودا تەواو بكرێن.

لە كانوونی دووەمی ۲۰۰۳ بەڕێوەبەری گشتی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی محەمەد بەرادعی و هانس بلیكس، سەرۆكی پشكنینەكانی نەتەوە یەكگرتووەكان لە عێراق، بە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكانی ڕاگەیاند كە "پرسیاری كراوە" سەبارەت بە بەرنامەكانی پێشووی چەكی كۆمەڵكوژی عێراق هێشتا ماوە. لە ژێر فشاری نێودەوڵەتی توند و

له كه‌شوهه‌وای به‌رده‌وامی گوماندا، داوای له عێراق كرد چالاكتر بێت له هاوكارییه‌كانیدا.

له شوێنه گشتییه‌كانی شاری به‌غدا، هاوڵاتیانی ئاسایی به وریاییه‌وه باسیان له‌و ڕووداوانه ده‌كرد كه له گۆڕه‌پانی نێوده‌وڵه‌تیدا ڕووده‌ده‌ن و به‌م زووانه چاره‌نووسیان دیاری ده‌كرد. كۆده‌نگییه‌كه، لانیكه‌م له‌به‌رده‌م خه‌ڵكدا ئه‌وه بوو كه ئه‌مریكییه‌كان وڵات داگیر ناكه‌ن، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ویستیان داگیری بكه‌ن، ئه‌وا له‌لایه‌ن هێزه عێراقییه‌كانه‌وه شكست پێ ده‌هێنرێن.

هه‌موو شه‌وێك من و له‌یلا و منداڵه‌كان له ژووری میوانه‌كه‌ماندا به ده‌وری ته‌له‌فزیۆنه‌كه‌دا كۆده‌بووینه‌وه بۆ بینینی هه‌واڵه‌كان له كه‌ناڵه‌كانی ئه‌لجه‌زیره و بی. بی. سی. سه‌ربازه ئه‌مریكییه‌كان ڕژانه ناو كوێت و بنكه‌یه‌كی به‌رفراوانیان له بیابانه‌كاندا دانا كه دوور نه‌بوو له سنووری عێراق. په‌یامنێران زۆری نه‌خایاند ژماره‌یان به ٢٠٠ هه‌زار كه‌س مه‌زه‌نده كرد. ملیۆنان كه‌س له سه‌رانسه‌ری جیهاندا ڕژانه سه‌ر شه‌قامه‌كان بۆ ناڕه‌زایه‌تی ده‌ربڕین به‌رامبه‌ر به‌و شه‌ڕه‌ی كه له ئارادایه. شاره‌زایانی ڕۆژئاوا له‌سه‌ر چاره‌نووسی وڵاته‌كه‌م خه‌ریكی مشتومڕێكی گه‌رم بوون.

له ٥ی شوباتدا سه‌یری كۆلن پاوڵی وه‌زیری ده‌ره‌وه‌ی ئه‌مریكامان كرد كه له‌به‌ده‌م ئه‌نجومه‌نی ئاسایشی نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان به‌ڵگه‌ی پێشكه‌ش كرد، كه گوایه عێراق هێشتا چه‌كی كۆمه‌ڵكوژ په‌ره‌پێده‌دات، له‌نێویاندا تۆمه‌تێكی درێژخایه‌ن له‌سه‌ر بۆرییه ئه‌له‌منیۆمییه‌كان. پێده‌چوو گه‌لانی وه‌ك فه‌ره‌نسا و ئه‌ڵمانیا و ڕووسیا به‌و پێشكه‌شكردنه سه‌رسام نه‌بن. ئێمه پێشبینیمان

کرد کە ئایا سەددام دەتوانێت پشت بە پشتیوانی ئەو ولاتانە ببەستێت بۆ ڕێگریکردن لە لەشکرکێشی. من ئەمەم زۆر بەدوور دەزانی. هەستم کرد کە لەشکرکێشی ئەمریکی حەتمییە و تازە هەر دەکرێت.

کۆبوونەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە باکووری کوێت نزیك بوو لە تەواوبوون، بەهۆی ئەوەی کەلوپەلی زۆر و سەربازەکان کۆکرانەوە بۆ ئەوەی ڕێگە بدرێت بەشێوەیەکی باش کارەکە بەڕێوەبچێت.

سەددام بەرامبەر بەو ڕووداوانەی کە بە دەوریدا دەخولانەوە وەك بۆکسێنەرێکی ماندوو لە قۆناغی دوانزەهەمدا کە چاوەڕێی لێدانی کۆتایی دەکرد، کاردانەوەی هەبوو. وتارەکانی پڕ لە قسەی زل بوون و بەلام نەیتوانی وەلامی ئەو هێزە ترسناکانە بداتەوە کە لە دژی گرد ببوونەوە. دەنگۆی ئەوەم بیست کە لەبری ئەوەی خۆی بۆ شەڕ ئامادە بکات، خەریکی ڕۆمانێکی نوێ بووە. سەددام لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردوودا "بە بێ ناو" دوو ڕۆمانی دیکەی چاپ کردبوو. یەکەمیان (زەبیبە و پاشا) بوو، کە تێیدا حاکمێکی میهرەبان، نوێنەرایەتی سەددام دەکات، بەرگری لە ژنێکی قەشەنگ دەکات –ژنەکە نوێنەرایەتی گەلی عێراق دەکات- لە هاوسەرە خراپەکارەکەی -کە نوێنەرایەتی ئەمریکا دەکات-. چەند لاپەڕەیەکم لێ خوێندبوویەوە و دواتر وەك جۆرێك لە زبڵ و خاشاك کە تەنیا لە عەقڵێکی تەواو وەهمییەوە سەر دەردەکات، فڕێمدابووە لایەك. ڕوون بوو کە سەددام لە جیهانێکی تەواو خەیاڵیدا دەژی.

لە هەنگاوێکی ئاشتەواییدا، ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر ڕێگەدان

بە فڕینی فڕۆكە سیخوڕیەكانی U-2 بەسەر خاكی عێراقدا، بەڵام ئیمتیازەكە لەلایەن ئەمریكا و بەریتانیاوە ڕەتكرایەوە. پێدەچوو سەددام هیچ ستراتیژییەكی ڕاستەقینەی نەبێت بۆ مامەڵەكردن لەگەڵ بینای هەڕەشەی سەربازی لەبەردەم دەرگاكەیدا. عێراقی بەسەر كەرتەكاندا دابەش كرد بۆ بەرگریكردن لە بەرامبەر دوژمنێك كە بە تەواوی لە خاڵە بەهێزەكانی تێ نەدەگەیشت. بە شێوەیەكی هەڕەمەكی دەستی كرد بە دابەشكردنی بەشەخۆراكی زیادە بەسەر دانیشتووانەكەیدا، بەبێ ئەوەی پێشبینی ئەوە بكات كە شەڕەكە چەندە بەردەوام دەبێت. لە زۆربەی كاتەكاندا وا دیار بوو ڕژێم پێی باشتر بوو چاوەكانی لە هەڕەشەكەدا دابخات بەو هیوایەی كە هەڕەشەیەك بێت و تێپەڕێت و هیچی تر. لە بارەگای MIC، بەرپرسان كۆبوونەوەی بێشوماریان ئەنجامدا سەبارەت بە چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ پشكنەرەكان بەڵام خۆیان لە پلاندانان بۆ شەڕێكی نزیك بەدوور گرت.

هەر زوو دوای وتارەكەی پاول، بەڕێوەبەرایەتی چاودێری نیشتمانی ئاگاداری كردمەوە كە بڕیارە چاوپێكەوتن لەگەڵ پشكنەرانی نەتەوە یەكگرتووەكان بكەم و ئەمە دوا چاوپێكەوتنم دەبێت لەگەڵیان. پاشنیوەڕۆی ١٢ی شوباتی ٢٠٠٣ لە بارەگای MIC ئۆتۆمبێلێك لە بەڕێوەبەرایەتییەوە هەڵیگرتم، لە ڕێگادا بۆ ئۆفیسی نەتەوە یەكگرتووەكان، یاوەر و پاسەوانم، بەڕێز شاكر ئەلڕەیس، تۆماركەرێكی كاسێتی پێدام و پێی وتم كە تەواوی گفتوگۆیەكەم لەگەڵ پشكنەرەكاندا بە كاسێت تۆماربكەم. سەددام ڕایگەیاند كە دەیەوێت چاوپێكەوتنەكان تۆماربكرێن بۆ ئەوەی حكومەتەكانی ڕۆژئاوا نەتوانن لێدوانەكان بقۆزنەوە یان زانیاری هەڵە بخەنە ناو تۆمارەكەوە.

به‌ڕێز شاكر به یاوه‌رییه‌وه منی برده كافتریای نهۆمی دووه‌می باڵه‌خانه‌ی ئۆفیسێكی به‌غدا و له شوێنه‌كه‌دا مایه‌وه كاتێك من له ده‌رگاكه‌دا چوومه ژووره‌وه. پێنج پشكنه‌ر كه له ده‌وری مێزێك دانیشتبوون، هه‌ڵسانه‌وه. له‌نێویاندا كه‌سێكی كه‌نه‌دیم به ناوی جۆرج هیلی له پشكنینه‌كانی ساڵانی نه‌وه‌ده‌كاندا ناسیه‌وه، به‌ڵام پێشتر هیچ كام له‌وانه‌ی دیكه‌م نه‌بینیبوو. له‌وانه دوو ژن، خه‌ڵكی هۆڵه‌ندا و باشووری ئه‌فریقا، هه‌روه‌ها دوو پیاو، خه‌ڵكی به‌ریتانیا و میسر بوون ئه‌وه‌بوو هه‌رزوو خۆمان ناساند. له‌كاتی دانیشتنماندا، هیلی سه‌یری تۆماركه‌ره‌كه‌ی كرد.

ئه‌و: "ئایا به‌ڕاستی ئه‌وه پێویسته؟".

گوتم: "ئه‌وه ته‌نها ڕێكاره‌كانه"، ده‌مزانی ئه‌گه‌ر بگه‌ڕێمه‌وه به‌بێ تۆماركردنی دانیشتنه‌كه‌مان كێشه دروست ده‌بێت. "به‌ڵام هێشتا نه‌مكردووه‌ته‌وه، بۆیه ئه‌گه‌ر ده‌ته‌وێت پێشتر شتێكم لێ بپرسێت . . ."

ئه‌م پێشنیاره تا ڕاده‌یه‌ك بێ باكانه بوو، به‌ڵام شتێك له مندا ده‌یویست ئاماژه به‌وه بكات كه لانیكه‌م له باخچه‌كه‌مدا، هێشتا ڕاستییه‌كان هه‌ن كه ده‌بێ ئاشكرا بكرێن. پشكنه‌ره‌كان سه‌یری یه‌كتریان كرد و ڕه‌نگه دركیان به‌وه كردبێت كه باشتره پابه‌ندبن به‌و یاسایانه‌ی كه له‌لایه‌ن NMD ه‌وه دانراون، بۆیه كۆك بوون كه گفتوگۆكه به ته‌واوی تۆمار بكرێت.

تۆماركه‌ره‌كه‌م داگیرساند و هیلی و هاوكاره‌كانی به نۆره پرسیاریان ده‌كرد. سه‌ره‌تا ئه‌و باسه‌كان ئه‌وانه‌بوون كه له ماوه‌ی ساڵانی نه‌وه‌ده‌كاندا به ته‌واوی لێكۆڵینه‌وه‌یان له‌سه‌ر كرابوون. پرسیاریان كرد ده‌رباره‌ی دابه‌شكردنی به‌رپرسیارێتی له نێوان

زانایانی سه‌نته‌رفیوج له‌ كۆتایی هه‌شتاكانی سه‌ده‌ی ڕابردوودا، و له‌ دوای شه‌ڕی ١٩٩١ له‌ كویێ كارمان كردووه‌. پێم گوت تیمه‌ كۆنه‌كه‌ی سه‌نته‌رفیوجه‌كه‌مان ئێستا زیاتر له‌ ساڵی ١٩٩٨ په‌رش و بڵاوه‌، ئه‌مه‌ش ئاماژه‌یه‌كی دیكه‌ بوو بۆ ئه‌وه‌ی هیچ به‌رنامه‌یه‌كی چالاكمان نییه‌.

پرسیاریان له‌باره‌ی هه‌وڵه‌كانی عێراق بۆ كڕینی موگناتیسی كوالیتی به‌رز و پلانه‌ هه‌ڵوه‌شاوه‌كانی دروستكردنی هێڵی به‌رهه‌مهێنانی موگناتیسی كرد. لێكۆڵینه‌وه‌كانمان له‌سه‌ر ئه‌و بابه‌ته‌ ڕوونكرده‌وه‌ و دڵنیامكردن كه‌ موگناتیسیه‌كان چه‌ندین به‌كارهێنانی پیشه‌سازییان هه‌بووه‌ و ئه‌گه‌ر بۆ سه‌نته‌رفیوجه‌كان بوونایه‌، ئه‌وا منیش ده‌مزانی. پاشان هاتنه‌ سه‌ر خاڵی سه‌ره‌كی خۆیان. وه‌ك كۆڵن پاول هه‌فته‌یه‌ك پێشتر ئاماژه‌ی پێكردبوو، عێراق له‌ ساڵانی ڕابردوودا داوای ده‌یان هه‌زار بۆڕی ئه‌له‌منیۆمی پله‌ به‌رزی بۆ موشه‌كه‌كانی سه‌ربازی كردووه‌، كه‌ به‌پێی سزاكانی نه‌ته‌وه‌ یه‌كگرتووه‌كان قه‌ده‌غه‌كراون. پشكنه‌ره‌كان ده‌یانویست بزانن ئایا ئه‌مانه‌ ده‌شێت شتێكی "به‌كارهێنانی دووانی"بن كه‌ مه‌به‌ست لێی به‌كارهێنان بێت وه‌ك ڕۆتۆری سه‌نته‌رفیوج.

كه‌م وكوڕییه‌ سه‌ره‌كییه‌كانی ئه‌م بیرۆكه‌یه‌م ڕوونكرده‌وه‌. تیره‌ی ئه‌و بۆڕیانه‌ی عێراق فه‌رمانی كڕینی كردبوون، هه‌شتا و یه‌ك ملیمه‌تر بوو بۆ ئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ تایبه‌تمه‌ندییه‌كانی موشه‌كه‌كانی تۆپخانه‌كه‌ماندا بگونجێت. ئه‌و ڕۆتۆره‌ سه‌نته‌رفیوجانه‌ی كه‌ له‌ كۆتایی هه‌شتاكانی سه‌ده‌ی ڕابردوودا كارمان له‌گه‌ڵدا كردبوو نزیكه‌ی دوو هێنده‌ی ئه‌م تیره‌یان هه‌بوو. ئه‌م ناته‌باییه‌ گه‌وره‌یه‌ به‌

تەنیا هەموو دیزاین و نەخشەکانمانی بێ سوود دەکرد و پێویستی بە دیزاینکردنەوەی تەواوی بەرنامەکە هەبوو.

گوتم: "وەك دەزانن بەرنامەی سەنتەرفیوجەکەمان بۆ بەکارهێنانی ڕۆتۆری ڕیشاڵی کاربۆنی دارێژرابوو. هەروەها ئامادەبووین پۆڵای پتەو بەکاربهێنین. بەڵام ئەلەمنیۆم مادەیەکی زۆر نزمترە. ئێمە و کارکردن بە ئەلەمنیۆم مەحاڵ بوو. هەروەها هیچ دیزاین و حیساباتێکمان نەبوو کە بۆ تیرەیەکی بچووکتر بگونجێت".

من دەمزانی کە دکتۆر فارس پێشتر دۆزینەوەکانی خۆی سەبارەت بە میکانیکی بۆرییە گومانلێکراوەکان و بەکارهێنانیان بۆ موشەکی تۆپخانە خستۆتە ڕوو. بۆیە زیاتریش لەوە لەسەری ڕۆیشتم بۆ ئەوەی ڕوونی بکەمەوە کە بۆچی لە ڕوانگەی ئەندازیاری بنەڕەتییەوە بۆ بەرنامەی سەنتەرفیوج نەگونجاون. بەو دیزاینانەی کە لە سەنتەرفیوجی ئەڵمانی کڕیبوومان، توانیبوومان کۆپییەکی ورد دروست بکەین. ئەمە پرۆسەیەکە بە ئەندازیاری پێچەوانە ناسراوە، کە مرۆڤ بەهۆیەوە مۆدێلێکی سەرکەوتووی پێشتر کۆپی دەکات. بەڵام هەر گۆڕانکارییەکی بەرچاو لەو مۆدێلەدا پێویستی بە ئاستێکی تەواو نوێی زانست دەبوو. گۆڕانکاری ڕیشەیی لە تیرەی ڕۆتۆردا بە تەنیا ناچاری دەکردین لە سفرەوە بنکەیەکی شێوە تۆپی نوێ دیزاین بکەین، لەگەڵ ڕووکارە وردەکانی و موگناتیسی و کاپ و ماتۆڕ و دەیان پێکهاتەی دیکە. پێویستی بەوە دەبوو بگەڕێینەوە سەر تەختەی وێنەکێشان بۆ ئەوەی حیساباتە ئاڵۆزەکان سەرلەنوێ بکەینەوە.

مرۆڤ دەتوانێت ئەمە بەراورد بکات بە تیمێکی ئەندازیاری ئۆتۆمبێل کە دەیانزانی چۆن مۆدێلێکی دیاریکراوی مێرسیدس-بێنز دروست بکەن، و دیزاین و لێهاتوویی و زانیارییەکانیان تەنها بۆ ئەو مۆدێلە بوو. ئەگەر کەسێك بەشێك لە جۆرێکی تری ئۆتۆمبێل بەم تیمە بدات- بۆ نموونە پستۆنێك لە ئۆتۆمبێلی فیات-ئەوا کاتێکی زۆر زۆریان دەوێت تاوەکو فیاتێکی تەواو دروست بکەن.

ویستم هاوار بکەم بەسەر پشکنەرەکاندا: "ئێوە زۆر بە هەڵەدا چوون! جارێ باسی ئەلەمنیۆم هەر لەبیر بکەن؛ بەڵکو زیاتر بیر لەو توانایانەی عێراق بکەنەوە کە خاوەنییەتی!" بەڵام ئەوان وەك ئەسپی پێشبڕکێ وابوون کە پارچەیەك قوماش بەسەر چاویاندا درابێت و وا دیار بوو دەتوانن تەنها بە یەك ئاراستەدا ڕابکەن. دواجار کاتێك لە کۆتاییدا هەموو پرسیارێکی ئەگەریان سەبارەت بە بۆڕی ئەلەمنیۆم کرد، ئەوەبوو کۆتاییان بە دانیشتنەکە هێنا.

لەناخمدا پرسیارم لەخۆم کرد کە ئاخۆ ئەگەر بێت و پشکنەرەکان زانیارییان لەسەر کۆگای نێژراوی بەڵگەنامە و پێکهاتەکانم هەبووایە لەناو باخچەکەمدا -کە پێویست بوون بۆ دەستپێکردنەوەی بەرنامەی سەنتەرفیوج- ڕەنگە گومانەکانیان کەم بکردایەتەوە. من خەیاڵم دەکرد تیمێکی نەتەوە یەکگرتووەکان بهێنمەماڵەکەم و بەناو باخچەی گوڵەکاندا بڕۆم بۆ دامێنی نیلوفەرەکە بۆ ئەوەی دەست بە هەڵکەندن بکەم. ئەوان دەیانبینی کە چۆن ئەو زەویەی کە لەژێرییەوەو بەرمیلی پلاستیکی داپۆشیبوو، بەهۆی زیاتر لە دە ساڵ گۆڕانی وەرزەکانەوە ڕەق

بووه‌ته‌وه له كاتێكدا به‌رنامه‌كه به خه‌وتوویی ماوه‌ته‌وه.

تۆماركه‌ره‌كه‌م كوژانده‌وه، به‌ڵام هێشتا ئاماده نه‌بووم كافتریاكه به‌جێبهێڵم. ساڵانێكی زۆر بوو كه كۆمه‌ڵێك زانای بیانیم نه‌بینیبوو و ته‌نانه‌ت ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه‌ی دوو كاتژمێریمان به جۆرێك به‌هێزی كردم، كه هه‌ستم به پاڵنه‌رێكی به‌هێز كرد بۆ یارمه‌تیدانی ئه‌م هاوڕێ زانایانه بۆ گه‌یشتن به ڕاستییه‌كان. ئه‌و مه‌ترسییه‌ی كه به‌رنامه‌ی سه‌نته‌رفیوج دروستی كردبوو، له دامه‌زراوه‌یه‌كی نهێنیدا نه‌بوو له شوێنێكی عێراقدا كه یۆرانیۆمی پیتێنراوی ده‌رهێنابوو كه ده‌توانرێت بدرێت به تیرۆریستان. مه‌ترسییه‌كه شاراوه بوو، له شێوه‌ی زانینێكدا كه ده‌كرا به هه‌موو جیهاندا بڵاوبێته‌وه. په‌ندێكی كۆنی چینی هه‌یه ده‌ڵێت، ماسی مه‌ده به هه‌ژار به‌ڵكو فێری ماسیگرتنی بكه؛ واته مرۆڤ فێری ماسیگرتن بكه و تا ته‌مه‌نی خۆراكی پێ بده". ئه‌وه‌ی پشكنه‌ره‌كان هه‌رگیز نه‌یاندۆزیبووه‌وه، ئه‌و زانیارییه‌ی سه‌نته‌رفیوجه‌كه بوو كه ده‌توانێت عێراق، وڵاتێكی دیكه، یان گروپێكی پاره‌دار بتوانێت به ته‌نها بازدانێك به‌رنامه‌ی پیتاندنی یۆرانیۆم ده‌ستپێبكات. ئه‌م جۆره زانیاریانه به ئه‌گه‌رێكی زۆره‌وه به‌قه‌د چه‌كێكی ڕاسته‌قینه مه‌ترسیدار بوون، ئه‌گه‌ر زیاتریش نه‌بێت. به‌ڵام ئه‌مه بابه‌تێك بوو كه نه‌متوانی له‌گه‌ڵ هیلی یان پشكنه‌ره‌كانی تری نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان بیوروژێنم.

نزیكه‌ی هه‌فته‌یه‌ك دوای ئه‌م كۆبوونه‌وه‌یه، من و چه‌ند زانایه‌كی دیكه‌ی عێراقی له‌گه‌ڵ كۆمه‌ڵێك هاوتاكانی به‌رنامه‌ی پێشووی چه‌كی ئه‌تۆمی ئه‌فریقای باشوور كۆبووینه‌وه له هه‌وڵێكی كۆتاییدا بۆ یارمه‌تیدانی عێراق بۆ پاككردنه‌وه‌ی لێك تێگه‌یشتنه

هەڵەكانی لەگەڵ نەتەوە یەكگرتووەكان. ئەفریقای باشوور مێژوویەكی مامەڵەی شەفافیان لەگەڵ پشكنەرەكاندا هەبووە. لە ساڵی ١٩٩٠، لەگەڵ دانانی بەرنامەی تێكچڕژان و كەوتنەخوارەوە بۆ یەك بۆمب، ئەفریقای باشوور بوو بە یەكەم وڵات كە خۆبەخشانە دەستبەرداری تەماحە ئەتۆمییەكانی بوو، دواتر زاناكانی دەستیان كرد بە هاوكاری نزیك لەگەڵ چاودێرە نێودەوڵەتییەكان بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئامێرە ئەتۆمییەكان و دابینكردنی بەڵگەنامە.

سیمینارەكە تەنها چەند كاتژمێرێكی خایاند. دكتۆرە ڕیحاب تەها -ئەو ژنەی لە دەرەوەی عێراق بە دكتۆر میكرۆب ناسرابوو- باسی لە كارەكانی ڕابردووی عێراق كرد لەسەر چەكی بایۆلۆژی. دكتۆر فارس ئەو شیكارییەی بۆری ئەلەمنیۆمی پێشكەش كرد كە بۆ پشكنەرانی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی كردبووی. ئەوە یەكەمجار بوو كە بە وردی گوێم لە قسەكانی بوو. ئەو نیشانیدا كە ڕەهەندەكانی بۆرییە ئەلەمنیۆمییەكان لەگەڵ پێداویستییەكانی موشەكی تۆپخانەدا دەگونجێت. هەروەها گونجانی كانزاكە هاوتا بوو، بە یارمەتی پرۆژێكتۆرێك لە سەرەوە ئەم زانیارییانەی ڕوونكردنەوە.

گرنگترین گونجان لە تەنێكی ستوونیدا بریتییە لە سەرنجڕاكێشییەكەی، یان مەودای بچووكی نێوان دوو میحوەر كە ڕەنگە بە دەوریدا بسووڕێتەوە. لە موشەكدا، ئەم نائاسایی بوونە یارمەتی دیاریكردنی ڕێڕەوی فڕین دەدات. ئەمە تەواو ڕاست بوو كە سەرنجڕاكێشیی ئەو بۆرییە ئەلەمنیۆمییانەی كە عێراق فەرمانی پێكردبوو، بێكۆتایی بچووك بوون. ئەوانەی ئەفریقای باشوور

پرسیاریان لە دكتۆر كرد كە پێدەچوو تایبەتمەندییەكان زۆر بەرزتر بن لەوەی مرۆڤ چاوەڕێی دەكات بۆ بەكارهێنانی سەربازی عێراق.

ئەوەبوو من بیرم لەوە كردەوە كە ئاخۆ ئینگلیز و ئەمریكییەكان چۆن گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی كە بۆرییە ئەلەمنیۆمییەكان دەبێ بۆ شتی تر بەكارهاتبن جگە لە موشەكی تۆپخانە. ئەوان شێوازێكی درۆینەی كلاسیكی لۆژیكیان پەیڕەو كردبوو. لەبەر ئەوەی عێراق پێویستی بە بۆری كوالیتی بەرز دەبێت بۆ بەرنامەی سەنتەرفیوج، وایان زانی كە كڕینی ئەوانەش بەڵگەیە بۆ بەرنامەیەكی لەو شێوەیە. بەڵام نەیانتوانی لەنێو شتەكانی تردا جیاوازییە كولتوورییەكانی عێراق لەبەرچاو بگرن، كە ستانداردكردن زۆر دەگمەن بوو و كوالیتی كەرەستەكان لە پڕۆژەیەكەوە بۆ پڕۆژەیەكی دیكە جیاوازییەكی زۆری هەبوو. بە خەیاڵمدا هات كە هێندێك ئەندازیاری گەنجی عێراقی لەسەر تەختەی داڕشتنی موشەكەكانی تۆپخانە دیزاین بكەن و داوای بەرزترین تایبەتمەندیان بكەن، وریا بن لە هەر هەڵەیەكی دیزاین كە بتوانێت تووشی كێشەمان بكات، بێ ئاگا لەوەی داواكارییەكەی دواجار گومانی كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی بەرز دەكاتەوە.

هەر لەو هەفتەیەدا كە چاومان بەوانەی ئەفریقای باشوور كەوت، پشكنەرەكان مووشەكەكانی ئەلسەمود ٢ و ئەلفەتحی عێراقیان دۆزیەوە كە توانای ئەوەیان هەیە چەند میلێك سنووری نەوەد و سێ میل تێپەڕێنن. جیاوازی مەوداكەی لە ڕووی ستراتیژیەتەوە كەم بوو، بەڵام نەتەوە یەكگرتووەكان ڕایگەیاند كە

ده‌بێت ئه‌و مووشه‌كانه‌ له‌ناوببرێن بۆ ئه‌وه‌ی عێراق ئه‌ركه‌كانی جێبه‌جێ بكات. سه‌ره‌تا سه‌ددام ڕه‌تیكرده‌وه‌ و گوتی مه‌گه‌ر نه‌ته‌وه‌ یه‌كگرتووه‌كان گه‌مارۆكانی سه‌ر عێراق هه‌ڵبگرێت، ئه‌مه‌ش ته‌نها گرژییه‌كانی زیاتر كرد. هه‌روه‌ها پشكنه‌ره‌كان ده‌ تۆپخانه‌ی پڕ له‌ گازی خه‌رده‌لی كوشنده‌یان له‌ناوبرد، كه‌ له‌ ساڵانی نه‌وه‌ده‌كاندا دۆزیبیانه‌وه‌ و به‌ درێژایی "ساڵانی تاریك" له‌ ژێر مۆری نه‌ته‌وه‌ یه‌كگرتووه‌كاندا مابوونه‌وه‌. له‌وه‌ده‌چوو هه‌ردوو ڕووداوه‌كه‌ بووبن به‌سه‌رچاوه‌ی تێڕوانینێكی نێوده‌وڵه‌تی كه‌ ده‌بێت عێراق هێشتا خاوه‌نی چه‌كی قه‌ده‌غه‌كراو بێت. سه‌رۆك بوش زنجیره‌ وتارێكی پێشكه‌ش كرد و تیایدا ئه‌وه‌ی ڕاگه‌یاند كه‌ وڵاته‌كه‌ی بۆ شه‌ڕ ئاماده‌یه‌. له‌ كۆتایی مانگی شوباتدا سه‌ددام ته‌حه‌دای دیبه‌یتێكی كرد، به‌ڵام ئه‌مه‌ هه‌رزوو له‌لایه‌ن ئیداره‌ی ئه‌مریكاوه‌ ڕه‌تكرایه‌وه‌.

دواجار فه‌رمانده‌كانی ئه‌مریكا له‌ ناوچه‌ی كه‌نداو ڕایانگه‌یاند، كه‌ ئاماده‌ن بۆ له‌شكركێشی.

له‌ باره‌گای MIC فه‌رمانێكی نوێی نائومێدیمان پێگه‌یشت: ئامێره‌كانی ناو دامه‌زراوه‌كانی MIC ده‌بوو بگوازرێنه‌وه‌ یان هه‌ڵبوه‌شێنرێنه‌وه‌ و له‌ شوێنێكی تر هه‌ڵبگیرێن. بۆ چه‌ند هه‌فته‌یه‌ك پێش جه‌نگ، كرێكاران به‌ په‌له‌ ئامێره‌ گرانبه‌هاكانیان لێك جیا ده‌كرده‌وه‌ و له‌و شوێنانه‌دا هه‌ڵیانده‌گرت كه‌ كه‌متر ئه‌گه‌ری بۆردومانكردنیان هه‌بوو. پاشان نزیك كۆتایی مانگی شوبات، جێگرێكی ده‌مارگیرانه‌ به‌ فه‌رمانێكی نوێ له‌ عه‌بدولته‌وابه‌وه‌ هاته‌ ناو ئۆفیسه‌كه‌مه‌وه‌.

ئەو: هەموو بەڵگەنامەكان لەناوببەن.

لە مێزەكەمەوە سەرم بەرز كردەوە، سەرم سوڕما لە سروشتی كتوپڕ و گشتگیری فەرمانەكە. ئەمەش نیشانەیەكی تری سەرلێشێواوی و ترس و دڵەڕاوكێ بوو لەناو بیرۆكراسیدا.

من: "واتە، بە چ شێوەیەك لەناویان دەبەین؟ پارچەكردن یان سووتاندن؟"

جێگرەكە ئامادە نەبوو وەڵامی ئەمە بداتەوە.

"هەموو بەڵگەنامەكان ئامادە بكەن بۆ ئەوەی لەناوببرێن. كە ئامادەتان كرد ئینجا یەكسەر شێوازەكە ڕوون دەبێتەوە".

ڕۆژی دواتر بانگ كرام بۆ كۆبوونەوەیەكی ئەمنی لە MIC، لەوێ فەرمانەكە گۆڕدرا. ئێستا پێویستە هەموو بەڵگەنامە كاغەزییەكان سكان بكەین و فایلەكانی كۆمپیوتەر بگوازینەوە بۆ سەر سی دی، كە دەتوانرێت بە ئاسانی بشاردرێتەوە. پاشان بەڵگەنامە كاغەزیەكان و هارد دیسكەكانی كۆمپیوتەر كۆدەكرانەوە بۆ لەناوبردنی.

دەبێ سەددام پێشبینی ئەوەی كردبێت كە ئەمریكییەكان دەست بەسەر تەواوی وڵاتەكەدا دەگرن و بە فایلەكانی هەموو وەزارەتێكدا دەچنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا دیارە گەڕانەوەی بۆ دەسەڵات پێشبینی دەكرد. ئەگینا بۆ فەرمانی دروستكردنی سی دی؟ پرۆسەیەكی ئاژاوەگێڕانە بوو، كە گواستنەوەی فایلەكان بە شێوەیەكی هێندە هەڕەمەكی ئەنجام دەدرا كە ئەگەر سی دییەكانیش وەرگیرایەوە، بێ هیوایی بوو، چوون زۆر ناڕێك بوون.

ئەوەبوو سەددام ڕازی بوو بە لەناوبردنی مووشەكەكانی ئەلسەمود ٢ و ئەلفەتح كە مەودای ڕێگەپێدراویان تێپەڕاندبوو. لە سەرەتای مانگی ئازاردا، كرێكارانی عێراقی دەستیان كرد بە لەناوبردنی مووشەكەكان و ژوورەكانی كاستینگ كە بۆ بەرهەمهێنانیان بەكاردەهێنران. بەڕێوەبەرایەتی بەدواداچوونی نیشتیمانی نوسراوێكی دارشت و ئەو بانگەشەیەی پێشووتری دووپاتكردەوە كە عێراق كۆگاكانی خۆی لە مادەی كوشندەی دەماری ڤی ئێكس VX لەناوبردووە. بەڵام ئیدارەی بوش ئەم ئیمتیازانەی ڕەتكردەوە و بەوە ناوی برد كە كاتەكەی زۆر درەنگە بۆ ئەنجامدانی ئەم كارە.

پشكنەرانی ئەتۆمی درێژەیان بە ڕووپێوی تیشكدانەوەكانیان دا. كۆمپانیا بازرگانییەكان و ناوەندە پزیشكییەكان و دامەزراوە پیشەسازییەكانیان گەڕان، لەنێویاندا كۆمپانیای سەعد كە من بەڕێوەبەری گشتی بووم. لە ٧ی ئازاردا محەمەد بەرادعی بەڕێوەبەری گشتی ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی چووە بەردەم ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەكگرتووەكان بۆ ئەوەی كورتەیەك لە ئەنجامەكانی پشكنەرەكان تا ئەوكات بخاتەڕوو. وادیاربوو بە گفتوگۆ باش لێكۆڵینەوەكراوەكانمان قەناعەتی كردبوو، بەو ئەنجامە گەیشتن كە هیچ ئاماژەیەك نییە كە هەوڵەكانی عێراق بۆ هاوردەكردنی بۆری ئەلەمنیۆم یان بەرهەمهێنانی موگناتیسی پەیوەندی بە سەنتەرفیوجەكانەوە هەبێت. ئاماژەی بەوەشكرد، ئەو تۆمەتانەی باس لەوە دەكەن كە عێراق هەوڵی كڕینی یۆرانیۆمی لە ئەفریقا داوە، بێ بنەمان. هەروەها ڕایگەیاند كە پێویستە پشكنەران بەردەوام بن و داوای لە سەددام

کرد کە خێرایی هاوکارییەکان زیاتر بکات. داواکارییەکەی دووبارە کردەوە بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ زاناکانی عێراق لە دەرەوەی وڵات. بەڵام دوای سێ مانگ لە پشکنینی دەستێوەردانانە، وتی، ئاژانسی نێودەوڵەتی وزەی ئەتۆمی هیچ بەڵگە و ئاماژەیەکی جێی متمانەی بۆ زیندووکردنەوەی بەرنامەی چەکی ئەتۆمی نەدۆزیوەتەوە.

لە ماوەی هەفتەی دواتردا، بەهێزترین گەلانی جیهان بەردەوام بوون لە مشتومڕ لەسەر داگیرکردنی عێراق. ئەمریکا و بەریتانیا و ئیسپانیا پشتگیریان لە کردەوەی سەربازی دەکرد مەگەر ئەوەی سەددام بەڵگەی دەستبەجێی بدا کە چەکی کۆمەڵکوژی نییە. لە لایەکی دیکەوە فەرەنسا، ئەڵمانیا، ڕووسیا و چین باسیان لەوە دەکرد کە پێویستە کاتێکی زیاتر بدرێت بە پشکنەرەکان بۆ ئەنجامدانی کارەکانیان. تا ١٥ی ئازار، کاتێك ئەمریکا پێشنیارێکی وڵاتی شیلی بۆ پێدانی دوا دەرفەت بە سەددام ڕەتکردەوە، دۆسیەکە داخرا. ئیتر ساتەوەختی حەقیقەت گەیشتبوو.

لە ١٧ی ئازاردا سەرۆك بوش ئاگادارییەکی دەرکرد کە ئەگەر سەددام و کوڕەکانی لە ماوەی چل و هەشت کاتژمێردا عێراق بەجێ نەهێڵن ئەوا ڕووبەڕووی هێرشێکی سەربازی تەواو دەبنەوە. ئەوەبوو سەددام ڕەتی کردەوە. ڕۆژی دواتر نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر ئامۆژگاری حکومەتی ئەمریکا داوای لە پشکنەرانی چەك کرد کە عێراق چۆڵ بکەن. لە بەغدا مامۆستایانی قوتابخانەکان خوێندنیان هەڵوەشاندەوە. کچەکانم لە ماڵەوە مانەوە، ئەوان بە تەواوی ترسیان لێ نیشتبوو. دوکاندارەکان دەرگاکانیان

داخست و پەنجەرەکانیان تەختەبەند دەکرد. چاوەڕێی ئەوە بووین کە دۆزەخ لە ئاسمانەکانەوە بباریێت.

شەوی ١٩ی ئازار، فڕۆکە جەنگییەکانی ئەمریکا سێ باڵەخانەیان لە بەغدا بۆردومان کرد، لەنێویاندا چێشتخانەیەك کە وا بیردەکرایەوە سەددام خۆی لێ حەشاردابێت، ئەمەش بریتی بوو لە هەوڵێکی سەرنەکەوتوو بۆ تیرۆرکردنی بەرلەئەوەی جەنگ هەڵگیرسێت. ئەو هێرشە "شۆك و سەرسام"انەی کە بەدوایدا هاتبوون، بە شێوەیەکی ناتەواو ناویان لێنرا. دەبوو بە هێرشی "شۆك و تیرۆر" ناویان بنایە. هاواری بۆمبی هاتوو، درزی تەقینەوەی پەنجەرەکان، لەرزینی زەوی ترسێکی لە ئێمەدا دروست کرد کە ژیان لەگەڵ مووشەکەکانی داهاتوودا کۆتایی پێبێت. هەموو شەوێك دڵم لێیدەدا تا پێم وابوو کە لەپڕ خانووەکە دەتەقێتەوە لەکاتێکدا دوعام بۆ ڕزگارکردنی خێزانەکەمم دەکرد. ئاسۆ لە هەموو ئاراستەکاندا بە ئاگر دەدرەوشایەوە. شوێن پێ هەڵگرەکانی دژەفڕۆکە بە ئاسماندا بەرەو سەرەوە دەڕۆیشتن. ئاگادارکەرەوەی هێرشی ئاسمانی بە بەردەوام لێیدەدا. ئەگەر تەقینەوەکان دوور بوونایە، یەك دوو چرکە پێش ئەوەی شەپۆلی دەنگ و وزە بە جەستەماندا تێپەڕێت، تیشکی ڕووناکی تەقینەوەکەمان دەبینی.

بەیانیان کاتێك بە ئۆتۆمبێلەکەم دەڕۆیشتم بۆ بارەگای MICی خۆماڵی لە باخچەی ساوایان لە جومهوریە، هەوری دوکەڵی ڕەشی باڵەخانە سووتاوەکان و دوکەڵی ئاگری نەوت ئاسمانی تاریك کردبوو. بەرپرسانی MIC پابەند بوون بە خوو و خشتەی

کارەکانیانەوە، هەموو بەیانیەك کاتژمێر هەشت دەگەیشتن، ئەو وەهمەیان هەر لەلامابوو کە ئەو ڕووداوانە هەمووی کابوسێکە و تێدەپەڕێت. هەفتەیەك دوای دەستپێکردنی بۆردومانەکە، زریانێکی خۆڵ بە بایەکی هێزی گەرماوە هاتە ناو بەغدا و تیشکی خۆری کوژاندەوە. تەمێکی پرتەقاڵی تۆز تێکەڵ بە دوکەڵی تاریك و تەمی شەڕ، بینایی قورسکردبوو. دەمێکە گوتراوە کە حەقیقەت یەکەم قوربانی شەڕە و ئەمەش بە تایبەتی بۆ شاری بەغدا ڕاست بوو. ڕاپۆرتە هاوتەریبەکانی ململانێکان لەسەر زەوی و لە مانگی دەستکرد لە ماڵەوە پەرەی سەند. لە ٢٦ی ئازاردا کەناڵە هەواڵییە نێودەوڵەتییەکان بڵاویانکردەوە کە هێزەکانی ئەمریکا و بەریتانیا بەندەری ئوم قەسری عێراقیان گرتووە. وەزیری ڕاگەیاندنی سەددام، موحەممەد ئەلسەحاف، بانگەشەی ئەوەی کرد کە بەندەرەکە هێشتا بە سەلامەتی لە ژێر کۆنترۆڵی عێراقدایە. هەروەها ڕایگەیاند کە هێزەکانی عێراق هێرشی ئەمریکایان لە سنووری کوەیت بەرپەرچ داوەتەوە. لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا مووشەکەکان کەوتنە سەر تاوەری تەلەفزیۆنی بەغدا و پەخشی دەوڵەتییان کوژاندەوە. لە بارەگای کاتی MIC، بەرپرسان لەسەر هێڵی حزبی خۆیان هێشتەوە کە عێراق لە بەربەستی سەرکەوتنێکی گەورەدایە. ئەو ئێوارەیە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیم لە هاوڕێیەکم لە شارۆچکەی ناسریە پێگەیشت، کەمێك پێش ئەوەی بۆمبەکانی ئەمریکا خزمەتگوزاری تەلەفۆن لە سەرانسەری وڵاتدا ببڕن.

"من لە پەنجەرەکەمەوە سەیری دەرەوە دەکەم، و تانکی

ئەمریکی لەسەر شەقامەکە وەستاوە لەبەردەم ماڵەکەم!" بە بەپەلە ئەمەی وت. "بەڵام من پێم وابوو ئەمریکییەکان هێشتا لەسەر سنوور شەڕ دەکەن."

گوتم: دەزانم.

ئەوە بوو بۆ ساتێك ترسم لەبیرکرد کە تەلەفۆنەکە لەژێر سیخوڕی دایە و وتم: "من لە ڕێگەی سەتەلایتەوە سەیری هەواڵەکان دەکەم."

کاتێك بۆ ڕۆژی دواتر ئەم پەیوەندییە تەلەفۆنییەم بۆ بەرپرسێکی MIC گێڕایەوە، ئەو بە گەمژەییەوە وتی کە هاوڕێکەم دەبێت مەحکوم بکرێت بەهۆی درۆ و خیانەتەکەیەوە. بەڵام دەمتوانی ئەوە بەدی بکەم کە ئەویش ڕاست ناکات؛ و دەمبینی دووڕوویی لە چاوەکانیدا بوو. بەڵام نەیدەتوانی ئەوە بە ئاشکرا دەرببڕێت کە چاوەکانی دەیانگوت.

شەڕی پڕوپاگەندەیی لە هەردوولا بە تەواوی لە ئارادا بوو. چەند ڕۆژێك دوای دەستپێکردنی داگیرکارییەکە، زریانێکی سپی کە بریتیی بوو لە نامیلکەی کاغەز لە ئاسمانەکانی سەرووی ماڵەکەمانەوە فڕێدرانە خوارەوە. ئەو نامیلکانە لەسەر زەویدا دەسوڕانەوە، بەهۆی هەڵکردن و لێدانی (با) وە. نامیلکەکان لە تەك پەرژینەکانی نیشتەجێبوون و لەنزیك بێستانەکان دا گیریان دەخوارد. دوو دانەیان لە باخچەکەمدا نیشتنەوە. بە عەرەبییەکی بێ کەم و کوڕی نووسرابوون.

یەکێك لە نامیلکەکان وێنەی خێزانێکی ئاسایی عێراقی لە

لایه‌ك و له لایه‌كی دیكه‌وه یه‌كێك له ئه‌فسه‌ره باڵاكانی سه‌ددامی پیشان ده‌دا، له‌گه‌ڵ نووسینێك كه نووسرابوو: "كێ زیاتر پێویستی به ئێوه‌یه، خێزانه‌كانتان یان ڕژێمه‌كه؟ بڕۆنه‌وه بۆ ماڵه‌كانتان و لای خێزانه‌كانتان!" نامیلكه‌كه‌ی تر په‌یامێكی نامۆی له‌سه‌ر بوو. تێیدا هاتبوو، "عێراق: ئێمه ده‌توانین هه‌موو شتێك ببینین. بۆیه چه‌كی ئه‌تۆمی و بایۆلۆژی و كیمیایی به‌كارمه‌هێنن".

یه‌كێك له كۆتا فه‌رمانه‌كان كه له‌لایه‌ن ڕژێمی سه‌ددامه‌وه پێمگه‌یشت، بریتی بوو له پشكنینی ئینفۆنتۆری به‌نزینی MIC له تاجی كه نزیكه‌ی پانزه میل له باكووری به‌غداوه دووره. دره‌نگانی به‌یانی له‌گه‌ڵ یاریده‌ده‌ری به‌ڕێوه‌به‌ری دامه‌زراوه‌ی ئه‌ندازیاری FAO به‌ڕێكه‌وتم. شه‌قامه‌كان به شێوه‌یه‌كی بێزاركه‌ر وێرانه بوون و هه‌ر كه گه‌یشتینه ده‌وروبه‌ری به‌غدا، ئۆتۆمبێلی ئێمه تاكه ئۆتۆمبێل بوو له‌سه‌ر ڕێگاكه. ده‌نگی زه‌نگی ئاگاداركه‌ره‌وه‌ی هێرشی ئاسمانی له پشتمانه‌وه كاڵ بووه‌وه و به ئاسته‌م ده‌گه‌یشت. ئێمه به خێرایی به‌ره‌و باكوور به ڕێگای خێرا به‌ره‌و تكریت ڕۆیشتین، ترساین له‌وه‌ی له ڕێگای كراوه‌دا ئۆتۆمبێله‌كه‌مان له‌لایه‌ن فڕۆكه ئه‌مریكییه‌كانی سه‌ره‌وه بكرێته ئامانج.

نزیكه‌ی نیو میل له كۆگای به‌نزینه‌كه‌وه دووربووین، به كۆمه‌ڵگه‌یه‌كی ئاڵوگۆڕی ته‌له‌فۆندا تێپه‌ڕین. دیواره‌كانی ده‌وری به كونی بۆمب هه‌ڵزرا بوون. هێشتا دوكه‌ڵ له داروپه‌ردووی ناوه‌وه‌یدا به‌رز ده‌بووه‌وه. ئێمه خۆمان كێشایه ناو كۆگاكه و بینیمان كه نزیكه‌ی پانزه له هاوڵاتی سڤیلی شارۆچكه‌كه -كه

تووشی شۆك بوون- له‌لایه‌ن پیاوه ئه‌منییه‌كانی سه‌ددامه‌وه ده‌ور درابوون و هه‌وڵیان ده‌دا تانكه به‌نزینه گه‌وره‌كان به كیسه‌ی گه‌وره‌ی خۆڵه داپۆشن وه‌ك هه‌وڵێك بۆ ئه‌وه‌ی له هێرشه ئاسمانییه‌كان بیانشارنه‌وه. ئه‌م بیرۆكه‌یه سه‌رسوڕهێنه‌رانه بێ هیواكه‌ر بوو. لانی كه‌م سه‌د پیاوی ده‌ویست. ڕیزێك له شانزه تانكی سپی، سێ مه‌تر پان و پانزه مه‌تر درێژ و سه‌دان هه‌زار گالۆن به‌نزین له ناوه‌وه! له كاتێكدا كه هه‌وڵیان ده‌دا بۆ پڕكردنه‌وه‌ی كیسی خۆڵ له‌و زه‌وییه‌ی كه شۆفڵه‌كان هه‌ڵیان كه‌ندبوو، چاوه‌كانیان پڕ بوون له ترس. ئه‌وان ده‌یانزانی ئه‌گه‌ر بۆمبێك به‌ر تانكه‌كان بكه‌وێت ئه‌وا ده‌ستبه‌جێ له‌نێو زریانێكی ئاگریندا ده‌بنه خه‌ڵووز. خۆزگه ده‌متوانی ده‌سه‌ڵاتیان پێ بده‌م پۆسته‌كانیان به‌جێبهێڵن و بچنه‌وه ماڵه‌وه بۆ لای خێزانه‌كانیان، به‌ڵام نه‌متوانی. چوون وڵات هێشتا عێراقی سه‌ددام بوو.

به فه‌رمان له‌گه‌ڵ زه‌ید گه‌ڕامه‌وه بۆ ئه‌وه‌ی دوای دوو ڕۆژ ئه‌نجامیان بزانم. هه‌مان پانزه كرێكار له شوێنی ڕووداوه‌كه بوون، هێشتا له بۆردومانكردن ده‌ترسان به‌ڵام له‌وه‌ش زیاتر له تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه له‌لایه‌ن هێزه ئه‌منییه‌كانه‌وه ده‌ترسان ئه‌گه‌ر ده‌ركه‌وت كه وازیان له كاره‌كه‌یان هێناوه. له شانزه تانكییه‌كه ته‌نیا دوو تانكییان به كیسی خۆڵ داپۆشیبوو. من و زه‌ید به‌په‌له ئه‌و دیمه‌نه مه‌ترسیداره‌مان به‌جێهێشت. له‌كاتێكدا به ئۆتۆمبێله‌كه‌مان ڕۆیشتین، دوعایه‌كم بۆ سه‌لامه‌تی ئه‌و پیاوانه كرد.

به ئۆتۆمبێله‌كه‌مان به به‌غداوه ڕۆیشتین بۆ باشووری گه‌ڕه‌كی زه‌عفه‌رانییه، كه من له‌وێ گه‌وره ببووم، بۆ ئه‌وه‌ی پشكنین بۆ

ئەندازیارێكی گروپی بەشی كارەبای كۆمپانیای سەعد بكەین، كە لە تەنیشت یەكێك لە دامەزراوەكانیان ساتریان دروست كردبوو. حەشارگەیێكیان وەك ئەو حەشارگەی بارەگای باخچەی ساوایان دروست كردبوو، كە كۆنتێنەرێكی كەشتیوانی نیوەی لە زەویدا نێژرابوو. ئەندازیارەكان لەناوەوە كۆبوونەوە، فەرمانی ئەوەیان پێدرابوو كە پۆستەكەیان بەجێنەهێڵن، چاوەڕێی مردن بوون. ئەوان دەیانگوت موشەكی دژەـفڕۆكە لە نزیكەوە دانراوە، لەناو باخەكانی پرتەقاڵدا شاراوەتەوە كە بە میوە قورسەكان شۆڕبوونەتەوە. لە دوورەوە گوێمان لە دەنگی گوللەی تۆپخانە بوو. ئەمریكییەكان نزیك دەبوونەوە. زۆری نەخایاند لە دەروازەكانی بەغدا دەبوون، پاشان چوونە ناو شارەكەوە، من و خێزانەكەم بەزەحمەت ڕزگارمان بوو.

# به‌شی ده‌یه‌م
# ده‌فری كاتكۆ[1]

هه‌فته‌یه‌ك به‌سه‌ر داگیركاری ئه‌مریكادا تێپه‌ڕیبوو، هه‌ر زوو دوای ئه‌وه‌ی كاپتن باتله‌ر و ئه‌ندازیاره‌كانی موشه‌كه‌ ئه‌مریكییه‌كه‌یان له‌ سه‌ره‌ ڕه‌فه‌ وێرانبووه‌كان هه‌ڵوه‌شانده‌وه‌ و بردیان، گه‌ڕامه‌وه‌ بۆ ئه‌وه‌ی سه‌یری ئه‌و شوێنه‌ بكه‌م كه‌ مووشه‌كه‌كه‌ بۆی هاتبوو و له‌وێدا كه‌وتبووه‌ خواره‌وه‌، كه‌ چه‌ند پێیه‌ك له‌ شوێنی كچه‌كانمه‌وه‌ دووربوو. واته‌ ژووری نووستن. ڕه‌فه‌ كانزاییه‌ دارماوه‌كه‌ شێوه‌ی لووله‌ی مووشه‌كه‌كه‌ی پاراستبوو، منیش ته‌واو ترسابووم به‌تایبه‌ت كاتێك بیرم له‌وه‌ ده‌كرده‌وه‌ كه‌ چۆن سێبه‌ری مردن چه‌ند جارێك له‌ شه‌ڕی به‌غدادا خه‌ریك بووه‌ به‌سه‌ر خێزانه‌كه‌مدا بكه‌وێت. به‌سه‌ر هه‌ست و سۆزدا زاڵ بووم، ئه‌وه‌بوو به‌ بێده‌نگی دوعایه‌كی سوپاسگوزاریم بۆ خودا كرد كه‌ به‌زه‌یی پێمان هاتۆته‌وه‌.

خۆر له‌ ئه‌ژنۆی ده‌دام و كاتێكیش هه‌ستامه‌وه‌ بۆ چه‌ند ساتێك هه‌ستم سه‌ر سوڕان و گێژبوونێك كرد. ئه‌وه‌بوو به‌ره‌و دامێنی نیلۆفه‌ره‌كه‌ ڕۆیشتم. خه‌ریك بوو بڕیارێك بده‌م كه‌ كاریگه‌ری

---

[1] The Time Capsule كه‌پسولی كات یان ده‌فری كاتكۆ بریتیه‌ له‌ ده‌فرێك یان لوله‌كێك كه‌ كۆمه‌ڵێك شتی تێدا هه‌ڵده‌گیرێت و یان حه‌شار ده‌درێت وه‌یان هه‌ڵده‌گیرێت تاوه‌كو كه‌سانێك له‌ داهاتوو بیدۆزنه‌وه‌، وه‌یان زۆرجاران ئه‌و كه‌سه‌ی ئه‌و كاره‌ ده‌كات خۆی كه‌سێك دیاری ده‌كات كه‌ له‌ داهاتوو ئه‌م ده‌فره‌ بكاته‌وه‌. بۆنموونه‌، باوكێك ده‌فرێكی له‌مجۆره‌ بۆ چه‌ندین نه‌وه‌ی داهاتوو هه‌ڵده‌گرێت .

لەسەر ژیانی من و خێزانەكەم هەبێت بە شێوەیەك كە نەمدەتوانی پێشبینی بكەم. لە ژیانمدا بە چەندین تاقیكردنەوەدا تێپەڕیبووم، بەڵام پێشبینی ئەوەم دەكرد كە مامەڵەكردن لەگەڵ ئەو بۆمبە كاتییەی كە لە ژێر پێیەكانمدایە، تاقیكردنەوەیەكی زۆر قورس دەبێت. سەیری ئەو پارچە زەوییە بێ زیانەم كرد كە لەژێر پێیەكانمدا بوو و هەوڵمدا پتر لە دۆخەكە تێبگەم.

زۆر كەس هەبوون كە حەزیان دەكرد دەستیان بە نهێنییەكانی سەنتەرفیوج بگات. ئێستا كابرای ستەمكار لە پۆستەكەی دوور خرابووەوە، بەڵام ئەوانەی لایەنگری ستەمكاری بوون، هێشتا لە عێراقدا خەریكی خۆدزینەوە بوون، لە باڵەكاندا چاوەڕێیان دەكرد، لە هەر شوێنێك كە دەیانتوانی دەسەڵاتی خۆیان بەكاردەهێنا. ئەگەر سەددام، كوڕەكانی، یان دڵسۆزەكانی ئەو بەڵگەنامانەیان بویستایە، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەهاتنە سەرم. زانستی سەنتەرفیوج بۆ هەر كەسێك كە ئارەزووی دروستكردنی بۆمبی ئەتۆمی یان فرۆشتنی نهێنییەكانی لە بازاڕی ڕەشدا هەبوو، بەنرخ بوو. چی ڕوویدەدا ئەگەر بریكارەكانی وڵاتێكی بێگانە یان گروپێكی تیرۆریستی سەردانێكیان بكردبام و بە زۆر منیان هێنابایە سەر ئەوەی كە دەبێت نهێنییەكان هەڵڕێژم؟ چوون ئەوان ڕەنگە تەماحی ئەو كەرەستانە بكەن كە لە ژێر نیلۆفەرەكەدا نێژرابوون. تەنانەت ڕەنگە ناچارم بكەن كە هاوكاریان بكەم لە بەرنامەیەكی نهێنی سەنتەرفیوج لە وڵاتێكی بیانیدا، وەك چۆن سۆڤیەتەكان لە كۆتایی جەنگی جیهانی دووەمدا لەگەڵ گێرنۆت زیپ ئەم كارەیان كرد. ئەگەرچی هەوڵمدا قەناعەت بە خۆم بێنم بەوەی ئەمانە تەنها بیركردنەوەیەكی شێتانە و خەیاڵین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ترسەكە هەر بەردەوام بوو.

من خه‌یاڵی ئه‌وه‌م ده‌كرد كه ئه‌مریكییه‌كانیش حه‌ز ده‌كه‌ن حه‌شارگه‌ی سه‌نته‌رفیوجه‌كه‌م ببینن. ئێستا كه داگیركاری له هه‌موو گۆشه‌كانی عێراقدا بڵاوبووه‌وه، سه‌ربازانی ئه‌مریكی وه‌ك ڕاوكردن به‌دوای چه‌كی كۆمه‌ڵكوژ و كه‌سایه‌تییه پێشه‌نگه‌كانی حكومه‌تی سه‌ددام ده‌گه‌ڕان. ئه‌گه‌ر من له لیستی ڕه‌شدا بوومایه، دۆخه سه‌خته‌كه‌م هێنده‌ی تر تاریكتر ده‌بوو. ده‌نگۆی ئه‌وه به‌ده‌وری به‌غدادا بڵاوببوویه‌وه كه ئه‌مریكییه‌كان لیستی "كۆمه‌ڵێك كارت"یان بۆ ئه‌و په‌نجا و پێنج عێراقییه داڕشتووه كه زۆرترین داواكارییان هه‌یه بۆ ده‌ستگیركردن. جا ئه‌وه‌بوو له ڕۆژانی سه‌ره‌تادا، نه‌مانده‌زانی كه ئاخۆ وێنه‌ی كێ له‌سه‌ر ئه‌و كارتانه‌یه. ترسم هه‌بوو له‌وانه‌یه منیشی تێدابێت. چوون هه‌ر له‌و كاتانه‌دا بوو كه ئه‌مریكییه‌كان هه‌ندێك له به‌ڕێوه‌به‌ره‌كانی پێشوومیان ده‌ستگیر كرد.

بژارده‌كانمم خسته تای ته‌رازووه‌وه و سه‌نگم كردن. ده‌متوانی دیزاین و پێكهاته‌كانی سه‌نته‌رفیوجه‌كان به‌جێبهێڵم كه له باخچه‌كه‌مدا نێژراون و هیچ شتێك ده‌رباره‌یان به كه‌س نه‌ڵێم. تا قوسه‌ی سه‌ددام یان یه‌كێك له كه‌سانی متمانه‌پێكراو شتێك ده‌ڵێت، چونكه جگه له‌وانه هه‌رگیز كه‌سی تر هیچ ده‌رباره‌ی بوونیان نه‌ده‌زانی. هه‌وڵمدا ده‌رئه‌نجامه‌كانی داهاتووی دووری عێراق له خه‌یاڵمدا وێنا بكه‌م. ڕابردوو مێشكی منی به په‌نجه‌یه‌كه‌وه گرتبوو. خه‌ونی من له گه‌نجیدا ئه‌وه بوو وڵاتی خۆشه‌ویستم ببینم كه چرۆ ده‌كات. به‌ڵام سته‌مكاری و ته‌ماحه‌كانی منی شێواند و له‌باری بردن، چوون سه‌ددام ناچاری كردم كه زانیاری و تواناكانم بۆ مه‌به‌ستی شه‌ڕانگێزی خۆی به‌كاربهێنم. كه‌س نه‌یده‌توانی به‌ڵێن بدات كه ڕابردوو خۆی دووباره ناكاته‌وه و عێراق ڕۆژێك له

ڕۆژان لە لایەن دیکتاتۆریکی ترەوە حوکمڕانی ناکرێت کە ئامادەبێت بۆمب دروست بکات بەوەی کە بتوانێت مرۆڤایەتی لەناو ببات. هیچ گەرەنتییەك نەبوو کە جارێکی تر ناچار نەبم نهێنییەکانم دەربهێنم و جارێکی تر بەکاریان بێنمەوە.

ئەگەر بەڵگەنامەکان و پێکهاتەکانیان هەڵدایەوە، ئەوا دەتوانم هەوڵبدەم بە پارەیەکی زۆر بیانفرۆشم. بەڵام سزاکە قورستر دەبێت ئەگەر بگیرێم و بیرۆکەی هاوکاریکردنی بەرنامەیەکی ئەتۆمی شاراوەی دیکەش بۆ من ناخۆش بوو. تاکە بژاردەی تر کە مابووەوە ئەوە بوو کە بدرێت بە ئەمریکییەکان. لە قووڵایی ناخەوە تامەزرۆی ئەوە بووم ڕاستییەکان دەربارەی ئەو توانایانەی کە لە بەرنامەی سەنتەرفیوجی عێراقدا ماونەتەوە ئاشکرا بکەم و دواجار خۆم لەم بەرپرسیارێتییە ڕزگار بکەم.

بەڵام بە نزیکبوونەوە لە ئەمریکییەکان هەمیشە کۆنترۆڵی چارەنووسی خۆم بە تەواوی لەدەست دەدا. هیچ ڕێگەیەك نەبوو بۆ ئەوەی بزانم کە ئەوان چۆن مامەڵە لەگەڵ یەکێك لە زانایانی پێشووی چەکی بایەلۆژی عێراق دەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا من هێشتا بەڵگەم لە دەستدا بوو، بۆیە ترسم هەبوو زیندانیم بکەن. چوون ئەوان تازە شەڕێکیان بەئەنجام گەیاندبوو بۆ دۆزینەوەی ئەو چەکە کۆمەڵکوژانەی کە گوایە عێراق دروستی کردوون وەیان پەرەی پێداون. لەوانەبوو من وەك تاوانبارێك لە لێکۆڵینەوەکانیاندا ببینن. دەرئەنجامێکی دیکەی نزیکبوونەوە لێیان بە ئەگەرێکی زۆرەوە کوشندەتر بوو. لەلایەکی تر ترسم لەو هێزانە هەبوو کە هێشتا دڵسۆزی سەددام و کوڕەکانی بوون. بە دڵنیاییەوە سەددام تۆڕێکی زۆر و چڕو پڕی ڕێکخراوی لە شوێنکەوتوانی هەبوو کە هێشتا لە شەقامەکاندا بوون. ئەگەر بۆیان دەربکەوێت کە من خۆبەخشانە

دوا نهێنی ئەتۆمی ئەوم ڕادەست كردووە، ئەوا من و خێزانەكەم بە ئاسانی دەبینە ئامانجی تۆڵەسەندنەوەیان. ئەمانە بكوژانی ڕاهێنراو بوون كە هیچ سڵیان لە كوشتنی خەڵكی مەدەنی نەدەكردەوە. پرسیاری من ئەوەبوو كە چۆن ئەمریكییەكان لەم حاڵەتەدا گەرەنتی سەلامەتی من بكەن؟

ژن و منداڵەكانم لە ماڵی ئیسرای كچە گەورەكەمەوە هێنایەوە ماڵەوەی خۆمان. دوای ئەوەی جارێكی تر گەڕاینەوە بۆ ماڵەوەمان، ئینجا بۆ لەیلا و زەیدم ئاشكرا كرد كە لە باخچەكەماندا كۆمەڵێك زانیاری گرنگ سەبارەت بە سەنتەرفیوج نێژراون. من بۆ ئەوانم ڕوون كردەوە كە ئەم هەموو ساڵە لە ترسی سەلامەتییان ئەم زانیارییەم پێ نەگووتون و ئەوانیش بە خێرایی لە قورسایی بابەتەكە تێگەیشتن.

هەر زوو دوای ڕووخانی بەغدا، پەخشێكی ڕادیۆیی ئەمریكی داوای كرد هەموو زانایانی چەكی جۆری كۆمەڵكوژ خۆیان ڕادەست بكەن، بەڵام نەیگوت لە كوێ و بە كێ. دەنگۆی ئەوەم بیستبوو كە هەزار یان زیاتر لێكۆڵەری چەك بە سپۆنسەری ئەمریكا دێنە عێراق بۆ ئەوەی هەوڵی چەسپاندنی بانگەشەكانی پێش جەنگ بدەن. بەڵام لانیكەم چەند هەفتەیەك مابوو. هەموو خزمەتگوزاری تەلەفۆنی پچڕا، بۆیە زەیدم نارد تا داوا لە بەرپرسانی پێشووی بەشەكانم دكتۆر عادل و دكتۆر فارس بكەن بێنە ماڵەكەم تا بتوانین باسی باشترین ڕێگای نزیكبوونەوە لە ئەمریكییەكان بكەین. لە باخچەكەم دانیشتین و هەوڵمان دەدا پێشبینی ئەوە بكەین كە چۆن مامەڵەمان لەگەڵ دەكەن.

دكتۆر فارس پرسیاری كرد: پێت وایە كە دەمانگرن و زیندانمان دەكەن؟

بەجۆرێك كە هەوڵمدا بێ متمانەیی خۆم بشارمەوە، گوتم: "نا، ئەوە مانای نییە كە ئەوان ئێمە بگرن".

ئەو قسانەی من تەنها پێشبینی بوون. دواجار ئێمە لەسەر ئەوە كۆك بووین كە یەكێك لە ئێمە وەك نێردراوێك لە ئەمریكییەكان نزیك بێتەوە، ئەمەش بێ هیوایان دەكات لە ڕاگرتنی زانایەك و ترساندنی ئەوانی دیكە بۆ شاردنەوە. ڕۆژی دواتر دكتۆر فارس چووە كۆشكی كۆماری، كە ناوەندی دەسەڵاتی پێشووی سەددام بوو و سوپای ئەمریكا بارەگای سەرەكی خۆی تێدا دانابوو. درەنگانی پاشنیوەڕۆ گەڕایەوە ماڵەكەم و وتی بەرپرسی سوپای ئەمریكا پێی وتبوو كە بچێتەوە ماڵەوە كاتێك لێكۆڵەرە ئەمریكییەكان ئامادە دەبن، ئەوكات خۆیان دێن و دەیدۆزنەوە.

من: ئایا ئەوە هەمووی بوو؟

ئەو: پرسیاریان لێكردم كە ئایا من شوێنی سەددام دەزانم، یان شوێنی چەكی كۆمەڵكوژ دەزانم؟

دكتۆر فارس و دكتۆر عادل هیچ زانیارییەكی نوێیان نەبوو سەبارەت بە بەرنامەی ئەتۆمی بیدەن و لێرەشدا ڕێگاكانمان لێك جیابوونەوە. دوای ئەوەی دكتۆر فارس ڕۆیشت، هەستم كرد پێویستە ڕێبازێكی چالاكتر بگرمەبەر. بەڵام بەغدا لە دۆخێكی پشێوی تەواودا بوو. تەقینەوەی بەردەوام هەبوو كە دەمارەكانمانی دەلەرزاند. ترس حوكمڕانی شەقامەكانی دەكرد. كەسانی پابەندی یاسا زیاتر لە ماڵەكانیان دەمانەوە. لێخوڕینی ئۆتۆمبێل لەنێو شاردا

مەترسیداربوو. تاوانە هەڕەمەکییەکان بێ سزا بوون، کەسیش دوای تاریکی ئێوارە نەدەچووە دەرەوە. لە غیابی تەواوەتی یاسا و ڕێسادا، پرسیارم دەکرد کە ڕەنگە چ هێزێك، ناوخۆیی یان دەرەکی، بە دوای ئەجێندای خۆیاندا بەناو شاردا بگەڕێن.

بابەتەکەی واشنتۆن پۆستم خوێندەوە کە لە ئینتەرنێتەوە دامبەزاندبوو، کە ناوی منی وەك یەکێك لەو زانایانەی عێراقی کە پشکنەرەکان زۆرترین جار ویستوویانە چاوپێکەوتنیان لە دەرەوەی عێراق و لە پێش جەنگ ئەنجام بدرێت. لە بابەتەکەدا قسەی پشکنەرێکی پێشووی بە ناوی دەیڤید ئۆلبرایت هاتبوو کە بنکەکەی لە واشنتۆن بووە. دوای لادانی حوسەین کامل لە ساڵی ۱۹۹۵ چەند جارێك ئۆلبرایتم ناسیبوو، بە بیرمدا هاتبوو هەوڵبدەم پەیوەندی پێوە بکەم. کەسێکی وەك ئەو لە گرنگی ئەو شتانە تێدەگات کە لە لای منن و هەروەها پێموابوو سروشتێکی زۆر تەکنیکییە بۆ سەربازە ئەمریکییەکان کە بەدوای چەکی ڕاستەقینە دەگەڕان. لەبەر ئەوەی لە واشنتۆن بوو، پێم وابوو دەتوانێت مەبەستی حکومەتی ئەمریکا بەرامبەر بە زاناکان هەڵبسەنگێنێت و ڕەنگە ئامۆژگارییەکیانیشی زۆر پێویست بن. کێشەکە ئەوە بوو کە ژمارەی تەلەفۆنی ئۆلبرایتم نەبوو و وە تەنانەت ئەگەر هەشبێت، هیچ خزمەتگوزارییەکی تەلەفۆن لە عێراقدا نەبوو. ئێمە بە تەواوی لە دونیا دابڕابووین.

من و زەید بە ئۆتۆمبێل بەنێو شاردا ڕۆیشتین بۆ هۆتێل فەلەستین، کە فەیلەقی ڕۆژنامەوانی نێودەوڵەتی و هەندێك لە ئەفسەرانی حکومەتی ئەمریکا لەوێ بوون. هێزی دەریایی ئەمریکا بە تەلی دڕکاوی دەوری هۆتێلەکەیان گەمارۆدابوو. لەناو بەربەستەکەدا چەندین تانك و دەیان سەرباز پارێزگاریان لەو

بیانیانە دەکرد کە لە هۆتێل فەلەستین و هۆتێل شیراتۆنی تەنیشتی مابوونەوە. تانکەکان ڕوویان لە گۆڕەپانی فیردەوس بوو، کە پاشماوەی پەیکەری سەددام لە دامێنی پایەی سەددامدا کەوتبوو. خۆپیشاندانێکی گەورە لە ئارادا بوو. هەزاران عێراقی لە دەرەوەی گەمارۆی تەلی دڕکاوی کۆبوونەوە. من و زەید وەستاین و بەناو لێواری دەرەوەی قەرەباڵغیەکەدا جووڵەمان کرد بۆ ئەوەی لە نزیکەوە سەیر بکەین. خۆمان لەناو کۆمەڵێکدا بینیەوە کە لەلایەن مزگەوتێکەوە لە یەکێك لە ناوچە هەژارەکانی بەغدا ڕێکخرابوو. ئەوان داوای ئازادکردنی دوو پیاوی ئایینیان دەکرد کە پێشتر لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە دەستگیرکرابوون. بەزمانی عەرەبی هوتافیان دەکێشا و دەیانگوت"بڕوخێ، بڕوخێ، ئەمریکا!"، "نا بۆ داگیرکاری!" لە دیوەکەی تری تەلە دڕکاویەکەدا، هێزەکانی دەریایی ئەمریکی بە گولـلە بەند و کڵاوەوە، پەنجەیان لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگەکە بوو. درکم بەوەدەکرد کە نە لە قسە و نە لە مەبەستی خۆپیشاندەران تێناگەن. بەناو خەڵکەکەدا بە پەلە ڕۆیشتم تا گەیشتمە کۆتایی حەشاماتەکە، لەوێ هەوڵمدا سەرنجی یەکێك لە هێزەکانی دەریایی ڕابکێشم.

هاوارم کرد: هەوڵ دەدەم بچمە ناو هۆتێلەکەوە. وتی: کەس بەبێ پرس بۆی نییە بچێتە ژوورەوە.

گوتم: من یەکێکم لە زاناکان. "لە ڕادیۆ ئاگاداری کرا و دەیگوت پێویستە خۆمان ڕادەست بکەین."

حەشاماتەکە بە دەنگی بەرزتر هاواریان دەکرد و خەریك بوو گوێچکەکان کەڕبن لە ئاستیان و کابرای هێزی دەریاوانیش تووڕەتر دەردەکەوت:

"تۆ لێره ناچیته ژووره‌وه!" ئه‌و هاواری كرد. "چت له من ده‌وێت كه بیكه‌م؟ ده‌ته‌وێت قۆڵبه‌ستت بكه‌م و بتبه‌م بۆ زیندان؟"
من و زه‌ید پاشه‌كشه‌مان كرد بۆ گۆشه‌ی شه‌قامێك، له نێوان خۆپیشانده‌ران و گۆڕه‌پانی فیرده‌وس، بۆ ئه‌وه‌ی سه‌یری رووبه‌ڕووبوونه‌وه‌كه بكه‌ین. وا دیار بوو هیچ ڕێگه‌یه‌ك نه‌بوو بۆ ئه‌وه‌ی بچینه ناو هۆتێله‌كه‌وه. پاشان له ناوه‌ڕاستی ئه‌و شه‌ڕه‌دا، ژنێكی شۆخم بینی كه دوو كامێرای به‌سه‌ر شانیدا هه‌ڵدابوو، پیاوێك —كه ڕوخساری له‌عێراقی ده‌كرد- یاوه‌ری بوو و پێم وابوو كه وه‌رگێڕه‌كه‌یه‌تی. لێی نزیك بوومه‌وه و به ئینگلیزی قسه‌م كرد.

- ببوره تۆ ڕۆژنامه‌نووسیت؟

وه‌ستا و سه‌یریكی كردم، سه‌رنجی ئه‌وه‌ی دا كه من پاڵتۆیه‌ك و بۆینباغم پۆشیوه كه ئه‌مه‌ش له ته‌واوی حه‌شاماته‌كه جویێم ده‌كاته‌وه.

گوتم: من دكتۆر مه‌هدی عوبێدیم، یه‌كێك له زانایانی ئه‌تۆمی سه‌ددام. "پێم خۆشه له‌گه‌ڵ ڕۆژنامه‌نووسێك قسه بكه‌م."

ئافره‌ته‌كه خۆی ناساند و گوتی ناوم مۆلییه. ئه‌وه‌بوو منیش بابه‌ته‌كه‌ی واشنتۆن پۆستم پیشانی دا، بۆ ئه‌وه‌ی بزانێت من كێم. وتی له‌گه‌ڵ هاوكارێكم له ناو هۆتێلی فه‌له‌ستین په‌یوه‌ندیم پێوه ده‌كات. له گۆشه‌ی شه‌قامێكدا چاوه‌ڕێ بووم، تا هاوكاره‌كه‌ی هاته ده‌ره‌وه. ئه‌وه‌بوو من و زه‌یدی به‌ناو گه‌مارۆی هۆتێله‌كه‌دا هێنایه ناوه‌وه و به سه‌ربازه ئه‌مریكییه تووڕه‌كانی گوت كه ئێمه وه‌رگێڕ و شۆفێری ئه‌وین. دوای گفتوگۆیه‌كی كورت، ڕازی بوو یارمه‌تیم بدات بۆ دۆزینه‌وه‌ی شوێنی ئۆلبرایت. له باڵكۆنی سویتی هۆتێله‌كه‌ی وه‌ستاین كه ڕووی له خۆپیشاندانه گه‌وره‌كه و

سه‌ربازه ئه‌مریكییه تووڕه‌كانی خواره‌وه بوو، و باسمان له‌وه كرد كه ئایا ئه‌مریكییه‌كان ده‌زانن خۆیان خستۆته ناو چ دۆخێكه‌وه!

ڕۆژی دواتر ڕۆژنامه‌نووس مۆبایله‌كه‌ی كه به مانگی ده‌ستكرده‌وه به‌سترابوویه‌وه هێنایه ماڵه‌كه‌م و وتی ئۆلبرایت چاوه‌ڕێی په‌یوه‌ندییه‌كه‌ی منه. له‌سه‌ر كورسی پلاستیكی له‌نێو باخه‌كه دانیشتین، په‌یوه‌ندیم به واشنتۆنه‌وه ده‌كرد.

ئۆلبرایت: "ماوه‌یه‌كی زۆره قسه‌مان نه‌كردووه" ده‌نگی كاڵ ده‌بووه‌وه و ده‌هاته‌وه چونكه كاتێك سیگناڵه‌كه له مانگی ده‌ستكردێكه‌وه له ئاسمانه‌كاندا ده‌هات و دوای دواكه‌وتنێكی كورت ئینجا ده‌نگه‌كه ده‌گه‌یشت.

گوتم: به‌ڵێ حه‌وت ساڵ ده‌بێت ده‌یڤد.

ئۆلبرایت یه‌كسه‌ر چه‌ندین پرسیاری ته‌كنیكی كرد، ئه‌مه‌ش بووه هۆی ئه‌وه‌ی كه ئایا هیچ كارێكی سه‌نته‌رفیوج له‌م دوایانه‌دا هه‌بووه یان نا. ده‌بێ زانیبێتی كه من بۆ ئه‌وه په‌یوه‌ندی پێوه ده‌كه‌م بۆئه‌وه‌ی شتێك ئاشكرا بكه‌م.

گوتم: نه‌خێر، له ساڵی ١٩٩١ه‌وه كارمان له‌سه‌ر به‌رنامه‌ی سه‌نته‌رفیوج نه‌كردووه.

هه‌ناسه‌یه‌كی قووڵم هه‌ڵمژی. ته‌نانه‌ت به ئاماژه‌دان به سروشتی نهێنییه‌كانم، ده‌رگام بۆ ده‌رئه‌نجامه نادیاره‌كان ده‌كرده‌وه.

گوتم: ده‌یڤید شتێك هه‌یه كه ده‌مه‌وێت باسی بكه‌م كه تا ئێستا شاراوه‌ته‌وه.

هه‌ستم ده‌كرد له دووری هه‌زاران كیلۆمه‌تره‌وه ته‌واوی سه‌رنجی خۆی كۆكرده‌وه.

"به‌ڵێ؟" ئه‌و وتی. «ئه‌وه‌ چییه‌ و له‌ كوێ؟»

من ده‌ترسام زانیاری زۆر بده‌م به‌ یه‌كجاری. ئه‌گه‌ر كه‌سێك له‌ عێراق بزانێت كه‌ نهێنی ئه‌تۆمی له‌ باخچه‌كه‌مدا هه‌یه‌، له‌وانه‌یه‌ بۆم بێن. هه‌ناسه‌یه‌كی ترم هه‌ڵمژی و ده‌ستم پێكرد.

ئه‌و: "ده‌ته‌وێت باس له‌ به‌ڵگه‌نامه‌كان و پێكهاته‌كان بكه‌یت."، "ئایا ئه‌و به‌ڵگه‌نامانه‌ له‌وه‌و پێش نه‌بینراون؟".

گوتم: "به‌ڵێ ڕاسته‌. به‌ڵام پێش ئه‌وه‌ی هیچ شتێك بڵێم ده‌مه‌وێت گه‌ره‌نتی سه‌لامه‌تی خێزانه‌كه‌م ده‌سته‌به‌ر بكه‌م. لێره‌دا یاسا و ڕێسایه‌ك نییه‌. دۆخه‌كه‌ زۆر ناجێگیره‌. ترسم هه‌یه‌ كه‌ كه‌سانی مه‌ترسیدار هێرشمان بۆ بكه‌ن".

وا دیار بوو ئۆلبرایت له‌ سه‌ختی بارودۆخه‌كه‌ی من تێگه‌یشتبوو. ئامۆژگاری كردم كه‌ به‌ هیچ شتێكه‌وه‌ له‌ سه‌ربازانی ئه‌مریكا نزیك نه‌بمه‌وه‌.

وتی: ئاگاداربه‌ چی ده‌ڵێیت. "له‌وه‌ده‌چێت هێڵی ئه‌م مۆبایله‌ سه‌لامه‌ت نه‌بێت."

بیرم له‌وه‌ كردبووه‌وه‌. ئه‌مریكییه‌كان به‌ ئامێره‌ ئاڵۆزه‌كانیان، ده‌یانتوانی گوێ له‌ هه‌ر په‌یوه‌ندییه‌كی ته‌له‌فۆنی یان ڕادیۆیی له‌ عێراق بگرن. "خه‌ڵك هه‌موو بێ هیوا بوون له‌ دۆزینه‌وه‌ی به‌ڵگه‌ی چه‌ك. كه‌س هاتۆته‌ ماڵه‌كه‌ت؟"

گوتم: "هێشتا نا. -پێت وایه‌ له‌وانه‌یه‌ من ده‌ستبه‌سه‌ر بكه‌ن؟ ده‌مه‌وێت بزانرێت كه‌ من به‌ ته‌نیا، به‌ نیه‌تێكی باشه‌وه‌ دێمه‌ پێشه‌وه‌".

ئۆلبرایت ڕازی بوو په‌یوه‌ندی به‌ هه‌ندێك كه‌سه‌وه‌ بكات كه‌

دەیناسین و ڕێککەوتین کە ڕۆژی دواتر جارێکی تر بە مۆبایلی مانگی دەستکرد قسە بکەین.

چەند ڕۆژێك دواتر بینیم هەندێك لە کوڕانی گەڕەکەکەمان کاغەزێکیان دەخوێندەوە کە لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە دابەشکرابوو کە پەنجا و پێنج عێراقییە زۆر داواکراوەکەی لەسەر کارتەکان دیاری کردبوون. سەیری لاپەڕەکەم کرد لە سەرەوە بۆ خوارەوە. سەددام و کوڕەکانی لە پلەی یەکەمی لیستەکەدا بوون، دوای ئەویش ڕاوێژکارانی سەرۆکایەتی کۆمار، وەزیرەکانی حکومەت، کەسانی باڵای سەربازی و سەرۆکی پارتی بەعسی ناوچەیی. ئەمیر ڕەشید موحەممەد وەزیری نەوت -کە بانگهێشتی کردبووم بۆ ئەوەی پۆستێك لە وەزارەتی نەوت وەربگرم-. هەروەها عەبدولتەواب، کە تا دوو هەفتە پێشتر بەڕێوەبەرم بوو، سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی بەدواداچوونی نیشتمانی، حوسام موحەممەد ئەمین. هەروەها دکتۆر هومام عبدالخالق پێش چاوپێکەوتنەکەم لەگەڵ پێریکۆس لە ساڵی ١٩٩١دا ڕاهێنەرایەتی کردبووم. بەڵام لەهەمووی ئاسودەتر ئەوەبوو کە ناوم لە لیستەکەدا نەبوو.

لە ماوەی یەك دوو هەفتەی داهاتوودا، من و ئۆلبرایت نزیکەی هەموو ڕۆژان قسەمان دەکرد. داوای لێکردم ئارام بگرم. پاشان، لە درەنگانی پاشنیوەڕۆیەکی ناوەڕاستی مانگی ئایاردا، بەهۆی بە توند لەدەرگادان لە دەروازەی پێشەوەی ماڵەکەمان ڕاچڵەکام و سەرم سوڕما. زەید لە دەرەوە بوو، بۆیە بە لەیلا و کچەکانم گوت لە ناو ماڵەکەدا بمێننەوە و چوومە دەرەوە بزانم کێیە. کاتێك لە درزێکی بچووکی دەرگاکەوە سەیرم کرد، پیاوێکی باڵابەرز و

سمێڵدارم بینی کە شەرواڵێکی لەبەردابوو، لەو جۆرانەی کە لە باکووری عێراق لەبەر دەکرێن.

ئەو: "ئایا ئەمە ماڵی دکتۆر مەهدییە؟" بە لەهجەی کوردی پرسی.

من: "کێ پرسیار دەکات؟" گومانم بۆ دروست بوو چوون کەسێکی نامۆ هاتووە و پرسیار دەکات.

کوردەکە سەرەتا وەڵامی نەدایەوە، دەستی بە ڕوخساری داهێنا وەك ئەوەی بەدوای وەڵامێکدا بگەڕێت.

ئەو: "بەدوای پزیشکی ددانندا دەگەڕێم". لە دەرمانخانەکە پێیان وتم کە دکتۆری مەهدی لێرەیە.

ئەمە دیاربوو کە قسەیەك بوو مەبەستێکی دیکەی لەدواوە بوو، ڕوون بوو کە دەیوست بزانێت کە ئەمە بەتەواوی شوێنی نیشتەجێبوونی منە.

من: "ببورە، هیچ پزیشکی ددان و تەنانەت هەر هیچ پزیشکێك لەم کۆڵانە نییە، بۆیە پێویستە لە شوێنی تر بەدوای دا بگەڕێیت."

وەك ئەوەی کە قەناعەتی بە وەڵامەکەم کردبێت، وتی: زۆر سوپاس، ببوورە بێزارم کردی.

لەنێو گومان و دڵەڕاوکیدا دەرگاکەم داخست. ئەم پیاوە کێ بوو و کێ یان چ گروپێك لە پشت سەردانەکەیەوە بوون؟ هەرزوو خۆم دڵنیا کردەوە کە ئەمە چونکە کوردە ئەوا نابێت لەلایەن گرووپەکانی سەددامەوە نێردرابێت، بەڵام دەکرا پەیوەندی بە ئەمریکییەکانەوە هەبێت. بەڵام ئاخۆ مەبەستی چی بووبێت لەوەی کە بەجۆرێك قسەی کرد و لەپشت دەستەواژەکەیەوە مانایەکی

حه‌شاردابوو؟ ده‌كرا ئه‌ویش به‌دوای كه‌سانی داواكراوه‌وه بێت و له‌بری ئه‌وه‌ش خه‌ڵاتی دارایی وه‌ربگرێت. به‌ڕاستی دۆخی به‌غدا جگه له گومان هیچی تری لێ چاوه‌ڕوان نه‌ده‌كرا.

زه‌ید وه‌ك پاسه‌وانی شه‌وانه له‌سه‌ر قه‌نه‌فه‌ی ژووری میوان ده‌خه‌وت و كلاشینكۆفێك به ده‌ستیه‌وه بوو. تاوه‌كو له‌توانام دابوو دوور له ماڵه‌كه‌مان ده‌ستم كرد به دیداری ڕۆژنامه‌نووسه‌كه و به ته‌له‌فۆنی مانگی ده‌ستكرد قسه‌م ده‌كرد. له حه‌وشه و ژووری میوانه‌كانی ماڵی ناسیاوه‌كانمان كۆده‌بووینه‌وه، زۆرجار به‌هۆی نه‌بوونی كاره‌با له به‌غدا به‌ده‌وری چرا داده‌نیشتین. ئۆلبرایت وتی دۆخه‌كه له ڕوانگه‌ی واشنتۆنیشدا ئاڵۆزاوه‌گێڕانه ده‌رده‌كه‌وێت. سه‌ربازه ئه‌مریكییه‌كان له سه‌رانسه‌ری عێراق به‌دوای چه‌كی كۆمه‌ڵكوژ ده‌گه‌ڕان، به‌ڵام هێشتا له پایته‌ختی ئه‌مریكا كۆده‌نگییه‌ك نه‌بوو سه‌باره‌ت به چۆنیه‌تی مامه‌ڵه‌كردن له‌گه‌ڵ زاناكان. ئه‌مریكا ده‌ستیكردبوو به كۆكردنه‌وه‌ی تیمێكی زیاتر له هه‌زار پشكنه‌ر بۆ هه‌ماهه‌نگی گه‌ڕانه‌كه، ناوی گروپی ڕووپێوی عێراق بوو، به‌ڵام هێشتا كه‌س نه‌یده‌زانی چه‌ند هه‌فته تێده‌په‌ڕێت تا ده‌گه‌نه عێراق. له‌لایه‌كی دیكه‌وه، وتی كه كارمه‌ندانی هه‌واڵگری له ده‌زگا جیاوازه‌كان له‌سه‌ر زه‌وی عێراق بوون، كێبڕكێیان له‌سه‌ر دۆزینه‌وه‌ی به‌ڵگه‌كانی چه‌كی كۆمه‌ڵكوژ ده‌كرد كه پاساو بۆ له‌شكركێشییه‌كه ده‌هێنێته‌وه.

تا ده‌هات دڵه‌ڕاوكێم زیاتر بوو. له‌گه‌ڵ گه‌شه‌كردنی متمانه‌م به ئۆلبرایت، ده‌ستم كرد به ئاشكراكردنی سروشتی گشتی شته نێژراوه‌كانم به‌بێ ئه‌وه‌ی باس له تایبه‌تمه‌ندییه‌كان بكه‌م و له كوێدا

هەڵمگرتوون. لە ڕێگەی تەلەفۆنی مانگی دەستکردەوە پێم گوت کە چەندین پێکهاتەی نموونەیی و وێنەکێشانی وردی سەنتەرفیوجم لایە.

"وێنەکێشانی پێکهاتەکان؟" ئەو پرسی. "بەڵگەنامەکانی سەنتەرفیوجی ئەڵمانی؟"

گوتم: بەڵێ. "ئەوانەی کە پشکنەرەکان هەرگیز نەیانبینیوە."

بێدەنگییەکی کورتخایەن و سەرەتای قسەکانی پێی وتم کە ئۆلبرایت بەم قسانەی من سەرسام بووە. بەڵام وتی کە ڕەنگە سەربازەکان لە عێراق نەتوانن گرنگی بەڵگەنامەکانم بزانن، چوون ئەوانە لەو شتانە نەبوون کە ئەمریکییەکان بەدوایدا دەگەڕان. دەکرێت وەك بەڵگەیەك لێکبدرێتەوە کە سەددام بەنیازی ئەوە بووە کە بەرنامە ئەتۆمییەکە پێکبهێنێتەوە، چونکە بناغە و تۆوی سەنتەرفیوجەکە بە درێژایی ئەو ماوەیە بە شاراوەیی هێڵدرابووەوە. بەڵام بە هەمان شێوەی ئەو ڕاستییە، ئەمە لەهەمان کاتدا مانای وابوو کە بۆ ماوەی زیاتر لە دە ساڵ نێشتنی ئەو بەڵگانە، بەڵگەی ئەوە بوو کە تەماحە ئەتۆمییەکانی عێراق بە هەمان شێوە لەو ماوە دا بە خەوتوویی ماونەتەوەو و دەست بۆ بەرنامەی ئەتۆمی نەبراوە. ئۆلبرایت وتی گرنگە کە من لەگەڵ ئەو پسپۆڕانە قسە بکەم کە زانیاری دروستیان هەیە.

وەك ئەوەی کە دەزگا هەواڵگرییەکان هەموو بە یەکجار هاتبن، بەمجۆرە لە نیوەڕۆیەکدا -کە دوای سەردانە نهێنییەکەی کوردەکە زۆری نەخایاند- ئۆلبرایت پێی وتم کە بەیانیەکەی دیکە بریکارێکی ئەمریکی لە یەکێك لە کۆشکەکانی سەددام -کە کەمتر بەکاردەهێنرێت- لە باشووری بەغدا چاوەڕێم دەکات. بە

ئۆتۆمبێلەكەم ڕۆیشتمەوە ماڵەوە و لەیلا پێی وتم كە لەكاتێكدا من لە دەرەوە بووم، دوو پیاوی ئەمریكی هاتوونەتە ماڵەكە، خۆیان وەك بریكاری هەواڵگری سوپای ئەمریكا ناساندووە و داوایان كردووە كە لە ئۆفیسە نوێیەكەیان لە ناوەڕاستی بەغدا لە هەمان كاتدا چاویان پێیان بكەوێت، مەبەست لەو كۆبوونەوەیەی كە ئۆلبرایت تازە ڕێكی خستبوو. هەروەها پەیامێكم لە یەكێك لە هاوڕێ زاناكانم پێگەیشت كە ژنێكی بەریتانی پەیوەندی پێوە كردبوو، كە گریمانە بوو بریكاری MI6 بێت، دەیەوێت شوێنی زانایانی پێشووی سەنتەرفیوج بزانێت.

نزیكەی كاتژمێر حەوتی بەیانی ڕۆژی دواتر من و زەید بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشتین كە ئۆلبرایت ئاماژەی پێكردبوو. لەكاتێكدا بە درێژایی ڕێگای خێرای ئەبوغرێبدا دەڕۆشتین، ئاوڕم دایەوە و تێبینیم كرد كە چەند ئۆتۆمبێلێكی كۆری كە لە جۆری كیا بوون بەدوای ئێمەدا دەڕۆیشتن. دڵم خورپەی دەكرد، چوون ئەمە هەمان مۆدێلی ئەو ئۆتۆمبێلانە بوون كە دارودەستەكەی سەددام بەكاریان دەهێنا. لە چوار ڕییانەكە نزیك بووینەوەو بە زەیدم گوت كە بەردەوام بە لە لێخوڕینی ئاساییدا. شۆفێرانی ئۆتۆمبێلی كیا لە تەنیشت ئۆتۆمبێلەكەمانەوە بوون و خاویان كردەوە. سەیرم كرد و بینیم شۆفێرەكەی لای ڕاستمان بە هەڕەشەئامێزەوە سەیری ئێمەی دەكرد. كاتێك لە چوارڕییانێك نزیك بووینەوە كە سەربازانی ئەمریكی تێدابوون، شۆفێرانی كیاكان خێراتر بوون و بڵاوەیان پێكرد. ئەوەبوو ترسەكەم ڕەویەوە. من و زەید گریمانە و پرسیاری ئەوەمان لە یەكتر كرد كە ئاخۆ ئەم پیاوانە بكوژ بوون، دەبێت ئەوانە لە پیاوە ئەمنییە بەجێماوەكان بن، وەیان تەنها تاڵانچین و ئۆتۆمبێلە دزراوەكانی ڕژێمی پێشوویان بەكارهێناوە؟ لە كاتێكدا

بە كارمەندە هەواڵگرییەكانی ئەمریكا گەیشتین، وا دیار بوو قۆڵی درێژی ستەمكاری سەددام خەریك بوو بمانگرن و وادەركەوت كە ئەو شۆفێرانە لە پیاوانی سەددام بوون.

پاسەوانانی عێراقی و هەڵگری چەكی ئۆتۆماتیكی لە دەروازەكانی ڕێگای هاتووچۆی كۆشكەوە بردیانین. گەنجێكی ئەمریكی پاك و خاوێن لەناو دەروازەكاندا چاوەڕێی دەكردین. خۆی ناساند و گوتی ناوم گارییە. لەكاتێكدا بە ئۆتۆمبێلەكەمان بەرەو گردێك بۆ گۆڕەپانی كۆشكەكە دەڕۆیشتین، زۆر بە ڕێزەوە قسەی دەكرد و وا دیار بوو بە وردی وشەكانی هەڵدەبژێرێت بۆ قسەكردن. لە ئۆفیسێكی تەنیشت بینای سەرەكی كۆشكەكەدا لەسەر قەنەفەی جوانی عێراقی دانیشتین كە تا ئەم دواییەش سەددام لەسەری دادەنیشت. وا دیار بوو ئەمریكییەكان تازە هاتوونەتە ناو ئەم كۆشكەوە، چونكە هێشتا مۆلیدەی كارەبایان نەبوو. بەبێ بوونی هیچ فێنكەرەوەیەك، وادایاربوو كە ئۆفیسەكە گەرم بوو — ئەگەرچی كات شتێك لە بەیانی ڕەت ببوو- سەربازێك لە گۆشەكەدا خەوی لێكەوتبوو و تفەنگێكی بەسەر ئەژنۆكانیەوە بوو.

لە یەكەم پرسیارەكانی گاریەوە دیار بوو كە خاوەنی زانیارییەكی قووڵ نەبووە لەسەر بەرنامەكانی چەكی كۆمەڵكوژی عێراقی، بۆیە مێژوویەكی كورتم لەبارەی بەرنامەی سەنتەرفیوج و هەڵوەشاندنەوەی دوای جەنگی كەنداو لە ساڵی ١٩٩١دا پێدا. ئەو زیاتر حەزی دەكرد لەبارەی كارەكانی. كۆمپانیای سەعدەوە بزانیت بەتایبەتی لە ماوەی ساڵانی نەوەدەكاندا، منیش باسی پاڵاوگەكان و پرۆژە مەدەنییەكانی دیكەم بۆ كرد، هەروەها ئەو كارگەی تەقەمەنیەی كە كارمان لەسەر كردبوو.

پرسیاری کرد کە ئایا من شتێك دەزانم دەربارەی ئەو تاقیگە بایۆلۆژییە گەڕۆکانەی سەددام -کە گوایە سەربازە ئەمریکییەکان دۆزیویانەتەوە-. منیش وتم نەخێر، ئەو شتانەم تەنها لە هەواڵەکاندا بیستبوو. گاری وێنەی چەندین ترێلەی نیشاندام کە پشکنینیان بۆ دەکرا بۆ ئەوەی بزانرێت ئایا مەبەستیان دروستکردنی مادەی بایۆلۆژییە یان نا. من بە وردی سەیری وێنەکانم کرد. هەرچەندە هیچم لە بەکارهێنانی بارهەڵگرەکان نەدەزانی، بەڵام ئاماژەم پێدا کە بۆرییەکان نایەکسانن و بە شێوەیەکی نارێك بەیەکەوە لکێنراون، وەك ئەوەی بە شێوەیەکی هەڕەمەکی پێکەوە دانراون. بە دڵنیاییەوە ئەمە لەلایەن سەعد و هیچ کام لە کۆمپانیا ئەندازیارییەکانی دیکەوە بەرهەم نەهێنراون، کە کوالیتی کارەکانیان زۆر بەرز بووە. هەندێك تێبینی نووسی و وتی زانیارییەکانی ناوەوە بەنرخن.

گەرمای زۆر بەتین دەستی پێکرد. تارادەیەك بێ ئیرادە، گاری پرسیاری لەبارەی بەرنامەی سەنتەرفیوج و ئەو کارانەی کە من و زانایانی دیکە لە ساڵی ١٩٩١ەوە ئەنجاممان داوە، ئارەزووی خۆی دەربڕی بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ هەندێك لە بەڕێوەبەرانی کۆمپانیایی سەعد، کە زۆر دوور بوو لەو بابەتەی کە من هیوای ئەوەم دەخواست باسی بکەم. من بە وردی قسەکانم هەڵبژارد بۆ ئەوەی ئارەزووی ئەو بە ئاراستەیەکی دروستدا ببەم.

گوتم: "ئێمە باسی مێژوو دەکەین، بەڵام ویستم باسی شتێکی هەنووکەیی بکەم. وەك دەزانن پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان پێش شەڕ لێرە بوون. هەندێك خاڵی بەرچاو هەبوون کە نەیانتوانی ببینن. هیوادارم لەم چوارچێوەیەدا لەگەڵ کەسێك قسە بکەم، بەڵام هەندێك نیگەرانیم هەیە سەبارەت بە سەلامەتی خۆم".

گاری بەم ئاماژەیە هێور بووەوە. پێدەچوو ئەوەندە زیرەك بێت کە بە خێرایی تێبگات کە پێویستە لەگەڵ کەسێك کۆببمەوە کە زانیاری قووڵتری لەسەر بەرنامەکانمان هەبێت و دەسەڵاتی زیاتری هەبێت لەسەر ئەوەی کە چۆن مامەڵەم لەگەڵ دەکرێت. ڕێککەوتین کە لەبری ئەوەی لەگەڵ بەڕێوەبەرانی سەعد کۆببێتەوە، لەجیاتی ئەوە کۆبوونەوەیەك لە ڕۆژانی داهاتوودا لەگەڵ هەندێك لە هاوکارەکانی ڕێکبخات و قسە بکەین.

کاتێك من و زەید گەڕاینەوەماڵەوە لەیلامان لە دۆخێکی ناڕەحەتدا بینی. یەکێك لەو پیاوانەی سوپا کە ڕۆژێك پێشتر هاتبوو، ناوی جۆن بوو، نیوەڕۆی زوو لەگەڵ وەرگێڕێکی عێراقی گەیشتبووە ئەوێ. لەیلا بە ترسەوە گێڕایەوە:

- "هاوسەرەکەت چۆن جورئەتی کردووە کە نەیەتە کۆبوونەوەکەمان؟ نازانێت کە دەتوانین فڕێی بدەینە زیندان؟ ئەگەر سبەی نەیەت، ئەوا کێشەی بۆ دروست بێت".

لەیلا وتی ئەم قسانەی هەژاندوویەتی. ئەگەرچی ئەو ژنێکی بەهێز و خاوەن ئیرادە بوو. ئەوەبوو نەمتوانی شانازی بەم ژنەوە نەکەم کاتێك پێی وتم کە چۆن وەڵامی وەرگێڕە عێراقییەکەی داوەتەوە.

ئەو بە زمانی عەرەبی پێی وتووە: "زیاتر لە بیست ساڵە لە سەردەمی سەددامدا ستەممان لێدەکرێت و هەڕەشەی زیندانیکردنمان لێدەکرێت. ئایا ئێمە لە ژێر ئەم دەسەڵاتە نوێیەشدا بە هەمان شێوە ستەممان لێ دەکرێت؟"

وادیاربوو ئەم وەڵامە جۆنی تووشی سەرسوڕمان کردبوو. دوای ئەوەی وەرگێڕەکە وشەکانی بۆ وەرگێڕابوو، ئەوەبوو سەری

لەقاندبوو و ڕۆیشتبوو. بەڵام دەمزانی هەڕەشەکە جدییە، بۆیە من و زەید بە ئۆتۆمبێلەکەمان ڕۆیشتینە ئەو ئۆفیسەی کە جۆن دیاری کردبوو. تەنیشت شوێنی داواکراوەکان کە پێشتر شوێنی بەناوبانگی بازنەی ناوەوەی سەددام بوو، ئێستا هەموو ناوچەکە لەلایەن عێراقییە چەکدارەکانەوە پاسەوانی دەکرا کە بۆ ئەمریکییەکان و کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی کاریان دەکرد. کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی پارتێك بوو بە سەرۆکایەتی ئەحمەد چەلەبی –کە بۆ ماوەیەکی زۆر بازرگانێکی دوورخراوە بوو-. کۆمەڵێك پیاوی عێراقی بە سکی گەورە دانیشتبوون و بە شێوەیەك دردەکەوتن کە دڵخۆشبن و چەکیان بەدەستەوە بوو، کە دەرگای چوونە ژوورەوەی فەرمانگەی هەواڵگری سوپایان داخستبوو. من و زەید بە ئەدەبەوە چووین و بەڵام ناچار بووین بەلای ئەواندا بڕۆینە پێشەوە چونکە ئەوان ڕەتیانکردەوە لە شوێنی خۆیاندا بجوڵێن. کاتێك چووینە ژوورەوە، بەرەو ژوورێکی گەورە بردیانین کە دیوارەکانی خشتی بۆیاخ نەکراوبوون و مێزی سادە و لە کەشوهەوای بنکەیەکی پۆلیسی عێراقی دەکرد. لە دەرەوە گوێم لە دەنگی مۆلیدەیەك بوو و لانیکەم بۆئەوەبوو کە شوێنەکە ئامێرێکی فێنککەرەوەی تێدابێت.

دوای نزیکەی دە خولەك، جۆن گەیشتە لامان و خۆی و دوو هاوکارەکەی ناساند. جۆن لە سەرەتای شەستەکانی تەمەنیدا بوو، بە ڕووخساری دەردەکەوت کە وەك یەکێك لە تیمی فڕۆکەوانان و هەروەها شێوازی قژی، وێنای پیاوێکی دەکرد کە ژیانێکی سەختی بەسەر بردووە. داوای لێبوردنم کرد کە پێشتر نەمتوانی چاوم پێی بکەوێت و ڕوونم کردەوە کە لە شوێنێکی تردا چاوم

بە هەندێك لە كەسانی تری ئەمریكی كەوتووە. ئەوەبوو یەكسەر گومانی بۆ دروست بوو.

ئەو: "ئەوان كێ بوون؟ لەگەڵ كێی تر قسە دەكەیت؟"

گوتم: "ئەوان بە تەواوی نەیان دركاند كە كێن."

جۆن لەگەڵ یەكێك لە هاوئەمریكییەكانیدا نیگایەكی ئاڵوگۆڕ كرد.

هاوكارەكەی پێی وت: سی. ئای. ئەی. هەوڵی دەستوەردان دەدات. "وەك ئەوەی كە ئەو زانیارییانەی هەیانە بەشی پێویست نەبێت".

وتی: دەبێت ئەم بابەتە یەكلایی بكەینەوە كە لەگەڵ كێ قسە دەكەیت. "دەبێت لەگەڵ ئێمە قسە بكەیت نەك ئەوان."

سەرم سوڕما كە بریكارەكانی دەزگایەكی هەواڵگری ئەمریكی و لەبەردەم كەسێكی غەیرە خۆیاندا ئەو قسەیە بكەن. بۆیە من هەوڵمدا شێوازێكی دیپلۆماسی بۆ ئەم دۆخە نائاساییە بدۆزمەوە.

گوتم: "بۆ من ئەمریكی هەر ئەمریكییە. لە چاوەكانمدا هیچ جیاوازییەكی نییە. ئامادەم وەڵامی پرسیارەكانتان بدەمەوە".

زانایەكی سوپای ئەمریكا بە ناوی دەیڤد كە ڕووخسارێكی ئاسایی فراوان و ڕەفتارێكی دۆستانە بوو، لەگەڵمان بوو. جۆن لە تەنیشتمەوە لەسەر مێزێك دانیشت و یاریدەدەرێكی لە تەنیشتی بوو بۆ ئەوەی تێبینی یەكان بنووسێت. دەیڤد بەرامبەرم دانیشت و زۆربەی پرسیارەكانی دەكرد. ئەو كەسێكی ڕێزدار بوو و بە ڕوونی لە زانستی ئەتۆمی تێدەگەیشت، بەڵام پێنەدەچوو كە بە باشی شارەزای بەرنامەی چەكی ئەتۆمی عێراق بێت. ئەوەبوو

گەرامەوە سەر مێژووی بەرنامەکەو سەرەتای دەستپێکردنی. دەیڤد پرسیاری ئەوەی کرد کە ئایا بەرنامەکە لە دوای ساڵی ١٩٩١ دەستپێکراوەتەوە، ئەوەبوو کاتێك وتم نەخێر، ئەو بە زەحمەت توانی نائومێدی خۆی بشارێتەوە.

ئەو: "ئایا هیچ ئامێرێك بۆ بەرنامەی سەنتەرفیوج کڕدرابوو؟ ئایا بەدوای کەرەستەدا دەگەڕان؟ هیچ کڕینێکتان بەهەر شێوەیەك بێت ئەنجام دابوو؟"

لە کاتێکدا دەیڤد بەردەوام بوو لە نووسینی تێبینییەکانی، من بە یاریدەدەرکەم گوت: "تەنها بەردەوام بە لە نووسین، 'نەخێر'".

لە کۆتاییدا دەیڤد بابەتەکەی گۆڕی بۆ دەستکەوتەکانی بەرنامەی سەنتەرفیوج لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا. ئێمە بە زاراوەی تەکنیکی قسەمان لەسەر ئەو بڕە کەمەی یۆرانیۆم کرد کە لە ساڵی ١٩٩٠ بە نموونەی سەرەتایی پیتاندبوومان و هەروەها ئەو پرسانەی دیکە کە لە ماوەی دوانزە ساڵی ڕابردوودا لەلایەن پشکنەرانی چەکی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە ڕووماڵ کرابوون. سەرەڕای گفتوگۆی دۆستانە لەگەڵ دەیڤد، درکم بەوە دەکرد کە خەریکە جۆن نائارام دەبێت.

ئەو: دەزانیت لە لیستی زۆرترین داواکراوەکانیت؟

من بەم قسە وەك ئەوە وابوو بەنج بووبم: کامە لیست؟ ئێوە لیستەکەتان بینیوە، منی تێدانییە!

جۆن وتی لیستێکی درێژتر هەیە. منی بردە سەر مێزێکی تر و کاغەزێکی فەرمی پیشاندام. لەم لیستەدا من وەك یەکێك لە پەنجا و پێنج عێراقییە زۆر داواکراوەکان دانرابووم. پاشان لاپەڕەیەکی

دیکەی کردەوە کە تەواوکەری ئەوەبوو و دەستەکانی خستە سەر زۆرینەی ناوەکان تاوەکو نەتوانم بیانخوێنمەوە.

گوتی: ئا ئەوەتا تۆ لێرەیت.

لەوێدا من وەستام و لەنێو پەنجەکانیدا چاوم لێکرد و ناوی خۆم و ژمارەی تەنیشتم بینی. شەست و شەش. هەوڵمدا هەستی پڕ لە خورپەم بشارمەوە. هیچ بیرۆکەیەکم نەبوو کە کێ ئەم لیستەی داڕشتووە، بەڵام ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە دەتوانرێت من بخرێتە هەمان پۆلی هاوڕێکانی سەددام کە بە دڵنیاییەوە هێور هێور لەلایەن ئەمریکییەکانەوە دەستگیر دەکرێن. نەمدەتوانی بێنمە پێش چاوی خۆم کە چیم بەسەردێت. دواتر جۆن ژوورەکەی بەجێهێشت بەبێ ئەوەی هیچی زیاتر ڕوون بکاتەوە. من و زەیدیش بەردەوام بووین لەوەی کە بەرێزەوە لەگەڵ دەیڤد و یاریدەدەرەکە قسە ئاڵوگۆڕ بکەین و دواجاریش بەرەوماڵەوە ڕۆیشتنیەوە.

ترسەکانم ببوون بە شتێکی ڕاستەقینە. ئێستا ئەمە چیتر پرسیارێك نەبوو کە ئاخۆ من لە لیستی ڕەشی داواکراوان دام یانەخۆ نا، بەڵکو زیندان وەك ئەگەرێك هاتە ئاراوە. هەموو شتێك لەمێشکمدا شێواو دەردەکەوت. گومانەکان لەبەردەم دەرگاکەمدا کەڵەکە بوون: وادیارە گومانم لێدەکرا کە بەرنامەیەکی بەردەوامی سەنتەرفیوج بەڕێوەببەم، هەروەها سەرکردایەتی کۆمپانیای سەعدم دەکرد، کە تۆمەتبارکرابوو بە بەرهەمهێنانی چەکی بایۆلۆژی. من لە نێوان ئەم دەزگایانەدا کارم دەکرد کە وا دیار بوو هەموو لەسەر ئەوە کۆك بوون کە من کەسێکی گرنگم. ئینجا ئەو کوردەش کە هات و وتی کە ئاخۆ من پزیشکی ددانم و ناوم مەهدی عوبێدییە پتر دڵەڕاوکێی منی گەورەتر کرد.

له هه‌فته‌كانی دواتردا چه‌ندین جار له‌گه‌ڵ هاوكاره‌كانی گاری كۆبوومه‌وه. ئه‌وان وتیان تێگه‌یشتوون كه من به ئه‌گه‌رێكی زۆره‌وه و به نزیكبوونه‌وه لێیان خۆم و خێزانه‌كه‌م ده‌خه‌مه مه‌ترسییه‌وه. به‌ڵام نه‌مده‌زانی تا چه‌ند ده‌توانم متمانه‌یان پێ بكه‌م. نه‌مده‌زانی متمانه‌م به كه‌س بكه‌م یان نا. هه‌ستم ده‌كرد ده‌بێت شتێك بكه‌م بۆ ئه‌وه‌ی شته‌كان ڕوونتر بن، بۆیه پێشنیارێكم كرد كه نمونه‌یه‌ك له‌و شتانه پیشان بده‌م كه پێشكه‌شی ده‌كه‌م. نیوه‌ڕۆیه‌كی گه‌رم و گوڕ له سه‌ره‌تای مانگی ئایاردا، به بێڵێك ده‌ستم كرد به هه‌ڵكه‌ندن له دامێنی نیلوفه‌ره‌كه‌دا. زه‌وی ڕه‌ق و وشك بوو، به‌ڵام زۆری نه‌خایاند لێواری ته‌پلی پلاستیكی سه‌وزه‌كه به‌ده‌ركه‌وت. چاڵێكی فراوانم هه‌ڵكه‌ند بۆ ئه‌وه‌ی پیسی ده‌وروبه‌ره‌كه‌ی لاببه‌م. پاشان ده‌فره‌كه‌م له زه‌وی ده‌رهێنا و له ته‌نیشت خۆم دانا. وه‌ك ئه‌وه وابوو كه‌پسولێكی كات بدۆزیته‌وه. سه‌ره‌وه‌م كرده‌وه و كیسه نایلۆنه‌كانم ده‌ركرد كه به‌ڵگه‌نامه‌كان و پێكهاته‌كانی تێدابوو هه‌ر وه‌ك چۆن زیاتر له ده ساڵ پێشتر ناشتبووم. بردمنه ژووری نووستنی پشته‌وه‌م و نمونه‌یه‌كم بۆ ئه‌مریكییه‌كان جیاكرده‌وه: بنكه‌ی تۆپی سه‌نته‌رفیوج له‌گه‌ڵ كۆپانێك كه وێنه‌ی پێكهاته‌ی ورد و تایبه‌تمه‌ندییه‌كانی دروستكردنی تێدابوو.

كاتێك ئه‌م نموونانه‌م دا به هاوكاره‌كانی گاری، پێده‌چوو ئه‌وان له‌ووپه‌ڕی خۆشحاڵیيدا بن و شتێكی به‌رجه‌سته‌یان ده‌ستكه‌وتبێت كه په‌یوه‌ندی به به‌رنامه‌كانی چه‌كی كۆمه‌ڵكوژی عێراقه‌وه هه‌بێت و له‌وه‌و پێشیش نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان هه‌رگیز نه‌یبینیبوو. هه‌روه‌ها پێده‌چوو سه‌رسام بوون كاتێك پێم گوتن ده‌ستم به چه‌ند پێكهاته و دیزاینێكی دیكه گه‌یشتوه بۆ باقی

سەنتەرفیوجەكە، كە ڕۆژی دواتر ڕادەستم كرد. ئەو هەستەم بۆ خۆم دروستكرد كە بە هیوای ئەوەی ئەمریكییەكان بەهای بەشداریكردنم بدەن و ئەوەندە بەهایەك بدەن كە سەلامەتی خێزانەكەم مسۆگەر بكەن و لە عێراق بمانهێننە دەرەوە. تەلەفۆنم بۆ واشنتۆن كرد بۆ ئەوەی لەگەڵ ئۆلبرایت قسە بكەم، ئەویش وتی كە لە بری من فشار دروست دەكات. بەڵام هیچ ئاماژەیەكی پێنەگەیشتبوو كە چۆن مامەڵەم لەگەڵ دەكرێت.

نزیكەی كاتژمێر هەشتی بەیانی ٣ی حوزەیران، كاتێك منداڵەكانم هێشتا خەوتبوون، من و لەیلا لەسەر مێزی چێشتخانەكەمان نانی بەیانیمان دەخوارد. گوێم لە بزوێنەری دیزڵی ئۆتۆمبێلە سەربازییەكانی ئەمریكا بوو لە كوچەی تەنیشت ماڵەكەماندا، نزیكتر دەبوونەوە. سەرەتا من هیچ نیگەران نەبووم، چونكە سوپای ئەمریكا بەردەوام دەوریەی شەقامەكانی بەغدایان دەكرد. من و لەیلا بەردەوام بووین لە خواردنی نان و پەنیرەكەمان و خواردنەوەی چاكەمان. لەناكاو دەنگێك لە دەرەوەی دیواری باخچەكەمان دەستی كرد بە هاواركردن، بڕۆ! بڕۆ! بڕۆ!" لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوەم كرد و بینیم كۆماندۆكان بەسەر دیوارەكەدا بازیان دا و دەهاتنە ناو باخچەكە بەلای ئەو شوێنەی كە گوڵی گاردینیای لێ بوو. بەرەو دەرگای پێشەوەمان ڕایانكرد. دوای چركەیەك بە توندی لەدەرگایان دایەوە. چایەكەم دانا و بەپەلە بەرەو ئاڕاستەی هاوارەكە ڕۆیشتم، واتە بەرەو ژووری میوان -كە زەید بەزۆری لەسەر قەنەفەیەك بە تفەنگێكی كلاشینكۆفەوە دەخەوت بۆ پاراستنی خێزانەكە-.

كاتێك بینیم دەیان سەربازی ئەمریكی بە چەكی ئۆتۆماتیكی

ئاڕاستەیان لە کوڕەکەم گرتووە و هاواردەکەن: "مەجوولە! مەجوولێ!" زەید زۆر ترسا. هەرزوو چاوێکم بە دەوروبەریدا گێڕا بۆ کلاشینکۆفەکە و بینیم کە لای نەبوو، لەوە دەچوو ئەم شەو نەیهێنابێتە لای خۆی، ئەمە ژیانی لە جەڵتە ڕزگار کردم. کە سەربازەکان منیان بینی، دوو کەسیان چەکەکانیان ئاڕاستەی سنگم کرد.

هاواریان کرد: "هێی تۆ، بکەوە سەر زەوی!". کاتێك دەستەکانم لە هەوادا بەرزکردەوە و لە تەنیشت مێزی قاوەکە کەوتمە ئەژنۆ، دڵم بەخێرایی لێیدەدا.

گوتم: هەڵەیەك هەیە. بەڵام سەربازەکان هەر گوێیان پێ نەدام.

دیسانەوە هاواریان کرد: "بکەوە سەر ئەژنۆ، هەر ئێستا!".

لەکاتێکدا خۆم خستە سەر ئەژنۆ، سەربازەکانی تر بە ماڵەکەمدا بڵاوەیان کرد.

سەرم بەرزکردەوە و بینیم لەیلا بەپەلە لە چێشتخانەوە هاتۆتە ژوورەوە. کاتێك من و زەیدی بینی لەسەر سك و لەسەر زەوییەکە پاڵ کەوتووین و بە چەکدارەکانەوە دەور دراوین، بە دەنگی بەرز گریا. سەربازەکان پێیان گوت کە ئەویش بێت و لەنزیك ئێمە پاڵ بکەوێت. دواتر سەربازەکانی تر دوو کچە هەرزەکارەکەمیان هێنا بە ناوەکانی ئامینە و ئایەت و پێیان وتن کە ئەوانیش لەلای ئێمە پاڵ بکەون. هەموومان لە ترسدا دەلەرزین.

من: چیت لە ئێمە دەوێت؟

پیاوێك کە وا دیار بوو فەرماندەییان بوو داوای ناسنامەی منی

كرد. هێشتا بیجامەكەم لەبەردا بوو، پێم گوت ناسنامەكەم لە ژووری نووستنمدان لەگەڵ جلەكانم.

گوتی: "هەستە، با بڕۆین."

بەناو هۆڵەكە ڕۆیشتم و فەرماندەكە و وەرگێڕە عێراقییەكەی بەدوامدا هاتن. كاتێك ناسنامەم پێدا، دەستەكانم لەرزین. وەرگێڕ سەیری ناوەكەمی كرد كە بە عەرەبی نووسرابوو و سەیری وێنەكەی كردم و پاشان سەیری دەموچاوی كردم.

وتی: "ئەوە خۆیەتی، ئەمە ئەو كەسەیە كە تۆ دەتەوێت. ئەمە دكتۆر مەهدی عوبێدییە".

ئەفسەرەكە و كۆمەڵە سەربازەكە هەستیان بە ڕووخساری پڕ لە نیگەرانی خێزانەكەم كرد و ئەوەبوو لە دەرگای پێشەوە دەرچووین. كاتێك گەیشتینە باخچەكە هەستم بە دەستێكی كرد كە ڕێك لە بڕبڕەی پشتیدام كاتێك یەكێك لە سەربازەكان پێی وتم دەستەكانم بخەمە پشتمەوە و كەلەبچەی كردم. لەوەو پێش بینیبووم شتێكی لەو جۆرە بەسەر كەسانێك دێن كە یاسا پێشێل دەكەن و تاوانباران. هەرگیز بە بیرمدا نەهات كە ڕۆژێك دێت دەستەكانی خۆم لە پشتمەوە ببەسترێن. بە یاوەرییەوە سەربازەكان لە دەرگاكە دەرچووین و ژنی هاوڕێكەم و هەروەها دراوسێكەمم بینی. كاتێك منیان بینی كە لەلایەن ئەمریكییەكانەوە كەلەبچەكراو قیژاندی و هاواری كرد. فەرماندەكە فەرمانی بە یەكێك لە سەربازەكانی كرد كە كەلەبچەكەم بكاتەوە و دەستەكانم لە پێشەوە دەستبەند بكات، چونكە من هاوكار بووم و هیچ كاردانەوەی خراپم نەبوو. یارمەتیان دام بچمە سەر كورسی

پشتەوەی هامەرەکە و لە تەنیشت ئەفسەری فەرماندەیی. بە کۆلانەکەدا بەرەو ڕێگای سەرەکی ڕۆیشتین.

گوتم: "من باوەڕم وایە دەبێت تێنەگەیشتنێك هەبێت. لەماوەی چەند ڕۆژی ڕابردوودا چەندین جار لەلایەن دەزگای هەواڵگری ئێوە چاوپێکەوتنم لەگەڵ کراوە".

وتی: "بەداخەوە هیچ لەو بارەیەوە نازانم، من تەنها فەرمانم لایە کە تۆ لەگەڵ خۆمدا ببەم."

نزیکەی یەك میل لە دوورییەوە کاروانەکەمان لە ماڵێکی دیکە وەستا. کۆمەڵێك لە کۆماندۆکان لە دەروازەی پێشەوە ون بوون بەڵام دوای چەند خولەکێك بە تەنیا گەڕانەوە، دیارە هەڵەیان کردبوو. من تاکە دیل بووم کە ئەو بەیانییە دەبرایە چارەنووسێکی نادیار. لە کاتێکدا بە خێرایی زیاتر لە پەنجا میل لە کاتژمێرێکدا بەرەو ئاراستەی فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی دەڕۆیشتین، بایەکی گەرم لە پەنجەرەی هەمەرەکەوە دەهاتە ژوورەوە. بە تەنیشت باخی خورما و داروپەردووی تانکی عێراقی لە هەردوو دیوی جادەکەدا تێپەڕین. دڵم خەریك بوو تۆزێك هێور ببێتەوە، بۆیە هەوڵمدا گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەفسەرە ئەمریکییەکە دەستپێبکەم. ئێستا پێدەچوو ئارامتر بووبێت. لەگەڵ نزیکبوونەوەمان لە فڕۆکەخانە، باسمان لە شەڕی نێوان هێزەکانی ئەمریکا و عێراقی لەوێ کرد لە کاتی لەشکرکێشی چەند هەفتەیەك پێش ئێستا. سەرم سوڕما کاتێك وتی هیچ شەڕێکی ڕاستەقینە لەوێ ڕووی نەداوە، و ئەمریکییەکان لە چەند کاتژمێرێکدا فڕۆکەخانەیان گرتووە. بە ئەفسەرەکەم گوت کە بەڕێوەبەرەکانم لە MIC بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە هێزەکانی عێراق ئەوەندە توند بەرگرییان لە

فڕۆکەخانەکە کردووە کە ئێرە پڕبووە لە تەرمی سەربازە ئەمریکییەکان. ئەوەبوو ئەویش ئەمەی بە شتێکی پێکەنیناوی زانی.

ئۆتۆمبێلە هەمەڕەکە بەسەر جادە قیرتاوەکەدا بەرەو کۆمەڵگەی سەرەکی ڕۆیشت و لە شوێنێك وەستا کە دەرگای چوونە ژوورەوەی بە تەلی دڕکاوی دەورە درابوو. تابلۆیەکی دەست ڕەنگاوڕەنگ نووسرابوو "EPW." واتە دوژمن دیلی جەنگە. دڵم پڕ بوو لە ترس. ئایا ئێستا من دیلی جەنگم؟ ئەفسەرەکە لە دوورەوە منی هێشتەوە کاتێك لەگەڵ ئەفسەرێکی دیکە قسەی دەکرد. پاشان بۆ پشکنینی پزیشکی بردمی بۆ ئەولایەی کە زیاتر بە تەلی دڕکاوی دەورە درابوو. دەستەکانی کردمەوە و پارچە کارتۆنێکم دۆزیەوە کە لەسەری دابنیشم. ئەفسەرێکی گەنجێك هات و پرسیاری لەبارەی تەندروستی منەوە کرد. پاشان لێی پرسیم ئایا من شوێنی سەددام حوسێن دەزانم؟ لە پرسیارەکەی دیاربوو کە چەندە زانیاری کەمە لەبارەی عێراقەوە.

گوتم: من زانام، چۆن بزانم کە سەددام کوێیە؟

ئەفسەرەکە شانی هەڵکێشا و ڕۆیشت. لە دەوروبەرمدا سەیری ئەو دەستبەسەرانەی دیکەم دەکرد کە لەسەر زەوی لەسەر بەتانی یان کۆنکریتی ڕووت دانیشتبوون. زۆرێکیان وەك تاوانبار و ستەمکاری باو دەرکەوتن. ژنە سەربازێکی گەنجی ئەمریکی لە دەروازەی گەمارۆکەدا پاسەوانی وەستابوو و گوێی لە مۆسیقای پۆپ دەگرت لەسەر ستێریۆیەکی گەورە. پێدەچوو یەکێك لە گۆرانییەکان بردبێتی بۆ جیهانێکی تر و لە کاتی خۆیدا دەستی کرد بە جوڵاندنی چەناگەی خۆی لەگەڵ مۆسیقاکەدا. یەکێك لە دەستبەسەرکراوە عێراقییەکان -کە وەك بڵێی کەسێکی سەر شێت

بێت-، لەسەر زەوییە كۆنكریتییەكە هەستا و لە دوورەوە دەستی كرد بە سەماكردن لەگەڵیدا. سەربازەكە پێكەنی و بۆ چەند ساتێك ڕێگەی دا سەما بكات. بەڕاستی من لەوێدا دانیشتم و هەستم بە شەرمەزاری كرد.

وا دیار بوو كات زۆر بە هێواشی تێدەپەڕی. لەم بەری قیرتاوەكەوە دەمتوانی خانوویەك ببینم كە خەیاڵی ئەوەم دەكرد ئەمریكییەكان دیلە ناودارەكانی جەنگ وەك تاریق عەزیز، سەعدون حومادی، سەرۆكی پەرلەمانی نیشتمانی عێراقی و عەبدولتەواب لەوێدا دەستبەسەر بكەن. بێ هیوا بووم لە بیركردنەوە لەوەی كە ڕەنگە ئەمریكییەكان لەو شوێنەدا، دوور لە خێزانەكەم، من زیندان بكەن. ترسم لەوە هەبوو كە ئاخۆ دەبێت خێزانەكەم چییان لێ بێت. تاكە دڵنەوایی بچووكم ئەوە بوو كە ئەگەر لەگەڵ كەسایەتییە باڵاكانی ڕژێمی سەددام بخرێمە زیندانەوە، ڕەنگە ئەوكات خێزانەكەم لە دڵسۆزانی سەددام سەلامەت بن.

لەژیانی مرۆڤدا هەمیشە كاتێك هەیە كە تاڵە موویەكی باریك دەشێت ڕاستی لە درۆ جیا بكاتەوە، یان متمانە لە بێ متمانەیی. هەستم دەكرد لەسەر هێڵێكی وەها چارەنووسساز هاوسەنگیم هەیە. تەنیا چەند ڕۆژێك پێشتر وا دیار بوو ئەمریكییەكان دڵخۆش بوون كە من كۆمەڵە بەڵگەنامە و دیزاینێكی سێ پێیی سەنتەرفیوجیانم بۆ ئاشكرا كردوون. لە ژێر درەختی نیلوفەرەكەمەوە ئەو نهێنییانەی كە ئەگەری كوشندەیان هەبوو هەڵمكەندبوون. دڵ و مێشكم كردبووەوە و دواجار دوای ئەو هەموو ساڵە لە فریودان، توانیم ڕاستییەكان ئاشكرا بكەم بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بەجێبهێڵم. مەبەستم ڕوون بووبووەوە و بە نیەتێكی باشەوە لە ئەمریكییەكان

نزيك بووبوومەوە. كەواتە ئەمە چى بوو؟ ئايا پاداشتەكەم بۆ ئەوە بوو ببمە ديلى جەنگ؟ ئايا ئەمريكييەكان بەو بێ بەزەييانە ئاوام لێ دەكەن؟ لە كاتێكدا هەستم دەكرد ئەم بيرۆكە تاريك و نارِوونانە خەريكن مێشكم ژەهراوى دەكەن، وەك زۆربەى جاران لە كاتى قەيران و گومانەكاندا پەنام بۆ نوێژ برد. دەستم كرد بە خوێندنەوەى ئايەتێك لە قورئانى پيرۆز كە بە ئايەتى كورسى (آية الكرسي) ناسراوە:

اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ.[١]

خوێندنەوەى ئەو وشانەى نێو ئەو ئايەتە تا رِادەيەك دڵنەوايى دام و خۆمدايە دەست چارەنووس، جا هەرچييەك بێت. هەروەها بەوە دڵنەوايى خۆم دايەوە كە ئەو بارە قورِسەم لەسەر شانم لابرد كە بۆ ماوەى دوازدە ساڵى رِابردوو لەسەر شانم بوو. سەير لەوەدابوو، هەر لەو ساتەدا كە خۆمم بينيەوە كە رِووبەرِووى ئەگەرى زيندان بوومەتەوە، هەستم بە ئازادى زياتر دەكرد لەوەى كە ساڵانێك بوو. ئەمەش دياردەيەكى زانستى بيرخستمەوە كە بە وزەى ئاستبەرز ناسراوە، كە تيايدا وزە دەبێت بگاتە گرينگترين

---

[١] سورة البقرة، آية ٢٥٥

و به‌رزترین ئاستی پێش ئه‌وه‌ی له‌ دۆخێكی هاوسه‌نگی نزمتردا جێگیر بێت. هه‌ڵكه‌ندنی ڕاستییه‌كان له‌ كۆتاییدا چاره‌نووسی من بوو، ئه‌مه‌ش هه‌ستێكی پێبه‌خشیم كه‌ وه‌ك زانایه‌ك و وه‌ك مرۆڤێك له‌ خودی خۆمه‌وه‌ نزیكتر بم.

له‌ كاتێكدا كه‌ نوقمی ئه‌و بیركردنه‌وانه‌ ببووم، له‌ شوێنێكدا ئه‌فسه‌رێكی سوپا هاته‌ ناو ئه‌وێ و بۆلام هات. به‌ ڕه‌وشته‌وه‌ سڵاوی لێكردم و كورسییه‌كی پێدام كه‌ له‌سه‌ری دابنیشم له‌بری پارچه‌ كارتۆنه‌كه‌. منیش به‌و ئاماژه‌یه‌ كه‌مێك تووشی سه‌ر لێ شێوان بووم. دوای ئه‌وه‌ی ڕۆیشت، به‌ ده‌وروبه‌رمدا سه‌یری هاوڕێ ده‌ستبه‌سه‌ركراوه‌كانم كرد كه‌ هه‌موویان له‌سه‌ر زه‌وی دانیشتبوون.

پاسه‌وانه‌ ژنه‌كه‌ وتی: "كورسییه‌كی جوانت لایه‌." منیش به‌ وه‌ستانه‌وه‌ گوتم: تكایه‌ بۆ خۆت ببه‌.

وادیاربوو هه‌ستی به‌وه‌ كرد كه‌ من زیندانییه‌كی ئاسایی نیم، وتی: "نا، نا، من ته‌نها گاڵته‌ ده‌كه‌م".

نزیكه‌ی كاتژمێر سێی پاشنیوه‌ڕۆ، له‌لایه‌ن ئه‌فسه‌رێكه‌وه‌ كه‌ هێڵ و ئاماژه‌ی پله‌داری زۆر له‌سه‌ر شانی جله‌ سه‌ربازییه‌كه‌ی بوو له‌گه‌ڵ پیاوێكی باڵابه‌رز به‌ جلوبه‌رگی مه‌ده‌نییه‌وه‌ هاتنه‌ لام. ئه‌وان خۆیان ناساند و ته‌وقه‌مان كرد، له‌ كاتێكدا دیله‌كانی دیكه‌ی عێراقی و پاسه‌وانه‌كان سه‌یریان ده‌كردین. كه‌سه‌ مه‌ده‌نییه‌كه‌ ده‌ستی به‌ قسه‌ كرد.

ئەو: "دکتۆر عوبێدی، من ناوم کارلە، بەداخەوە لام وایە کە هەڵەیەکی ترسناك ڕوویدابێت. هیوادارم میهرەبان بن و لێمان ببورن. پێدەچێت دەستی ڕاستمان نەزانێت کە دەستی چەپمان چی دەکات."

بە ئاسوودەییەوە ئاهێکم هەڵکێشا و گوتم: هیوای ئەوەم دەخواست کە ئەمە بێت. "بەڵام سوپاس."

وتی: هەرکاتێك ئامادە بوویت دەتبەمەوە ماڵەوە.

لە کاتێکدا کارل بە ئۆتۆمبێلەکەی بردمیەوە ماڵەوە، بیرم لە سەرەتای ئەو ئایەتە کردەوە کە بەدوای ئایەتی کورسی دێت، پێدەچوو بە شێوەیەکی سەیر لەگەڵ بارودۆخەکە گونجاو بێت:

لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ...[1]

کاتێك کارل لە درەنگانی پاشنیوەڕۆدا گەیاندمیەوە ماڵەوە، خێزانەکەم لە خۆشیدا گریان. ئەوان چاوەڕوانی خراپتریان دەکرد و بیرۆکەی ئەوەی کە من دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە لە بێ هیوایی زیاتر هیچی تر نەبوو. یەك دوو کاتژمێر پێشتر یەکێك لەو هەواڵگریانەی کە پرۆتۆتایپ و دیزاینەکانی بنکەی تۆپەکەم پێدا، هاتبووە ماڵەکە و بەدوای مندا دەگەڕا. لەیلا وتی کە ئەو کەسە زۆر دڵتەنگ بووە کاتێك بیستوویەتی سوپا منی گرتووە.

ئەو گوتبوی: بە نەفرەت بن، چۆن کارێکی وا دەکەن؟

هەوڵی دابوو دڵنەوایی ژن و کچەکانم بدات کە دەگریان و

(١) سورة البقرة، أية ٢٥٦

بەڵێنی پێداون کە شتێك لەو بارەیەوە بکات. بەڵام دوای ئەو بەیانییە ناخۆشە، لەیلا وتی، نەیدەزانی باوەڕ بە چی بکات. لەو کاتەوە ڕووداوەکان زۆر بە خێرایی تێدەپەڕین. سەرەڕای ئەم ڕاستیەی کە من باقی بەڵگەنامە و پێکهاتەکانم ڕادەستی ئەمریکییەکان کردبوو، ژن و کچەکانم نیگەران بوون لە مانەوە لە ماڵەکەماندا چونکە ترسیان هەبوو سەربازە ئەمریکییەکان لە هەر خولەکێکدا بێت دەتوانن هێرش بکەنە سەرمان و جارێکی دیکە بمبەنەوە. من زیاتر خەمی تۆڵەسەندنەوەکانی دڵسۆزانی سەددام بووم. بە دڵنیاییەوە قسە بکەوتە زارەکی، دەکەوتە شارەکی و لەو ڕۆژانەش زۆر ئەمریکی بینرابوو کە لە ماڵەکەمانەوە دەهاتن و دەچوون.

لەو ماوەیە لە ماڵی ئیسرای کچم و ئەندامانی تری خێزانەکەم خەوتین. دوای چەند دانوستانێکی سەخت دواجار هەواڵم پێگەیشت کە خێزانەکەم کە لە نۆ کەس پێکهاتبوون- هاوسەرەکەم، منداڵەکانم، زاواکەم و دوو نەوەکەم- پێویستە خۆیان بۆ جێهێشتنی عێراق ئامادە بکەن. بەڕۆژ گەڕاینەوە ماڵەکەمان بۆ کۆکردنەوەی کەلوپەلەکانمان. لەیلا کە دەیزانی بەم زووانە ناگەڕێینەوە، سندوقی قاپ و جێگەی نوستن و کتێب و جل و بەرگی کۆکردەوە. منداڵەکانم جانتاکانیان پڕکردەوە، دەیانزانی ناتوانن بە هاوڕێکانیان بڵێن کە خەریکە بۆ هەتا هەتا ئێرە جێدێڵن. ڕۆژێك پێش ڕۆشتنمان بۆ دواجار ئاوی باخەکەم دا. لەکاتێکدا خەریك بووم ئاوەکی زیاترم بە دارە میوەکان دەدا، مانگۆیەکیم بینی تازە سەری دەرکردبوو و بە شێوەیەکی نزم لە لقە بچووکەکەیەوە هەڵواسرابوو. باریك و سەوز بوو، یەکەم

مانگۆی ساڵ بوو. بینینی ئەو دیمەنە منی خستە نێو حاڵەتێکی خەمناك، چوون تێگەیشتم کە ئیدی هەلی ئەوەم نییە سەیری بکەم کە گەورە دەبێت و دەبێت بە میوەیەکی سوور و زەردی شیرین. بەڕاستی دڵتەنگ بووم نیشتمانم بەجێدەهێڵم، کە زۆر یادەوەری نایاب و هەروەها ترسناکیشی پێبەخشیبووم. سەیرکردنی مانگۆ تازەکە بیری هێنامەوە کە منیش ناتوانم بەشداری لە ئاوەدانکردنەوەی عێراقدا بکەم، لانیکەم بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ، مەگەر ئەوکاتەی هەست بکەم کە گەڕانەوە بۆ وڵات سەلامەتە.

بەیانیەکەی ڕۆژی دواتر، لە ٢٠ی حوزەیران، ئەمریکییەکان بە دوو ئۆتۆمبێلی وەرزشی گەیشتن بۆ ئەوەی من و خێزانەکەم بەرەو کوێت ببەن. دراوسێکانمان لە درزەکانی دەرگای پێشەوەی ماڵەکانیان سەیری دەرەوەیان دەکرد، کاتێك کەلوپەلەکانمان لە لێواری ڕێگای هاتووچۆکەمان کۆدەکردەوە. هەرچەندە خۆر هێشتا لە ئاسماندا نزم بوو، بەڵام زۆر بەتینی تیشکی پەخش دەکرد. وەك ئەوەی لە خەو و خەفەتدا بین جانتاکانمان لەناو ئۆتۆمبێلە ئەمریکییەکاندا بارکرد. لە کورسی پشتەوە، باوەشم بە دوو کچە بچووکەکەمدا کرد کە هێشتا لە نێو ترسدا بوون. هیچ شتێك نەبوو ئاماژەیەکمان پێبدات بەوەی ئاخۆ داهاتوو چی بۆ مەڵاس داوین. من وامدەزانی دەمانبەن بۆ ئەمریکا، بەڵام تەنانەت ئەمەش هێشتا ڕوون نەبوو. لەگەڵ دوورکەوتنەوەمان لە ماڵەکەمان، من و خێزانەکەم بە غەریزە سەرمان سوڕاند بۆ ئەوەی دوا سەیرێکی دەرگای پێشەوەی ماڵەکە بکەین. کەس تەنانەت یەك وشەیشی نەگوت. ئێمە زۆر ماندوو بووین، زۆر لەوە زیاتر کە قسە بکەین. هەرچەندە من سوپاسگوزار بووم، چوون خێزانەکەم لە پشێوی و

نائەمنی عێراق دوور دەخرانەوەو سەلامەتتر دەبوون، بەڵام هەموومان لەژێر هەستکردن بە خەسارەت وێران ببووین. ئێمە لە زۆر ڕووەوە خەریك بوو ڕۆحمان لەدوای خۆمان بەجێدەهێشت، ڕۆحەكانمان لەگەڵ هاوڕێكانمان و خێزانە گەورەكەمان و ڕابردوومان.

# كۆتایی

ئێستا من و خێزانەكەم لە كۆمەڵگەیەكی نیشتەجێبوون لە دەرەوەی شار دەژین لە شوێنێكی ئاشكرا نەكراو لە ئەمریكا. سێ شوقەكەمان هەیە پاك و خاوێن و ڕێك، لەگەڵ قاپشۆری ئۆتۆماتیكی و سەتەلایت و مەلەوانگەیەكی ناوماڵ. هەرچەندە هەندێكجار ئەم ژیانە تازە بەجۆرێك دەبینین، بەڵام من و خێزانەكەم هەوڵدەدەین بە باشترین شێوە خۆمان لەگەڵ ئەم شێوازەی ژیانی ئەمریكی بگونجێنین. ئەوەتا منداڵەكانم خەریكن بەئینگلیزییەك قسە دەكەن وەك ئەوەی كە زمانی زگماكی خۆیان بێت. زەید و ئامینە و ئایەت، خەریكی خوێندنی ئەو زمانەن بۆ ئەوەی خۆیان بۆ چوونە ناو قوتابخانەكانی ئەمریكا ئامادە بكەن. كچەكانم هێشتا هاندەری گەورەی میوزیكی عەرەبین، بەڵام لەم دواییانەدا گوێیان لە گۆرانیبێژانی ڕۆژئاوایی وەك ماریا كاری و بریتنی سپێرز بووە. زەید لە هۆڵی وەرزشی شوقەكەمان وەرزش دەكات ئەمەش وەك بەرپەرچێك بۆ كەمكردنەوەی كاریگەرییەكانی خواردنە خێراكان كە لە ئەمریكا باون. ئەو، خەریكی خوێندنەوەی بەرهەمەكانی ئێرنست هێمینگوایە وەك مەبەستێك بۆئەوەی وشەی زیاتر فێربێت لەم زمانە، و پێشوەختەش ناوی خۆی لە پرۆگرامێكی ئەندازیاری لە زانكۆیەكی ناودار تۆمار كردووە.

لەیلا وەك هەمیشە هاوسەنگییەك دروست دەكات لەنێوان

ماڵەكەمان و ژیانی كۆمەڵایەتیمان، و كۆبوونەوە لەگەڵ هاوڕێ عێراقییەكان و خزمە دوورەكانی كە لە ئەمریكا دەژین ڕێكدەخات. ئەو خواردنی تری ڕۆژئاوایی وەكو پاستا و مریشكی سوركراوەی زیادكردووە بۆ سەر لیستی ژەمە عێراقییەكان كە توانیویەتی بە پێكهاتەكانی ماركێتە ئەمریكییەكان خواردن دروست بكات. هەروەها خەریكە ئینگلیزییەكەی باشتر دەبێت، هەرچەندە ئەو ڕۆژەی كە لە بازاڕكردنێكەوە بەبێ كڕینی كشمش هاتەوە ماڵەوە، هەردووكمان تێر پێكەنین، چونكە نەیتوانیبوو وشەكە بڵێت وەیان بۆ كارمەندەكە ڕوون بكاتەوە كە چی شتێكی دەوێت.

سینەما و مۆڵی بازرگانی -كە لە شوقەكەمانەوە دوورن- بوونەتە شوێنی دڵخوازی ئامینە و ئایەت كە دوای چەندین مانگ دووری لە نیشتمان، ئەمە ڕەنگە نیشانەیەك بێت بۆ ئەوەی كە ئەوانیش خەریكن دەست دەكەن بە گونجان لەگەڵ ئەو ژیانەی ئێرە. زۆرجاران كاتێك لە گەشتە خێزانییەكان دەچینە مۆڵەكە بۆ ئەوەی سەیری دوكانە گەورە و ڕازاوەكان بكەین و پاشانیش لە هۆڵی چێشتخانەكە نان بخۆین —كە عادەتەن خواردنی خێرایی وەكو لەفە، تاكۆ، یان سوشی پێشكەش دەكەن- لە دەوروبەرمان دەنگە دەنگی هەرزەكاران و قەرەباڵغی هەیە، ڕێك وەك ئەوەی كە بازاڕێكی عەرەبی بێت. ناوەندی مۆڵەكە بە دارخورما دەورە دراوە كە بەرزیان دەگات بە گلۆپی بنمیچە شووشەییەكە. من زۆرجاران لەم باخچە نامۆیەی دوورە وڵات دادەنیشم، باخەكانی پڕ لە خورماو باخچەكەی خۆمم لە عێراق بیردەكەوێتەوە. باخچەكەم یەكێكە لەو شتانەی كە زۆر بیری دەكەم. من تامەزرۆی ئەو ئارامی و تەنیاییەم كە جاران لە كاتی چاودێریكردنی گوڵ و

دره‌خته‌كان هه‌مبوو و نیگه‌رانم له‌وه‌ی كه له غیابی مندا بمرن، هه‌رچه‌نده هه‌ندێك هاوڕێ له به‌غدا به‌ڵێنیان داوه چاودێری ماڵه‌كه‌مان بكه‌ن.

هه‌ر زوو دوای گه‌یشتنم به ئه‌مریكا له ئابی ٢٠٠٣، خێزانه‌كه‌مم برد بۆ واشنتۆن دی سی بۆ بینینی شوێنه‌وار و بیناكانی پایته‌خت، له‌نێویاندا یاده‌وه‌ری جێفرسۆن كه بۆ یه‌كه‌مجار چل ساڵ پێشتر كاتێك وه‌كو خوێندكاری قۆناغی یه‌كه‌می كۆلێژ بووم، سه‌ردانم كرد. پاشان له‌یلا و زه‌یدم برده ناوه‌ندی هۆڵه‌كه و ئه‌و ئاماژه‌یه‌م بۆ وه‌رگێڕان كه له ناوه‌وه‌ی قوبه‌كه‌دا بوو، كه تێیدا جێفرسۆن سوێند ده‌خوات و ده‌ڵێت: "من له قوربانگای خوداوه‌نده‌وه سوێندم خواردووه كه دوژمنایه‌تییه‌كی هه‌میشه‌یی له دژی هه‌موو جۆره سته‌مكارییه‌ك بكه‌م كه به‌سه‌ر عه‌قڵی مرۆڤدا بێت". له كاتێكدا له ژێر وێنه‌ی برۆنزی سه‌رۆكی پێشوودا وه‌ستابووین، بیرم له‌و كابوسه سته‌مكارییه كرده‌وه كه پێده‌چوو به كه‌وتنی په‌یكه‌ری سه‌ددام له به‌غدا كۆتایی هاتبێت. به‌ڵام سته‌مكاری هێنده به ئاسانی واز له عه‌قڵ ناهێنێت.

له‌م ڕۆژانه‌دا كاتێك كه‌سانی نامۆ له‌ناو سه‌رخه‌ر (مه‌سعه‌د) یان له پۆسته‌خانه‌دا گفتوگۆم له‌گه‌ڵ ده‌كه‌ن، من ئه‌گه‌رچی دۆستانه‌م به‌ڵام هێشتا وریام زۆر شت له‌باره‌ی پێشینه‌ی خۆمه‌وه ئاشكرا نه‌كه‌م. ده‌یان ساڵه ترس و بێ متمانه جێ په‌نجه‌ی خۆیان له‌سه‌ر من به‌جێهێشتووه. مێشكم باش دركی به‌وه‌كردووه كه ئێستا له سه‌لامه‌تییه‌كی ڕێژه‌ییدا ده‌ژیم، به‌ڵام ده‌ماره‌كانم ناتوانن به ته‌واوی له بارودۆخی چاره‌كه سه‌ده‌یه‌ك له چنگی سه‌ددامدا ڕزگاریان بێت. هه‌ندێك شه‌وان له‌خه‌و هه‌ڵده‌ستم و ترس لێم ده‌نیشێت و وا هه‌ست ده‌كه‌م كه هێشتاش دارو ده‌سته‌كه‌ی سه‌ددام لێره‌ن. من

زۆر حەزدەكەم كە ئەم جۆرە هەستە لە یاد بكەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجاران وا هەست دەكەم كە ڕەنگە ئەم شتە هەرگیز ڕوو نەدات و هەمیشە لەژێر ئەو هەستەدا بم.

هەمیشە هەوڵ دەدەم ڕابردووم بخەمەوە بەرچاوم و تێی بگەم و بیخەمە نێو ڕوانگەیەكی دروستەوە. سەددام ئەگەرچی هەرگیز چەكی ئەتۆمی بەدەست نەهێنا، بەڵام چیرۆكی ئەوەی كە عێراق چەندە نزیك بوو لە بەدەست هێنان و پەرەپێدانی چەكی ئەتۆمی، دەبێ ببێتە ئاڵای سوور بۆ كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی. مەترسی ئەتۆمی هەر ماوە. وڵاتانی دیكە هەوڵی پەرەپێدانی چەكی ئەتۆمی دەدەن و ڕەنگە مرۆڤ وا گریمانە بكات كە لە داهاتوودا چەندین وڵاتی دیكەش هەوڵی ئەوە بدەن. سەنتەرفیوج تاكە مەترسیدارترین پارچەی تەكنەلۆژیای ئەتۆمییە. لەبەر ئەوەی كارامەترین و ئاسانترین ڕێگایە بۆ شاردنەوە، سەنتەرفیوج بەردەوام دەبێت وەك ڕێگەی پەسەندكراو بۆ بەرهەمهێنانی یۆرانیۆم تاوەكو ئاستی پلەی بۆمب بە شێوەیەكی نایاسایی. بەهۆی پێشكەوتنی تەكنەلۆژیای سەنتەرفیوج، ئێستا ئەگەری ئەوە هەیە كە بەرنامەی پیتاندنی یۆرانیۆم لەناو یەك كۆگادا بشاردرێتەوە.

هیوادارم چیرۆكەكەم بتوانێت وەك هۆشدارییەك بێت سەبارەت بەوەی كە ئەمە چۆن ڕوودەدات و یارمەتی خەڵكی گشتی بدات لە مەترسییەكە تێبگەن. هەروەها هیوادارم باشترین ڕێگە بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم مەترسییە نیشان بدات. بەرنامە ئەتۆمییە نایاساییەكان خاڵێكی لاوازی هاوبەشیان هەیە: پێویستیان بە پابەندبوونی نێودەوڵەتی هەیە. پاكستانییەكان بۆمبەكەیان پەرەپێداوە، چونكە زاناكانیان سوودیان لە شارەزایی لە هۆڵەندا وەرگرتووە، بۆ نموونە. بەرنامەی سەنتەرفیوجی عێراق هەرگیز

نه‌یده‌توانی سه‌ركه‌وتوو بێت ئه‌گه‌ر ئێمه سوودمان له هاوكارییه‌كانی ئه‌ڵمانیا، به‌ریتانیا، سویسرا و ئه‌مریكا نه‌بینیبا.

ئه‌و ڕێگایانه‌ی كه من له‌م وڵات و ئه‌و وڵات به‌دوایدا ده‌گه‌ڕام، داخراون. به‌شێكی زۆریشی هۆكاره‌كه‌ی ئه‌وه‌یه كه دۆسیه‌ی عێراق حكومه‌ته‌كانیانی وریاتر كرد. له‌وه‌ته‌ی نه‌ته‌وه یه‌كگرتووه‌كان مامه‌ڵه‌ی ئێمه‌ی له‌گه‌ڵ كۆمپانیای M.A.N ئاشكرا كرد. ئیتر له‌و ساته‌وه‌و زانایانی ته‌كنه‌لۆژیای نوێ بۆ نموونه ئه‌ڵمانیا و وڵاتانی تری ڕۆژئاوا بوونه‌ته پێشه‌نگ له یاساكانی كۆنترۆلكردنی هه‌نارده‌كردن.

ڕه‌نگه وڵاته زلهێزه‌كانی ڕۆژئاوا تا ئێستا خراپترین شوێن بن له‌سه‌ر زه‌وی بۆ بازاڕكردن بۆ پێكهاته ئه‌تۆمییه نایاساییه‌كان. ڕێساكانی شتومه‌كی (به‌كارهێنانی دوانه‌یی)، و ئه‌و كۆمپانیایانه كه به‌رهه‌میان ده‌هێنن، قه‌ده‌غه‌ده‌كردنه. به‌ڵام ئه‌گه‌ر بته‌وێت هه‌موو كه‌لێنێك له سه‌رانسه‌ری جیهاندا دابخرێت، ئه‌وا ڕه‌نگه مه‌حاڵ بێت. له‌لایه‌كی تر زۆرێك له گه‌لانی دیكه ئه‌وه‌نده پێشكه‌وتوو بوونه كه له توانایان دایه پێكهاته‌ی سه‌نته‌رفیوج به‌رهه‌م بهێنن. كۆمپانیاكانی وڵاتانی وه‌ك سینگافوره، ئه‌نده‌نوسیا، یان فینلاند كه ژێرخانی ته‌كنه‌لۆژیای به‌رزیان هه‌یه به‌ڵام هیچ به‌رنامه‌یه‌كی ئه‌تۆمی تایبه‌ت به خۆیان نییه، له‌وانه‌یه خۆیان ئاماده بكه‌ن بۆ دروستكردنی پێكهاته‌كان به‌بێ ئه‌وه‌ی زه‌نگی ئاگاداركردنه‌وه لێبده‌ن.

عێراق هێشتا ناوه‌ندێكه له‌به‌رده‌م وه‌ستاندنی هه‌ڕه‌شه‌ی بڵاوبوونه‌وه‌ی چه‌كی ئه‌تۆمی. هه‌روه‌ها سه‌دان زانای ئه‌تۆمی خاوه‌ن شاره‌زایی پێویست بۆ پیتاندنی یۆرانیۆم و دروستكردنی

بۆمب لە بەغدا ماونەتەوە. ڕەنگە هەندێك لە هاوكارەكانی پێشووم پێش لەشكركێشی و دوای داگیركاری وڵاتەكەیان بەجێهێشتبێت و ئەمەش مەترسییەكی بەردەوامی هەیە كە ڕەنگە زانیاری بەرهەمهێنانی چەكی كۆمەڵكوژ لە دەرەوەی سنوورەكانی عێراق زۆرتر بێت. دوای ماوەیەكی زۆر لە كۆتایی هاتنی بەرنامە ئەتۆمییەكەی سەددام، زاناكانی وەك ئینسایكلۆپیدیایەكی پڕ لەزانیاری لە تەكنەلۆژیای سەنتەرفیوجدا ماونەتەوە. ئەمەش دەشێت ئەوانە بۆ بەرنامەیەكی چەكی بیانی زۆر بەنرخ بن.

وەك لە چیرۆكەكەمدا دەردەكەوێت، زۆرجار زانایان بەهۆی زانیارییەكانیانەوە دامەزراون و دواتر دەخرێنە دۆخێكەوە كە كۆنترۆڵێكی كەمیان بەسەردا هەیە. سەرەڕای ئەو دەستەواژە ئازایانەی كە لەسەر یادەوەری پەیكەری جێفرسۆن نەخشێنراون، بەڵام هێشتاش ستەمكاری دەتوانێت پیاوێك بخاتە دۆخێكی ناپاكەوە ئەگەر بیەوێت خێزانەكەی بپارێزێت. تێگەیشتن لەم فشارە كلیلی وەستاندنی بڵاوبوونەوەی چەكی ئەتۆمییە. من باوەڕم بەوە نییە كە هاوكارانی پێشووم چالاكانە هەوڵی فرۆشتنی زانستە ئەتۆمییەكانیان بدەن لە بازاڕی ڕەشدا. بەڵام عێراق شوێنێكی مەترسیدار و ناسەقامگیرە بۆ ژیان لە ئێستادا و ڕەنگە هەندێك لە زانایانی پێشووی چەكی ئەتۆمی و تەقەمەنی بێكار بن. بە ئاسانی دەتوانن ببنە ئامانجی هەر كەسێك كە بیەوێت سوود لەو كارامەییانەی كە لەسەر داوای سەددام فێری بوون، بەكاربهێنێت.

وەك ئاشكراكردنی بەرنامە ئەتۆمییەكەی لیبیا لە ساڵی ٢٠٠٤دا دەركەوت، هێشتا بازاڕێكی ڕەشی نێودەوڵەتی بوونی هەیە كە برسی تەكنەلۆژیا و شارەزایی ئەتۆمییە. جیهان تووشی شۆك بوو كاتێك زانی چۆن نهێنییەكانی سەنتەرفیوج لە پاكستانەوە بۆ لیبیا

و ئێران و كۆریای باكوور و ڕەنگە لەودیوەوە بڵاوبوونەتەوە. وانەكە سادەیە: زانین یەكەم و گرنگترین پێكهاتەیە بۆ بەرنامەی چەكی شاراوە و كاتێك زانیاری ئەتۆمی كەوتە سەر زەوی واقیع، ئیتر كۆنترۆڵكردنی ئەستەمە.

زانایانی پێشووی ئەتۆمی لە بەغدا پێویستیان بەوەیە بخرێنە سەر كارێكی باش كە هاندەریان بێت تاوەكو لە عێراق بمێننەوە. پێویستە هەنگاو بنرێت بۆ دڵنیابوون لە سەلامەتییان، بۆ ئەوەی هەرگیز ئەو ئەگەرە سەرهەڵنەدات كە ڕەنگە ناچار بكرێن بۆ خزمەتكردنی بەرنامەیەكی ئەتۆمی نهێنی بۆ وڵاتێكی دیكە یان گروپێكی تیرۆریستی. ڕەنگە بۆ ئێستا هەندێك لە زانایانی پلە باڵا لە عێراق بهێنرێنە دەرەوە. زۆر گرنگە كە یەكێك لە دەرئەنجامەكانی ڕزگاركردنی عێراق كەمكردنەوەی مەترسی بڵاوبوونەوەی چەكی ئەتۆمی بێت نەك زیادكردنی.

هەموو شەوێك من و خێزانەكەم لە كەناڵی جەزیرە و سی ئێن ئێن سەیری هەواڵەكان دەكەین، ئەمەش وەك هەوڵێك تاوەكو بزانین كە لە زێدی خۆماندا چی ڕوودەدات. داهاتوو زۆر نادیار و ناڕوونە، بەجۆرێك بەڕاستی هەست بە بێتاقەتی دەكەم لەوەی كە لەم شتانەوە دوورم كە بۆمن زۆر گرنگن. دەزانم هێشتا سەلامەت نییە بۆ من بگەڕێمەوە بۆ عێراق، بەڵام پلانم هەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو كارە بكەم، لانیكەم بۆ ئەوەی لە شوێنی لەدایكبوونمدا بمنێژن. سەبارەت بە منداڵەكانیشم، ناتوانم خەیاڵی ئەوە بكەم كە ئاخۆ لەداهاتوو چ ڕێگەیەك دەگرنە بەر، ڕێك وەك خۆم كاتێك لە تەمەنی ئەواندا بووم هەرگیز خەیاڵی ئەوەم نەدەكرد كە بكەومە سەر ئەم ڕێگەیە. تەنها دەتوانم دوعا بكەم كە ستەمكاری نێتە سەر ڕێیان هەروەك هاتە سەر ڕێگای من.

زەید لەم دواییانەدا پێی وتم، ئەگەر بارودۆخی عێراق سەقامگیرتر بێت، دوای ئەوەی بڕوانامەی زانکۆی بەدەست دەهێنێت، دەیەوێت بگەڕێتەوە بەغدا بۆ ئەوەی هاوكار بێت لە ئاوەدانكردنەوەی وڵات. كاتێك ئەمەی وت، پریشكێكی سۆزداریم لە چاویدا بینی كە شتێكی لە مندا هەڵگیرساندەوە. لەناكاو خۆمم هاتە بەرچاو كە لە تەمەنی ئەودا بووم، كەسێكی ئایدیالیست بووم و خەونم بەوە دەبینی كە بتوانم جارێكی دیكە یارمەتی وڵاتە بەپیتەكەم بدەم بۆ گەیشتن بە ئامانج. هەربۆیە حەز دەكەم بیر لەوە بكەمەوە كە بە پێچەوانەی منەوە، دەتوانێت توانا ئەندازیارییەكانی بەرەو ئامانجە ئاشتیخوازانەكان بەكاربهێنێت.

# سوپاس و پێزانین

دەمەوێت ددان بە قوربانیدان و مەینەتیەكانی ئەو نەوەیەی عێراق دا بنێم كە لە سەردەمی سەددام حوسێندا ژیاون. لە پێناو ئەوانەی نەماون و ئەوانەش وەك پەڵەیەك ماونەتەوە، نابێت هەرگیز زوڵمی ڕژێمەكەی سەددام لەبیر بكەین تاوەكو جارێكی تر دووبارە نەبێتەوە.

نووسەرانی ئەم كتێبە دەیانەوێت سوپاسێكی تایبەتی دەیڤید ئۆلبرایت بكەن كە هاوكارییەكانی وایكرد ئەم كتێبە لەدایك ببێت. هەروەها سوپاسێكی زۆر بۆ مۆلی بینگهام، كۆری هیندەرشتاین، جەمال سەلمان، جاك باوت، گاری دیلۆن، ئەلیس مارتێل، دانێل مۆرتۆن، سیموس كۆنلان، كریستیان جۆری، ئێریك نێلسۆن، لۆرا كوساك، لۆری سەید-مێهرتێنس و دیڤرا ك. نیلسۆن، هەروەها سوپاسی بنەماڵەی عوبێدی و پیتزەر دەكەین، بۆ خۆشەویستی و پشتیوانییان لە كاتە سەختەكاندا.



## مەهدی عوبێدی

لەدایکبووی 1944ی شاری بەغدادە.

دوای قۆناغی سەرەتایی لە عێراق، لە قوتابخانەی کانەکانی کۆلۆرادۆ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەخوێنێ.

لە ساڵی 1967 پەیوەندی بە وەزارەتی نەوتی عێراقەوە دەکات.

لە ساڵی 1972 بڕوانامەی دکتۆرا لە زانکۆی سوانزی لە بەریتانیا و لە بواری زانستی کەرەستەدا بەدەست دێنێ.

پاشان پەیوەندی دەکات بە ئاژانسی وزەی ئەتۆمی عێراقی و کار لەسەر کارتێکەرێکی فەرەنسی بۆ تاقیکردنەوەی ماددە ئەتۆمییەکان دەکات.

مەهدی عوبێدی و هاوڕێکانی لە ئاژانسی وزەی ئەتۆمیی عێراقی، توانیان لە ماوەی سێ ساڵدا بگەنە یەکێک لە خێراترین و کاراترین شێوازەکانی پیتاندنی یۆرانیۆم لە مێژوودا، لەسەر بنەمای شێوازی سەنتەرفیوج، بەڵام دوای ڕووخانی ڕژێمی عێراق، دکتۆر مەهدی عوبێدی عێراقی جێ هێشت و ئێستا لە شوێنێکی نەزانراو لە ئەمریکا لەگەڵ خێزان و منداڵەکانی دەژیت.

مەهدی عوبێدی
کێرت پیتزەر

# بۆمبێک لە باخچەکەمدا

THE **BOMB** IN MY GARDEN

وەرگێڕان و پەراوێز
سەنگەر حەسەن نەجم

# بۆمبێک لە باخچەکەمدا

THE **BOMB** IN MY GARDEN

"بۆمبێک لە باخچەکەمدا" دانپێدانانی زانایەکی عێراقییە کە بە دارێژەری سەرەکیی بەرنامەی ئەتۆمیی سەدام حوسێن دادەنرێت. کتێبەکە بە هاوکاری لەگەڵ کێرت پیتزەر -ڕۆژنامەنووسێکی بە ئەزموون- نووسیویەتی و تیایدا تیشک دەخاتە سەر چیرۆکی دروستکردن و پەرەپێدانی چەکی ئەتۆمی لە لایەن عێراقەوە و چۆن توانرا لە ماوەیەکی زۆر کەم بگەنە پیتاندنی یۆرانیۆم و دواجار هەوڵەکانیان بۆچی شکستی هێنا؟ بە گوتەی عوبێدی، زانا کوردەکان ڕۆڵی گرنگ و بەرچاویان هەبووە لە پیتاندنی یۆرانیۆم و دەڵێت کە کوردەکان بە زیرەکی و پڕ لە وزە و چالاکی ناسرابوون. لە بەشێکی دیکەی کتێبەکەدا، نووسەر باس لەوە دەکات کە لە کاتی داگیرکردنی کوێت و هێرشی هاوپەیمانانـدا، سەددام چۆن داوای ئەوەی کردووە کە بە زووترین کات ئەگەر تەنها بۆمبێکیش بێت، دروستی بکەن!


8,000 IQD




دەزگای فام
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

FAM PUBLICATION
+964 750 773 71 76
info@fam.pub • www.fam.pub
FAMpublication

COVER DESIGN BY
Bavan Rebwar